یادەوەری

# کۆڵان کۆڵان گێڕانەوە

بەرگی سێیەم
(١٩٨٠ – ١٩٨٣)

کەریم کاکە





**ناوەندی ڕۆشنبیریی**

**مەم و زین**

- ناوی کتێب: کۆڵان کۆڵان گێڕانەوە – بەرگی سێیەم
- نووسەر: کەریم کاکە
- نەخشەسازی ناوەوە: ناوەندی مەم و زین
- نەخشەسازی بەرگ: پەپوولە یوسفی
- وێنەی بەرگ: عومەر کەریم
- بابەت: یادەوەری
- نۆبەتی چاپ: یەکەم - ٢٠٢٣
- تیراژ: ٥٠٠ دانە
- نرخ: ٨٠٠٠ دینار

لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان
ژمارەی سپاردنی ( ٢٨٠ )ی ساڵی (٢٠٢٣)ی پێدراوە.

**سەرجەم مافەکانی ئەم کتێبە پارێزراوە بۆ ناوەندی ڕۆشنبیریی مەم و زین©**

Memuzin20@gmail.com

## پەلکەزێڕینەی هاوینە

هەوکەوش حەزت لە پرچی ئایشە و فاتمەیە، لۆ کێی دەنەخشێنی؟
زمانم تێکئالا:
لۆ...
بریا بایی یەک (تۆ)ی دوای لۆیەکە زاخم تێدادەبوو. ئای بۆ ئەو چۆڕە زاخە، ئەگەر هەمبا، دەمگۆ:
تۆ.
داری بریا کەی بەری گرتووە! لەدەستمچوو، جا من چیم لە دەست نەچووە! کەنگینێ لە جێی خۆی قسەم بۆ هاتووە؟ ئەو جارە باش هات، لێ شەرم زمانمی لە گۆ خست و زارمی بەست. تۆش لە جێی من بایت، لەو لۆیە پترت بە زاردا نەدەهات.
نەتدی، تۆ نەتدی، هێ لە من کەس نەیدی. لەو هاوینە گەرمە، لە ناو پەلکەزێڕینەکەی دەستی من، چ پەلکەزێڕینەیێ دەرکەوت و منی بە چ دەردێ برد! هەر بەڕاستی ئەو لەو گەرمای هاوینە، پەلکەزێڕینەی پاش بارانی زۆری بەهاری بوو. پەلکەزێڕینەیێ منی بە تەواوی خستە نێو نیوە بازنەی خۆیەوە. پەلکەزێڕینەکەی بە دەستی خۆم نەخشاندبووم، شوێنەواری نەما.
ئەز لە سەر کۆسپەی دەرکە، سۆندەی ئاوێ بە دەستەوە، کۆلانم دەڕشاند. لە بن تیرۆژی رۆژێ بە رووی دیوارەکە پەلکەزێڕینەیەکی ناسکم نەخشاندبوو. ئەو ئیشە پیشەی خۆم بوو، مندال بووم، هێشتا گەورەیی نەفرەتی لێکدی دانەبڕیبووین، بە سۆندە، بە پرووشەی ئاوێ لە بەر هەتاوێ، لە پێش دەرکێ بە رووی دیوارێ لە چێکردنی پەلکەزێڕینە دەکەوتینە

پێشبڕکێ. بە زۆری من دەمبردەوە، ئەو دەیگۆ:
دەی پرچی ئایشە و فاتمە بنەخشێنە.
بە دڵی وی دەمنەخشاند، دەیگۆ:
وەی چەند جوانە، دەڵێی هی ئاسمانێیە.
دەمگۆ:
بڕۆ بیگرە، لۆ تۆ.
دەچوو، پرچی تەڕ دەبوو، هەستمدەکرد کەمێ لە پەلکەزێڕینەکە دەچێ، پرچی دەبووە پرچی ئایشە و فاتمە.
دەیگۆ:
سۆندەم وێدە، نۆرەی منە.
پەلکەزێڕینەی دەنەخشاند، دەیگۆ:
ها، کووە؟
دەمگۆ:
جوانە، بەڵام ناگاتە ئی من.
دەیگۆ:
تۆ سۆندەکە چۆن لە بەر رۆژێ رادەگری؟ دە فێرمکە.
دەمگۆ:
دە بڕۆ کچێ، بە من فێرنابی.
رووی سۆندەی لە من دەکرد و لە ئاوی هەڵدەکێشام.
لەو چەند چرکەیەی سەر دەرگا، چەند دیمەنێکی منداڵیم ناو پەلکەزێڕینە، هاتنەوە بەر چاو. خۆزی لە خۆزیداران هەر دوو منداڵەکەی هەینێ دەبووین، ئێستا بێ شەرم پەلکەزێڕینەکەم لە مل دەکرد. ئەها، گەورەبوون چ بێزاخی و داخێکی بۆ من هێنا، ئەوەتا کەویاری پەلکەزێڕینە، دوای هێندە ساڵە، بە زمانی خۆی لێم دەپرسێ:
پرچ بۆ کێ دەنەخشێنی؟
کەچی من زمانم دەبەسترێ و هیچم بۆ ناگوترێ! دڵیشم هەمیشە دەکوتێ و لە کوتانە.

له دوای کۆچەکەی، ئەوکۆچەی منی بە دەردێک برد ناهێتە گۆتنێ. ئەوە یەکەم جار بوو، وا لە نزیکەوە ببینم و بێتە ماڵێ مە و قسەم لەگەڵ بکات. وای خودایە، چەند جوان بوو، کار لە پەلکەزێڕینە نەبوو، نە بە منداڵی نە پێش کۆچەکەی وا جوانم نەدیوە. چما کچ بە بووک بچێ، مێرد بکات، جوانتر دەبێت! ئەدی بۆنەکەی! ئەوە چ بۆنێکی لە خۆی دابوو؟ پێدەچێ هەر بۆنی خۆی بووبێ، ئاخر ئەو کچە لە منداڵییەوە سەر بە نێرگز و ڕێحانە و مێخەک و شەوبۆ بوو. لە دەمی ئارەقەکردنێش بۆنی خۆشی لێدەهات، دەتگوت لە کۆلانی قەنەفری ناو قەیسەرییەوە هاتووە.

مەستی کردم، چاوم لە بەر تیشکی جوانیی هەڵنەدەهات، سەر ڕوومەتەکانی دەگەشانەوە و لە شێوەی ئاوی کەسکوسۆر تیشکیان دەدایەوە، نا، تیشکی ڕەنگاورەنگ لە شێوەی پەلکەزێڕینە. تەنها زمان نا، دەست و پێشم تێکهالان. وا تێبگەم لە شپرزەییم تێگەیی، بە بێدەنگی و لە شێوەی تاوس چووە ژووری. ویستم بە دوایدا بچم، چۆکم شکا، لە سەر دەرگا دانیشتم، ئاگام لە سۆندەی ئاوێ و نەخشاندنی پەلکەزێڕینە بڕا، کەوتمە سەرکۆنەکردنی خۆم:

دەبوو شتێکم کردبا، دەبوو بەر لە شووکردن ماچێکی خۆشەویستیم تێگرتبا، دەبوو تێگەیشتبا من چەندم خۆشدەوێ، ڕەنگە ئەویش منی ویستبا...

بیرمنایەتەوە، کەی هەستا و ڕۆیشت، داخوا منی لەو باری مەلوولی و تێکشکانە دیت، یان نا؟ لەو دیدارەی سەر دەرگای خۆمان، دیداری دیار پەلکەزێڕینە و ناو پەلکەزێڕینە هەر هێندەم لە یادە، ئەو ڕستەیەی خۆشم بیرناچێتەوە، کە لە دڵەوە گوتم:

من و ژیانیان نەگوتووە.

لێ بوێریم تێدا نەبوو، هەر جارەی شتێ دەیگێڕامەوە و بە ژیانی دەبەستمەوە.

بیرمە ئێوارەکەی لە سەر بانەوە، کەویارەکەی حەسەن زیرەکم بە شمشاڵ بۆ گوتەوە، ئەو کەویارەی کە کەویار بە منداڵی زۆر حەزی لێدەکرد و منیش زوو زوو بۆم دەژەنی:

**کەویارێ کەویار، خاس کەویارێکی**
**دەم تەڕ و لێو ئاڵ، زولف لوول، عەجەب یارێکی**
**وەنەوشەم دەچنی مەڵۆ بە مەڵۆ**
**خەڵکان پێی شاد بوون، ئەمنیش رەنجەڕۆ**
**وەنەوشەم دەچنی پەنجەم دا لە گوڵ**
**شەوگارم شڕکرد، نەگەییم بە دڵ**
**کەویارێ کەویار، کەویارەی خۆمی**
**باڕێزەی شاخان، کەنیرەی چۆمی**

روو لە ماڵی کەویار، کەویارم بۆ کەویار ژەند، توند فووم بە شمشاڵدا دەکرد، تا گوێی لە ئاوازە دڵنشینەکەی خۆی بێت و منداڵیمانی جوان وەبیربێتەوە، وێنەی جاری گۆڕین، لە سەر ئاوازەی کەویارێ کەویار، بێتە کۆڵانێ بە رەوتی و کەو و بە لەنجەولار.

ئەو شەوە هەر خۆم دەزانم چ شەوێکی پڕ لە ئەندێشە و ئاریشەی دڵ بوو، نەمزانی چۆنم کردەوە.

وا تێبگەم ئەو شەوە بوو یان شەوی دوایی، خولیای سەر زێ کەوتە سەرم. نامەیەکی چەند دێریم نووسی و سبەی زوو هەیپەم لێکرد و چووم.

تا گەیشتمێ، بیرم لە پاش خۆم دەکردەوە، داخوا چ دەبێ، چ روودەدا، دەمبیننەوە یان نا، گریان و ئەو شتانە.

هەوکە وا لە سەر پردی ئاسکی کەڵەکم، روو لە خوارێ لە نێوان دوو مەلەوان راوەستاوم، یەکیان دەپرسێ:

بۆچێ بە جلکەوە خۆ هەڵدەدەیتە ناو زێ؟

باگۆم نەدایەوە، ئەوان خۆیان هەڵدا، کەوتنە بن زێ و دوای تاوێ سەر ئاو کەوتنەوە و بە باسکەمەلە گەیشتنەوە کەنار، لە بەر خۆمەوە گوتم:

من ئیدی بە کەنار ناکەومەوە.

وا لە لێوارم، لێواری دوا هەناسەکانی ژیان، دەستم لە دنیا شووشت،

ئەوەشم بیردێتەوە، رووم لە ئاسمان کرد و گوتم:

خودایە، ئەگەر ئەو دنیا هەیە؟ بمبە بەهەشت، لەوێ ئەوکچەم پێببەخشە کەوا لە پێناوی وی خۆم بە زێدا دا.

ئەگەر لە کونێکەوە چاوتان لێدەبوو، دەتاندی کوو کوویی پێم بڵند دەکرد و دامدەنایەوە، بە دەنگی بڵند بە خۆمم دەگوت:

دەی نەوێرۆک، ئەدی ئەو رێیە دوورەت بۆچی بڕی، بۆ پیاسە هاتی؟!

لەگەڵ خۆم کەوتمە مشتومڕ و کێشمەکێشێکی توند، لەنێوان مردن و ژیان کامیان؟

بیرمدێتەوە، کتێبەکەم بیرکەوتەوە، ئەوەی دوو سێ رۆژێ بوو دەستم بە خوێندنەوەی کردبوو، دوا رستەی سەر پردی ئاسکی کەڵەکم کە بۆ خۆم گوتەوە، ئێستاش بە ئاوازەی خۆیەوە لە گوێمە:

با کتێبەکە تەواو بکەم، هەینی دێمەوە ئێرە.

بە هەڵەداوان خۆم گەیاندە گەراج و تا گەیشتمەوە ماڵێ، بیرم لای نامەکە بوو، لە بن لێوانەوە نزام دەخوێند، کەس نەیبینیبێت. کەس هەستی بە شتێ نەکردبێت. گەیشتمەوە هۆدەکەی خۆم، ئاهم هاتەوەبەر و بە هەناسەیەکی سەرڕێژ لە ئاسوودەیی:

ئۆخەیش، لە شوێنی خۆیەتی.

لە دیوی ژۆرێ لە لای سەرێ بە کەتیرە بە دەرگامەوە نووساندبوو.

دەستوبرد دڕاندم و سووتاندم.

ئەوە نازانم نیازی یەکەم یان دووەم بوو، نیازی خۆکوشتن، نیازی خۆکوشتنم مەبەستە. ئیدی چەندان جار هەوڵی لەو شێوەم داوە، بەڵام سەرینەگرتووە و هەموو جارێ بەو دەردە چووە. هەر جارەی شتێ پەژیوانی دەکردمەوە، تۆ بڵێ هەر جارەی بەهانەیەکت دۆزیوەتەوە! ئا، رەنگبێ بەهانە بووبێ!

بۆیێ ئەوە ناهێنن بکەونە کۆڵان کۆڵانەوە، سەری ئێوەی پێ بێشێنم. لەبیرمبێ، نیازی خۆ کوشتن لەگەڵم هات و وازی لێم نەهێنا.

زۆر کەڕەت هەندێ گرتە و گۆتەی سینەما نیازی خۆکوشتنیان لە دڵم

زیندوو دەکردەوە، زاخم دەدایە بەر خۆم و دەگەیشتمە سەر لێواری کردە، هەر سینەما پەژیوانی دەکردمەوە، بەهانەی بۆ دەدیتەوە. سینەما بۆ وام لێ دەکات! وا چاکە واز لەو نیاز و بەهانە و پەژیوانبوونەوانە بهێنم و شتێ لە جوانی و ئەوینی سینەما بگێڕمەوە.

## ئەوینی سینەما

بـێ سـینەما هەڵمنەدەکـرد، وەک چـۆن حەمەشـێت بـێ ئاسـن و پاسـن هەڵینەدەکرد، عەمـۆ جەلیل بـێ رادیـۆ، حەمەد مەسـتان بێ بـادە، ئەنـۆ بـێ دارلاسـتیق، دایکـم بـێ قەیسـەری، بـاپیرم بـێ داپیـرم و جغـارە و تەڕوار، کۆترباز بێ کۆتر و باڵدار، ئەویندار بـێ دۆسـت و یـار، مـن بێ کەویـار، بێ سینەما، بێ سـینەما هەڵمنەدەکرد. ئەز لە زووەوە، لە منداڵییەوە هەر ئەوەتـا سـینەما و دەرێـی سـینەمام لێکدی جـودادەکردەوە، بـوومە هـۆگری سـینەما. نـاوە نـاوە نەچووبـام، بە زگـم دەدا، سـەردەهێنم و دەبەم بـۆچی بەو شـێوە شێتی سینەما بووم، تێناگەم.

تۆ بڵێی بە هۆی بابمەوە بووبێ؟ بیرمە دوایوەی بلیتی بڕی، گوتی:

وا دەچیـنە ژوری، لەوێ هەرچیـت دی، بـزانە بە قەسـتیە و بە راسـتی تێمەگە، ئەگەر شتی ناخۆشت دی، مەترسە و خەمـی لـێ مەخۆ، ئەگەر شتی خۆشت دی، پێی دڵخۆش ببە و چەپڵەی لۆ لێدە.

بابم لە ئەزموونەوە قسەی دەکرد، کاتی خۆی کە یەکەم جار بوو سـینەما ببینێ، کەمێ ترسابوو، ئەو بەر لە تەلەفزیۆن سینەمای دیبوو.

زۆر جار دەیگۆ:

هەزار تەلەڤزیۆن ناگاتە یەک سینەما.

تـۆ بڵێـی شـەیدابوونی مـن بـۆ سـینەما، پێوەنـدی بە پیـری سـوارچاکانی باپیرمەوە نەبێ؟

بە دووری مەبینـە، ئـاخر ئەو جـارەی لەگەڵ وی چـوومە سـینەما، دواتـر هەند جوان جوانیی سینەمای پێشاندەدایەوە، مەگەر جوانیێ گوڵی کۆسـارانی نەنکم، یـان بەهـاری تەڕواری وا هێنـابێتەوە نـاو قسـە و باسـان، زۆر جـار دەیگۆ:

حەیف و مخابن، منداڵی و گەنجیم بێ سینەما بە سەربرد، نەبوو، هەینێ سینەما نەبوو.

باپیرم بە پیری سینەمای دیبوو، تەمەنی حەفتای ئاودیوکردبوو، بۆ هەشتا دەچوو. ئەو جارەی منیشی بردە سینەمای حەمرا، بێ منەت تەمەنی سەدەێ دەبوو، بیرمە دەیگۆ:

لەشت ساغ بێ و بیستن و دیتنت کز نەبێ، هی ئەوەیە حەفتەی کەڕەتێ دوو بچیە سینەما.

بابیشم بە گەورەیی سینەمای دی، بە قسەی خۆی بێ، بیست و شتێ بوو.

بەڵام من بە گچکەیی چووم، ئەو ساڵەی بۆ یەکەم جار لەگەڵ بابم چووم، چوار پێنج ساڵان دەبووم، ئەویش لە چلی تێپەڕاندبوو.

هەر دەمێ بابم و باپیرمی ناو سینەمام بیردەکەوتەوە، پتر متووی سینەما دەبووم.

دووریش نیە هۆگریی من بۆ سینەما بە هۆی جیاوازیی هەردوو دنیاکەوە بووبێت، دنیای ناو سینەما و دنیای دەرێ، هی خۆمان. ئاخر سینەما هەر لەو ساتەی گلۆپەکان بە دوای یەکدا دەکوژانەوە، دەکەوتیە دنیایەکەوە، لە دیدی منەوە ئێرە و ئەوسەری دنیا، جیا لە دنیای خۆمان. دنیای ئەوێ خۆر و مانگ و رۆژ و شەویشی وەک هی خومان نەبوو.

تۆ بڵێی کەویاریش دەستی لەو ئەوینە نەبێ! ئەوینی من بۆ سینەما، بۆ نا! ئەگەر کاولیان نەکردبێ، من ئێستاش جێیەکەی وی دەناسمەوە، هەر جارێ چووبێتمە سینەما سیروان، تا جێیەکەی ئەو هەبووبێت، لە چ جێ دانەنیشتوومە، لەو سەری لە لای پشتەوە بوو. هەر وەکوو هەوکە بێ، وا جوانم لە یادە، زۆر منداڵ بووین، ماڵی وان لەمێژ نەبوو هاتبووە گەڕەکێ. بیرم نیە کێ بوو، هەردووکمانی بردە سینەما، ئەو جاری یەکەمی بوو، تا گەیشتینە ژوورێ و گلۆپ کوژایەوە، سەد پرسیاری لێ کردم:

سینەما کووە؟ کەسەکانی ناوی گەورەن یان گچکە؟ دەنگیان بەرزە یان نزم؟

ئەمنیش لە وەڵامدانەوە زۆرم دەخستە سەری.

لە تەنیشت یەکتر دانیشتبووین و بە دەم گوڵەبەڕۆژە قرتانەوە، تێکەڵی فیلمەکە بووین، حەیفم دێ ئەوە یەکەم جار و دوا جار بوو، پێکەوە بچینە سینەما.

هەینیێ سەردەمی منداڵیی مە، کەس نەبوو حەزنەکات لە سینەما، ژن و پیاو، ورد و درشت، دەوڵەمەند و گەدا، بە کەڕولاڵ و دەرۆزەکەر و شێتیشەوە.

هەندێ گرتە و گۆتەی ناو سینەمام بیرکەوتەوە:

عەمۆ جەلیل، پیاوەکەی ناو دەلالّخانە، ئەوەی لە خەوێش رادیۆ یان دەنگگری بە بن گوێوە بوو، بە دەنگگرەوە لە تەنیشتە من دانیشتبوو، دەنگی دابووە پاشای تەنبووریێ، گوێی دابووە یار یار گەوریێ. گڵۆپ کوژایەوە، شاشە رووناکبۆوە، فیلم دەستیپێکرد، ئەو لە گوێی خۆی نەکردەوە، بەڵام کزی کرد، چاویشی لە شاشە بڕی. هەینیێ هەر عەمۆ جەلیل نا، زۆر کەس لە جغارە پیستر بە رادیۆیان گرتبوو، هەبوو لە کاتی دەنگوباس، بە دیار تەلەفزیۆنەوە دادەنیشت، بەڵام رادیۆی دەکردەوە، چاو بۆ تەلەفزیۆن و گوێ بۆ رادیۆ.

سینەما هێند بەکێش و دڵکێش بوو، لە هەلێک حەمە شێتی بە کۆڵی ئاسن و پاسنەوە راکێشا و بۆ تاوێ بە دیار فیلمێکەوە دانیشت. ئەو شێتە ئەگەر بە پێڵاوەوە لە ناو مزگەفتێ بچووبایەتە جێی نوێژی مەلاش، کەس پێشی پێنەدەگرت، خەڵک وەک فریشتەیێ، بوونەوەرێکی ئاسمانی لێیان دەڕوانی.

وا تێبگەم لە سینەما حەمرا بوو، بەر لە کوژانەوەی گڵۆپ بە ژۆریێ کەوت، ئەو خەڵکە یەکپێ لە بەری هەستانەوە و کەوتنە چەپڵە کوتان، بەکرێ و هێور هێور هات هات لە ناوەڕاستێ لە تەنیشت کورسیێ لەو گۆڕە دانیشت. چەندی هەوڵیان لەگەڵ دا، بێتە سەر کورسی، گوێی بە کەس نەدا. گڵۆپ کوژایەوە، دوای تاوێ هەستایەوە، لایتیان بۆ لێدا، دیار بوو، چاوی باش نەیدەدی، ویستیان دەستی بگرن، نەیهێشت. فیلمیان بڕی و گڵۆپیان پێکردەوە، تا لە دەرگا نەچووە دەرێ، گڵۆپ نەکوژایەوە. هەینیێ شار بە

مزگەفت و سینەماوە بەو شێوە ڕێزی شێت، حەمە شێتی خۆی دەگرت.

هەبوو کۆتریشی دەهێنایە ناو سینەما، نازانم لە کوێی خۆی دەیشاردەوە و دەرگاوان نەیدەدی، ئەوجا کۆتری ناو سینەما بەزمیشی دەنایەوە، جار هەبووە شەڕیشی لێکەوتۆتەوە، من شەڕێکی ئەنۆی گەڕەکێم لە نزیکەوە دی.

بەر لەوەی زەنگی دەرگا داخستن لێبدرێ و گلۆپ بکوژێتەوە، لەو سەرەوە کۆترێ هەڵدرا، کۆتر لە بن ساپیتەی هۆڵی سینەما دەتگۆ پانکەیە بە دەوری خۆیدا دەسووڕێتەوە. ئەنۆ کە لە پێشە من دانیشتبوو، دارلاستیقی دەرهێنا بە یەکەم بەرد کۆتری سەراوسەر هێنا خوارێ، کوڕێ بە دەنگێکی زیقن:

ئەوە چ سەگبابێ ئەو بەردەی هاویشت؟

ئەنۆ لە جێی خۆی هەستایەوە و بە دەنگێک کە دەنگیدایەوە:

ئەوە چ قووندەرێ بوو ئەو کۆترەی هەڵدا؟ با خۆی دەرخا.

دوو سێیەک بۆی هاتن، دەستی یەکیانی گرت و بایدا، هاواری گەیشتە سەر جادە. مستێکی لە سینگی یەکیان دا، لە شێوەی گا بۆڕاندی، ئیدی هەلاتن. ئەوانەی لە نزیکەوە بوون و شەڕەکیان دی، دیاربوو ئەنۆیان دەناسی، بە یەک دەنگ:

بژی ئەنۆ قەیسی، بژی شەریفە دبە.

ئەنۆ لە بەهێزی و ئازایی (قەیسی)یەکەی لە عەدنان قەیسییەوە پێبڕابوو. شەریفە دبەش کەسایەتیەکی قەڵەوی ناو فیلمان بوو، بە مستێ بیست کەسی بە سەر یەکدا بەردەداوە.

فیلم دەستیپێکردبوو، کەسێ بە کوتەکوت و لە بن تیشکی لایتێکی کز، لە تاریکی لە تەنیشتم دانیشت، بە دیار فیلمەوە ناوە ناوە شووشەیەکی لە بەرکی دەردەهێنا و نەرم سەری دەکردەوە و فرێکی لێدەدا و خێرا دایدەخستەوە و دەیخستەوە گیرفانی، بۆنێکی ناخۆشی دەپژاند. دەڵێی ئەو پیاوە دەناسم، هەوە، مەستەکەی گەڕەکی خۆمانە، حەمەد مەستانە، شەرمم لێی کرد و خۆم لێی ئاشکرا نەکرد، بەر لە هەڵبوونەوەی گلۆپ جێی خۆم گۆڕی.

لە فیلمێکی گریاناوی، کوڕێ هەبوو وەک من چارەڕەش و دڵشکاو، هاتە سەری خۆی بکوژێ، بەڵام تێدا مابوو چ کەرەستەیەکی خۆ کوشتن هەڵبژێرێ، خۆ هەڵدانە ناو زێ، خۆ هاویشتنە بن ترومبێل، لە سەر تەلاری بەرزەوە خۆ فڕیدان، خۆ بە پانکەوە کردن، دەرمان خواردن، بیرمە لەگەڵ فیلمەکە تێکەڵ بووبووم و هەستمدەکرد من کوڕەکەم.

نازانم کوڕەکەی ناو سینەما گەیشتە چ ئاکامێ، بەجێمهێشت، من لای خۆمەوە چەکم هەڵبژارد، لەگژ پەیداکردنی دەمانچەیەک و چۆنیەتی سوارکردنی بووم، کوڕەکەم بیرکەوتەوە، لە بەر خۆمەوە گوتم:

وا باشە فیلمەکە ببینمەوە بزانم کوڕە چی بە سەر هات، هەینێ منیش، کەرەستەی کوشتنی خۆم هەڵدەبژێرم، تا فیلمەکەم دیتەوە، لە کوشتن پەژیوانبوومەوە.

با لە سینەما گەڕێم، بنی نایە، ئێستا سەری لە میرپێداوان دەدەم.

## میرپێداوان و دەوروبەری

ناونانەکە هی شاتکە شێتە، لە سەر زاریشی گەلەک خۆش دەهات، کەس نەیدەتوانی وەکی وی گۆی بکات. وشەکەی زاری شاتکە بە چ رێنووسێکیش نانووسرێتەوە، بۆیە ناچارم بە شێوەی سەر زاری گەڕەکێ بینووسمەوە.

ئەو گەڕەکە مەگەر میری بزانێ مالّی چەند جۆرە ئادەمزادی هاتۆتێ. میرپێداوان، لە دوو لاوە بەلاشاوە دەوری داوە، لە خوارێوە لە پشت خانووەکەی حەسەن عەلییەوە دەستپێدەکات و ئاوبارەکەی حەسەناغاش کەوتۆتە سەرە کۆلانێکیەوە. لەولاشەوە لە کەندی گڵکەندێ نزیکدەبێتەوە. دەوی دێویش لە ناوەڕاستی گەڕەکە، ئەو دێوە دەڵێم کە کاتی خۆی پیسۆ لە پێش چاوی من پالّی بە کەرێکەوە نا و خستیە ناو دەویەوە.

میرپێداوان تازەیە، لە تەمەنی بەردکێشانی منە، لە یەکەمین بەردی بناخەدانانی گەڕەک ئەز لەگەڵ بوومە، کرێکارێکی مندالکار بووم، لەگەڵ ئەکرەم بڕنۆش ئەو پیاوەی تیچاوێکی هەر لە بانیەکانی کەسنەزان و چیای سەفینێ بوو، چەندی دەیکرد لەگەڵ ریخاندنی شۆڕش و سەرشۆڕیی ناو شار رانەدەهات. لەگەڵ ئەو بڕنۆیە بناخەی میرپێداوانمان لێدەدا، ئەو دوودەو لە دەست و من خاکەناس، جاروباریش دەمانگۆڕیەوە و فێریدەکردم، بە شێوەیەک دوودەو بوەشێنم، تا زوو ماندوو نەبم. بیرمە بڕنۆ دەیگوت:

ئەو خانووانە زۆر گەورەن،ٔداخوا حوکمەت دەیانداتە چ تەرەس و تەرەسبابێک!

وابوو، خانووەکان گەورەبوون، بە قەد چوار پێنج خانووی بەلاشاوە گەورەتریش. لە هەڵنانی گەڕەکی میرپێداوان تۆ بڵێ (ئەمین عامان) رۆژانەیەکی باشم وەردەگرت، هەندەک رۆژان لە دوای دەستهەلگرتنێ لە مام

برنۆ دادەبڕام، بە جلکی کار و چڵک و ئارەقەوە رووم دەکردە ناوشار، یەکپێ حەمرا خۆت بگرە هاتم، بە یەک دوو بابۆڵەی چەورەوە، بە دیار فیلمەوە دادەنیشتم. درەنگ، زۆر درەنگ دەگەڕامەوە ماڵێ، ئەو هاوینە نانم کەوتبووە رۆنێ، دەوی دێو لێی تێکنەدابام، پارەیەکی باشم پەیدادەکرد و لە تێری و بە تێری دەچوومە سینەما و بە دڵی خۆم کتێبانم دەکڕی، نەیهێشت، دەوی دێو نەیهێشت، بزانە کوو بوو:

دەبوو زووتر بڵێم، لەوێ هەمیشە ترسی دەوی دێوم لە دڵ بوو، ئەو رۆژانەی کارمان دەکەوتە دەوروبەری دەوی وی، بە ترسەوە پێم هەڵدەگرت و دادەنا، دەترسام لەهیکڕا دەوی بکاتەوە و قووتم بدات، راستە پڕیانکردبۆوە و شوێنەواری نەمابوو، بەڵام دڵێ من وای نەدەگۆ، باوەڕم نەدەهات پڕبووبێتەوە، پێموابوو ئەگەر قەڵات هەڵگریت و هەمووی رۆکەیتە زاریەوە، پڕنابێتەوە، دەزانی چەند قووڵ بوو، وەک دەیانگوت:

بنی لە دەریایە. ،

ئێ، رۆژەک لەوێ بەرەبەری دەستبەردانێ، لە دەمی بەردکێشانێ، بە سەر مقەبایەکی گەورەدا رۆیشتم، مقەبا کون بوو، پێم رۆچوو، تا چۆک چوو، زراوم چوو، هاوارمکرد، گەیشتنە سەرم، قیتیان کردمەوە و پێ هاتەوە و تێر پێمپێکەنین، نەمزانی قۆرتی بن مقەباکە چی بوو، بەڵام من بە شوێنەواری زاری دێوی تێگەیشتم، ئیدی کەس منی لەوێ نەدیتەوە و ئەو هاوینە وازم لە کرێکاری هێنا.

با درێژەی نەدەمێ، میرپێداوان بۆتە گەڕەکێ ئەگەر کوو دەنا هەموو لایدەن و شار نایناناسێت، خەڵکی ئەوێ بە عارەبی و کوردی دەئاخڤن، تورکمانییش دەبیستی، میرپێداوان لە خڕ گەڕەکەکانی شار جوانتر و پاکژتر، ئێمەمانان مەگەر لە خەونێ، دەنا جێی ئاوامان نەدیتووە، ناوەکەی بە خۆوەیە، میرپێداوان.

میرپێداوان بێوەی تانۆککرابێت، تەلبەندکرابێت، گەڕەکێکی داخراوە، لە دوورەوە دیارە کۆڵانەکانی بێ منداڵن، ژنان لە سەر کۆسپەی پێش دەرگا دانانیشن. منداڵی گەڕەکەکانی بەلاشاوە و سەیداوە و گڵکەند بۆ شت

فرۆشــتنیش ڕێیــان بەو گەڕەکە نەکەوتــووە، باوەڕنــاکەم کــۆنەکڕیش ئەو کۆلانانەی دیتبێ.

گەلەک جاران دەهاتە سەرم، مل لێنێم و کۆلان کۆلانی میرپێداوان بگەڕێم و جێ جێ جێدەستی خۆم ببینمەوە، بە جێ دەوی دێو بکەومەوە و بزانم چی بە ســەرهاتووە، نەدەوێرام، لە چاوی زەقی پۆلیس و ئەمن و وەلەکە عارەب دەترسام، بە قسەی حەمەد مەستان بێت:

میرپێداوان ئەگەر کوو وەرنا ماڵە عارەبی تێدانیە، بەلام کەمی وا هەیە لای شــەرم و کەم نەبــێ، بە کــوردی قســان بکــات، پێیــانەوە دیــارە عارەبییەکەیان دووکەڵێ دەکات.

دوورنیە قسەی مەستان راست بێت، دواترێ لەوێ منداڵێکم دی کوردی نەدەزانی، دایک و بابیشی کوردبوون، دایکی عەرەبییەکەی لە هی من خراپتر بوو.

ئەز گەلەک خەفەتــم لەو گەڕەکە دەخــوارد، تــۆ وەرە بە دەســتی خــۆت هەڵیبنێ، نەوێری بە دڵی خۆت پیاسەیەک بە کۆلانە پڕ داروبارەکانیدا بکەیت. وا تێبگەم هەر لەو سەروبەندەش بابم بە زمانی بە رۆژی بناخەی ئەو تەلارە بڵندەی لێدەدا کە بووە جێی هەندێک لەو سەر زلانەی گەڕەکی میرپێداوان، لەوێ وەک دەمانبیســت لە پشــتی مێزێ خەوەنووچکەیــان دەبــردەوە، گــوایە یاسای ئۆتۆنۆمی دادەنێن و تاوتوێی دەکەن، بابیشــم نەدەوێرا نزیکی ئەوێ بکەوێتەوە.

دەی، واز لەوە بهێنە، بــابم چــی کــردووە و مــن چــی، ئەوەی چــوو چــوو. هەوکە دەمەوێ یەک دوو ســەربردەی ســەرە کــۆلانی میرپێداوان بگێڕمەوە، ئەنگۆ لە من باشتر دەزانن رەوشی هەینێی شار کووکوویی بوو، فڕان فڕان، کوشتوبڕین، گەیشتە ئەتککردن و گوێ بڕینیش. لەو ســالانە پێشــمەرگە نــاوە ناوە دادەبەزینە ناو شــار و دەســتی خۆیــان دەوەشــاند و بۆی دەردەچوون، قسەی من لەو سالانەیە:

بەرەبەری رۆژئاوابوونە، سێبەری قەلاتێ، بە دیوی رۆژهەلاتێ بە ســەر بەشێکی شــاردا کشــاوە، مــن لە کێنــدەرێم؟ بە تەنیشــت میرپێداوانــدا جــادە و

جاده هەڵدەکشێم، ماویەتی بگەمە یەکەمین ریزە ماڵی بەلاشاوە، ریزە ماڵی روو لە قەلاتێ، ببینە چ قەوما:

لە سەر تخووبی بەلاشاوە و میرپێداوان، رێک لەو سەرە کۆلانەی کە چەند جارێ شاکر فەتاحم دەدیت لێیەوە دەهاتە دەرێ، لەوێ لە هیکەوە، نازانم لە کوێوە پەیدابوون، دوو چەکدار خۆیان لەچک دابوو، تفەنگیان لە ترومبێلەک راکێشا، شوفێریان دایە بەر قۆنداغان و هەڵیاندایە جادە، باژۆ، ترومبێل لە گوللە تیژتر رۆیی. من ترسام و پێم هەڵێنا، بەر لەوەی لە کابرای لە سەر زەوی کەوتوو بزر بم، ئاورمدایەوە، دیتم هەستایەوە، دەمانچەی هەڵکێشا و ئاسمانی دایە بەر فیشەکان، من هەلاتم و لە میرپێداوان بووە تەقوهۆر.

دوو سێ کۆلان سەرتر، لە نزیک باخچەی ساوایان، ترومبێلی رفێنراوم دیتەوە، لە پێشم هێواشی کردەوە، بە دەنگ شوفێری تازەم ناسیەوە:

+ وەرە، سواربە تا ماڵێ.

- نا، ئەنگۆ زوو خۆ دەربازکەن.

لە سەرە کۆلانی ماڵی کەویار، لە بن دارتێلی یاد تووشیان بوومەوە، وا لە ترومبێلێکی دێ بەنزین بەتاڵدەکەن. نەگەیشتبوومەوە ماڵێ، پێیان پێوەنا و رێی باداوەیان گرت، ئەو کورەی کە شایەک بە ناوەکەیەوە بوو، لەگەڵ برادەرەکەی بەو ئێوارەیە باڵیان گرت و نەمزانی لە کوێ نیشتنەوە.

ئەو شەوە دڵم زۆر خۆش بوو، لێتان ناشارمەوە حەزمدەکرد هەر ترومبێل نا، قل قل پیاوەکانی گەرەکی میرپێداوان بە شاکر فەتاحیشەوە بڕفێنن. ئەو شاکر فەتاحە نووسەرە ناودارەکەیە، دواتر لە خۆی و لە میرپێداوان و لە دنیا تووڕە دەبێت و سەری هەندێ لەو قسانە دەکاتەوە کە ساڵانێکە لە دڵی پەنگیان خواردۆتەوە، هەر لەوێ قۆڵبەستی دەکەن و کەس بە زیندوویتی نەیدیتەوە.

سەرهاتەکی دی، ئەوەیان لە جادەکەی ئەودیوە، دیوی کەندی گەڕەکی گلکەندێ، نزیک ئەو تەلارەی بۆ مندالانی میرپێداوان هەڵنرابوو، بەلام کۆلیژی ئەدەبیاتی هاتێ. لەوێ، بەرانبەری ئەو کۆلانەی دەگەیشتەوە پێش ماڵی

شـەکراویٚ، قەومـا، خـراپیش قەومـا، سـەرچیخ نەچـووبم ئەو قەومـانەش دەمەدەمـی ئێـوارە بـوو، دنیـاش هەورولێـڵ بـوو، زەوی تەڕ بـوو، بـارانیش دەیپڕووشاند، ئەریٚ کیٚ و کیٚ بووین؟

ئا، فازیل ریٚحانە و جەباری داربەست و رەقیب و من و یەک دووانێکی دی، نازانم لە بازاڕیٚ، لە کویٚ دەهاتینەوە. هەر هێندەمان زانی لە ترومبێلێکی گچکەوە بەرازیلیە چیە، ئەوەی هەنـدێک عـارەبی هەولێریٚ ناویـان لێنـابوو (دەبـابە مـال ئەکـراد)، لە پێچکـردنەوەیەک دابەزیـن و غـرڕڕڕ... ترومبێلێکی بڵندیان دا بەر دەستڕێژان، جێی ساغیان نەهێشت، کردیانە سەرەند وبێژینگ، لە وان کەس دەستی نەکردەوە.

بە سەری هەردووکمان کووی دەڵێم ئەوهایە، پێوەنانی پێوە نیە، دەبابەی کـوردان جـادە و جـادە بەرەو سـەریٚ، بەرەو بەلاشـاوە پێـی پێوەنـا، ئێمەش رووەو کەندیٚ قووچاندمان، نازانم کیهان بوو گۆتی:

کوڕە، هەڵێن، بە ملی ئێمەدا دیٚ.

کەند و کەند هەڵیٚ، پێیەکمـان کـردە سـیٚ پـیٚ، لێکدی دابڕاین. شـەو فازیـل ریٚحانەم دیتەوە، ئەوانی دیش رۆژی دوایی، ئەو شـەوەش شـەوێک بـوو لە شـەوە خۆشـەکان. پێیلێدەنێم هەینـیٚ مـن نـازانم بۆچی حەزمـدەکرد هەرچی بەلای دنیـایە بەسـەر میرپێداوانـدا بـیٚ، هەسـتمدەکرد، ئەومـالانە مـاڵی منیـان داگیرکردووە و بەشی من دەخۆن .

سـەرم پڕە لە سـەرهاتی گەڕەکی میرپێداوان، بەلام بـا لە کـۆلان کـۆلانیٚ بگەمە سالانی کۆلیژی ئەدەبیات و کەمێک ترسـم لەو گەڕەکە بشـکیٚ، هەینیٚ سـەربردەی کـۆن و تـازە لێکـدی گرێـدەدەمەوە. هەوکە سـەرێک لە بـازاڕ و چاخانەی عەبۆ دەدەم و پاشان بێرەدا دەگەڕێمەوە.

## له عەبۆی رۆژنامەوە

بیرمنایەتەوە کێ بوو، ناوی لە عەبۆ نابوو رۆژنامە، عەبۆ رۆژنامەیەکی ئازادی هەرزانە، بابیەکەی یەک چایە، یان ماستاوێک و ئاویشی لە سەر وەردەگریەوە. رۆژنامەی عەبۆ، هەواڵی گەڕەک گەڕەک، کۆڵان کۆڵانی شاری تێدایە، هەواڵی گوند و شارەکانی دیش، هەواڵی دنیاشی لە ناو دایە. عەبۆ رۆژنامەیەکە بۆ بینا و نابینایان، گوێت چەندێ سووکتر بێ، پتر هەواڵ دەبیستی.

عەبۆ رۆژنامەیەکی بڵێم چەند لاپەڕەییە، بۆ زانینی ئەوە ناچارین بچین مێزەکانی عەبۆ بژمێرین، هەر مێزێکی لاپەڕەیەکە، رەنگە پتریش بێ، هەر مێزە لاپەڕەیەک جۆرە هەواڵێک: سیاسی، ئەدەبی، هونەری، وەرزشی، پیشەگەری، مێبازی...

هەندێ رۆژیش هەواڵی هاوبەش هەیە و هەموو مێزەکان دەگرێتەوە، بە هەندێ گۆڕان و دارشتنەوەی نوی چەند پات دەبێتەوە. هەواڵ هەیە لە چای شیرن شیرنتر، هەواڵیش هەیە تاڵتر لە چارەی ئەو بێریە سۆرانەی جاروبار سەرێ بە ژۆرێدا دادەگرن.

رۆژ هەیە بەر لە سڵاو لە عەبۆ، دەزانم هەواڵی هاوبەش چیە، دەزانم هەر لە مێزی شەترەنج و دامە و دۆمینەوە تا دەگاتەوە مێزی وێنە و شیعر، باس و خواس چیە. ئەورۆ لە کتێبخانەی خۆماڵییەوە، لە بن دیواری یانەی فەرمانبەرانەوە، تێگەیشتم سەردێری هەواڵەکانی رۆژنامەی عەبۆ چیە.

ئەوەتا لەوێ خەڵک کەرەسیسەیان کردووە، وا تێگەیشتم (کێشکەی کورا)یە و دەوریان داوە، ئەو کێشکەیەت لێ نەبێتە پرسیار، هەینێ خەڵک دەوری مەنجەڵی پڕ کێشکەیان دەدا و کێشکەفرۆش پێرانەدەگەیشت بەرێیان

بکات. بۆوەی پێبکەوین لەو شارە چەند کێشکە و رەشۆڵە خوراوە، دەبێ لە سەلیم قاقا بپرسین، ئەو قاقایەی هەرچی رەشوێرەی ئاسمانی بوو، بۆ ناو تۆڕ و داوی وی ریزیان بەستبوو، کوڵانی تەعجیلیش مەنجەڵ مەنجەڵ، مەنجەڵی زنجیردار دەیکولاندن.

ئێ، چوومە پێش، کێشکە نەبوو، کاخەز دەرچوو. دوو پەڕە کاخەز بە تەنیشت یەکەوە بە دیوارەوە، یەکیان بە کوردی، ئەوی دی بە عارەبی، رێک بە وێنەی وێنەی ئەو کورد و عارەبەی بە دار و دیوارەوە دیتبوومن.

دوورم، باش بۆم ناخوێندرێتەوە، رێ نیە بچمە پێشێ، پیاوێکی بەتەمەن لە پشتەوە دەڵێ:

کاکی برا، کەسێک بە دەنگی بڵند بۆهەمووان بخوێنێتەوە.

کوڕێک بە دەنگێکی لە قاز تیژتر کوردییەکەی خوێندەوە، ئەوەی لەو دەنگە قازیەوە بیستم، ئەگەر لە دێرێک کورتی بکەمەوە، ئەوەیە:

ناپاکی لە شۆرش و میری نیشتیمانی کرد و چووە ریزی تاقمی خۆفرۆش و نۆکەرانی بێگانە...

ئەو دژە میریە کێیە؟ نازانم کێ ئاکرەیی ناوە. ئەوجا با بزانین لە رۆژنامەی عەبۆ، لە میزەکانی عەبۆ لە بارەی ئەو پیاوەوە چ باسە، لە رەگژی مشک نەبێت، زەحمەت دەبیستی، چوونکێ قسەکان زۆری لە بن لێوانەوەیە:

– هەر ئەوەی لێ چاوەڕوان دەکرا، نازانم چۆن ئەو چەند ساڵە لەو کارتۆنیە ئیشی کرد!

– کاتی خۆی بەزۆر پاڵیان پێوە نا، دەنا نەدەکەوتە ناو کارتۆنیەکەوە.

– بەزۆر چیە! شۆرشگێڕی تەواو ناخزێتە شوێنی واوە...

من شتێکی ئەوتۆم لە بارەی ئەو پیاوەوە نەدەزانی، لێرەوە سۆزم بۆی جوولا کە دژی میری وەستاوەتەوە، خۆزگەم دەخواست هەموو رۆژێ ئاکرێییەک پەیدابێت و ناوی بکەوێتە سەر پەڕە کاخەزێکەوە و بە دیواری یانەی فەرمانبەرانەوە هەڵواسرێ.

لە عەبۆ دەمێنمەوە، رۆژنامەی عەبۆ بە چایەی شیرنەوە دەخوێنمەوە.

چاو چاو، پەڕەکاخەزێ بە جامخانەی عەبۆوە لکاوە، چ هەرایەکی

ناوەتەوە، لە رۆژنامەی عەبۆوە شارێک قسەی لەسەر دەکات. پەڕە کاخەز وێنەیەکە، لە بن وێنەکە یەک دوو رستەی درشت لە دوورەوە دەخوێنرێنەوە، وێنەکە پیاوێکە کەپووی لە بنەوە بڕاوە، وا دیارە دوای تیمارکردن و هەتوانکردن گیراوە، خوێنی پێوە نەماوە. پیاوی کەپوو بڕاو زەق زەق تەماشامان دەکات، من لە چاوی خوێندنەوە هێندە زیرەک نیم، بەڵام لە چاوی وێنەکەوە پەشیمانیم خوێندەوە. هەر کێ دێتە ژوورێ، تەواوێ لە وێنەکە رادەمێنێ، هەندێکیان بزە دەیانگرێ، هەندێکیان چوک چوک دەکەن و روو وەردەگێڕن و لە مێزێکی دوور دادەنیشن.

ئەو پیاوە کەپوو بڕاوە کێیە؟ وا هەندێ کەس لە چاویانڕا دیارە، لە بزەی بن سمێڵیانڕا دیارە دڵیان بەو دیمەنە خۆشە، هەندێکیش بە بینینی تووڕە دیارن. وا پێدەچێ کەس نەیناسێ، ناسینەکە هەر هێندەیە کە دوو رستەکەی بنی ناساندوویەتی:

یاخیگەران و نۆکەرانی بێگانە، هاوولاتی ئەتکدەکەن، لە سەریان ناچێ.

با هەستراگرین بزانین رۆژنامەی عەبۆ لە بارەی پیاوی کەپوو بڕاوەوە چی دەڵێ. زۆری برد تا پێکەوتم، ئەو پیاوە موختاری نازانم کێندەرێیە و پێشمەرگە بۆ چاوشکاندنی موختاران، ئەو موختارەیان بەو پەندە بردووە و کردوویانە بە سۆدرەی وڵاتێ. ئەو سەردەمە هەڵمەتی تەمبێکردنی موختاران دەستپێکردبوو، لە زۆر کەسانم دەبیست کە بەشێکی زۆری سەر لە قوڕنان و بە گرتندانی کوڕانی ئەو شارە، خڕی لە بن سەری موختارە، کام موختاری زۆر باشە، ئەو چاوساغی (ئەمن) و جاشە، وا بوو، وا نەبوو، لەوە گەڕێ.

ئەمن گەلەک رقم لە موختاران دەبۆوە، حەزمدەکرد موختارکوژ قل قل موختاری هەڵگرتبا و قڕانی تێخستبان، گۆڕستانێکی تایبەتیشیان هەبا، تا فاتیحای خەڵکیان بۆ نەچووبا، بەڵام دیمەنی وێنەکەی جامخانەی عەبۆ دڵخۆشی نەکردم، ئەو کارەم بەدڵ نەبوو، لە بەر خۆمەوە بە کەپووبڕم دەگوت:

باشە بۆ بە دوو گوللە ساردت نەکردەوە، بۆچی کەپووت بڕی؟

پێشـترێ چ کەپـووبڕاوم نەدیتبـوو، نەشمبیسـتبوو پێشـمەرگە شـتی وای کردبێ، بە راسـت تۆ بڵێی دەسـتی حـوکمەتی تێدانەبێ؟ دوورنـیە، حـوکمەت بێـت و بیخـاتە ملـی پێشـمەرگە، ئەمـن دەمویسـت بـاوەڕ بە خـۆم بهێـنم کە پێشمەرگە کاری وا کەم و ناچیزەی لێناوەشـێتەوە، بە تەنـێ مـن نـا، هیـدیش هەبوون، باوەڕیان نەدەهات، وا تێبگەم عەزیزی مەلای رەش بوو گۆتبووی:

پێشمەرگە بە کەپوو بڕین، دەست نا، ناوی خۆی پیس دەکات.

بەڵام زۆری دی، لەگەڵ کەپووبڕین و گـوێبڕین و هەمـوو شـتبڕین بـوون، سەردار و لوقمان لە یەکتریان دەگێڕایەوە:

– دەستیان خۆش، ئەو کەپووە سـەد موختـار لە گەوادی و خراپەکاری دووردەخاتەوە.

– موختار چاوی (ئەمن)ە، ئەو چاوە دەبێت بشکێت و ئەتکبکرێت.

– ئەو کەپووە دوا کەپوو دەبێت، لەوەودوا کەس کاری موختاری ناکات.

– کەپووی دوو سێ جاشیش ببڕن، جاش نیواونیو کەم دەبنەوە.

فازیل رێحـانەش چـووە سـەر دینـی کەپـووبڕینێ، بەڵام مـن شـادەم بەوە نەهێنا و هەر جارێ وێنەکەی جامخانەی عەبۆ دەهاتەوە بەر چاوم، مـوچڕکم بە لەشدا دەهات و دەمگوت:

کەس بە سەر کەسی نەهێنێ.

درەنگتـریش کـاتێ بیسـتم سـەدام حوسـێن گـوێی سـەربازی هەڵاتـوو دەبڕێ، وێنەکە، وێنەی موختارە کەپووبڕاوەکە روونتر خۆی پیشاندەدایەوە.

لە عەبۆ دەمێنمەوە.

لە مێزی بن جامێ، دیوی ناندێنی بەهەشتێ، دانیشتووم، جارێ پرسیاری ناندێنەکەم لێمەکەن، لەوێ دانشتووم و لەو دیوەوە دڵۆپە باران بە جامەکەدا دێتە خوارێ، منیش بابۆڵەی پاقڵاوەم لە دەستە و چایەم لە پێشە، بەر لەوەی تاڵیی دەرێ تام بکەین، با شیرنیی ژۆرێ تـامبکەین. ئەوە لەگەڵ برادەران بە تـایبەتی دڵشـاد حەیـران، ئەو زۆر حەزی لێبـوو، دەچـووین و سـەرو نـان و پاقڵاوەیەکی لـوولەیی درێژی بە شـیلاومان دەهێنـا، پاقڵاوەمـان لە نـاو نـانێ لوولـدەدا و دەهـاتین بە چـایەی کەمـێ کەمشـەکرەوە لوولمانـدەدا، حەڵـوای

مووسڵێی بە کیلۆ بە قوربان بێ. نانی گەرم و پاقلاوەی بە شیلاو و چایەی بەڕەنگ بە دیار بارانەوە ئەگەر بێریەسۆر لێت بە سندان نەکات، چ خواردنێ شان لە شانی نادات.

ئای بێریەسۆر، دواتان بڕێ، بۆ دەرمانیش دانەیەکتان نەمێنێ لە شار، بێریەسۆرێکی کورد هەیە لە خوێڕیایەتی بای لە بێریەسۆرانی عارەب و تورکمان بڕیوە، تەماشای بکەیت، گێچەڵت پێدەکات و بە عارەبی گووێک دەخوات. ئەو بێریەسۆرە بە زۆری لە بەری قەیسەری لە نزیک مێوانخانەی هەندرێن رادەوەستێ، دارە سۆرەکەی دەستی هەمیشە لە جوولەیە.

ئێ با لە عەبۆ دوورنەکەومەوە، ئەوەتا لە جامەوە چاوم لێیە گەنجێک بە رووی مزگەفتی حاجی لەقلەقێ هەڵدێ، بێریەسۆرەکە بە دوایەوە، دەمانچە و دار بە دەستەوە، دەمانچەی نەتەقاند، دارە سوورە ئەستوورەکەی راوەشاند، بێریەسۆر نیشانەی راستە، دەستی بشکێ، تیراوەی لێبێ، داری سندان کوشتی رێک بە پشتە سەری کوڕە کەوت و لە جێی خۆی کەوت، لە سەر پشت تەخت بوو. بێریەسۆر گەیشتە سەری، دارەکەی هەڵگرتەوە و دەستێکی گەیاندە سەر سینگی کوڕە، بە نیازی چیە؟ من هەر وا لە جامەوە تەماشا دەکەم، خەڵک خڕبوونەوە.

دیتم بێریەسۆر دەرپەڕی، رووەو قەیسەری، بە کۆڵانی مزگەفتی شەش پەنجە بە فڕین فڕی، عەبۆ هەموو هاتە دەرێ، کوڕە بەخۆهاتەوە، لە ناو دەلاڵخانە خۆی بزرکرد.

درەنگ زۆر درەنگ، دوای راونانی بێریەسۆران و گەیشتنە ئازادی، ئەو بێریەسۆرەم هەر لەو دەوروبەرە دیتەوە، دووسێ پاسەوانی لە دوو بوو.

دەی، لەو ئازادییە گەڕێن، ئێستا دەچمەوە ئازادییەکەی گەڕەکی ئازادی.

## ئازادی
## نەخشەی کوشتنی ئیتیحادی

هێند لە ئازادی بێزارم، هێستری بەستراوە هێندە لە سنگی داکوتراوی خۆی بێزار نیە، بێزاریی من لە دوو شتەوەیە:

بەرێوەبەر، هەرکە سەر و سیمای دەردەکەوێ، چاوم دەچێتە پشتی سەرم، بە من بێت سەری هەڵکێشم، بە دیتنی وی خولیای تۆڵە لە سەرم دەگەڕێ، بە دارلاستیقەکە و قرنجانی جامی ترۆمبێلەکەی، دڵم ئاوی نەخواردەوە، ئەنۆش نەما، تا بە دارلاستیقەوە بە هاوارمەوە بێت و تۆڵەی سەر دەرێ و بەر دەریی لێ بکاتەوە، ئەوە بەرێوەبەر.

ئەدی (ئیتیحادییەکان)؟ ئەوانە خوای منیان سووتاندووە، زۆر لێیان پڕم، جلەوی خۆم نەگرم، خۆم بە پەلێکدا دەدەم. ئەو ناکەسانە کاتێ دێنە ناو پۆل، بە شێر و ڕێوی هێنانەوە، ڕاستوڕەوان نا بە جۆرێک لە تێبزرکردن دەڵێن:

چەندی زووتر بێنە ڕیزی ئێمە، ئاسانتر دەگەنە کۆلێژ، دەگەنە مەبەست.

هەینی گۆتەنی: لە قسەی ئەو جڕوجامشتانە، زۆر پەست دەبم.

ئەوان بەر لەوەی نـــاوی ســـەرۆکی فەرمانـــدەیان بڵێن(خـــوا بیپارێزێ)دەڵێنەوە، هەینی لە پەناوە دەیگۆت:

کوڕە، لە کن ئەو جڕوجامشتانە سەدام لە پێغەمبەر لە سەرترە.

مەبەستی ئەوە بوو(د . خ) دوای ناوهێنای پێغەمبەرە، کەچی (خ . ب) پێش ناوی سەدام حوسێن دەهات.

لە ئازادی ئەگەر کوو دەنا کەس نیە حەز لە چڕوچاوی ئەو کوڕانە بکات، کانەبیی بەلاشاوە لە هەمووان پتر لێیان داخدار بوو، ئەو کوڕە ناجی گۆتەنی:

پێدەچوو خودا بۆ شەڕی ئیتیحادانی هەڵدابێتە دنیا.

دەیگۆت:

لە جاش تەرەستر ئیتیحادە.

کانەبی بە قسەی خۆی بێت، دوور لە چاوان لە پەنایان بە دەمامکدراوی چەندان لەو کوڕانەی شاپتڕین کردووە، بە زمانی سووتاوم باسی یەکێ لە ئیتیحادیەکانی ئازادیم بۆی کرد، گوتی:

ئەو حیزبابە بە شاپتڕین پیاو نابێت، ئەگەر پشتم بگری، بۆ بەغداشی پیاو دەکەم.

بەنابەدڵی ملمدا و بەگەڵ کەوتم، فازیل رێحانە و ناجیش بە ترومبێلەوە هاتنە ناو نەخشە و پلانەوە. کانەبی بەوە منی هێنا بن بار، ئەگەر ئەو کوڕە وا لێبکەین، دەبێتە چاوشکێن بۆ هەمووان و کەس زات ناکات ببێتە ئیتیحاد.

کانەبی چەند رۆژێ بە دوایەوە بوو، خۆی لێ گرت و باش پێکەوت چ جێ و کاتێک گونجاوە بۆوەی ناوی خودای لێ هێنین، ئێوارەی سێیەم یان چوارەم بوو، کوڕە بە داوەوە بوو، لە سەری جادەکە لە ناو قەمەرە دڵی من نازانم لە چەند لێدەدا، شەرم پێ و زاری نەبەستابام، خۆم هەڵدەدایە خوارێ و دەمگوت:

کاکە، من لە جغزی ئەو پلانەی ئێوەدا نیم.

ئەها، هەوکەا کوڕە ئیتحاد پێچدەکاتەوە و ئێمە لە چاو ترووکانێک دەگەینە سەری، هەڵیدەدەینە ناو ترومبێل و دەیبەینە پشت باداواە، لەوێ وەردەگەڕێینە سەری و سەر و سێ چەقۆی بە قەستی کوشتن لێدەدەین و دەرخواردی سەگە بەرەلاکانی ئاقاری بنەسراوەی دەدەین، هەر ئەو شەوە لە سەر دیواری ئازادی دەنووسین:

ئیتیحادیەکان، برۆن تەرمی برادەرەکەتان لە پشت باداوا لە ناو گەنمان بیبیننەوە.

ئەوەتا، ئەوە کوڕەی دەرخواردی سەگی دەدەین، گەیشتە جێی مردن، جادە چۆلە، پشیلەیەکیش لە دەرێ نیە، ناجی پێی لێنا، دوای دوو سێ چرکەیدی، کانەبی و فازیل و من خۆ فڕێدەدەینە خوارێ، تێیدەوڕووکێین و قۆڵبەستی دەکەین و هەڵیدەدەینە ناو ترومبێل و باژۆ...

بزانە ئیش کوو دێ، نیو دارتێل نەمابوو بگەینە سەری، پپ... ترۆمبێل کوژاوە، هەڵنەبوّوە، وەرە خواریّ، پاڵدە، بیرمە کورە ئیتیحادەکەش یارمەتیداین، کاتێ ترۆمبێل کەوتەوە ئیش، بیرمانچوو بۆچی هاتبووین.

ئەو شەوە لە خۆشیی کوژانەوەی ترۆمبێل خەوم لێنەدەکەوت، تۆبەم کرد چیدی بیر لە شتی وا نەکەمەوە، فازیل رێحانەش پەژیوانبۆوە، بەڵام کانەبی رشتتر بوو .

ئەوجا تەماشاکە، بزانە کێو بە کێو ناگات، بەڵام بنیادەم بە بنیادەم دەگات، لە کوێوە هاتووە. دوای بیست ساڵێک لەو سەرهاتە، واتە دوای ئازادی، دوایوەی کورد بووە شت، هەر لە ئازادی ئەفەندییەک چاوی لە چاوم بڕی و گوتی:

دەڵێی دەتناسم!

ناسیمەوە، ئیتیحادەکەم ناسیەوە و گوتم:

سەدام حوسێن خودا بیپارێزێ...

قسەکەم تەواونەکرد، پشتی تێم کرد رۆیشت، هێندەی نەبرد ئەویش بووە شت!

لەبیریشمان بێ، هەر دوای رابوونی گەورە و ئازادی، (قوتابیان و خوێندکاران) زۆر لەجێ دەمەلاسکەی ئیتیحادیان دەکردەوە. وازی لێبێنە، دەگەڕێمەوە ئازادی.

## مەلا و دارشتن

له هیکرا مەلایەک وە ژۆر دەکەوێ، مەلای تەواو بە جبە و مێزەرەوە، چاومان زەق دەبێتەوە. ئازاد خەتخۆش کە لە پشتم دانیشتووە بە چپە دەڵێ:

هەبێ نەبێ رێی لێ تێکچووە، ئێرە بە مزگەفت تێگەیشتووە!

تێکچوونی چی! ئێمە پێشتر چتی وامان نەدیتبوو، لە سەرەتایی مەلا ئیخوانەکە وانەی پێدەگوتین، بەڵام بە چاکەت و پانتۆڕەوە، کەچی ئەو مەلایە بە جلکی خۆیەوە.

مەلا گەلەک رێک و قیت و کەشخە و پۆشتەیە، چ مەلایەکم نەدیت وێنەی ئەو مەلایە جلکی مەلایانەی لێبێ. مەلا گەلەک خاوێن و روونە، لە مینا دەچێ، لە بەر رۆژێ راگیرێ، تیشکێ خۆ دەداتەوە سێبەرێ.

بە زار کردنەوە و دوو سێ رستەی یەکەم تێگەیشتین گفتولفت شیرینە، مەلا مامۆستای عارەبی دەرچوو، یەکەمین مامۆستای عارەبی بوو کە رستەی شیدەکردەوە، شیکردنەوەکەی بە کوردی دەکردەوە. بە هۆی دارشتنێکەوە زوو بووینە برادەر، ئەمن لە عارەبی باش نیم، بە تایبەتی لە دارشتن، ناتوانم هەشت نۆ دە وشەی عارەبی لێکدەم و دوو سێ رستەی بە کەڵکیان لێ چێبکەم. بیرمە تاقیکردنەوەی دارشتنمان هەبوو، چەندی خۆم گوشی و هێنا و برد، دوو رستەی رێکم بۆ نەهات. چ بکەم خودایە، خۆ ناکرێ پەڕی بە سپێتی بدەمێ، دەی خودایە دوو سێ رستەی زمانی پەسڵانیم بۆ بنێرە! نەهات و نەینارد، منیش نەمکردە نامەردی ئاوا دەستمپێکرد:

الله ربنا، محمد نبینا، کورد قومیتنا، کردستان وتننا، هولیر مدینتنا، بلاشاوه حیبنا، سمکۆی شکاک بتلنا، حریه هدفنا..........سعدالدین استازنا...

دامه دەستی، بە دەستی خۆم کەوتنی خۆم نووسییەوە. رۆژی دوایی دارشتن دێتەوە، کەوتنی چی! نمرەکەم مامناوەندییە، دڵنیابووم نەیخوێندۆتەوە، دیارە ئەوەش لە پێڕی کەماڵە فەندییە، لەگەڵ زەنگی دەرێ بانگیکردم و دەستی خستە سەر شانم و گوتی:

بە خودای هەر نمرەیەکت بۆ دانێم کەمە، لە هەموو جوانتر بەلاشاوەکە بوو، هەولێریشت نەکردبووە ئەربیل...

دەبێ بڵێم لە ناو رستەی عارەبی بۆ یەکەم جار لە مامۆستا عەبدوڵا زێباری دیتم کە(هولیر)ی دەنووسی و نەیدەکردە ئەربیل، زۆر دڵم بەو (هولیر)ەی ناو نووسینی عارەبی خۆش بوو، منیش چاوم لەو کرد.

ئەو مامۆستا مەلا سەعدەدینە دواتر لە رزگاری و لە رۆژانی خۆپیشاندانەکان دەیبینمەوە و دێتەوە ناو رستان. بەو برە رستەیە برم ناشکێ، لەوێ ورد و باریک بە درووداو دەیگێڕمەوە. جارێ لە ئازادی دەمێنمەوە، هەولێرەکەی زاری مامۆستا زێبارییەکەتان بۆ دەڵێمەوە.

## زێباری و سەواف

عەبدوڵا زێباریی زارشیرن دەستی گرتین و بردینی، نازانم ئەوانی دی بەڵام منی نزیککردەوە لە بنج و بنەوانی وشەی هەولێر. هەینێ لە بارەی وشەی هەولێر سێ لێکدانەوە هەبوو، بیرمە واتای هەولێریان لە مامۆستا مەلاکە پرسی، ئەویش بە بزە شیرنەکەیەوە، گوتی:

چ دوور نیە، لە( ها لێرە، هۆ لێرە..)ەوە هاتبێ.

بیستبووم کابرایەک لە دوورەوە دێ و پرسیاری شار دەکات، کابرایەکی دی دەڵێ:

لەو بستییە سەرکەوە، ها لەوێیە.

سەردەکەوێت، ئاوەدانییەک لە دوورەوە دیارە، دەڵێ:

هەوە، لێرەیە.

ئیدی هۆ لێرەیە، هەوە لێرەیە، دەبێتە هەولێر.

ئەو لێکدانەوەیە راست بێ، هەولێر ناوێکی دەشتەکیانەیە!

هەشبوو دەیگۆ:

هەولێر، بە واتای شوێنی خۆر، یان شاری خۆر دێ، گۆیە (هۆر)ەکە لە کۆندا واتای (خۆر)ی داوە، ئەویش وەکوو هۆرەمانە و خۆرستانە.

بەڵام عەبدوڵا زێباری دبێژێ:

خودێ، نە هۆسایە، نە هۆرە و نە هۆ لێرە و لەوێیە.

ئەو پێیوابوو ئەرابائیلۆ بۆتە ئەربیل، ئەویش بۆتە هەولێر(ئەربیل ـ هەربیل ـ هەرویل ـ هەو..) دەنگە و گۆڕانی بە سەردا دێ. زێباری باسی ئەوەشی کرد کە لە دنیا زۆر شار هەیە، بە تێپەڕینی کات گۆڕان بە سەر ناوەکانیان دێ، وەک: کەرکووک و هەمەدان و ئەستەنبۆل و...

بەو قسەیە بێ، هەولێر ناوێکی شاریانەیە!

زێباری دەیگۆ:

هەولێر پێتڤیە لە هەموو جێیەک بەو ناوەی خۆیەوە ناوی بێ.

نەبادا زێباری نەیەتەوە ناو گێڕانەوەی من و لەبیربچێتەوە، ئەو سێ چوار دێرەی لە بارەوە بخوێننەوە:

عەبدولا زێباری بە پرِی و مشتی لە ئەزهەرێ گەڕابۆوە، هەر چۆنێکت دەدواند، پەیڤی مرواری و زانیاری لە زاری دەباری. هەر گاڤێ پێی دەخستە ناو پۆلێ، من لە دڵەوە -نەک لە ناچاری و ترسەوە- یەکپێ لە بەری هەڵدەستام، ئاخر ئەو مامۆستایە گەلەک گران و بەرکەفتی بوو، مرۆڤێکی بێ گرێ و گۆل، زەلال و بێ خڵت و خۆڵ، کوردێ بوو نەبێتەوە.

پاشتری زانیمەوە، لە سەردەمی خوێندکاری لە زانکۆی ئەزهەرێ، کابرایەکی مووسڵاوی دەگەڵ دەبێ، نازانم کێ سەوافی دەڵێنی، ئەو سەوافە وەک بڵێی بۆ دوژمنایەتی کورد هاتبێتە دنیایێ وا بوو، سەر بە برایان (ئیخوان)یش بوو.

ئێ، ئەو ئیخوانە عارەبە، زێباری و کوردێکی دی ناوی وی حوسێن نازانم کێ دەبێ، بە گرتن دەدا، تۆمەتی جوداخوازی و کۆمۆنیستییان وەپاڵ دەدا، ئەگەر خێرۆمەند نەبان، هەردووکیان لە کونجی زیندانێ دادەڕزان.

ئەوجا تۆ بەرێ خۆ دێ، نیو تەمەنێ پاشترێ دەسەلاتبەدەستانێ هەولێرێ چۆن چاکەی مامۆستا زێباری دەدەنەوە؟

دێن، مزگەفتێ هەڵدەچنن، رووبەرەکەی بە قەد نیوەی رووبەری قەلاتێ، منارەکەشی چەند هێندەی منارەی چۆلی، بە خەتێکی درشتیش لە ئاوی زێڕ دەچێ، دەنووسرێ:

مزگەوتی سەواف

## حەیران
## قەیسەری و جادەی برایم پاشا

ئێرە سەربردەی لە بەر دەڕوا، سەربردەی درێژ، درێژتر لە حەیرانەکانی دڵشاد. با شتێکیش لەو حەیرانبێژە بگێڕمەوە، لە پشووەکان چوار پێنجێکمان دەرگای پۆلمان لە سەر خۆمان دادەخست و تێیهەڵدەکردە حەیرانێ، قەراج و قەرەچووخ و کەندیناوە و بنە بنی سەفینی دەهێنایە ناو پۆلێ. ئەو کوڕە لە حەیران گۆتنێ بە ئاسانی نەدەهاتە رایێ، بەڵام کە دەستیپێدەکرد تا تەواوی نەکردبا، دەسستت لە هەوکێی نابا، رانەدەوەستا، بیرمە دەیانگۆت:

+ کوڕە، مامۆستا هات.

- راوەستە، هێشتا لە زوورگەزراو ئاودیو نەبوومە!

لە هەر جێیەک حەیرانی هاتبا، دەیگۆت، بیبینمەوە بە بیریدەهێنمەوە کە لە ناوەندی قەیسەری، لە کۆلانی ئەو گۆڕەی کەس نەیزانی کێیە و لە سەر چ ئایینە، لە خۆوە ناویان نا سەید عەبدوڵا. لەوێ دڵشاد دەستی خستە بن گوێی و تێیهەڵکردە حەیران، ئەو کوڕە حەیرانی گەیاندە برایم پاشاش، برایم پاشای سلێمانی.

خەتخۆش و دڵشاد و ئەز، وا لە سلێمانی پیاسە دەکەین، ئەمن پێشتری دیتبووم، بەڵام هەر هێندەی ئەوان شارەزای جادە و بازێڕم، لە جادەکی دەڕۆیشتین، لە کەسێکمان پرسی:

+ئەو جادە ناوی چیە؟

- برایم پاشا.

ناوەکە خۆش هاتە گوێمان، دڵشاد لە بەر خۆیەوە گۆتی:

ئەو برایم پاشایە کاتی خۆی پێدەچێ حەزی لە کیژۆرە ئەسمەرێ بووبێ، با لۆی بڵێم.

به سەری هەمووان چۆنی دەگێڕمەوە ئەوهایە، لە ناو جادەی برایم پاشا، دەستی خستە بن گوێی و تێیهەڵکردە حەیرانێ، ئەمن دەمگۆت:

کوڕە، کزیکە کزیکە.

خەتخۆش گۆتی:

+ ئێستا بە ناو خەڵکدا بڵاودەبێتەوە، ڕەسووڵ گەردی مێوانە!

- هەوریەکەی کەمە.

ڕەسووڵ گەردی هەینێ گەلەک خۆشەویست بوو، هێمان قادسیە نەیبردبوو، دەوری بەسرای پۆلاڕێژ نەکردبوو!

ئەها، بڵێمە خوێنەرێ خۆ، ئەز هزرم کوڕە، بەردە قارەمانەکەی سەر رێ و تابلۆ ناسکەکە و بە ساقەی ناسکی ژنە تەڕەکە و گەزۆی خۆش و بابۆڵەی بێ تام و شامی ئەوێ، سلێمانیم بەبیربهێننەوە .

لە ئازادی دەمێنمەوە و دەچمە ناندێنی بەهەشتێ، لەوێشەوە بۆ پرا دەلال و سنوور.

## نانديٚنى بەهەشت
## پرا دەلال و...

ئەرێ چەند کەس لەنگۆ، نانديٚنى بەهەشتتان ديتووە؟

با پيٚتان بلٚيٚم لە کوێ بوو، لە ريزى قاوەخانەى عەبۆ، پشت لە مزگەفتى حاجى لەقلەق و روو لە قەيسەرى. ئەنگۆ ئەگەر نانديٚنەکەشتان نەديبێ، بەلاٚم دلٚنيام شتيٚک لە خواردنى بەهەشتێ دەزانن، نەخاسمە مريشکى سۆرکراوە. ئەها، مەلاٚ هەيە لە مەولوودێ، پيٚشەوەى خواردنى بيٚتە پيٚشێ، ديٚتە سەر باسى مريشکى بەهەشتێ:

لەوێ درخەت هەيە، مريشکى سووركراوە دەگرێ، هيٚند سۆربۆتەوە رەنگى تەماتەى گرتووە، تک تک رۆنى لێ دەتکێ، بۆنى رۆژە ريٚيەک دەڕوات، لەو دەمەى حەزت دەچيٚتێ، مريشک وەک سيٚو بەردەبيٚتەوە و لە پيٚشتە.

مەلا رەنگە لەوە هەلٚەيەکى کردبێ، چوونکێ من بە چاوى خۆم ديتم، مريشکەکەى نانديٚنى بەهەشتێ بە درەختەوە نەبوو، شيشکەيەکى تيٚهەلٚکيٚشرابوو، هيٚدى هيٚدى بە دەورى خۆيدا دەسووڕايەوە و چۆڕ چۆڕ چەوريى لێ دەچۆڕا. هەلٚەکەى ترى مەلا لەوەيە، من نەک هەر حەز، وەختە بۆى بە زگ بدەم، مريشک نەهاتە پيٚشم.

پێ نانە نانديٚنى بەهەشتێ بە پارەيە، پارەى باشيش، من تا نووکە لە دوورەوە تەماشاى دەکەم، زارم ئاودەکات و زەقە زەقى چاوم دێ. نانديٚنەکەى بەهەشتێ ناوێکى تريشى هەبوو، هەلٚە نەبم (تاجريان)يان دەگۆتێ، ئەگەر سەيرانەکەى ئازادى نەبا، درەنگتر تامى خواردنى بەهەشتيٚم دەکرد.

لەگەڵ خەتخۆش و هەینی، بە سێیان لە ناندێنی بەهەشتێ مریشکێکمان کڕی، کەوتینە ڕێ، وا بە دەم سروودەوە بە سەر پردی کەڵەکێ لە زێی گەورە پەڕیینەوە بەری بادینان. زێ باش هەستایە، بەهارەکەی بە باران بوو، مینا ناخی کوڕانی ئازادی شەپۆلان دەدا.

لەودیوی زێ، تا مووسڵ و عێنزالەم دیتووە، دڵم بەو سەیرانە زۆر خۆشە، ئەوڕۆ پرا دەلال دەبینم، زۆر تامەزرۆی دیتنی سێ جێ لەو جێیانەی لە شیعر و کتێبان ناویان هاتبوو، بووم:

- ملەکەوە، ئەویش لە جوانیی ملی کەو (وا تێبگەم ناوکەش پێوەندی بە کەوەوە نەبوو)
- شانەدەر، لە سەرسامیم بە ژیانی مرۆڤی کۆن و نیاندرتال و...
- پرا دەلالی زاخۆ، لەبەرخاتری خوێنی دەلال.

بڕۆ، پرا دەلال، ئەم هاتین.

لەبیرمچوو بڵێم، لە هەولێرەوە تا زاخۆ و سەر سنوور پیاوانی بازگە بە دیتنی ئێمە سەریان بادەدا، روویان گرژ دەکرد، برۆیان تێکدەنا. ئاخر ناو پاس یەک پارچە رانکوچۆغەیە، کلێتە لە سەر، جەمەدانی لە مل و فەقیانە و پووزەوانەش هەیە. وێکڕاش سروود و گۆرانی، ئەی رەقیبیش سەرتوپی سروودان. پیاوانی بازگە سەرێکیان بە ناو پاسدا دادەگرت و داوایان دەکرد کە سروودی عێراقی و سەدامی بڵێینەوە. تاهوو واها! کوڕانی ئازادی، سەدامی و عێراقی و سەدامی! بە( هە چەرمە چەرمە، هێ...) وەرامی بازگەیان دەدایەوە.

پرا دەلال، ئەم هاتین.

دەرکەوت، لە جامەوە زاخۆ لەشێوەی چەند پەلە هەورێکی دەست لە ناو دەستی لە سەر زەوی نیشتوو، دەرکەوت، پەلە هەوری ڕەنگاوڕەنگ دەتگوت خۆیان داوەتە زەردەپەڕ. جێی وا جوانم نەدیتبوو، جێی خۆیەتی بە دیار ئەو دیمەنەوە گۆشتەکەی بەهەشتێ بخۆیت، دەزانن لە ناندێنەکەوە تا ئێرە، دیمەنی گۆشتەکە لە چاوم لا ناچێ، خوا خوامە زوو نیوەڕۆ دابێ و وەرگەڕێینە سەری.

ئەوەتا دەلال، بە دیتنی وی دەلالە جوانەکەم بیرکەوتەوە، دەزانن کام دەلال دەڵێم، ئەوە نیە چیرۆکەکەی (پرا دەلال) دەڵێ:

لە نیوەی پردێ، وەستای پرد چەندی دەکات بەرد و قسڵ یەکدی ناگرن، لە خەونێ پێیدەڵێن:

خوێنی کچێکی تێنەکەی، زەوی ئاسمان بە یەک بگەن، بەرد و قسڵ ئێکدی ناگرن.

خەونەکە دەگاتە میر، لەگەڵ وەستا دوو بە دوو دەکەونە پرس و را، چ ژنێک سەربڕن باشە، لە سەر ئەوە رێکدەکەون، کام ژن لە پێش هەموو ژنان چووە سەر سەراوێ، بیگرن و وەک مامز سەریبڕن. بەدبەختی وەستا، سبەینی زوو دەلالی کچی دەگاتە سەر رووبار، وەستا لە قسەی خۆی پەژیواننابێتەوە، دەستی دەچێتە کچا خۆ و بە خوێنی وی پردەکە تەواو دەکات، رووی زاخۆ بە سەر ئەودیوی رووبار دەکاتەوە و کێشەی پەڕینەوە نامێنێ.

پەلەمە بۆ کردنەوەی پریسکە، ئەو پرێسکەیەی خواردنی بە هەشتی تێدایە، خۆم دەگرم و خواردنەکە دەخەمە دوای دیداری برایم خەلیل، ئەمن بیستبووم، ئەو برایمە برایم پێغەمبەرەکەی خۆمانە، بەر لە کردنەوەی ئاگر، لێرە لە نزیک کانیەکە کەپرێکی چێکردبوو، ئیدی لەوەوە ئەو ناوەی هەڵگرت.

ئێرە سنوورە، ئەوە نەبوو لە نێوان تورک و عارەب بووە راکێشڕاکێش، کورد بۆ جاری نازانم چەندەم لێرە پسا و هەوکەشپێوە یەکینەگرتەوە. لە بەری باشوورەوە بەرێ خۆ دەدەینە بەری باکوورێ، وەلەکە عارەب بە ئاماژە تخووب دەکێشێ، رێنادا پتر بچینە پێشێ، برادەرێک دوور نیە هەینی بووبێ، گۆتی:

توو وەرە لە ئاقاری خۆت، عارەبی پێ پەتی و تورکی قوون لە دەرێ، پێت دەبەستن و ناهێلن شەقاوان باوێی، ناهێلن بکەی ئەو بەر و بەرێ.

هەینی کورێ بوو، هەینێ کوردایەتی لێوە دەچۆڕا، کوردی دژە کوردیش چەند رۆژێ لەگەڵی ژیابا، چۆڕێ کوردایەتیی تێوە دەگەڕا. دواتر لە دەمی خۆپێشاندانەکان، لە چەند سەرە کۆلانێ دیتمەوە و برووخێ و بژی

دەگۆتەوە.

ئێ، لەو سەیرانە شوفێرەکەی دیوی باکووریشم لەبیرە، بۆ شتێک کە شتێکی وەکی (فیکی فیکی)یان دەگۆتێ دەورمان دابوو، کوڕێک بە تورکمانی شتێکی لێ پرسی، ئەو بە کوردی گۆتی:

ئەز کوردم، ب کرمانجی باخڤە.

رەنگە بپرسن ئەو شتە چ بوو کە دەتانویست لە شوفێرەکەی وەرگرن؟

بۆ وەرگرتنەوەی وەڵام دەبێت بچینەوە لای سایلۆی هەولێرێ و شوفێرێک لەو شوفێرانەی دیوی باکوور ببینین، ئەوانەی گەنمیان باردەکرد یان دادەگرت، بە دزیەوە بڵێین:

فیـ....... هەیە؟

تێدەگات، هەرزەکار و شوفێر لە زمانی یەکتر تێدەگەن! ئەگەر هەبێ هەندێ پارەی لە دەست بنێ و گۆڤارێکی رەنگاوڕەنگ بخە بن هەنگڵتەوە، گۆڤارێکی پڕ لە حۆری، حۆریی رووت رووت.

لە حۆری گەڕێ، ئێستا کاتی کردنەوەی پرێسکەی لە بەهەشتەوە هاتوود، نا، بەر لە تامکردنی خواردنی بەهەشتێ، دهۆکیشم دی، دهۆک لە ڕێمان بوو، ئەوەتا لە بن شاخی سەرکەش، لە دەو رووبارێکی گاڤێ سەرشێت گاڤێ ئارام خۆی شاردۆتەوە، لەو دیتنە دهۆک لە دیدی منەوە تەواوێک شێوەی کۆیێی دەدا. بیرمە لە نزیک کتێبخانەکە شتێکم بۆ هات، خۆم دایە پەنایەک و یەک دوو کۆپلەم نووسی، دواتریش بڵاومکردەوە، هەر لە دهۆکێ نەوارێکی پاشای تەنبوورم کڕی، غەزال و یار حەلیمێی تێدابوو، دوایی پاشای تەنبوورم وەبیربهێننەوە.

چ ما؟ یادەوەریم بەربادە، حەیف لە دهۆکێ هەر هێندەم لە یادە.

ئێ بە دیار پردی دەلالی دەلالەوە، دوو دوو، سێ سێ، پێنج پێنج... دامەزراین، ئێمە هەرسێکمان دەوری مریشکی بەهەشتمان دا، پاروومان کرد. ئای! گۆشتی بەهەشتێ ئەوهایە! لە بەر دەم ڕێوی دانێ، یەع دەکات، گۆشت دیوی دەرێی سۆر سۆر، وەها سۆربۆتەوە دەڵێی دەندووکی کەوە، دیوی ژۆرێی خاو خاو، گەرماییشی نەگەیشتۆتێ، بۆنیشی لێدێ.

لەوەوە بێزم لەناندینی بەهەشت بۆوە، بە پێشیدا دەڕۆیشتم رووی خۆم وەردەگێڕا، چیدیش بەو ناوە ناوم نەهێنا، منیش وەک زۆری خەڵکی تاجریانم دەگۆتێ و سوێندیشمخوارد ئەگەر لە ناندێنی پلکە سەبە نان بخۆم، سەر بە نادێنی بەهەشتێدا نەگرم، پاشترێ دەگەڕیمەوە لای پلکە سەبە.

چ ما؟ ئا، دەبوو کۆترێکی فازیل ریحانە لەگەڵ خۆم ببەم و لە بن مووسڵێ هەڵیدەمە ئاسمانێ، حەیف لە هاتنەوە بەبیرمهاتەوە. با ئەوەش بڵێم لەو سەیرانەش وا بزانم چ وێنەیەکم نەگرت، ئاخر لە وێنەکەی گۆرینەوە من زۆر ناچار نەکرێم، وێنە لەگەڵ کەس ناگرم، ئێرە جێیتی سەربردەی وێنەی گۆرین بگێڕمەوە، کورتەی سەربردە:

لەتەک خەتخۆش و سێ چواری وێنەمان گرت، من لە پەڕگە راوەستابووم، دوای چەند رۆژێ سەر و وێنەیەکمان بۆ هاتەوە، هەموو گوتیان:

زۆر جوان دەرچووە.

دووانیان روو لە من:

بەڵام تۆ ناشیرنت کردووە.

یەکیان لە دڵەوە گوتی:

هاسانە، هی ئەو رەشوبرژە ببڕە، بەوەی باشە لە پەڕگە راوەستاوە.

کوڕێکیان بە بەرچاومەوە وێنەکەی منی بڕی و دایەوە دەستم، منیش بە بەر چاوی هەمووانەوە، هی هەمووانم بڕی و تەنها هی خۆم هێشتەوە، ئیدی لەو رۆژەوە لە وێنەگرتن تۆرام، تا درەنگ بە تۆراوی مامەوە.

لە وێنە و تۆران گەڕێ، ئێستا دەچمەوە ئازادی.

## شەرم
## ئاهەنگی شیعر

ئازادی ئاهەنگ دەگێڕێ، ئازادی بانگ رادەدێرێ، بە ناو پۆلدا دەگەڕێن و جاڕدەر جاڕدەدا:

کێ شیعری هەیە؟ کێ پەخشانی هەیە؟ کێ گۆرانی دەڵێ؟ کێ دەبێتە ئەکتەر؟ با دەستهەڵبڕێ تا ناوی بنووسین.

هـی وا نـاوی نووسـرا، نە دەنگـی هەیە نە وشـە، نە دوو رسـتەش رێـک دەڵێتەوە. منی شەرمن، دەفتەرێکی شێستپەڕیم پڕکردۆتەوە، شـەرم دەستمی بە سـینگمەوە بەسـتۆتەوە و رێنـادا بڵنـدتر بێـتەوە، شـەرم زمـانمی لە گـۆ خستووە، چەندی دەکەم نابێتەوە، چەند حەزدەکەم بڵێم:

ناوی منیش بنووسن، شیعر دەخوێنمەوە.

نە دەسـت بـزووت و نە زمـان چـی گـوت، دەزانـم ئەگەر وا بڵـێم پـۆل بە خەتخـۆش و دڵشـاد و جەمالیشـەوە لە سـەر پشـت دەکەون و پێکەنینیـان دەگـاتە کۆڵانەکـانی ئـازادی، ئـاخر جـگە لە خـۆم کەس لەو دنیـایە بە کەویاریشـەوە نـازانێ مـن شـت دەنووسـم، ئێسـتا بڵـێم شـیعرم هەیە و دەیخوێنمەوە! بەزمەسات نیە؟!

ئازادی بە بۆنەی نەورۆزەوە، ئیتیحادییەکان گۆتەنی بە بۆنەی نەورۆز و ئـازارەوە ئـاهەنگی گێـڕا، سـاکەگۆڕی نـاو ئـازادی جێـی کەسـێکی دی لـێ نابێتەوە، تا ئەو ئاهەنگە من نەمدەزانی ئازادی هێندە قوتابییەی هەیە. ئاهەنگ بە وتەی ئیتیحادان دەستییێکرد، بەڵام زوو رەوتـی کوردانەی خـۆی گـرت و نەورۆزەکەی حەسەن زیرەک و ئەی شەهیدان و جەژنە جەژنی نەورۆزە لە ئازادییەوە گەیشتە کۆڵانەکانی ئازادی.

دیارە لە وانەی دەستیان هەڵبڕی و ناویان نووسرا، هەندێکیان دەرچوون،

ئەوەتا دێنە سەر شانۆ، لەوانەی شیعریان خوێندەوە:
چاوشین و بلە و سەردار رەشید و پشتیوان و تەحسین و ئەوانە بوون.
لەوانەی بە کۆرسیش سروودیان گۆت: سەرداری سەعید سۆفی و سەردارەکەی تر و دڵشاد و بلە و جەمال بوون، ئەو جەماڵەی مام رەمەزان دەیویست شیعریش بخوێنێتەوە، بەڵام ئیتیحادییەکان رێیان نەدا.
[ با ئەوە بڵێم دوای ئەو هەموو ساڵە، لە دەمی نووسینەوەی ئەو سەرهاتانە، جەماڵەکەی ناو سەرهاتان هەندێک لەو ناوانەی بەبیرهێنامەوە، من بیرمچووبوونەوە]
ئێ، لە تەماشاکردنی هەر یەکێ لەوانەی شیعری دەخوێندەوە لە دڵی خۆم دەمگوت:
خۆزگەم بە خۆت، بریا منیش زاخی ئەوەم تێدا دەبوو، بێمە سەر سەکۆی خوێندنەوە.
بیرمە شیعرەکەی چاوشین لە هەمووان پتر دەنگیدایەوە، بووە چەپڵەرێزانێ، هەرچی کۆتری ئازادی هەیە هەڵفڕینە ئاسمانێ، چەند حەزمدەکرد من لە جێی ئەو بام، چەپڵەکان بۆ من بان. بیرمە لە شیعرەکە (جلکی رەش)ی تێدابوو، ئەوەی تێدابوو کە کوتاڵی رەش بەشی ژنان ناکات، ئاخر رۆژانە ژن کۆستیان دەکەوێ، تەرمی کوڕ و برا و مێردیان دێتەوە، شەڕی قادسیە گەرم داهاتبوو، پێشمەرگەش لە دووی یەک گەشمردەی دەدا.
ئیرەییم بە چاوشین دەبرد، بە شیعرەکەی نا، هەستمدەکرد من شیعری لەو جوانترم هەیە، ئیرەییم بە خۆی دەبرد کە چۆن شەرمی نەکرد و وا بەدەنگی بڵند و جوولانەوەی جوان شیعرەکەی خوێندەوە، ئەدی کاتێ مامۆستایێ لە ناو پۆلێ باسی شیعرەکەی وی دەکرد و دەیگۆت:
شیعرەکەی چاوشین لە هەمووان خۆشتر بوو.
لە دڵی خۆ دەمگۆ:
مامۆستا ئەگەر شیعری منت دەدی، هەرگیز وات نەدەگۆ.
هەیێ شیعری خۆم گەلەک لا جوان بوون!
دەهاتە سەرم خۆم ئاشکرابکەم و چەند شیعرێ بدەمە مامۆستا، شەرم نەیهێشت.
شەڕ گەرمە، شەڕێکی تیر، تیری تێناچێ، دەڵێن چی لە پەنایەکەوە تیچاوێکی بدەیێ!

## فڕۆکەی ئیمام

## دۆشکەی سەر قەڵاتێ

## قادسیە تەرم تەرم

گەرم داهات، بەو زستانە باوبۆرانە زەوی و ئاسمان تایان هاتێ، گەرم داهاتن، قادسیە ئاگری کردەوە، پێشتریش شەڕ بوو، وادیارە وڵات بێ شەڕ هەڵناکات، بەڵام شەڕی ئەوجارە وا لە ئاسمانی شارە، بەری هەنگینێ لە شار شەڕ نەکەوتبووە ئاسمانێ، پێشان لەو لایەوە، تەنها فڕۆکەی بەغدا دەچوو، چیا و گوندی دەکردە رەژوو، ئێستا سەرباری بەغدا، فڕۆکەی تارانیش بەسەردا دەدات و شار بۆردومان دەکات.

فڕۆکە دێ و ناگەڕێتەوە، نەوی نەوی، هەر ئەوەتە زگی بە دارتێل ناکەوێ، باکی بە هیچ نیە، کوێی بوێ کاولی دەکات، ناگەڕێتەوە نە لە کلاشینکۆفی سابیر سارووغ، نە لە دۆشکەی قەدۆ، دەڵێن سابیر سارووغ یەکەم کەس بووە لە هەولێرێ لە پێش باخچەی کورد و عارەب، لە ناو جادە کلاشینکۆفی راکێشاوە و فیشەکی بە فڕۆکەی ئێرانەوە ناوە، ئەوە بوێری بوو یان کەرایەتی! کێ دەیوێرا لە ئاست فڕۆکە سەر بەرز کاتەوە، خەڵک قۆپچە و ئەنگوستیلەی پەنجەی دەشاردەوە، نەوەکوو بریقەبداتەوە و فڕۆکە ببینێ، کەچی سارووغ کلاشینکۆفی پێوەنا، ساروغ هێشتا بە چیا نەکەوتبوو، قەدۆش تازە لە عەرەبستانێ هاتبۆوە.

شتەک لە قەدۆ دەگێڕمەوە و وەکات دەگەڕێمەوە بن سێبەری فڕۆکە. قەدۆ ئەو پیاوەیە، کاتی خۆی بابم دوو دیناری لە بەرکی بوو، یەکیانی بۆ

وی نـارد، ئەو دوورخرابـۆوە عارەبسـتان، باشـووری قـاقڕ، قەدۆ کـاتێ لە بیابان هاتەوە یەکەم ماڵ ماڵی ئێمە بوو سەری پێدابگرێ، گۆتیە بابم:

دینـارەکەی تـۆ تەنهـا جـووتێ پـێڵاوی پێهـات، بەڵام نیـوەی خێـل و کەسوکاری منی هێنا، تا مردن لە چاکەت دەرناچم.

ئەو قەدۆیە پیاوێکی زۆر سەرڕاست بوو، بۆ پەڕینەوە لە مـردنیش درۆی بە زاردا نەدەهـات، هەر لەبەر هەنـدێش دوای تـوانەوەی شـۆڕش ڕەوانەی بیابان کرا، خۆی گێڕایەوە:

*لە کاتی خۆڕادەستکردنەوە، لە هەر پێشمەرگەیەکیان دەپرسی:*

*ئیشی تۆ چی بوو؟*

*لەو سێ چوار ئیشە بترازێ، کەس ئیشێکی دی نەکردبوو:*

*- من نانەوا بووم.*

*- ئەز لە نانێنێ شیوم لێدەنا.*

*- من دەچوومە داران، دارم بۆ بۆ بارەگا دەکێشا.*

*- ئەز مەیتەر بووم، کەر و هێستری بارەگام بەخێودەکرد .*

*ئەمنەکە توورە بوو:*

*دیـارە ئەوانەی لەو شـاخانە گوللەیـان بە عێـراق و گەلـی عەرەبەوە دەنـا، ئیسرائیلی بوون!*

*من هەڵمدایێ:*

*نەخێر من بووم.*

*ئەمنەکە بە بزەیەکی تاڵەوە گوتی:*

*دەی بڵێ، بزانم...*

*گوتم:*

*ئەز لە سەر دۆشکەی شۆرش بووم، هەر فرۆکەیەکی عێراقی گوللەیەکی بەرکەوتبێ، لە لوولەی دۆشکەکەی منەوە بۆی چووە.*

ئیدی بیابان خۆت بگرە قەدۆ هـات، لەگەڵ شـەڕی قادسیە، قەدۆ هـاتەوە، حـوکمەت بـردیە سـەر قەڵاتـێ و لە سـەر دۆشـکەیەکی گەورەی دانـا. پیانگۆتبوو:

چۆنت بۆ مەلا مستەفا کرد، ئەوهاش بۆ ئێمەی بکە.
قەدۆ گۆتبووی:
مـن ناپـاکی لە چەکـی دەسـتم نـاکەم، کێشـکە لە قەڵات نـزیکبکەوێتەوە، دەیهێنمە خوارێ.
قەدۆ دەسـتی لە فڕۆکەی تـارانێ نەپاراست، یەکەم کەس بـوو لە بڵـندایی قەڵاتەوە فیشەک بنێ بە فڕۆکەی خومەینییەوە.
ئێ، قەدۆ و سارووغ لە جێی خۆیان، دێمەوە بەلاشاوە.
لە نزیک سەید مارف دارتێلێکی گەلەک گەورە و بڵند بە ئاسـماندا چـووە، دەنگێکی لێوە دێ، سەد خۆزگەت بە لوورەی سـەگ، بیرتانە؟ لـوورەی سـەگ ئیزرائیلی دەهێنا و کەسێکی دەبردە سەید مارف! لێ لـوورەی ئەو دارتـێلە بە گیـانی کەسـێک وازنـاهێنێ، ئیـزرائیلە ئاسـنینەکەی ئاسـمانی، ئەوەی لە بـن عەبـای ئیمـام خـومەینییەوە دەهـات، چەنـد کەسـێکی پـێکەوە دەنـاردە سـەید مـارف و گۆڕسـتانەکانی دی، باڵەخـانە و خانووشـی کاولـدەکرد، لـوورەی دارتـێلەکە کە بە (ئینـزارەکە) رادارەکە نـاوی رۆیشـتبوو، ئاگـادارکردنەوەی پێشوەختە بوو.
لەگەڵ لوورەی راداری دەبووە تێکئـالان و هەڵقژان و هـاوارێ، دەست و پێ تێکدەئالان، هەبوو لە جێی خۆی رووی بە زەویەوە دەنا و پشتی دەکردە ئاسمانێ، هەبوو غاریدەدایە کۆلانێ، هەندێکیش لۆ بن کـانتۆر، بۆ بنەبـانێ.
هەیە دەڵێ:
ساکەگۆڕ باشترە لەوەی بچیە ژۆرێ و بنەبانێ، فڕۆکە ناپـاڵم دەهـاوێژێتە خانووبەرە.
هەیە دەڵێ:
بـڕۆ پەنـایێ، بـن دیـوارێ، ئەگەر لەو گـۆڕە بیـت، لەو گـۆڕە سـاچمەیێ ساردت دەکاتەوە.
من کە ماڵەکەی موفتی و کوڕەکەی پێش دەرگەی مزگەفتی شێخەلام بە چاوی خۆم دیتبوو، نەمدەزانی بە قسەی کامیان بکەم. بزانە چیم دی:
لە سینەمای حەمرا پارەکەم دا، بلیتەکە هێشتا لە دەستی بلیتفرۆشە، بووە

زرم و هۆڕ، قەدۆ لە سەر قەڵاتەوە پلی پێوە نا، من فرۆکەم دیت، کوو لە گوللە تیژتر، لە دارتێل ستوونیتر چۆوە ئاسمان، کەشیدە لە سەرێک بە دەنگی بڵند دەڵێ:

فرۆکەی ئیمام دوژمنی سینەمایە، بە لای مزگەفتدا ناچێ.

لە سەر قسەی وی بەرەو مزگەفت هەڵاتم، بیرمە لەو ساتە مەمەدە شێتیش کە هەستمنەدەکرد هەستی ترسی مابێ، ترسی لێ نیشت و خۆی هاویشتە ناو سینەما، مەمەدیش چیرۆکە، بەڵام لەو هەڵات هەڵاتە ناپرژێمە سەر وی. یەکپێ هەڵاتم، تاهو واهـ، دارماڵە، لە سەری دەرژێ، پشیلەشی پێوە ناچێ، لە سەر دەرگا خۆم دەخیلی مزگەفتی شێخەڵا کرد. لرمەیەک چ لرمە، لە رووخانی قەڵات دەچوو، کوڕێکی لە من شتێک هەراشتر کە پشتی بە دیواری مزگەفتێ دابوو، بە لادا هات، خوێن لە لا ملیەوە هاتە خوارێ، وا بزانم هەناسەی تێدا نەما. پیاوێک کە ترومبیلەکەی لەوێ راگرتبوو و وەک ئیمە هانای بۆ مزگەفتێ هێنابوو، خستیە سەرشانی و هاویشتیە ناو ترومبیلێ و یەک دووانیکی دیش سواربوون و چوون. لە دلێ خۆم گوتم، سینەما لە مزگەفت پارێزراوترە، خۆزی لە کن مەمەدە شێت دەمامەوە.

بزانە، ئەوەی گەڕەکی موفتی کوو بوو.

من لە سەید مارفێ لە ناو چێورمەی خۆم لە گژ دەورکردنەوەم، لوورەی رادار هات، چووم چووم، خۆم دایە پەنای کێلی پیری سوارچاکان، ئەو کێلە بۆ من چی وای لە ساقۆ درێژەکەی بابم کەمتر نیە، دەمپارێزێ. زۆری نەبرد بووە زرموهۆڕ، لرمەیەکیان زۆر نزیک بوو، وەک بڵێی بە مەزاری سەید مارف کەوتبێ، سەرمهەڵبڕی، سەید سەلامەتە. لەولاوە لە ناوە گەڕەکێوە تۆز و دووکەڵ بەری ئاسمانی گرت، دوای نەمانی دەنگی فرۆکە، رووەو دووکەڵ هەڵاتم. چ ببینم، دوژمنت نەیبینێ، ئەوەی من دیتم و بیستم هەر بەقسە خۆشە، کۆشکێک لە کۆشکەکانی موفتی لە جێی خۆی دارماوە، لادیوارێکی بە پێوە نەماوە، گەڕەک دەوریان داوە، کەسی لە بنە؟

پیرێژنێ پرچ دەرنێتەوە:

ژنەکە، ژنەکە، منداڵەکەی هێشتا لە زگە، مامانەکەشی لە تەکە.

بە شۆفەڵ و گەورە و گچکە لە گڕن، سێ تەرمیان هێنایە دەرێ، یەکیان پێش هاتنە دنیا، گەیشتە ئەو دنیا و بای دنیای بەرنەکەوت، پیاوێک دەڵێ:

لە کاتی هاتنی فڕۆکە لە کۆڵانێ راوەستی باشترە لەوەی لە دوڕ ژۆرێ دانیشی.

سەرم تێدا ماوە، بچمە ژۆرێ، یان بن دیواری دەرێ!

لەگەڵ فڕۆکەی ئێمام سەربردەم زۆرە، ئەوەی ناو گەرماوێ ئەگەر لە سینەما ببینی، هەشبەسەر دەهێنێتە پێکەنینێ. سەر لە سبەینانەکی لە کێندەرێم؟ لە گەرماوەکەی جادەی شێخەلا، ناوی سەلاحەدینە، چیە، کێم لەگەڵە؟ لەبیرم نیە، دوور نیە فازیل رێحانە بووبێت، هەینێ لە گەرماوێ گەڵ وگون رووتی شەرم نەبوو، هەموو پێکەوە و بە تەنیشت یەکەوە، رووت رووت خۆیان دەشووشت. لە هیکڕا قەوما، لە کەس نەقەومێ، دیسان فڕۆکەی ئێمامە، دیارە قەدۆش لە سەری قەلاتێوە بە بەر دۆشکەی داوە، بەلام نازانم کلاشینکۆفەکەی سابیر سارووخ لە تەیراوەوە تەقەی دێ یان نا. ئەوجا ئەنگۆ تەماشای ئەو خەڵکە رووتە بکەن، کوو کوویی تێکدەسوورێن، کەس بە جلکی خۆی ناکەوێتەوە، هەیە بە گەڵ و گون رووتیەوە گەیشتە جادە، هەیە بە کراسێک، کلاوێک گونی خۆی داپۆشیوە، قوونیش با لێیدەدا. ئیدی رووتەکانی ناو گەرماوێ دەردەپەڕن و خەڵکی ناو جادەش غاردەدەنە ناو گەرماوێ، ئەوجا وەرە تێبگە، ژۆرێ چێترە یان دەرێ؟

بابم جێی سێیەمی بەبیردا هات، هاتە سەری لە دەو کەندێ، کونەفڕۆکە لێدا، دەیگۆت:

چارەی فڕۆکە هەر کونەفڕۆکەیە، لە ساچمە دەتپارێزێ و بان و دیواریشت بە سەردا نارمێ.

ئێ، لە فڕۆکە گەڕێ، خەڵک بەرە بەرە ترسی لێ شکا، ئەویش کەمتر هەردەستا، هەوکە گوێی خۆتان بگرن، با نەیبیستن، ناچارم بێمە سەر باسی بزربوونی برادەرەکانم و شینی گەڕەکێ و رەشپۆشیی ژنان و گۆڕستان .

قادسیە لە چ شەڕان نەدەچوو، لە زەوی و ئاسمانەوە، پانە و پان هات، گەڕەک گەڕەک، کۆڵان کۆڵان، ماڵ ماڵی گرتەوە، قادسیە شەقام شەقام

خەڵکی ڕاپێچدەدا، شار کێی تێدا ما؟ ئاوی تێوەرکرد. شاتکە شێت لە سەید مارفێ لە سەر گۆڕی مزەفەر، قسەی دڵی گەڕەکی کرد:

گەڕەک چۆڵ و گۆڕستان ئاوەدان.

لە یادەوەریی من مزەفەری کۆڵانێ، لە پێش هەموو کوڕانی گەڕەک لە شەڕ گەڕایەوە، قادسیە ئاڵای خۆی تێوە پێچابوو، بە خەتێکی درشتی عارەبی نووسیبووی:

شەهیدی قارەمان.

کۆڵان بە ورد و درشتەوە لە چۆکی خۆیان دەدا و (مزەفەر ڕۆ) گەڕەک گەڕەک دەڕۆیی، سەید مارف مزەفەری لە دەستی قادسیە وەرگرت و جلکی گۆڕی، لە کراسێکی سپی سپی، لە بەفر سپیتری پۆشی، دوو گەز عەردی خۆی پێبەخشی، براکەشی ترومبێلێکی سۆر، لە خوێن سۆرتری وەرگرت.

سەرەتا وابوو، قادسیە دەستبڵاو بوو، هەر کەسێکی ناردبایەتە گۆڕستان، دیارییەکی باشی دەدایە ماڵیان. هەر لە کۆڵانی مە نۆرەی سەلاح هات، ئەو کوڕەی پێکەوە دەچووینە پۆستەخانە، دیوار بە دیوارەوەین. شەو درەنگانێ زریکەی دایکی ئاسمانی هێنایە گریانێ، قادسیە ئەویشی بە ناوی (قارەمان) ناردەوە. دواتر زۆری بە ناوی ترسنۆک ناردەوە، بەڵام سەید مارف وەک پیشەی خۆی، بە یەک چاو دەیڕوانیە قارەمان و ترسنۆک و لە دوو گەز زەوی دەیگرتنە خۆ. ئیدی بە دوویدا هات، ڕۆژ نەبوو، سەید مارف لە قادسیەوە مێوانی نەیەت، من لە ترسی شینی ژنان، کەم دەچوومەوە ناو چێورمەکەی خۆم.

وای لێهات چێورمەش نەما، چێورمەکانی دەوری گۆڕ ڕووخێنران، چێورمەیەکی گەورە بە دەوری گۆڕستاندا هەڵچنرا، وا نە با، گۆڕ دەگەیشتە کۆڵان و ماڵان، ئێستا سەید مارف پڕبۆتەوە، جێی لە بارچوویێک، یان مەلۆتکەیەکی فڕێدراوی لێ نابێتەوە، قسە قسە ڕادەکێشێ، جێیتی قسەیەک لە مەلۆتکە فڕێدراوەکە بکەم.

ئەوە درەنگترە، لە منداڵی جوانتر لەبیرمە، لە سەر گۆڕی پیری سوارچاکان، ئەو پیرەی بە مردووییش بە پشت و پەنای خۆمم دەزانی،

هەستام، بیری عەباس و جەمیل رەنجبەرم کرد، عەباس ئەو پیاوەی بەعس بە برینداری لە بن قەلاتێ ددانەکانی هەلکێشا و رەنجبەریش ئەوەی کۆپتەری بەعس لەو دیوی کێوەڕەشێ گەیشتە سەری و ناردیەوە سەید مارف. ئەو دوو گۆڕە لە ریزی ئیکدین، سەید مەندییان بەینە، لەو رێیە، لە بن کێلێ، توورەگەیەکی سپی تۆزاوی کەوتبوو، زۆر لە توورەگەکەی سەر ئەستێرکی گولی کۆساران دەچوو کە نەمدەزانی چی تێدایە، داخوا توورەگەی بن کێلێ چی تێدا بێ! بە ترسەوە دەستم گەیاندێ، نەرمە، زارکی توورەگەم کردەوە، وای! خوایە، هاوارە، ئەوە چیە؟!

هەلاتم، لە پێش دەرگای مەزاری سەید مارف هاتمەوە سەرەخۆ و تێگەیشتم شتەکەی ناو توورەگەی سپی چیە، گۆتمە پلکە عەیشێی مجێور:

+ مندالێکیان لێرە فرێداوە.

- وەرە، پیشانمدە.

لە باوەشی کرد، گۆتی:

ئای، هەناسەی لەبەر ماوە!

پاش کەمێ:

وەیش، نەمێنم، فرپە بەهەشتێ.

چەند دلۆپە فرمێسکێکی هەلوەراند:

دنیا چۆن کاولنابێ، فرۆکەی دنیامان چۆن بە سەر وەرنابێ، ساوا بە زیندوویێتی فرێدەنە ناو گۆڕستانێ؟

بردیە مزگەفتەکەی خوار گۆڕستان، بیرمە سێ چوار زەلام بە خاکەناس و دوودەوە هاتن، جێ جێ گەڕان، تا لە نێوان دوو گۆڕ جێی گۆڕیچگەیەکیان دیتەوە، ئاخر قادسیە جێی گۆڕێکی نەهێشتۆتەوە.

قادسیە مال مال دەگەڕێ، هەر نێرینەیێ دەستی دار بگرێ، رایدەپێچێ، هەر نێرینەیێ تینی تفەنگ راگرتنی تێدا مابێ رایدەپێچێ. هی وەها رادەپێچێ، پەڕی راژەی (دەفتەر خدمە)ی سەردەمی پاشایەتی لە بەرکێیە، کوڕ و باب و باپیر لەبن سێبەری قادسیە چەک لە دەستن.

لە شار تەنها ئەو مالانەی پیاویان نیە، سەرباز و جاشیان نیە.

لە سای شەڕ دوو ڕێت لەپێشە:

سەربازی و جاشایەتی، ڕێی سێیەمیش هەیە، بەڵام کەم بوون ئەوانەی ئەو ڕێیەیان دەگرت، لە کەسانی نزیک کە لە ماوەی دوو سێ ساڵی شەڕی هەشت ساڵە بە ڕێی سێیەمدا چوون، چوون و نەهاتنەوە:

عەباس، کوڕانی شفتیفرۆش، مامۆستا حەیدەر، ئەنۆ، کاوێس، کیفاح، فازیل ڕێحانە، جەواد...

جارێ لە ڕێی سێیەم گەڕێ، لەبەر جاش و سەرباز نازانم سوپای میللی و ئەو شتانە ڕێ نیە پێدا بڕۆی، هەر لە ماڵێ مە دوو سەرباز هەیە، نازانم کەوتوونەتە کوێی شەڕ، فاوە، قەسری شیرینە، کوێیە. برای گەورە کە لە دوای ئاشبەتاڵەکەوە سەربازە، هەواڵ دێ بریندارە، هاتەوە. قادسیە بە برینداریش وازی لێ نەهێنا، دەستی گرت و بە شەلە شەل بردیەوە، بەڵام کەمەک لە دووری شەڕێ داینا.

دوای وی هەواڵ دێ، برای گچکە بریندارە، سەرباری برینداریش لە زیندانێ ئاخنراوە، ئەوە خۆشە، دەبێت کێشە چی بێت؟ تا بابم بە کەلێنی مووشەکی حوسێن و عەباس و ئەو شتانە خۆی گەیاندێ و پێکەوت و هاتەوە، لە ماڵێ مە شین و ڕۆڕۆیە. دیارە لە پێشەوەی بەرەی شەڕ بووە، ئەو جێیەی خدری زندەشی لێدانێی، بە زیندوویێتی ناگەڕێتەوە، ئەویش لە نێوان مردنی مسۆگەر و نیوە مردن، نیوەکە هەڵدەبژێرێ، دێ، بە دەستی خۆی گوللەیەک لە خۆی، قەیتانی پێڵاو لە کێندەر گرێدەدرێن لەوێ دەدا، ئیدی برادەرەکانی رایدەکێشنە دواوە، ئاشکرا دەبێت و لە زیندانێی دەپەستن.

دار و دیوار پەڕۆی ڕەشە، شار هەیە لە دنیایێ هێندەی هەولێر بە مزگەفت؟ ئەوجا بە پرسە ڕاناگا، ناچار پرسە تێکەڵدەکرێن، گۆڕستان پڕبوونەوە، سەید مارف زمانی هەبا دەیگۆ:

قادسیە، بەسە، جێم نەما.

قادسیە ئاشی خوێنە، دەگەڕێ و مردن لێدەکات، سەد ساڵیش دەبێت شار هێندەی ئەو چەند ساڵە کوڕەکانی نەکوژراون. پێش پێی قادسیە، لەو سەر تا ئەوسەری کۆڵانێ ڕەشپۆشی دووت دەدی، ئێستا قادسیە دەرگا دەرگا

لێدەدا، ڕەش دابەشدەکات. تاکوتەرا ژن دەبینی ڕەشی نەپۆشیبێ، تەماشای ڕێ گۆڕستان بکە، دەڵێی هەرچی قەلەڕەشکەی ئاسمانێ هەیە، باڵیان کراوە و لە ڕێی سەید مارفێ خۆ فێرە ڕۆیشتنی سەر زەوی دەکەن.

لەو سەروبەندەی سەرەتای قادسیە و سەدامی شەڕ کە تازە خەتی سمێلم دابوو، تازە ردێنم مووسێ ناسیبوو، بە چاولێکەری هەندەکان، هەوای هەندەران لە سەری دام، بەڵام نەمدەزانی بە چ ڕێیەکدا بچم، خۆم بدەمە دەستی چ بایێ. وەبیرمدێ لە ڕێی کوڕێکەوە، وا چاکە ناوی نەڵێم، دیتمەوە، ڕێی هەندەرانم دیتەوە، ڕێیەکەش لە ڕێی سێیەمەوەیە، ڕەنگە لەو ڕێگەیەوە بگەیێ، ئەو کوڕە ناوی پارتێکی هێنا، گوایە تێکەولێکەی خەڵک هەناردەی هەندەران دەکات، تەنها یەک مەرجیشی هەیە، یەک شتت لە سەرە، بەجێیبهێنە، هەندەرانت مسۆگەرە، مەرجەکەش زۆر ساناتر لە شەرتی شوانی، ئەگەر هی شوان حەفت ساڵە، چەندە، هی تۆ تەنێ ساڵێکە، ساڵێک پێشمەرگایەتی و بەس، ساڵێکیش چیە، لوقمان گۆتەنی:

بۆ خۆی دەڕوا، گەرمایەکی بە تین دێ، دوای وی زەردبوون و هەڵوەرین دێ، ئەوجا باوبۆران و بەفرێکی ئەستوور، لەپڕ دنیا وەک ئێستا کەسکدەبێتەود، ئەوە ساڵ تەواو و شەرتم هەلات و هەندەران هاتم.

بەڵام حەکیمی برای دەڵێ:

وا مەڵێن، ساڵی ئەوێ درێژە، نابڕێتەوە، ساڵێکی حەفت ساڵی ئێرەیە.

سەرباری درێژیی ساڵیش، بە قسەی سێئاغا بێ:

تا ئێستا کەس ساڵەکەی تەواونەکردووە، بە گوللەیەک ساردبۆتەوە.

سێئاغا ساردیکردمەوە و لە سەر پەتک و سنگی خۆم گیرسامەوە، لە سەر خوێندنی خۆم مامەوە. پاشترێ بیستمەوە، زۆر کەس بەو هەوایە ڕۆیشتن، پێش شەرتهەلاتن لە خوێنی خۆیان گەوزین و نەگەیشتن، وا تێبگەم تەنێ ئەنۆ تەواویکرد و گەیشت، بەڵام خێری نەدایەوە، لە دوورە وڵات و دوور لە کەسوکار سەری نایەوە.

## حەزی پارێزەری

ڕێی چیام نەگرت و لە سەر پەتک و سنگی خۆم مامەوە، قوتابخانە سنگ و پەتکەکەیە، بەستراوینەتەوە، لە بەستنەوەدا لەگەڵ خەتخۆش نەخشەی ئایندەی خۆمان دەکێشا، ببینە چی، چی باشە.

خەتخۆش

حەزی چووە پارێزەری، هێندە جوان لەو پیشەیە دەدوا، منیشی بە دوای خۆیدا ڕاکێشا، دەیگوت:

پارێزەری باش خدری زندەیە، دەتوانێ پەتکی قەنارە لە ملی شۆڕشگێڕ بپچڕێنێ، ژیانی پێببەخشێتەوە، پارێزەری باش هەڵەی گەورەی دادگا ڕاستدەکاتەوە.

بیرمە لە بارەی پارێزەرییەوە گوتمە ئازاد خەتخۆش:

عارەبی لە نەنکەوە خزم کە خۆی کردبووە کاردۆ، پارێزەریش بوو، میری بردی و شوێنبزری کرد و دایکی گۆڕەکەشی نەدیتەوە، خۆی پارێزەر بوو، ئەدی....

خەتخۆش دەڵێ:

ئاساییە پارێزەر نەتوانێت بەرگری لە خۆی بکات.

باوەڕمهات و هەرێم بە خۆم دا ببمە پارێزەر، لەوەش هێوەتر هەڵکشام، لە خەیاڵێکی جوان، ئەوەتا وڵات ڕزگار بووە، منیش بوومەتە دادوەر و تەرازووی لاسەنگی بێدادی هاوسەنگ دەکەمەوە.

ئیدی خواخوامان بوو، زوو پۆلی چوارەمی گشتی ببڕین، بچینە بەشی وێژەیی و دوورکەوینەوە لە فیزیا و کیمیا و زیندەوەرزانی و هاوکێشە و سەرئێشە، هەر چەندە ئەو وانانە بۆ من لە چاو جوگرافیا و مێژوو و ئەوانە

ئاوخواردنەوە بوون، بەڵام حەزی ویژە و پاریزەری وایکرد، پشت لە زانستی و روو لە ویژەیی بکەم. بەر لەوەی ساڵ بە خوێندن و پشووەوە دوایی بێ، هەندێک وردە سەربردە هەن.

## چریکەی ناو چادر

لەوبەرەی گردی قالینجاغا بە دیوی گەڕەکی کۆماری چادرێ لە ناو حەفتان هەڵدراوە، بە هەر لایەکدا سەر هەڵدەبڕی ژمارە (٧) روو لە ئاسمان زاری کردۆتەوە. ئاسمانی چادریش هەمووی وێنەیە، وێنەی گەورە، گچکەکەیان نیو بەژن دەبێت، وێنەکان هەر یەکەی لە رەنگ و شێوەیێ، بەڵام دیارە هەموویان هەر ئەو پیاوەن کە لە پەڕی یەکەمی کتێبەکانی دەستی ئێمەش چاوی زەقکردۆتەوە، وێنەکان بە بای نیسانێ دەلەرێنەوە، لە دەستمبێت، لە جێی ئەو شنەبایەی خاکەلێوە، ئاگرێک هەڵدەکەم، وێنە و حەفتەکان لوولدا و لەو حەفتی نیسانە قرچەقرچیان بگاتە بەغدا، حەزمدەکرد دوو پێشمەرگە پەیدا بن و بە ئارپیجیەک چادر بە حەفت و وێنەوە بە ئاسمان بێخن، لەو خەیاڵانە بووم، چ ببیستم! چریکەیەک لە چادرەوە هات.

چ چریکە! کوردی با، دەمگوت مریەم خان یان ئایشەشانە، هەستانێک هەستا، رەسەنایەتی لێوە هەستا، ئەو رەسەنایەتییەی ئەگەر لە وشەیەکیشی تێنەگەیت، تێدەگەیت رەسەنە. رەسەنایەتییەک دڵنشینە و دڵ دەبات و ناتداتەوە، کەمەندکێشی ناو دنیای خەیاڵت دەکات و لە خۆت دادەبڕێنێ و هاییت لە هیچ نامێنێ، من وام لێهات، حەفتەکان و وێنەکان بزربوون، تێکەڵی هەستانی رەسەن بووم و هیچم نەدەدیت، بە دوای (یا یومە و یا بویە) هۆدا و ئۆبابدا چووم، باشە پێشترێ ئەو دەنگەم نەمبیستبوو؟ دوورنیە، بەڵام لەو بن چادرە، بووە دەنگی دڵنشینی من، خۆم رادەستی:

**ئیزا ئەنتە لەم تەعشوق وە لەم تەدری مەن هەوا، جانا...**

**فەکون حەجەرەن.....**

کرد و نەمزانی چۆن چووم، ئەگەر وەلەکە بەعسی لێگەڕابان، وەها زوو

نەدەهاتمەوە. هێندەم بیردێتەوە، دەستێکی گرانی کەپکە شاخی لە سەر سینگمە و پشتاو پشت کەوتم، ئای! ئەوە چ بوو، وێنەکان و حەفتەکان زیندوو بوونەوە، چریکە نەما، خەتخۆش گەیشتە سەرم، قیتیکردمەوە و گوتی:

کورە، تۆ هێڕ بووی، نەمگوت بگەڕێوە.

مەڵێ، گۆرانیی ناو چادر منی هێڕ کردووە و وەک مەرە گێژە ملم ناوە و چەندی گوتوویانە:

بگەڕێوە، چیت دەوێ؟

نەگەڕاومەتەوە، لە بن چادرەکە وەلەکێ پاڵێکی وەلەکانەی پێوەناوم، ویستبوویان بکەونە سەرم، برادەرەکەم گەیشتبوو، نەیهێشتبوو. تا گەیشتمەوە ماڵێ، جوێنم بۆ ئەو چریکە ژنانییە نارد، هێندەم بۆی نارد، شیعە بۆ عومەریان نەناردووە، خەتخۆش تا درەنگیش بە پێکەنینەوە دەیگوت:

ئەها لێرێهێ دەنگی زوهرە حوسێن دێ، بڕۆ گوێبیدێ.

زوهرە حوسێن بە لێدانی دام، بەڵام وازم لێ نەهێنا، ناسکترین (یا یومە)م لە دەنگی ویەوە بیست، وەک چۆن ناسکترین (ئەلاهو ئەکبەر) لە دەنگی نازم غەزالییەوە، لە ئەلاهوئەکبەری دەروێش برایمش ناسکتر. خۆ کاتێ دێری فارسییە کوردییەکەشی تێکەڵی عارەبی دەکرد، شیرینتر دەبوو. ئیدی لە دەنگی رەسەنی عارەبان لە دوای نازم غەزالی، زهور حوسێنم ناسی، ئەها گوێڕادێرە:

**یا عەزیزی رووح، یا بەعەد عێنی**

**شنهو زەنبی وەیاک، ما تحاچینی**

**تو گولی سورخی، مەن بولبولی شەیدا....**

لە سەر ئەو دەنگە دارکاریش بکرێیت، دەستبەرداری نابیت.

## حاجی عەبدوڵای دەفژەن

ئەگەر کەسێ لە کەسێ بپرسێ:

ئەرێ شیعری سافی هیرانی بۆچی بەو ئەندازەیە تەڕ و پڕە، پڕ ریتم و ئاوازەیە، تۆ بڵێی هی ئەوە بێ، لە کانی شیلانەی خواردۆتەوە، سینگی بۆ شنەی سەفین کردۆتەوە؟

وەڵام .لای حەمد مەستانی تەڕپیرە:

سافی هیرانی هەر شیعرێکی نووسیبێ، بەر لەوەی کەس بینیبێتی و بیستبێتی و خستبێتیە دەفتەری شیعرەوە، حاجی عەبدوڵای دەفژەنی تی کردۆتەوە و گوتوویەتی:

ها، ئەو شیعرە بخوێنە.

دەفژەنیش شەهابانە چریکاندوویەتی، داودیانە خوێندوویەتی، لە هەر وشەیەکیش لاسەنگی هەبووبێت، دەفژەن نەرمە کۆخەیەکی هاتۆتێ و هیرانی زوو تێگەیشتووە، وەکات هاوسەنگی کردۆتەوە، بۆیە شیعری هیرانی هەمووی دەنگ و گۆرانییە.

ئەو دەفژەنە کە زۆر کەس حاجی و هەندەکیش مەلا دەفژەنیان دەگۆتێ، بە قسەی حەمەد مەستانی هەمیشە مەست بێت، لە دەفلێدان کار لە دەروێش برایم و کوڕە دۆمە رەشتارەکەی سەیداوە نیە. کاتێ دەف دەگرێتە دەست، قەڵات دەهەژێ، منارەی چۆلی حەی حەی دەکات، سەرخۆش زەرگ لە خۆ دەدات، شەقاوە روو لە خۆ پەنا بۆ کەتەر دەبات، لە دەنگیش سەید عەلی ئەسغەری کوردستانی گوێی لێبێ، دەڵێ:

ئەوە دەڵێی منم لە قەڵاتەوە گۆرانی دەڵێم!

با بزانین وایە؟

لـێ بەر لە بەدواداچـوون نەبـادا بیـرمبچێتەوە، بـا گوێمـان لە دەنگـی مەسـتانیش بـێ، ئەویـش دەنگـی خـۆش بـوو، خۆشیشـی دەگـۆ. مەسـتان پێشـەوەی بەلاشـاوە چـۆل بکـات، نـاوە نـاوە تێیهەڵدەکردە مەقـامی نزیـک سـەبکی دەفزەنـی قەلاتـێ، لـێ داخـی گـرانم، مـن بە کـێش و سـەرواوە لە بیرمنەمـاوە، هەر هێنـدەم بیردێتـۆ، لەوپەڕی مەسـتی، شـتێکی نزیـک لەوەی دەگۆ:

وەرنە وانەی هونەرێ

هەر نووسین نا، خوێندنەوەش هونەرە

هەر چێکردنی شەراب نا، خواردنەوەی شەرابیش هونەرە

هەر گۆتن نا، بیستنیش هونەرە

هەر رۆیشتن نا دانیشتنیش هونەرە

هەر زەڕین نا، لەوچینیش هونەرە

هەر خوایەتی نا، بەندایەتیش هونەرە

هەر دەنگی مەستانی هەمیشە مەست نا

پرتە وبۆڵەی (خاوە)ی ژنیشم هونەرە،

دێ وارنە، وانەی هونەرێ

(ژنەکەی حەمە مەستان دوو ناوی هەبوو، مەستان و خاوە)

ئێ، بێینەوە سەر باسی خۆمان، ئەز درەنگ زۆر درەنگ گەیشتمە دەف و دەنگ، دەنگ و دەفی حاجیی دەفژەن، درەنـگ، بەلاشاوە نە حەمەد مەستانی مابوو، نە کەویار. ئەز رۆژەکی دەچوومە سەر کار، کار لە کوێیە؟

لە شەقلاوێ، بە پیرمامدا هەڵدەگەڕاین، پێچی کەریم حەشاشمان بڕی، لە تـــرومبێلەوە دەف و دەنـــگ بەرزبـــۆوە، ئەز وا تێگەیشـــتم ســـەید عەلـــی کوردستانییە، بەڵام شوفێرەکە گۆتی:

ئەو نەوارە جگە لە من کەس گوێی لێنەبووە.

کرێکارێ پرسی:

ناوی چیە؟

شوفێر:

حاجی عەودولای دەفژەنی هەولێری.

بە دیار دەفژەنەوە مەست بووم، گەیشتبوومە شەقلاوە و سەر کار، دوودەویشم رادەوەشاند بەرینەدابووم. ئەوجا بزانن لەو رێیوبانە، دەفەکە با مەزەی دڵ بێ، وەز بە شەهرزادی چ هەستانێکی پتر مەست بووم، لە هەستانەکەش بە پێکی چ دێرێکی؟ سوێندی کەسم لە سەر نیە، ئەو رۆژە دەست بە دوودەوەوە تا دەستبەردانێ لە بەر خۆمەوە:

**بە غەمزەی چاوەکەی، عەقڵ و و دڵ و دینم بە غارەت چوو**

م دەگوتەوە، ئەدی ئەوەی:

ئاخ و ئۆخ و سێو و خۆخ و نێرگز و باخ

سەروایەتی!

دوای بیستنی دەف و چریکەی حاجیی دەفژەن، بیری حەمەد مەستانم کرد، نەمدیتەوە. دڵم بۆ کەویار وەک دەفی حاجی لێیدەدا، بەڵام فڕیبوو، وێنەی ئەو کۆترانەی پێش جەردبوون، باڵم دەکردنەوە و هەڵمدەدان و نەدەهاتنەوە، مەستانم نەدیتەوە، وەرنا دەمگوت:

منیش مەستم بەو دەفژەنەی دەمێکە تۆی مەست کردووە.

شەرم نەیهێشت دەنا دەچوومە دوای کەویار و لە سەر دەرگا، سینگی خۆم دەکردە دەف و بە زاری دەفژەنەکە دەمگوت:

**دڵ و دینم بە غارەت چوو...**

## رەسوولی حەیران

ئەو سەرهاتەیان کەمێک درەنگترە، بەڵام کڕی گێڕانەوەی هات، بەر چەقۆیان دابوو، بەڵام دانەکەوت و وەختایەکی لە دوای سەدام پڕترین پیاوی شاشە بوو، رەنگ نەبوو تەلەفزیۆن بکەیتەوە، بە:

پۆلاڕێژە...

مێشکتی بزمارڕێژدەکرد، کەچی بابم لە لای پەنجەرەکەوە گوێی دابووە نەواری:

کیژۆرە ئەسمەرێ...

لەگەڵی دەناورایەوە، گۆتم:

- بابە، تۆ تا ئێستا گوێ لەو جاشدەنگە رادەگری؟!

+ کوڕم من چیشم لە پۆلا و چەقۆ هەیە، گوێ لە رەسووڵی حەیران رادەگرم، رەسووڵی حەیران!

لەوەوە، لەو قسەیەی بابم لە مەڕ رەسووڵی حەیرانەوە، رەفیق چالاکیشم بە چاوێکی دی دی، ئەو چالاکەی بە من با، نەک هەر دەنگ ناویشم نەبیستبا، چەند رقم لە ئەبوو عەلا دەبۆوە، دوو هێندە لەو رەفیقە.

ئەنگۆ دەزانن لە هەولێرێ ئەبوو عەلایەکی سەدامی هەبوو، زۆر جار بۆ وەرگرتنی قسەو باس، جلکی شڕو وڕی دەپۆشت و لە کۆڵانان دەگەڕا و شەکەراتی دەفرۆشت، جارێ ئەو شەکەراتفرۆشە با لەو لا بێ، چالاکی هونەرمەند هاتۆتە بەر باسێ.

لەو دەمەوەی پێکەوتم لە رێی پێلێنان و پاکانەی ئەو هونەرمەندە، چەند هاوڕێیەکی خۆی گیراون و دوو سێیەکیان لە قەنارەش دراون، پێش

میرغەزەبان کەوتووە و کون کون لە دوای هاورێکانی دەگەڕێ، بە من با دەنگ و زایەلەی سەر نەواری وی خڕبکەمەوە و لە کونی ئاودەستیان بکەم، بەڵام لەو قسەیەی بابمەوە لەگەڵ دەنگی رەفیق چالاک ئاشتبوومەوە و گوتم:

رووخان و کرێگرتەیی هێوە، دەنگ و هونەر هێروە.

چالاک کەسێکە دەکەوێتە چێوەی ناپاکانەوە، لەم بارەیەوە هونەرەکی بە هانایەوە نایێ، دیارە ناپاکییەکەشی هونەرەکەی رەشناکاتەوە.

## مریەم خان
## تۆلی جوانێ

ئاشنایەتیم لەگەڵ مریەم خان دەمێکە، سەربردەی مەستبوون بە دەنگی وی زۆر کۆنە، بەڵام هەڵمگرت و حەزمکرد لێرە بیگێڕمەوە. ئەز لە ڕێی ژنی کۆلان و شمشاڵەوە ناسیم، بەڵام بەر لە سەردانی سێ عەلییەکە نەهاتبووە ڕیزی حەوتەوانەی دەنگان، هەر کاتێ لە رادیۆوە وەک شنەبای زۆزانێ هەڵیدەکردە:

**دۆمام، ئاڤا شەتێ مە شەربەتە**
**دۆمام، پێلا ناڤی هەڤ دکەتە**
**دۆمام دبێ: نیکاهێ خەلکێ عالەمێ عادەت بوو**
**یا من و دۆماما منی جزیرا بۆتا ج قەحبەتە**

لەکۆلانێ مە ژن هەبوو وێنەی بنجە گیای دەم با خوی دەهەژاند، ژن هەبوو وردە رۆندکی بە سەر بەختی خۆیدا دەباراند، دەنگی بریندار مریەم خان دلبەر و دڵبەردی دەگریاند! شمشاڵی منیش بەر لە هەر ئاوازێ (لێ لێ وەسۆ)ی هەوکی ئەوی دەژەند...

بەڵام مریم خانەکەی ڕێی گەڕانەوە جیا بوو، گەڕانەوە لە سەردانی سێ عەلی (قەردار و بەگ و عاشق)، لە پێچەکانی سپیلکێ، بە دیوی هەریر و پاتاسێ شۆڕدەبووینەوە، مریەم خان مینا کۆتری بریندار ناورایەوە و (محەمەد)ەکەی خۆی تاواندەوە. سەرە ژنێک کە دەتگوت ئەستێرەیە ڕژاوەتە ناو ترومبێل، دەبینم نەرم نەرم هوردە رۆندکان دەبارانێ، دەبیستم بە دەنگێکی ناسک لە جێ جێ، لەگەڵ مریەم خان ستران دەڵێتەوە، لەو دەمەی دەیگۆ:

**بازنێ دەستێ خۆ بشکینم...**

هەستمدەکرد بە راستی دەیشکێنێ بۆ جوانییەکەی سوارە جوانەکەی دەکاتە ناڵ و بزمارە. ئێوە ئەگەر ئەو لاوکەتان نەبیستووە، بیبیستن، محەمەدەکەی ئێرە لەوە لە گەنج خەلیلەکەی ئەوێ دەچێ کە کچکێ دینێ نایەلێ لاوکێ خۆ لە ولاتی غەریباتی کەس پێبلێ سوارەکی چ بێ کاروبارە...

ژنە ئەستێرەکەی نشێوەی سپیلکێ، محەمەدێ رۆنی دەگەڵ مریەم خان لە ناو فرمێسکان دەگۆتەوە، ئەو سەرە ژنە جوان لە ترومبێل دابڕابوو، پێدەچوو گەیشتبێتە ناو کار و بەرخی قەدپاڵی بەنی هەریرێ، نا زۆر هێوەتر برۆ، بگە دەشتی هەسنێ و ئاقاری جزیرێ، ئاخر ژنی هەینێ، نەگاتە وێ چۆلەوانیی وا، کوا زاری لاوکی وا ستران هەڵدێن؟

گریان و گۆتنەوەی ژنی ناو ترومبێلی منیشی لە ناو لاوکی محەمەدی رۆنی بزرکرد، گەیشتبوومەوە شاریش خۆم نەدیتەوە، لەبیرمبێت دواتر ژنەکەم دیتەوە و پێکەوتم کوڕێکی منداڵکاری ناو محەمدی هەبووە و لە سەر سنوور بە دەستی سەرباز وجاشان کوژراوە.

ئیدی ئەو دەنگە جزیرییە توند بە لاوکی بەستمەوە، بە تایبەتی لاوکی (وەرە حەلیمێ)، زۆر جزیری ئەو حەلیمایێ دەڵێنەوە، دیارە جزیرییەکی دەنگ ناخۆشیش نابینیەوە، ئاخر وەک بیستوومە سەردەمی زوو، میری جزیرێ هەر کەسێ دەنگی زەلال نەبوویێت و لاوکیانە هەڵنەکەوتبێ، رێینەداوە لە ولاتی جزیرەی بۆتا دانیشێ.

بەڵام هیچ جزیرییەک- پاشای تەنبووری بەگەڵ مەدەن- ناکارێ (وەرە حەلیمێ) وێنەی ئەو کچە فۆتە لە سەرەی دێرگولی جزیرا بۆتا کە مریەم خانی ناوە، بیلێتەوە:

**لێ لێ**

**وەرە وەرە وەرە، وارە، لێ وەر حەلیمێ**

**کچکێ دینێ...**

**ل خەلکێ تەحلێ ل من شیرینێ**

**دە وەرە وەرە ، وارە....**

ئەو لاوکەشـەم بە شمشـاڵ نزیـک لە خـۆی دەگـۆتەوە، بیـرمە لە جێـی (حەلـیم)ەکەش نـاوێکی دیـم دانـابوو، ئەو نـاوەی لە کۆلان کۆلان گێڕانەوەی من، ناوی گۆڕا و بووە کەویار.

(گولێ وەی نار)ەکەشم باش دەگوتەوە، ئەها گوێ لە دەنگی مەریەم خـان و شمشاڵی من بگرن:

**گولێ وەی نار وەنار وەی نارێ،**

**جانێ وەی نار وەی نار وەی نارێ**

**گولێ مەمک سینیا ساڤارێ**

**گولێ...**

درەنگیش لە ڕێی نازانم کێوە، ڕەنگبێ هەر لێکدانەوەی خۆم بووبێ، شـتێ لە سینیی ساوارەکە تێگەیشتم:

ئەها ئەوە سینی، لە سـینەش نـزیکە هـا! چـاودێ، ئەو سـینیە سـینەییە دوو لەگەنی گچکەی پڕ ساواری لە سـەرە، نێوانی دوو لەگەنەکە هەر دوو پەنـجە دەبـێ، لەگەن لە سـاوار بە سـەرە و بـۆتە قـۆمەت، لە سـەر سـەریش پشـکە گۆشت، لە دوورەوە تێچاوی بدێ، ڕێک گۆی مەمکە، ئیدی تێبگە تۆ، سـینی سـینەیە، دوو لەگەنە سـاوار جـۆت مەمکـن و دوو پشـکە گۆشـتەکەش گـۆ، ئەودیە:

مەمک سینیا ساڤارێ...

کەویاری منیش بە منداڵی ئەو بەستەیەی کە دەڵێ:

**گرێ سیرا ب جەیە، لێ لێ لێ مەیرۆ**

**گر خۆپانێ ب جەیە، تۆلی جوانێ مەیرۆ.**

**وا سوارا هەی و هەیە، لێ لێ لێ مەیرۆ**

**خوەستیێ مەیرۆ فەلەیە، تۆلی جوانێ مەیرۆ**

هێند شیرن دەگوتەوە، مەگەر مریەم خان وای بڵێتەوە.

## پاشای تەنبوور

ناوی پاشای تەنبوور هات، بێ وی لاوک سێویە، بۆیە دەست لە سەر سینە دەچمە پێشوازی. ئەمن یەکەم جار ئەو پاشایەم لە تۆمارخانەی کوڕە سازژەنەکە، کوڕی مام دیوانەی زورناژەن دی، باوەڕم بە چاوی خۆم نەکرد، چۆن دەبێت پاشایەکی وا مەزن، پاشای تەنبوور و لاوکان لە تەختی ئاسمانیی خۆی بێتە خوارێ و وەک من و تۆ لە تۆمارخانەیەک دانیشێ.

ئەنگۆ دەزانن ئەو پاشایە چەند ناوێکی هەبوو:

پاشای تەنبوور، میری لاوک، بابێ کەریم، محەمەد عارف جزیری.

ئەو جزیرییە تەنێ لە بەری بادینانی زێی بادینان پاشا نەبوو، لە بەری سۆرانیش پاشایەتی خۆی دەکرد. بیرمە لە ناو ترۆمبێل و سەر ماتۆڕ و دەلاڵخانە و چاخانە و کۆڵانان، لە کاوێژاغا و عومەر دزەیی دەبردەوە و دەچووە پێشبڕکێی حەسەن زیرەک، شار شتێ کەمتر لە زیرەک گوێی لە جزیری رادەگرت، شار کاتێ بە بن (باران بارانە)ەدا دەگەیشتە (هەر دەڕوا و بەجێمدێلێ) و لەوێوە بە( سەر ناڵەشکێن)ێدا دەهاتەوە، سەردانی (غەزال)ی دەکرد و پشووێکی لە کن (حەلیمێ گیانێ) دەدا و (وەرە وەرە وەکی بەرێ)ی دەگوتەوە.

ئەز لەگەڵ زایەلەی پاشای تەنبوورێ سەربردەم زۆرن، نزیکترینیان لە سەیداوەیە، ئێوارەیەک

ئەو پاشایە لە ماڵی فازیلی رووبەخاڵی مام دێوانە، بە غەزاڵ غەزاڵەکەی سەیداوەی مەست و حەیران کرد، ئێمەی لە بەلاشاوەوە دڵکێشکرد، هاتین، لەگەڵ فازیل رێحانە هاتین، لە سەرە کۆڵانی سیانانەوە گوێماندایێ، ماڵەوەدان! وەکی دەیگۆ:

**ئیرۆ پشتی تەڕا چ بکەم**
**غەزالێ، ل مالێ ب تنێ..**

ماڵێکی سەیداوە نەبوو لە ماڵی ئۆقرە بگرێ و نەیەتە کوڵانێ، ماخرا، کاتێ دەگەیشتە:

**مەمکێ غەزالا مال خراب**
**سۆر بوینە مینا شەمامۆکێ دەشتا هەسنا...**

گەنج نەدەما، خەیاڵ نەباتەوە بن کراس و سبوخمە، ئەو ئێوارەیە، خوا کردی کەتەرم لە بەرکێ نەبوو، دەنا چ دوور نەبوو، دوو سی کەتەرا لە خۆ بدەم.

لەو ئێوارەیەوە پتر بوومە هۆگری ئەو دەنگ و سەدایە، ئەو پاشایە، ریحانە گۆتەنی بوومە شایەری دەرباری، ئاخر شیعرێکی درێژم بە سەریدا هەڵگۆ، حەیف یادگەم بەربادە، تەنێ دێرێکیم لە یادە:

**بێ مال،**
**تۆ سەودای غەزال و**
**ئەز سەوداسەری غەزال غەزال.**

لە کۆڵانی لاوک دەمێنمەوە، ئاخر گۆرانی لاوکی لێکەوە چی پێوە دەمێنێ! نازانم کێ بوو، زوو زوو دەیگۆ:

گۆرانیی کوردی، لاوک و حەیرانی نەبێ، لە هەولێری بێ قەڵات و منارە دەچێ.

## گەنج خەلیل

لەکۆلانی لاوک دەمێنمەوە، لە پشت ماڵی نەنەخان، کۆلانی جۆتە خوشک نا ئەوی دی، کۆلانێک هەیە، نیوەی بەلاشاوە کۆلانی لاوکی دەڵێنێ. هەر کێ و هەر کاتێ ڕێی بەوێ کۆلانێ بکەوێ، لە ماڵێکەوە لاوکی بەر گوێ دەکەوێ. ماڵێکی دەرکە بۆری یەک دەری، دوو چاوە و هەیوان، دارتووێکی توو سوور و مێوێکی ترێ کشمیری و بنە هەنجیرێکی هەنجیر رەش و دوو سێ بنە مووورتکی بۆنخۆشیان لە پێش دەرگا و ناو حەوشێیە. لەو ماڵە پەلکی دار ببڕێ، چۆلەکە ببڕێ، دەنگی کاوێزاغا نابڕێ.

بە چاوی من لە کۆلانەوە چاودەنێ، دەرگای حەوشە لە سەر پشتە، دەبینن، ئەوەتا ژنێکی رەشپۆشی بسکشۆڕ دانیشتووە و تێکەڵی لاوک بووە. ژنە حەزدەکات لەو سەر تا ئەو سەری کۆلان و کۆلانی پشتەوەش لاوکی دڵی وی ببیستن، بۆیە دەنگی(گەنج خەلیل) بەرزدەکاتەوە، لەگەڵ تەوابوونیش زۆر جار نەوارەکە هەڵدەکاتەوە، دەیگەڕێنێتەوە سەر گەنج خەلیلەکەی خۆی:

**گەنج خەلیل کورمامێ من لە ولاتێ غەریبان و غوربەتێ گەلەکی نەخۆشە**
**وەزێ رابم نوینا رایەخم کەت کەتێنە بالیفا بدەمە پالە**
**ئەزێ رابم کەمەرا پشتا خۆ بشکینم**
**بو هەسپێ گەنج خەلیل بکەمە نالە**
**بازنێ خۆ بشکینم، بکەمە وردە بزمارە**
**بسکێ خۆ ببڕم، بکەمە سەرڕەشمە**
**کەزیان بکەمە تۆق و سەر هەوسارە**
**گەنج خەلیل بینم سوارکەم ل کوێتەکی تالە**
**بەلێ بلادی شام و ناو عوسمانیا با بێتە خوارە**

**کەس لۆمەی کوڕ مامێ من نەکەن،**
**بەلێ نەبێژن سوارەکێ کوردە چەندی بێ کاروبارە**

داخوا ژنەکەی گەنج خەلیل رۆژی چەند جار گەنج خەلیلی هەڵکردبێتەوە و لێدابێتەوە! ئەو ژنەی دیار لاوکی گەنج خەلیل، مێردە گۆڕ نادیارەکەشی گەنج خەلیل بوو، لە کن دایکی پێنج کوڕە شەهیدەکە گوتبووی:

ناچارم لە رێی لاوکەوە دەنگی گریانم هەڵبێنم.

گەنج خەلیلی مێردی ژنە لاوکیەکە، گیانگۆریەکەی کەوتە سەردەمی قەدەغەکردنی گریان، ئەو ساڵەی بە فەرمانی بەغدا گریان بۆ مردووی دەرەوەی یاسا قەدەغە بوو، ئەو خەلیلەش لە پێشمەرگایەتی گیانی سپاردبوو، نەدەبوو کەس بۆی بگرییێ، بەلام ژنەکەی لە رێی گەنج خەلیلی لاوکەوە گەرەکی تێگەیاند لە چ شین و قورپێوانێکە بۆ گەنج خەلیلی مێردی.

گەنج خەلیل خۆشەویستی گەرەک بوو، چ ماڵ نەبوو نەواری کاوێزاغای نەبێ، شەوانی هاوین لە زۆر سەربانەوە لاوک لە لاوکی وەردەگرتەوە. ئەها (گەنج خەلیل) دەیداوە (دۆتمام) و دەچۆوە (داری شەکران) لەوێشەوە بۆ (کەلی کاشخانێ) و دەستی (میرپەنجۆ)ی دەگرت و دەیبردە سەر (کورد خایەنۆ)...

ئەز بە دوای لاوکەوە بووم، خودا مەریەم خان و پاشای تەنبوور و کاوێزاغا بگرێ، هێندەی نەمابوو وەرمگێرن! حەزمدەکرد مەولوودنامە و بانگدان و قورئان خوێندنیش بە شێوەی لاوک با، لە دلێ خۆ دەمگۆ:

ئەگەر دەروێش برایم بانگدانەکەی بە ئاوازی (یار جەوێ ) گوتبا، دەبوو چ هێزەیەکی بە دنیا کردبا !

وەختایەک لەبەر لاوکی من بابم کاتی حەیرانی نەما، دەیگوت:

کوڕم، نەوارەکە بێنە دەرێ، هی رەسووڵی حەیرانی بخە سەرێ، دەمێکە گوێم لێ نەبووە .

جگە لەو سێ لاوکبێژە، بەلایەکی دیش! بە یەک لاوکەوە پەیدا بوو.

## مشکۆ بە جەوێوە

چ لاوک، دەتگوت شاگردی کاوێزاغایە، ئەوجا خۆ هەو بوو، بەلام من درەنگ بەوەم زانی، ئەو دەنگە شاگردی دوو دەنگان بوو، یەکیان شەهابەی دەنگ داودی، ئەوی دی کاوێزاغای دەنگ رەوەندی، لەبیرمان بێت دەنگی رەوەندییش بە چەند تەلێ دەچێتەوە سەر دەنگی داودی، ئەو دەنگە لە جەوێ زۆر رەوەندییە، ئەو دەنگە کە (دێرێ- قەلاتی)یە، جەوێ وەها دەلێتەوە، کەس هەیە بیلێتەوە!

ئەز هەرگیز لەو جەوێیە تێر نابم، مەگەر لە پاش مەرگم، جەوێبێژم لە منداڵییەوە دەناسی، ناوەکەیم لە گوێ خۆش نەبوو، دەمگۆ: مشکۆ، مشکۆ! بەلام درەنگ زۆر درەنگ، دوای (لە پاش مەرگم) خدێم پێوەگرت و لە یەکتر نەدەبووینەوە. تۆ کەمەک گوێی لێ رادێرە، ئەگەر بە دلت نەبوو، چ دەلێی بلێ:

**بەلێ، جەوێ جەوێ جەوێ**
**ئاخ خخخ....جەوێ**
**بەلێ تو کارمامزی، بێ دین، لە پێش رەوێ**
**تو کارمامزی، بێ دین، لێ لێ، چاو لە خەوێ**
**جەوێ،**
**بەلێ شەرت و قەراری مێران ل من کەتبێ**
**بەلێ پاشی جەواهیرا قەت چ کەس نەوێ...**

شاگردی دەنگی رەوەندی و داودی، لە جەوێ کاوێزی و لە پاش مەرگم وەک دەیانگۆت شەهابەیی هەلکەوتبوو، بە دیار لە پاش مەرگمەوە، سەربردە زۆرن، سەربردەی سەر گۆڕەکە سەد جار بیگێڕمەوە، لێی تێر نابم.

گۆڕێکی گۆڕستانی سەید مارف لە چ گۆڕان ناچێ، نە لە هی سەید مارف خۆی، نە لە هی پیری سوارچاکان، نە لە هی جەمیل ڕەنجبەر، نە لە هی کەس، گۆڕێکە کێلەکەی لە زراقی و ڕێکی، شتێ لە بەژنی شەمی دێوانە دەچێ. بەلاشاوەییان دەزانن، سەردەمانێک هێندەی ژنە مجێورەکەی ئەوێ، من لەوێ بووم، ئەوێ، بن چێورمەکەی پێشی پێشەوە جێی دەورکردنەوەی من بوو، بۆیە کێل کێل شارەزای گۆڕستانی پیری سوارچاکانم، بیرتان نەچێ، دوای ئەوەی پیری سوارچاکانیش کێلبۆوە، من لای خۆمەوە ناوی سەید مارفم گۆڕیبووە سەر باپیرم!

کێ هەیە بۆ مردوویێک گریابێت و من نەمبیستبێت! کێ هەیە دەستی بەکێلێکەوە گرتبێت و من نەمدیتبێت، ژن هەیە شیوەنی کردبێت و بە تەنیشت منـدا تێنەپەڕیبێت، پیاو هەیە بە گۆرانییەوە هاتبێتە سەر گۆڕێک و گۆرانییەکەم ئەزبەرنەکردبێت. هەبوو بە حەسەن زیرەکەوە دەهات، ئەو نەوارەی بە گریانەوە و گریانیشی لەگەڵ تۆمارکراوە، زیرەک بۆ دوایی لێگەڕێ، با بە لارێی گێڕانەوەدا نەچم و زوو بگەمەوە کێلە شەمیەکە و لە پاش مەرگم.

زووە، ڕۆژ هێشتا لەو دیوی بانیەکانی کەسنەزانە و نادیارە، گزنگی خۆی نەداوەتەوە قەلات و منارە، من بە کتێبێکەوە لە ناو چێورمەی خۆمم و دەوردەکەمەوە، چۆڵ، گۆڕستانێک کێل و من بە تەنێ. لە هێکەوە لە گۆڕستانێ (لە پاش مەرگم) بەرزبۆوە، سامگرتی بووم، خودایە، ئەوە چ مردوویێکە گۆرانی دەڵێ! بە ناو کێلاندا چاوم گێڕا، دیتمەوە، ناسیمەوە، لە پەنای کێلە بەژن شەمیەکە، لە پاش مەرگم دیتەوە، ئەو پیاوەی لەوێوە ناوی بووە لە پاش مەرگم. لەوێ لە سەر چیچکان دانیشتبوو، دەنگی دابووە لە پاش مەرگم، ئەو پیاوەی پێش مەرگی ژنەکەی، کەس لە چاویەوە تەڕایی نەدیتبوو، بیستبووم:

به وردکردنی پیازی تیژی سووریش فرمێسک لە چاوی نەهاتۆتە خوارێ.

چاودەنێ، سوولاوکەی فرمێسک بە سەر گۆڕی ژنەکەیدا شوڕەی دێ.

تا ئەو ڕۆژە نەمزانیبوو، چاو جێی هێندە فرمێسکەی لێ دەبێتەوە، ئەو

پیاوه بەو سپێدەیە، بە قەد گەڕەکێک ژنی گیرینۆک، بە قەد هەورێکی تیری بارانی، فرمێسکی بە سەر گۆڕدا داباراند، گریانێکی وا گریا، مەگەر مەولەوی وا بۆ عەنبەر خاتوون گریابێ، منیش گریانم هات لە پەناوە و دوور لە چاوی لە پاش مەرگم، وردە رۆندکم بە سەر کتێبەکەی دەستمدا هەڵوەراند.

بیستبووم، گۆرانیی (لە پاش مەرگم) زادەی سەر گۆڕی ژنە، کاتی خۆی مشکۆ لە سەر گۆڕی ژنەکەی لە پاش مەرگمی بۆ هاتووە و شەهابە ئاسا تێیهەڵکردووە، لەو سپێدەیە و بە دیتن و بیستنی لە پاش مەرگم، گۆرانییەکە لە دڵێ من جێی شایان بە خۆی گرت، هەر کاتێ دەیبیستم، دەستم لە هەر شتێ بێت، رادەبم و دەگەمەوە بن کێلە بەژن شەمیەکە.

ئێ، لە پاش مەرگم، منی تەواو لە خۆی نزیککردبۆوە، نێوانمان لەوانەیە هەر پێنج شەش کێلێ بووبێت، بە فرمێسکەوە ئاوێتەی لە پاش مەرگی فرمێسکاوی بووبووم، دەست و رستەکەی لە پاشمەرگم نەبووبا، پێنەدەچوو وەها زوو گەڕابامەوە سەر باری خۆم:

ئۆباب، لۆ دەگریێ، ئەو گۆرە چیت دەبێتەوە؟!

ئۆی، من باوەشم بە کێلێکدا کردووە، چ بڵێم؟ خۆ ناڵێم ئەو گۆڕە ناناسم و گریانی من بۆ لەپاش مەرگم و تۆ و ژنی تۆیە! هیچم نەگوت، بەڵام پێدەچوو تێمگەیشتبێت، لەو رۆژەوە ئەو لەپاشمەرگمە بووە برادەرم و بەر لەوەی بچێتە سەر گۆڕی ژنەکەی و بە لەپاش مەرگم گۆڕستان بەئاگابهێنێتەوە، لای دەدایە ناو چێورمەکەی من و هەندێ قسەی بۆم دەکرد، لە ناو قسەکانی قسەیەک هەیە، مەگەر لە پاش مەرگم لەبیرمبچێتەوە:

ئۆباب، هەوڵدە کەست هێندە خۆشنەوێ بۆی بگریێ.

ئەو لە پاشمەرگەماڵیان نزیکی کۆشکی باکوور، بەری کۆماری بوو، لەو سەروبەندە قادسیە بەزۆر جلکی سەربازیی پێ لەبەرکرد و هێندەی نەبرد بووە دیلی کۆماری ئیسلامی. دوازدە سێزدە ساڵێ دوای سەربردەی بن کێلە شەمیەکە، لەپاشمەرگمم لە گۆڕستان دیتەوە، بەڵام حەیف، چەندی نیشانی خۆم بۆی هەڵدا نەیناسیمەوە، کێلە شەمیەکەش شکابوو، دەستی رۆژگار بشکێ.

## لیٚ لیٚ بیٚ مال

ئەو گۆڤارە چ ژمارەیەکی هێندە نەفرۆشراوە، دوو رۆژی نەبرد، دانەیەکی لە چ جیٚ نەما، هەبوو لە تەمەنی نەیخوێندبووە، هەبوو خوێندەواریشی نەبوو، دەتبینی وا بە دەستیەوە، من بە چاوی خۆم نەمدیتبا، باوەڕم نەدەکرد، ئەوەتا کەسیٚ کڕی، بەرگەکەی لیٚکردەوە، گۆڤارەکەی لە شوێنی خۆی بەجێهێشت.

گۆڤارەکە وا تیٚبگەم بەیان بوو، گەیشتە زۆر ماڵ، بەرگەکەی لە چێوە گیرا، لە ریزی گوگوش و کچی کافرۆش و ئەوانە بە دیوارەوە هەڵواسرا. گەیشتە چاوە گچکەکەی منیش، چاودەنە ئەوە نیگارە چ شۆڕەژنێکە، چەند شۆخ ونازدارە، دەڵێی مانگە، دوو چاوی گەشی ئەستێرەیی، خاڵیٚ بە سەر گۆنایەوە لە دوورەوە دەڵێی پیرۆزەی شینە، گەردن کێلی لێو کشتەکی، سینگی کتومت کوارگی کەمایە، لە جوانی چەندی پێیدا هەڵبڵێی هەر کەمە.

رەنگ و روخسار لەویٚ، ئەوەی زۆر کەسی دین و سەرگەردان کردووە، دەنگ و ئاوازیەتی، ئەو چریکەیە زادەی چیە خودایە، ئەو چریکەیە لە هەموو چریکان جیایە، نە هی کەس لە هی وی، نە هی وی لە هی کەس دەچیٚ، چریکەیەکی زۆر ناوازەیە، هەر دەبیٚ ناوی بنێین ئایشە شانی.

ئایشە شان زۆر لەپڕ لە شێوەی پەڕجوو دەرکەوت، دنیای لە جوانی و چریکە گرت، کاتیٚ لە تەلەڤزیۆن دەردەکەوت، ورد و درشت هەست و خوستیان لە خۆ دەبڕی، هەناسەیان رادەگرت، تەنها دیتن و بیستن لە کار نەدەکەوتن.

ئەو ژنە ئامەدیە بە چریکەی ئایشە شانیەوە هات و بەری سۆرانیشی لە شێوەی بەری بادینان مەست و حەیران کرد، کەم کەس بەجوانی لە پەیڤی

زاری هەنگوینیی وی تێدەگەیشتن، بەلام لە ڕێی دەنگ و ئاوازیەوە تامیاندەکرد، ئەزبەریان دەکردن و کێ هەبوو لە بەر خۆیەوە ئەو نەلێتەوە:

**ئەمان نەمان کۆچەرێ**

**هەی واخ دایێ، لێ قەدەرێ**

**غەریبم دایێ**

**بابۆ ناستینم، زەری حەیران، لێ لێ بی مال...**

دە تۆ کەمێ گوێی بۆ رادێرە، بزانە بۆ گەیشتن بەو زۆزانە، بە مەرگی خۆت ناچیتە پێش!

**زەری حەیران**

**کچکێ دگۆ:**

**لۆ لۆ لاوکۆ، ناڤێ من عەیشانە**

**چاڤێ من رەشن...**

**سینگێ من زۆزانە**

**.......**

**زەری حەیران**

**ئەزێ بمرم ل دنیایێ**

**خەلکی دبێن: تو سەبەبی...**

ئەدی بێ مال! ئەوە، ئەوە منی مەست و سەرگردان کردبوو، شەو هەبووە بیست سی جار ئەو لاوکەم هەلکردۆتەوە، لێی تێر نەدەبووم، نەدەبووم، مالتە، وەکی تێیهەلدەکردە:

**لێ لێ بێ مال، لێ لێ بێ مال**

**زالمێ ئەزێ بێ مال نەبووم**

**تە سالێ ئی سالێ مالێ من شەوتاند**

حەفت مالت هەبا، بێ مال دەمایەوە، چ بێ مالێ لە بێ مالیی ئەو دەنگە چیاییە، ئەو دەنگە باکووریە، ئەو دەنگە ئامەدیە، بێ مالتر نەبوو، هەرچی بێ

مـاڵە لەو چـرکە ژنە داودیە مـاڵی خـۆی دەدیـتەوە و لەگەڵ وی بـێ مـاڵی خۆی دەگۆتەوە.

ئیدی ئایشەشان و مریەم خان دوو دەنگی ژنانەی دڵنشینی منن.

## لەدەستمدێ

کەس نیە پیاوە ئاسمانیەکە نەناسێ، ئەوەی بۆ من نەکەوتە وێنەیەکی گیراوەوە، زۆرکەسیش وەک من بە دیار (شەونامە...)ی شاعیرەکەوە شەونخوونی کردووە، بەڵام بە بیستنی (لە دەستمدێ)، دەنگبێژە ئاسمانیەکە پتر هەڵکشا، شاعیرە تینووەکەش پتر تینووی بێداریی کردم و بە من با شەو شووشەی شەراب با و زارم لە سەر هەڵنەگرتبا، یان فازیل ڕێحانە گۆتەنی: خێلەکیانە بینی پێوەنێی!

هەبوو دەیگۆ:

لە دەستمدێ بە شیعر و گۆرانییەوە خێلەکتیە، ئەوەی تینووی خوێندنەوە و بیستنیشی بێت، خێلەکیتە.

من لە ریزی ئەو خێلەکیتانە بووم، من وەکوو شیعر و دەنگ، وەکوو تیلمێک لە جوانیی (لە دەستمدێ)م دەدی، بە من چی، چی دەڵێ! روونتر بڵێم چی گۆتنەکەشم لە چێوەی جواناسیدا دەدیتەوە. ئیدی ئەو رۆژەی نەواری (لە دەستمدێ)ی دەنگە ئاسمانیەکەم دەستکەوت و دەنگمدایێ، لە دەستمهاتبا، لە گەرەکم دەگێڕایەوە، گێڕانەوە بۆ بیستنی لە دەستمدێ. لە دوای ئەوەش، لە ناو دەلاقەی کتێبان، جێی شەونامەکەم گۆڕی و چووە سەرتر و بەرچاوتر.

ئێستا بە نیازی ماڵاوایی، سەرێ لە ئازادی دەدەمەوە، بەڵام فەرهادی دەنگ شەهابەیی و سەمەرقەندیشم لە پێشە.

## فەرهادی دەنگ شەهابەیی

ڕێم کەوتە سەرە کۆلانێکی تەنگەبەری بەستەپیازە، بەستەپیازە ئەو گەڕەکە لاچەپەی شارە، ناوەکەشی هەر دەبێ لە پیازەوە هاتبێ. دەگێڕنەوە:

بەر لەوەی ببێتە گەڕەک، سێ چوار ماڵێ لەو دەو بەستە ناودێرنەکراوە، لەو چۆلەوانیە، لە ناو کەوێڵ و کەپر دۆمانە و خۆمانە دەژیان. لەو سەروبەندە، لافاوێکی بەهاری هەڵدەستێ، نازانم لە کوێوە دنیایێ پیاز لەگەڵ خۆی دەهێنێ، ئەو ناوە بن پیاز دەکەوێ. زۆر نابات، ئەو دەو بەستە لە تەرەپیاز کەسک دەچێتەوە، لە هەینێوە گەڕەک بە بەستەپیازە دەکەوێتە سەر زاری شار.

بەر لە هاتن و شینبوونی پیاز، دەو بەستەکە جێ جێ، قانگ قانگ رەشەڕێحانە و پوونگەی لە دوورەوە پێشانی هاموشۆکەرانی دەدا، لە دەمی هەڵکردنی با، بۆنیان ڕۆژە رێیێ دەڕۆیی، ئەو ناساندنەی گەڕەک هەر بۆ ئەوە بوو بڵێم:

ئەو فەرهادەی سەرباسە، رسکاوی کەلێنی چڵە رێحانە و پوونگەی گەڕەکی پەستە پیازەیە، رەنگبێ هەر لەبەر هەندێش بێ، کاتێ دەچریکێنێ، هەستدەکەیت لە زاریەوە بۆنی رێحانە و پوونگە دێ.

ئێ، بڵێمە گوهدار و خوێنەری سەربردان، ڕێم کەوتە سەرە کۆلانێکی بەستەپیازە، گوێم لە گریانە، وا دیارە پرسە و شینە. پێم هەڵێنا، ویستم توند هەردوو گوێی خۆم بگرم، ئاخر من بەرگەی گریانی ژن ناگرم، بەڵام زایەڵەیێ پێی بەستم و دەستم بە خۆمدا شۆڕبۆوە، ئەوە چیە خودایە! مریەم خانی چی، عەیشە شانی چی، گوگوش و ماجیدە رۆمی چی! ئەو ژنە کێیە سەردولکان دەڵێ؟ ئەوە چیە ئەو دەنگە، نیە، دەنگ نیە لەو رەنگە، لە هەینێوە تا هەوکە دەنگێکم نەبیست بگاتە ئەو دەنگە، کاتێ هەڵیکردە سەردولکان،

گریان نەما، ماڵ وکۆلان هەناسەیان لە خۆیان بڕی، من لە شوێنی خۆم وەک بلێی شینبووبم، لە شێوەی بت راوەستام و نەجوولام، نایەتەوە بیرم چەند بە بتی مامەوە و چۆن رێی بەجێهێشتنی ئەوێم داگرت، ئەوێی زایەڵەی ژنێک کە هەر ئەو جارە بیستم و ئیدی نە لە خۆی نە کەس نەمبیستەوە.

درەنگتر پێکەوتم، ئەو ژنەی بە دەنگی ئەفسووناوی، بە سەردولکان، منی بەینێ لە سەرە کۆلانێکی بەستەپیازە شینکردەوە و کردە بت، ناوێکی وێنەی حەلیمای هەیە، خوشکی ئەو فەرهادەیە کە بە بەستە و هەستانی، چەندانی حەیران و سەرگەردان کردووە.

ئێ لە خوشک گەڕێ، برا سەرباسە، ئەز پێشتریێ ئەو کوڕەم لە رێوبانان زۆر دیتبوو، سووکە چاکوچۆنیشمان هەبوو. گەڕەکێ مە، کەوتبووە سەر رێی ماڵە خالوانی وی، هەر جارێ دەچووە سەردانی وان، رێی چوون و گەڕانەوەی ئەو بەری ماڵێ مە بوو، بەلام چ بزانم برای ئەو کچە سەردولکەبێژە دەنگ جادوویيە دڵنشینەیە، چ بزانم خۆشی دەنگێکی هەیە داودی، رەوەندی، شەهابەیی، حەمەد مەستانی هەمیشە مەستی خۆمان کە پێدەچوو بە منداڵی، چریکەی شەهابەی بیستبێ، دەگێڕنەوە:

لە دانیشتنێ گوێی لە چریکەی فەرهاد دەبێ، لەوێ دەڵێ: ئەو کوڕێژگە شیرینە، بە هەوک دەچێتەوە سەر شەهابە.

پاشترێ، لە چەند زارێکم بیستەوە، ئەو کوڕێژگە شیرینە، ستران دەچڕێ و لە حەسەن زیرەک دەچێ.

رەنگبێ ئەو (زیرەک)ش لە شێوەی زیرەکەکەی حەسەن زیرەک، خەڵک پێیبەخشیبێ، نەک خۆی بە خۆیەوە نووساندبێ، هەرچۆنێ بێ، شار فەرهاد زیرەکێکی هەیە، من تا هەوکە –هەوکەی هەینێ- چریکەی ویم نەبیستووە، بیستنیشی ئاسان نیە، چ نەواری پڕنەکردۆتەوە، ئەگەر هەشبێ، دەستاودەستی نەکردووە و بلاو نەبۆتەوە. دەڵێن: لە دانیشتنی زۆر تایبەت نەبێ، ناڵێ، ئەگەر دڵی لە سەر نەبێ، گوڕاحی گۆرانیی خۆش نەبێ، دنیا هەستێ، کەس کەرتکە دەنگێکی لێ نابیستێ، لە سەری بدەی، زار ناکاتەوە.

دەڵێن: زۆریش بەوە تێکدەچێ، کە دەبیستێتەوە، هەندێ کەس بە چاوەش

ناوی دێنن...

دواتــر بیســتمەوە: خزمێکیــان لە مشــتومڕ و دەمەقرێیەکــدا، دەڵێــتە خوشکەکەی:

ئێوە فەرهادتان هەیە، ئێمەش فەرهاد، فەرهـادی ئێمە، بوێر و تفەنگچی، فەرهادی ئێوەش چاوەش.

خوشکیش وا باگۆی دەداتەوە:

وایە، فەرهادی ئێمە ئەویندار و هونەرمەندە، هی ئێوەش چەتە و جەردە.

ئێ، منیش لەوەتەی دەنگ و سەردولکەی خوشکم بیستووە، ئەگەر هی براکەی نەبیستم، لەزگە بە زگ بدەم، باشبوو، باش هات، ئەو ئێوارەیە، بەو دەنگە شـەهابەییە سەرمەست دەبم، وێکڕا، ئێوەش دەگەڵ من گوێڕادێرن، بزانن ئەوانەی پێیاندا هەلگۆ، راستیان گۆ، یان درۆ.

ئەو کـوڕەی نـاوی لوقمـان بـوو، بەلام لە سۆنگەی برنۆکەی بـابیەوە بە کوڕی برنۆ گازمان دەکرد، سەر لە ئێوارەیەکی سەرپەرەیی، گوتی:

ئەو دەنگەی تاسەی بیستنی دەکەی، دەتەوێ بیبیستی؟

هەر دەبێ گوتبێتم: توخدا ئەوە پرسیاری دەوێ؟!

ماڵێکی گۆت، لەبیرم نەماوە چ ماڵێ بوو، لە کۆلانی ماڵی پلکە بەندبێژ، لەو سەری، گوتی:

ئێوارێ لەوێ مێوانە.

گوتم: تۆ بلێی گۆرانی بلێ؟

گوتی: ئا، رەنگبێ، پێکەوە دەچین.

کوڕی برنۆ ماڵەکەی باش دەناسی و چووین، هۆدە سەرشارە، کەسێکی دی نـاگرێ، تەواوێ دانیشـتین، کـوڕەی لە قسـان دەنـگ شــەهابەیی، بـرای کچەی گۆرین، دەڵێی مقەبایە، ورتەی لێوە نایە، سەری خۆی شۆڕکردۆتەوە، وێدەچێ شـەرم دایگرتبێ، ئا لە رەنگوڕووی دیارە، زۆر رووتەنکە، لە دڵێ خۆ دەڵێم:

بەرد بێتە گۆ، ئەو کوڕە بە شەرم داکەوتووە، لێو لێک ناکاتەوە، دانیشتن بەلاشە، بڕۆم باشە.

کوڕی بڕنۆ پێدەچوو لە چاومەوە دڵمی خوێندبێتەوە، بە چپە گوتی:
مەبزوو، بزانین چ دەبێ.
سەیرە، ژاوە ژاوە، کەس سەری قسەی بە لای سترانا نابات، کەس زاخ ناکات بڵێ:
فەرهاد، بەستەیێ، هەستانێ...
وا دیارە، ئەوەی بیستبووم راستە، تا دڵی نەخوازێ، زاری سترانی نابێتەوە.
کوڕی بڕنۆش لە جوولە دەست و شانیڕا دیارە، بێزارە، وا تێبگەم دەیویست بڵێ:
با بڕۆین...
چ (ئەمان، نەما...)یێ بەرزبۆوە و هۆدە هەناسەی لە خۆی بڕی، حەسەن زیرەک لەوێ با، دوورنەبوو بڵێ:
کوڕە، ئەوە تۆ گەرووی منت دزیوە!
چ هەستانێ هەستا! چ زیرەکانە هەستا:
((ئەمان نەمان، لەیلم ...های لەی...))
وەرن یاران، لەو ئێوارە پاییزییە بە گوێی من گوێ بدەنە چریکەیێ، قاسپەیێ، خوێندنێکی وەها، ئاسمان و دارستان و کۆسار و زێ، لە هیچ قورینگ و کەو و بلبل و تیتلەکناچەیەکیان نەبیستووە، ئەو دەنگەی ئەز لەو ئێوارە پایزیە بیستم، دەتگۆ یەکەم بارانە، یەکەم ژوان و راموسانە، یەکەم گەشت و رامانە، چ بوو ئەو دەنگە ئەفسانەییە!
بە دیار ئەو هەستانبێژەوە لەگەڵ هەر هەستانێکی هەستمدەکرد وا لە دیداری حەسەن زیرەکم، لەوێوە دەگەیشتمە پیاوە ئاسمانیەکە، مەبەستم خارە تایەری خۆمانە، لەگەڵ هەستانێکی دی حەیدەر بەقاڵ دەهاتە بەر دەمم، ئەوەتا سەید عەلی ئەسغەری کوردستانیش گەیشت... ئەرێ ئەو کوڕەی ئەو ئێوارە، ئەو شەوە پایزیەی لە هەستان گرت، پڕ چریکەی کرد، کام لەو هەستانبێژانە بوو! تۆ بڵێی تێکەڵەیێ بووبێت لە هەموو ئەوانە! یان شەهابەیێ؟

پێموایە کەسیان نەبوو، خۆی بوو، لە کەس نەدەچوو، فەرهاد بوو.

لەو شەوە بە بەستە و هەستان مەستە، بە شێوەیێ مەست و سەرگەردان بووبووین، کەس لە جێی خۆی هەڵنەدەستا، فەرهاد گەیشتبۆوە ماڵێش، ئێمە هەر لەوێ دانیشتبووین، کەس ڕێی ماڵێی دانەدەگرت.

هێ لە دەنگی، من زۆر سەرسام بووم بەکەسایەتی، سادەیی و شەرمنی و بێفیزی...

لە هەستاندا، کەسێ گوتی:

ئەو کوڕە بەو دەنگە قورئان بخوێنێ، شەیتانیش شادە دەهێنێ.

ئیدی من لە کن برادەران کەوتمە پێدا هەڵگۆتنی ئەو دەنگەی لە هی کەس نەدەچوو، هەبوو دەیگۆ:

ڕەنگبێ دەنگی خۆش بێ، بەڵام بەو ڕەنگەش نا کە تۆ دەڵێی، ڕوو بە ڕوو گوێت لە دەنگی بووە، بۆیە وا کاری تێکردوویت، ئەگەر لە نەوارەوە یان رادیۆوە بیبیستی، لەگینە وا نەبێ.

جا خۆ ئەو قسەیەش ڕێی تێدەچێ، با نەوارێکی پەیدا بکەم، بزانم داخوا...

بەر لە بیستنی بەستە و هەستانی سەر نەوار، دیدارێ هەیە، بە سێ چوار دێرێ نەیگێڕمەوە، دڵم ئاو ناخواتەوە.

ئەو دیدارە ناوازە ئاودارە، سەرچیخ نەچووبم، کەوتە کۆڵانی پشت ماڵی مام دێوانە، ئەو دیوانەیەی خۆی بەزوڕنا و کورەکەی بە ساز، سەیداوەیان کردبووە گەڕەکی بەزم و ئاواز، هەر کێ هێندەی ژێیێ سوزی سترانی لە دڵ با، حەزیدەکرد هەمنشینی ئەو گەڕەکە و کۆڵانی ماڵی مام دێوانە با، ئەو ماڵەی پاشای تەنبوور، خاوەنی (خەزاڵ خەزاڵ و یار گوڵێ...) دەڵێم، زۆر دەهاتە ماڵیان و گەڕەکی لە لاوک دەگرت.

ئێ، دیداری ئەو جارەمان کەوتە وێرێ، ئەو دیدارە مینا دیداری بەرێ، دڵکێش و لە چێژ سەرڕێژ بوو، ئەو فەرهادە، فەرهادی دەنگ شەهابەیی سوێند بە هەرچی پیرۆزی هەیە بخۆیت، بە هەستانی هەوکی ویشەوە، سوێندت لێناکەوێ کە پلکە کافیەی دایکی بۆ هەستانبێژی هێناویەتیە دنیا و شیری هەستانی داوەتێ، من لەو دانیشتنەی ئەوێ، ئەوەی پێشتری

بیستبووم و گاڵتەم پێدەهات، هێندەی نەمابوو باوەڕبهێنم کە شتێ راستیی تێدایە، بیستبووم:

فەرهاد کە هەڵدەستێ و بە هەندێ کۆپلەی جەرگبڕ، هەستان لە هەستان گرێدەداتەوە، تۆ لە جێی خۆتەوە حاڵت دێتێ، چەقۆت لە بەرکێ بێ، سینگت دوو سێ برینی تێکەوتووە و خوێن چۆڕاوگەی بەستووە و هەستیش پێناکەیت.

چەقۆ و کەتەر لەوێ، لێگەڕێ، با بزانین بەهۆی چیەوە، من دواتر ناوم لەو دەنگە نا، دەنگ شەهابەیی؟ ئەز زۆر گوێم لە هەستانبێژان رادەگرت، هەر لە سێوەوە بگرە تا دەگاتەوە ماملێ، ئەو فەرهادە نەدەچۆوە سەر هیچیان، لە مەڕ شەهابەش لە زۆرانم بیستبوو کە دەنگێکی هەبووە، داود ئیرەیی پێبردووە، ئەو دەنگەش تۆمار نەکراوە و ونـدابووە، حەمەد مەستانیش ئەو فەرهادەی گەیاندبۆوە شەهابە، لە سەر هەندێ لە جێیە ئەگەر نازناوی دەنگ شەهابەیی پێببەخشین، خۆ لە باتی شەهابەیی ئەگەر بلێین فەرهادی، ئەویش لە جێیە.

باشە، لەوەش گەڕێ، ئێستا گوێ بۆ نەوارێکی رادەدێرین، ئەوەتا، نەوارێکی ئەو فەرهادە بە کەلەش وردیلە و بە دەنگ تا کەشکەڵانی فەلەک کەڵەگەت، بە دەستمەوە، هەڵە نەبم کوڕە خاڵەکەی بۆی هێنام، ئەو خاڵەی لە هیچوخۆڕا بووە بەلاگێڕی خێڵگەری، ئەو خێڵەی سەردەمانێ بەشێکی شاری بە دەستەوە بوو. ئەو کوڕە ماڵیان لەو بەری ماڵێ مە بوو، بەردهاوێژێ کەمێ پتر دوور بوو، ئێستا نەوارەکە دەخەمە سەر دەنگگرەکە و پێکەوە گوێی دەدەینێ، بزانین کەتەر و چەقۆ دەهێنێ؟!

نـا، پەلە مەکەن، شتێ هەیە، ب لەز دەیگێڕمەوە، هەینێ دوگمەی دەنگگرەکە دادەگرین و بە دڵی خۆمان گوێی لێ رادەگرین.

ئەمن بەو دوو سێ جار دانیشتنە لە کۆڕی ئەو ئەو کوڕە وردیلە شەرمنە شیرنە، دواتریش دەمبیستەوە، لە دیداری بەزم و هەستاندا حەزیدەکرد ئەو کەسانە خڕبنەوە کە سادە و لات و نەبوون، نەیدەویست بچێتە کۆڕی خواپێداو و ترزلان، ئەوەش وای کردبوو، خۆشەویستتر بێ و پتر بکەوێتە

بەر دڵان، کوڕانی گەڕەک، گەڕەکی قوڕ و میللی خووی پێوە بگرن و لە دەوری خڕ ببنەوە.

خۆ خدێگرتن بە دەنگیەوە هەر زۆر ترسناک بوو، من کەمێ پاشتر تێگەیشتم کە دەنگی ئەو فەرهادە لە دەنگی چ دەنگبێژێ ناچێ، بۆ هەندێکان کتومت جغارەیە، فێری بی، وازهێنانی ئەستەمە. بۆ هەندێکان بادەیە، فێری بی، هەر کاتێ وادەی هات، ناچاری پێک چێکەی. بۆ هەندێکان رەنگبێ لە شیوەی تریاک بێ، لە پێناویدا پەنا بۆ هەموو شتێ ببەی. بۆ هەندێکش ئەوین و ژوان بوو، بێ وی، ژیان بەهای پووشکەیەکی نەدەما.

من لە ترسی هەندێ، لە ترسی خدێ پێوەگرتن، هەوڵمدا تەواوێ لێی دوورکەومەوە و جارناجارێ گوێی بۆ شلکەم و لەگەڵیدا لە پێکەوە بە ناو دووکەڵی جگەرەدا باڵ بگرم و بە خەیاڵ بگەمە جێژوانێ.

دەی، ئەوە دوگمەی دەنگی فەرهادی دەنگ شەهابەییم داگرت، داخوا ئەو دەنگەیە کە من لەو دوو سێ دیدارەی وی بیستم، یان...؟!

## سەمەرقەند

## قۆریات، شاعیری بازاڕی فەلەک

بەر لەوەی مـــاڵاوایی لە ئـــازادی بـــکەم، ســـەرێ لە ســـەمەرقەند دەدەم، سەمەرقەندی شەهرزاد، لە مزگەفتەوە بۆ سەمەرقەند! بیرتان بێتەوە، کۆچی کەویار فێرە مزگەفتیشی کردبووم، لە سەر بەرماڵ دەکەوتمە نزا:

خودایە، بیگێڕەوە، ژیان بێ وی مردنە.

نەیگەڕاندەوە، منیش ئۆقرەم نەما و نوێژم هێلا.

ئێ، ئەرێ چ وەرزێ بوو؟ باڵداریش باران دەناسێتەوە، کەچی مەست کەم جـار دەیناسـیتەوە، لێـی تێکدەچێ سـەر بە چ وەرزێکە، وێدەچێ ئەوەش بە هۆی فڕینەوە بێ، ئاخر مەستان گوتەنی:

زۆر جار مەست لە باڵدار جوانتر باڵ لێکدەدا و بەرزتر دەفڕێ.

منیش ئەو بارانە ناناسمەوە کە دەیدا لە جامی سەمەرقەندێ، ئەو جامەی لە دیوی ژۆرێ روون و لە دیوێ دەرێ مەیلە و تار. بۆیە سەردانی یەکەمـی سەمەرقەند نایەتەوە یادم، داخوا کەوتە بن بارانی بەهاری، یاخود پایزی.

ئەوەتام روو لە باران، بە دیار شەهرزادەوە، دڵە دەڵێ:

چ پێناچێ، تۆ جاری یەکەمت بێ.

پێنەدەچـوو! تـۆ بڵێـی لە شـێوەی ئەزموونـداری دەسـتم لە ملـی شـەهرزاد کردبێ، وێنەی پیرەکەی بن جامەکە لە جامم کردبێ، مینا مەستانیش بۆ لێوم بردبێ؟ وێدەچێ وام کردبێ، نەرم شەهرزادم گرت و لە گۆزە ناسکتر لارم کردەوە، نەمهێشت نە قوڵپە بدات، نە کەفێ بکات. هەوکە شـەهرزاد وا لە نـاو پەرداخێ خۆی دەنوێنێ، پەرداخێکی روون، مینا گەردنی ئەو کچانەی وا لەو دیوی مینای سەمەرقەندەوە دەبینم نمەی بـاران بە سـەر پرچ و پەرچەمیانـدا دێتە خوارێ.

وای، شـــەهرزاد چ رەنـگە؟ زوو بیـرمکەوتەوە لە رەنگـی ئەو شـرووبەی

سەر سینیە کە کەویار بەر لە هەمووان دەستی بۆ دەبرد و بە سەری پەنجەی دۆشاومژەی دەگەڵ ئاردەکە تێکەڵیدەکرد.

بە شەرم و ترسەوە لێوم بە شەهرزادەوە نا، کەمێ تاڵە، بەڵام تاڵییەکەی لەو لێوە دەچوو کە لە ترسی ماچ بە گووژارک نا، بە کووزە ئارووی تاڵ تەڕی کردبێت، دوای سەمەرقەند سەربردەی لێو و گووژارکم وەبیربێننەوە. ئێ، بە دیار شووشە و مینا و باران و کچانی بەر بارانەوە، شەهرزادم هەڵدا، لە شەهرزادی دووەم، قۆریات، قۆریات، لە سەمەرقەندەوە چ قۆریاتێ هات! پیری بن جامی هێنایە گۆ:

لۆت بمرم، بەقاڵی قۆریات، بەقاڵی قەلات.

بەقاڵی قۆریات ؟! ئەها، مەبەستی حەیدەر بەقاڵە! ئەو دەنگبێژەی دوای قۆریات و ئامان کوردستان، دەیگۆ:

**ئەو دەستەم ببڕن، ئەم دەستەم پێوە**

**من دەست هەڵناگرم لەو شەکرە سێوە**

هەوە، ئەوە حەیدەرە دەچریکێنێ، ئەز پێشتری، پێش سەردانی سەمەرقەندێ، هێندەی تنۆکێ شەهرزاد چێژم لە قۆریات وەرنەدەگرت، بەڵام لەو سەردانەوە، لەو وەرزەی بارین و مەستیەوە، لە دەنگی بەقاڵی قۆریاتەوە، قۆریات هێندەی نەمابوو بێتە ریزی حەیران و لاوکەوە.

لە سەمەرقەندێ و بە دیار شەهرزاد و باران و لەنجەولاری کچانی ئەودیوی مینا و خەیاڵەوە، حەیدەر بەقاڵ چ دەنگێکی هەبوو، ئەگەر شەهرزادێکی دیم گازکردبا، دوورنەبوو بگاتە پیاوە ئاسمانیەکە، خۆ لە گوێی من لە هەندێ هەستاندا ئەو دووە هێندەی شووشە و پێک لێکدی نزیکدەبنەوە، نازانم چ مۆزیکناسێ بوو، دەیگۆ:

خارە تایەر و بەقاڵ، لە فێرگەی قەلاتێ لە سێبەری شەهابە یەکدەگرنەوە.

ئێ، بڵێمە موریدانی دەنگی داودی، لە سەر دەرگەی سەمەرقەندێ، لە هاتنەدەرێ، تیچاوێکم کەوتەوە سەر پیری ناو شەهرزادان، ئای! کوڕە ئەوە کێیە، هەوە؟ هەو بوو، قورئانخوێنەکەی چراخە، من ئەو پیاوەم چەند جارێ، قورئان بە دەستەوە و بە دیار گۆڕ و کێلەوە دیتووە، لێرەش وا بە دیار

شەهرزادەوە، پێک بە دەستەوە. لە چراخێ کورتەک و شەرواڵی خاکی لەبەر بوو، چەفیەکی سپی لە کفن سپیتری لە سەر بوو، چاویلکەیەکی گچکەی روونیش لە چاو. لێرەش، لە سەمەرقەندێ، چاکەت و پانتۆڕ، کڵاوی شاریانە، بێ چاویلکە، بەڵام دەیناسمەوە، بە خاڵی لاچاوی و زۆر شت دەیناسمەوە، لە دڵێ خۆ گۆتم، داخوا لەسەرچی وازی لە چراخ و قورئان هێناوە و پەنای بۆ سەمەرقەند هێناوە؟

پرسیارم لە دڵێ خۆم هەڵگرت، رۆژەکی بە دوای پرسیاری دڵ رێم کەوتەوە چراخ، دیتمەوە، پیری سەمەرقەندم بە قورئانەوە لە چراخ دیتەوە، بەو دۆزینەوەیە، نازانم بۆ کەوتمە بارێکی ئاڵۆزەوە، لە خۆم دەپرسی:

قورئانخوێنی و بادەنۆشی لە کوێ تێکدەکەنەوە؟

بەرە بەرە هاتمەوە سەرەخۆ و گوتم:

لەگوینە ئەو پیاوە ئایەتێکی وای دیتبێتەوە کە بادە خواردنەوە و قورئان خوێندنەوە، لە تەنیشت یەک جێبکاتەوە.

ئێ، دەگەڕێمەوە پێش دەرگای سەمەرقەندێ، دەستی راستمان گرت و بە بن نمەی بارانێ رووە و قەلاتێ هاتین، لە بەر دەم کتێبخانە شەپرێوەکە، ئەوەی کتێبەکان هەموو بە سەر یەکەوە بوون و دەتگوت هەر ئێستا، قەلابە هەڵیرێژاوە، کەوتمە نێوان دوو ژنی تا دەست هەڵبڕی کەڵەگەت، پێدەچوو داک و کیژ بن، لە زاری دایکەوە، جوێنێکی مزرم بۆ هات، هۆیێکم لە خۆم زانی، چم بە خۆم شک نایێ، راوەستام و ویستم شتێ بڵێم، دڵە پیلمی گرت:

+ وازبێنە، بڕۆ.

- من هیچم نەکرد، خۆ...

+ دەزانم.

توومەز بە لادا هاتبووم و شانم بە شانی کیژۆڵە کەوتبوو.

ئێ، جوێنەکە لە جێی خۆی، با مەستیم نەشکێنێ و لە پیاسەی بن بارانێ نەبم، هاتین، هاتین، بە پەیژەی (باکوور)دا هەڵگەڕاین، روو لە قەیسەری، چایەکی شیرن و بەرەنگم بە سەردا کرد، بەڵام لە خەیاڵ و لای دەنگی حەیدەر بەقاڵ مامەوە و درەنگ هاتمەوە.

بۆ چریکەی حەیدەر بەقاڵ، ئەز قەرداری شەهرزادی سەمەرقەندم، شەهرزاد ناساندی و شیرنی کرد، خۆزی زووتر، پێش مردنی دەچوومە سەمەرقەندێ.

بە چاوی خۆم دارەبازەکەیم دیت، لە سەر دەستان بە ناو وەرزێکی تووشدا ئاودیوی ئەودیوی دیواری گۆڕستانی گەورەیان کرد، دیتم نیوە شارێک خەڵک بە دوایەوە بوون، چەند پیرەمێردێ لە ژن ناسکتر بۆکۆچی حەیدەر دەگریان، ئەگەر کۆچەکە کەوتبایەتە دوای سەمەرقەند و دوای بیستنی هەندێ سەربردەی وی، دوور نەبوو منیشی گریاندبا.

سەربردەی حەیدەر، هەر ئەفەندییە کەڵەگەتەکەی چاخانەی عەبۆ بیگێڕێتەوە، لە ناوان بە ناو نەکەوتبم و تێکەڵوپێکەڵم نەکردبن، ئەحمەدی ناو بوو، ئەوەی لە مێزی لای پەنجەرە، دیوی تاجریان، نزیک دامەچیەکان دادەنیشت، حەیدەر بەقاڵ لە زاری ئەوەوە، دەبووە حەلوای بە شەکر:

حەیدەر دڵی شتێکی نەگرتبا، حوکمەت بڕیارێکی ناجێی دەرکردبا، یان هەواڵێکی ناخۆشی بیستبا، بە پرتاو خۆی دەگەیاندە سەری قەڵاتێ، روو لە منارە، دەستی دەخستە بن گوێ و تێیهەڵدەکردە:

ئامان، هەی کوردستانێ...

لە سەر ئەو ئامانە، چەند جارێ هۆشیاریان کردەوە، بەڵام کەڵکی نەبوو، حەیدەر بەقاڵ وێنەی تایەر تۆفیق لامل بوو، ئەو دەسبەرداری شیرین بەهارە و ئەم دەسبەرداری هەی کوردستانێ نەدەبوون.

ئەفەندیی جێ لە عەبۆ، فڕی شیرن شیرنی لە چای شیرن دەدا و لە شەکر شیرنتر زاری دەکردەوە:

حەیدەر، کوڕە کەچەڵەکەی هەولێرێ، لۆ کەس نا، لۆ دڵی خۆی و بە دڵی خۆی گۆرانی دەچڕی، دڵی نەیویستبا، دنیا هەستابا، زاری هەڵنەدەهێنا.

حەیدەرە کەچەڵ وابوو، نە کەس لەو، نە ئەو لە کەس دەچوو، نەیدەویست وەک سترانبێژ بکەوێتە سەر زاران، تا ئەو ساڵانەی دواییش نەیهێڵابوو، دەنگی بچێتە سەر نەواران، هێندەی هەیە، ئەویندارانی دەنگی وی، بە دزیەوە تۆماریانکردووە، ساڵانی زوو، ئەو دەمەی دەنگی دە قاتی

ئەوەی ئێوە بیستووتانە خۆش بوو، لە هەر دانیشتنێ، هەستیکردبا، نەواریان بۆ داناوەتەوە، پێوە نەدەبوو، لەپڕ قرِوقەپ، دەنگ لە بەردەوە هاتبا، لەو نەدەهات، سەد سوێندت دەخوارد، زمانی لە زاری نیە.

ئەفەندی، دەستی درێژی هەڵدەبرِی، روو لە سابیری چایەچی، بە جوولەی سەر پەنجەی دۆشاومژە، چا تێکوەردانی نیشاندەدا، هێشتا چای دووەم نەگەیشتبوو، ئەفەندیی کوشتەی چا و دوژمنی بابەکوشتەی جغارە، بە فووێکی درێژ، پانکەکەی بن ساپیتەش هێندە بایەی نەبوو، سەریشی لەگەڵ بادەدا، دووکەڵی سەر مێزی لە خۆ دووردەخستەوە، حەیدەری شیرنتر دەگێرِایەوە:

دوا هەستان و قۆریاتی حەیدەری دەنگ داودی بۆ هەولێرێ، کەوتە بن قوشتەپە، بیرتانە نەخۆشییەکی پیسی گرت، لۆ چارەسەر رێی بەغدا و دنیای گرتەبەر، ئەو رۆژەی چاوی لە هەولێرێ بزربوو، دیاربوو دڵی تریواندبووی، دوا کۆچە و دیداری قەڵات دەکەوێتە پەسڵان، بەئەسپایی دەست دەخاتە شەر شانی شوفێر:

بایی هەستانێ راوەستە.

شوفێر هێواش دەکاتەوە، دەداتە لارێ، حەیدەر دادەبەزێ، دەچێتە سەر بستیەکەی دەو جادە، پشت لە رووگە، روو لە قەڵاتێ، داودی، تۆ بڵێی شەهابەیی دەنگهەڵدەبرِێ، دوا گۆرانی بۆ شارەکەی دەچرِێ، بە چاوی پرِ گریانەوە سوار دەبێ، ئیدی کەس لە کۆرِی ئەگلەنجە و سەر قەڵاتێ نەیدیتەوە، کەس هەی کوردستان و قۆریاتی لێ نەبیستەوە.

سەربردەی حەیدەر بەقاڵ، لە رۆژە بارانـاویەکەی سەمەرقەند و شەهرزادی دوورخستمەوە، ئەرێ گەیشتبوومە کوێ؟ وا تێبگەم لەو جێیە بەجێمام کە چایەکی باکووریم بە سەردا کرد، بە ناو قەیسەریی مەیلە و چۆلدا مەستانە هاتم، سواری ریمی بەلاشاوە بووم، لە راست ماڵی ئاوتێکراوی حەمەد مەستان، کە دوو کۆلان لە خوار ماڵێ مە بوو، دەروێش برایم بانگی ئێوارەی دا، لەوێ دابەزیم، روو لە ماڵی مەستان تەواوێک راوەستام، دوور نیە گوتبێتم:

مام مەستان، لە کوێی؟ ئەوە منیش گەڕامەوە! هاتمە سەر ئایینی تۆ.

ئەو شەوە چ شەوێکی شیرن و ڕەنگین بوو، کەوتمە ناو ڕەزێ، ڕەزی ئامێزی کەویار، بەڵام نازانم بۆ ماچێکی لێویم نەکرد! بیرمە هەر لەو خەونە، لە ئامێزی کەویارەوە چوومە ناو ڕانی سستەرەکەی منداڵییش، بیرمبێتەوە، دوایی سستەرکە دەخەمە چەند رستەیەکەوە. پێشتریێ خەونی وام بە کەویارەوە نەدیتبوو، پتر بە خەونەکەوەش نەک شەهرزاد بە سەمەرقەندمەوە گرت، بە دیار شەهرزادەوە، بیرم لای خەونی شەوێ بوو، لەگەڵ هەر پێکێ نزام دەکرد لە خودا دەپاڕامەوە:

لە ناو خەونێ بۆم بێتەوە ناو نوێنێ.

بەڵام کوا، کەویار لە خەونێش دەڵێی بارەکەوە و بە من ناگیرێ.

ئێ، سەرێ لە سەمەرقەند دەدەمەوە و خەیامی هەولێریش دەبینم، لەگەڵ یووسفی خەونزان، یووسفی بەری کۆلانی مۆسکۆی سەیداوەم مەبەستە، نە هی کەنعان و میسرێ، ئەو کوڕە دوو سێ کەڕەتێ هێند بە دڵوداو خەونی بۆم لێکدایەوە، بۆیێ لەو سەرە کۆلانەی من بە خەونزان ناوی دێ.

لە سەمەرقەندێ دەهاتینە دەرێ، لە سەر دەرگا، بە لای ڕاستدا ئاوڕیدایەوە و ڕووی پرسیاری لە من:

+ ئەوە پیاوە دەناسی؟

- نایناسم.

+ ئەوە خەیامی هەولێرە.

- هەولێریش خەیامی هەیە؟!

خەیامی هەولێرم نەدەناسی، نەشمزانیبوو، ناوێ بەو ناوە هەبێ، بەڵام بیستبووم شاعیرێ هەیە، بە گۆتەی بادەنۆش و سەرمەستان بێ:

لە عەنکاوەوە بۆڕیی بادەی بۆ کەلاوەکەی خۆی ڕاکێشاوە، هێندەی شووشەکانی سەمەرقەندیش دێرە شیعری بە سەر بادە و مەستیدا هەڵداوە.

ئەها چ دەڵێ:

**بە عیلمی نەفس و کەف نادەم علوومی بادەنۆشی خۆم**

**هەموو عیلمی بەشەر لای من خولاسەی ئەلف و عەینێکە**

**لە جاهید وەرگرن دەرسی عولوومی دین و دونیاتان**
**مەڵێن: بێ دین و بێ فیکرە، کولاوی دەرسی عەشقێکە**

لە دەفتەرە شڕەکەی مەستانەوە چەند ڕستەیێ لە بارەی بۆڕیی بادەوە دەبیستین، هینگاوێ وێنەیەکی نیوە خەیاڵیی پێش مینای سەمەرقەندێ پیشاندەدەمەوە، حەمەد مەستان سەری بەسەر دەفتەرەوە:

لە دنیایێ یەک کەس هەس لە من مەستتر، ئەویش بورهانە، ئەو پیاوەی سەروەختایێ لە کەلاوە دەژیا، لە دارەتێ دنیایێ دوو شتی هەبوو: بادە و شیعر، بادەکەی لە عەنکاوەوە بە بۆڕیی ئاوێ بۆ دەهات، شیعریش لە بادەوە...

داخی گرانم، مەستانم نەدیتەوە، تا پەڕ پەڕ دەفتەری بادە و شیعر بخوێنێتەوە و بۆڕی بادەی پیشاندابایێ! دەی، چوون لە دوای چووان ڕستە و وێنە لە دەستچوونە، با بچینەوە دیار وێنەکەی بورهان جاهید، یان یووسفی خەونزان گۆتەنی خەیامێ هەولێرێ.

ئەنگۆ خۆ شووشەی بەژن زراڤی بادەتان دیوە، گچکەکەیان دەڵێم، ئەو ڕۆژە جاهید وا خۆی پیشانی من دا، من دەمگوت:

بەژنی وی لە شووشەی مل باریکی سەر تاقی سەمەرقەند دەچێ.

یووسفی خەونزان دەیگۆ:

تۆ باش بەرێ خۆت نەداوەتە نێرتکی گولەکی دەو ڕووباری بەستۆڕە، دەنا وات نەدەگۆ.

من دەمگۆ:

جاهید جگە لە شووشە بە چ چتێ ناچێ.

ئەو دەیگۆ:

من بە گولەکی دەبینم کە تا کەسک و تەڕە چ بەهارێک نایگاتێ، کاتێ وشکیش دەبێ، دەبێتە ئەو خەیامەی لە بەر چاوتە.

لە پێش سەمەرقەندێ بە دیار بورهان خەیامەوە، من بە شووشەیی و یووسف بە گولەکی ماینەوە، لەوە گەڕێ، هەوکە چەند دێرە هەنگوینیەکی ئەو پیاوە شووشەییە لە بەر خۆمانەوە دەڵێینەوە، هەنگینێ دوو قسە لە

یووسف دەکەم، ئۆجا دەگەڕێمەوە سەمەرقەندێ. چاودێ، قەد قەلات، دیوی سەمەرقەند بەو بەهارە چەند پنچکە تۆرکەی پێوەیە، من هێندە و پتریش ئەو دێرەی جاهیدم بۆ خۆم خوێندۆتەوە:

**خەیالاتی دڵی تەنگم لە دونیاما لە یەک پێکە**

**بفەرما، چاوەکەم ساقی، هەتا دەتوانی بۆم تێکە**

یووسفی خەونزانیش یەک دوو جارێ لێی وەرگرتمەوە:

**عەمامە و جوبەپۆشم دی نەیانتوانی بدەن فەتوا**

**بەڵام مەست و خەراباتی هەموو فتوایەکی رێکە**

ئەو وەک من نەبوو، دووبارەی نەبوو، ئاخر دیوانێک شیعری وی لەبەر بوو، هەر کوردی نا، تورکمانیش، دێرێکی گوت، بیکەینە کوردیێ نزیک لەوە دەردەچێ:

**لە هەولێرێ بە لادا دەهاتم، مەست مەست**

**لامدا مزگەفتێک و نوێژم بۆ خوا دابەست**

بوڕهان جاهید، یووسف گۆتەنی، خەیامی هەولێر، ناوێکی دیشی هەبوو. (شاعیری پشیلە)، بیرمنیە کیی لێینابوو.

حەمەد مەستان جاروبار بە مەستی و لەو دەمەی پشیلەیەک سەری کلکی لە رانی دەخشاند، پشیلەکەی جاهیدی بۆ پشیلەکە دەگوتەوە، هەینێ ئەز بەهای پشیلەکەم نەزانیبوو، ئەوەی دێری بەرایی ئەوهایە:

**پشیلەیەکی وەک بەشەر خولقاو**

**لێمان هاتە ژوور بە میاوە میاو**

(پشیلە) درێژە، لە میاوە میاوی پشیلەکەی سەر کۆشی مەستان درێژتر، لە دێری پێش دوماهی دەڵێ:

**ئەتۆ بۆ زگت وا پەرێشانی**

**ئیمشەو میوانی برات بوڕهانی**

ئەوجا ئەگەر سەربردەی پشیلە و بوڕهان بزانین، رەنگە پشیلەکە جوانتر خۆ پیشانبدات و میاوە میاویشی ناسکتر بێتە گوێ:

لە سەروبەندی بزاڤی سێیەمی دەڤەری بارزانێ، جاهیدیش دەخرێتە

زیندانی، له هۆدەکی دەکەویتە تەنیشت سێ چوار ئاغا، حەمەداغای مێرگەسۆریشیان دەگەڵ دەبێ، له سەر نانخواردنێ، پشیلەیەک له کەلێنی شیشەوە، به میاوە میاو و کلک بادانێ لێیان وەژۆر دەکەوێ، نازانم کیهە ئاغایە دەڵێ:

بورهان، ئەڤە میهڤانێ تەیە.

بورهان دەست به پشتیدا دادەهێنێ و وارێ:

مێوان خۆشەویستی شاعیرە.

خواردنەکەی خۆی لەگەڵ مێوانی خۆشەویست دەکاتە نیوە، ئیدی ئەو شەوە (پشیله) له شاعیر دەبێ، پشیلەیەک منیش ئەزبەرم کرد و ئەو دێرەم زۆر دەگوتەوە:

**هەزار کاتبی خەتخۆش و ئینشا**

**بوویتە خولامی چەلەبی و پاشا**

پشیله لەوێ، ئەدی بازاڕی فەلەک! ئەز تا بازاڕی فەلەکم له رووپەڕێکدا نەدیتەوە، تا سەربردەی بازاڕەکەم دەورنەکردەوە، له کوێ بزانم؟ خۆ پێکی خەیامی خۆمانم بۆننەکردبوو! لەو شارەش (بێکەس)ێ هەس، له بێکەسیش بێکەستر، ناوی له خۆ ناوە جاهید، جاهیدێ ساتێ دێتە سەری، بوێری هەر له خۆی دێ، ترس دەکاتە قاپقاپەی مزگەفتی قیبله خوار و له سەراوە له حوکمەت دادەڕسێ و به گژیدا دەچێ.

جاهیدە رچەیێ له بوێری دەشکێنێ، پێشە وی هیچ شاعیرێ مەگەر به خەیاڵ، دەنا پێی پێ نەکەوتبوو. جاهید بوو سەر له ئێوارەیێ، گرتی و هاتە سەری و چوو (بازاڕی فەلەک)ی به دیواری سەرای شارەوە هەڵواسی، چ بازاڕێ!

بۆ سەربردەی بازاڕی فەلەک، هەر دەبێ بچمەوە عەبۆ، عەبۆ هەزار و یەک شەوەیە، هەر چیرۆک و سەربردەیەکت دەوێ، بڕۆ لەوێ بیبیستە، من له زاری ئەفەندییە کەڵەگەتەکەی ئەوێ بیستم، ئەوەی چیرۆکی حەیدەر بەقاڵیشی بۆمان گێڕایەوە، ئەها:

زوو، زۆر زوو، سەردەمی پاشایەتی دەڵێم، هێشتا بەغدا نەیدەزانی

کوودەتا چیە، لێرەوە لە سەر دیواری سەراوە (بازاڕی فەلەک) کوودەتای کرد، کوودەتا بە سەر بەغدا.

+ مەبەستت چیە، مامۆستا؟

– دیارە بازاڕی فەلەکتان نەخوێندۆتەوە؟

ئەحمەدە فەندی، چایەکی دی گازکرد و شەهرزادانە گێڕایەوە:

ئەو جاهیدەی ئێستا کەس نایناسێ، سلاویش بکات کەس لە بەری هەڵناسێ، ئێوارەیێ بەر لەوەی رێی یانە بگرێ، دەچێ لە لای مزگەفتی قیبلە خواری ئێستا، لە سووچێ دادەنیشێ، بازاری فەلەک لە سەر پارچە مقەبایێ، بە خەتی درشت، هەر وشەیەکی بە قەد گوللەی بڕنۆ، دەنووسێتەوە، پوختە بە دیواری سەراوە هەڵیدەواسێ، بازاڕی فەلەک تا سبەینێ درەنگ بە سەراوە دەمێنێتەوە، نیوەی خوێندەواری شار دەیخوێننەوە، بازاڕی فەلەک بە شاردا بڵاودەبێتەوە، هەرایەکی گەورە دەنێتەوە:

**قەسابی سەری میللەتە، حوکامی زەمانە**

**جەلادی کەسی بێ کەسە، پۆلیس و شەبانە**

**لێمان دەستێنن بە هەوەس باج و سەرانە**

.......

ئەحمەدە فەندی بازاڕی فەلەکی خوێندەوە، چ خوێندنەوەیەک! بە دووری مەبینە شێرکۆ بێکەس لەوەوە فێربووبێ، لایەکی عەبۆی هێنایە جۆش و خرۆش، خۆ لە دوا کۆپلەدا:

**جاهید لە دەر و دەشت و بیابانە هەموو دەم**

**شیعر و غەزەلی زینەتی ئینسانە هەموو دەم**

**بوێژێکی وەتەنپەروەری کوردانە هەموو دەم**

**ئیتر بە چ نەوعێ بکەن ئەو عالەمە هاوار!**

عەبۆ لە سەر ئەوە بوو لە سەری بڕژێ و لایەکی بڕژێتە بازاڕ و بازاڕی فەلەک بڵێتەوە و کوودەتای جاهید پیشانی حوکمەت بداتەوە.

گوێملییە پیاوێ دەڵێ:

ئەو ئەفەندییە بە دەردێکمان دەبات و حوکمەتمان بە سەر وەردەکات.

دیارە ئەحمەدە فەندی قسەی کابرا دەبیستێ، بە پێکەنینەوە:
مەترسێ، من باسی سەردەمی پاشایەتی دەکەم.
ئەفەندی وێدەچێ هەزار و یەک شەوەی خوێندبێتەوە، چاو لە شەهرزاد دەکات و دەڵێ:
ئەورۆ بەس بێ، با بۆ رۆژێکی دی بێ.
داخی گرانم، ئەو رۆژەی چووبۆوە سەر سەربردەی بازاڕی فەلەک و تەواویکردبوو، من لەوێ نەبووم، بەڵام پاشترێ لە کورتە دیدارێ، لە زاری شاعیری بازاڕی فەلەکەوە بیستم:
بازاڕی فەلەک، لە سەردەمی نەجمەدین سائیب بوو، ئەو موتەسەریفی هەولێرێ بوو، بازاڕی فەلەک خستمیە زیندان و تەواوێک لێی مامەوە.
بیرمە ئەوەشی گوت:
دەمێکە وازم لە بادە هێناوە.
رۆژێکی دی ئەفەندییەکەی عەبۆ، جاهیدی هێناوە ناو قسە و باسان، بیرمە گوتی:
جاهیدی پێشان وەک هی هەوکە نەبوو، هەینی نەدار نەبوو، ساماندار بوو.
کەسێ هەڵیدایێ:
مامۆستا، ما توو چ دەڵێی! بە خودای جاهید قەتقەتۆکێ پارەدار نەبووە، هەمیشە هەژار و جلشڕ بووە.
ئەفەندی:
بابە، من نەمگوتووە پارەدار، گوتم ساماندار، دەزانی سامانی وی چی بوو؟
+ چی؟
- تۆ یەک ماڵت هەیە، جاهید سێ ماڵی هەبوو.
+ بۆ ناڵێی سێ ژنی هێناوە؟!
- نا، سێ ماڵی هەبوو، ماڵی یەکەمی یانە بوو، کەم شەو هەبوو سەر بەو ماڵەیدا دانەگرێ. ماڵی دووەم کەلاوەکەی خۆی بوو، کە چ شێت و

دەرۆزەکەری لێـــی نەدەحەواوە، شـــەو درەنگـــان دەچـــۆوە ئەوێ. مـــاڵی سێیەمیشی زیندان، ناوە ناوە سەردانی دەکرد، شەوانی درێژی بێ بادەی لەوێ دەکردەوە.

ئێ، زۆر لە یووسفی خەونزان دوورکەوتمەوە.

## یووسفی خەونزان

ئەگەر بمانەوێ ئەو کوڕە بناسین، چارمان نیە، پێتڤیە ڕۆمانی(کرێمستی) بخوێنینەوە، بڵێ بۆ؟

ئــاخر ئەو کــوڕە پتــر لە بەری خەیــاڵی ڕۆمــانە، نەک بەری خەیــاڵی یــادەوەری، ئەوانەی دەیانناسـی، ئەو قسـەیەم لێـوەردەگرن، بـۆیێ بە چەنـد رستەیێ وازی لێ دەهێنم و بە ڕۆمانەکەی دەسپێرم:

ئەو یووسـفە خەونـزانە، تـا پـارت بخـوازێ ئـازا بـوو، مەرگـی خـۆی لە ناولەپی خۆی دانابوو، شەوان کۆڵان کۆڵان دەیگێڕا، لە هەر سەرە کۆڵانێکی سەیداوە بپرسی:

نووسراوی هەینێی سەر سینەت، دەستخەتی کێ بوو؟

ئەگەر خۆی لە خوا نەکات و پارت چاوی نەنووساندبێت، بێ سێ و دوو دەڵێ:

کورێکی کورتە بالاَی سوورەی چاو گەش، یووسفی ناو بوو.

هەو بـوو، یووسـفە خەونـزانەکەی مـن بـوو، دار و دیـواری گەڕەکـی بە (بڕووخێ دیکتاتۆر...) نەخشاندبوو.

هەر ئەو یووسـفە سـوورە بـوو، لە جێی زەردێـنە و سـپێنە، بۆیـاخی لە هێلکە کرد، کێ لە ئێوە هێلکەی وای دیتووە و بیستووە؟!

هێلکە دەهێنێ، دەسـتەیەکە چەندە، دێ، کونی گچکە، هەر هێندەی جێی سـەرە پەنـجەی تـووتە، لە هـێلکە دەکـات و بەتـاڵی دەکـات و پڕی دەکـات لە بۆیاخ، هەر بە قەپێلکە هێلکە و کەتیرە کونەکان دەگرێتەوە. ئیدی لەگەڵ دوو سێ کەسێ بە هێلکەوە دەردەچن، ئەگەر تووشی ڕەوە ئەمن و جاشـیش بن، ترسیان نیە، کێ گومانی خراپی بۆ هێلکە دەچێ.

دەبێت لەو ڕێبـوارانە بپرسـین کە ئەو ڕۆژە ڕێیـان بەو ڕێوبـانە کەوتبـوو،

بەری هۆلی گەل و هۆلی میدیا و ئەو ناوە، بپرسین:

ئەرێ وێنەکانی سەدام، ئەوانەی بە دار و دیوارەوە سامیان دەخستە دڵەوە، بە چ دەرد و شێوانێ چووبوون؟

هەر یەکە و بە رەنگی چ هێلکەیێ بووبووە پەند و سۆدرەی دنیایێ؟

ئەوجا دوایی، دوایوەی سەدام لێرە راونرا، وێنەیەکی، گۆتەیەکی بە دار و دیواری شارەوە نەما، بە بیری کێدا دێ، ئەو یووسفە یەکپارچە جەرگە، دەستی بچێتە گیانی خۆی؟!

لە رۆژێکی گەرمی هەیڤی خەرمانان، بە گالۆنە نەفتێک و دەنکە شقارتەیێ، ئاگرێکی لە خۆی بەردا، تا درەنگیش گڕەکەی لە چاوی منەوە، لە سەر ماڵەکەیان لە شێوەی گێژەلووکە گێژی دەدا، لوولی دەخوارد.

تا هەینێ لە خۆ کوشتنێ هەر ژن چەکی ئاگریان بەکار دەهینا، یووسف لەوەش رچەی شکاند و پەنای بۆ گوللە و ناو زێ و سەر تەلاری بەرز و بن ترۆمبێل نەبرد، هات بە ئاگر خۆی لە ژیان پاککردەوە.

بە سووتانی وی گەڕەک تاسا، لە چاوی کۆلانەوە، سێ ریز سێ ریز فرمێسک رژا، سەیداوە یووسفێکی لە دەستچوو، وێنەی نەبوو.

وەبیرمدێ، بەر لە کۆچی بە چەند رۆژێ، خەونێکی خۆی بۆم گێڕایەوە و هەر خۆی لێکیدایەوە، لێکدانەوەیەک منی کەمێ ترساند، ئیدی چوو.

لای خۆمەوە کۆلانەکەی ئەو دیوەی کۆلانی مۆسکۆی سەیداوەم ناو ناوە یووسفی خەونزان.

## هەیڤی بەر پەنجەرە

هەر بۆ گەیشتنەوە بە رەز و باخی ناو خەونەکە، سەمەرقەند بە نزار و شەهرزاد بە فەریدە دەگۆڕمەوە، بەڵام وا چاکە مانگی بەر پەنجەرە ببینین، هەینێ لەگەڵ کوڕە ئەویندارەکە سەر و سێ فەریدە هەڵدەین:

هەنگینێ لە بەهاری گەڕەک دوو مانگ هەبوو، هەردووک لە پەنجەرەوە هەڵدەهاتن، مانگی سەر لە ئێواران لە پەنجەرەی هەورەوە، مانگی چێشتانان لە پەنجەرەی ماڵێکی گەورەوە. ماڵی گەورە، سەد ماڵی لێبکەوێتەوە، ماڵێکە بن کچ کەوتووە، کەس باوەڕ ناکات، ئەو هەموو خوشکە لە یەک دایک بن، یەک لە یەکیش جوانتر، بەڵام لە ناو جوانان یەک مانگ هەیە، ئەویش چێشتانان لە پەنجەرەی نهۆمی سەرەوە، جاروبار رووناهیی خۆی داوێتەوە کۆڵانە بەرینەکەی بەری موفتی، دەسماڵە زەردەکەی نیشان دەدات و گەڕەک دین و سەودا و سەرگردان دەکات. کوڕە ئەویندارەکە کە چاوبەخاڵیش هێندەی وی ئەوینی لە دڵ نەبوو، روو لە مانگی ناو پەنجەرەی هەورێ:

**ئەی مانگ، تۆ بە هەور نا،**

**بە ئاوی زێڕیش خۆت بشۆی،**

**ناگەیتە مانگی ناو پەنجەرەی دڵ...**

کوڕە ئەویندارەکە، ناوی لەو پەنجەرەی بەری موفتی نابوو، پەنجەرەی دڵ، جاروبار دوور لە چاوان، لەو بەرەوە، روو لە پەنجەرە:

**ئەی مانگەکەی بەر پەنجەرە**

**تیشکان باوێ و دڵم بەرە**

ماڵەوەدان، ئەوینداریان مارکوژیش کرد، لە ئەوین و گۆرانی نەکەوت، لێرەوە بە بادەی گرت و لە حەمەد مەستان و دارا شێت پتری دەخواردەوە، من جاروبار دەبوومە هاومێزی.

نزار جێی بانه و ڕۆمای گرتۆتەوە، ئەوە نیە، هەموو کۆڵان و ڕێیەکان لەوێ دەکەنەوە، تۆ لە هەر کۆڵانێ و ڕوو لە هەر لایێ، لە هەر کاتێ تووشی کوڕە ئەویندارەکە بی و لێی بپرسی:

- ها، برا، دەچیە کوێ؟

+ سەرێ لە نزار دەدەم.

نزار، سەمەرقەندێکە پڕ زایەڵەی ناسکی شووشە و چریکەی ئوم کەلسووم، کوڕە ئەویندارەکەش کوڕێکە دوای بارکردنی ماڵی مانگی بەر پەنجەرە، دڵی شووشە ئاسا شکاوە و لەگەڵ ئەستێرەی ڕۆژهەڵاتێ - هەندەک ئەو ناوەیان لێنابوو- هوردە فرمێسکان دادەبارێنێ، منیش فرمێسکم دێن، بەڵام دەیشارمەوە، ناهێلم نە ئەو نە کەس بیبینێ، کوڕی ئەویندار دەپرسێ:

+ دەڵێی تۆش وەک من کێشەی دڵت هەیە؟

- نەخێر هیچ لە گۆڕێ نیە.

باسم دەگۆڕی، ئیدی ئەوها و ئا، من بە نیازی خەونی ناسک بە دەم نزاوە فرم لە فەریدە دەدا، لەبیریشم بێ، لە گەڕانەوەی کەویار ئومێدبڕ نەبووبووم، دڵم دەیگوت:

چاوەڕێ بە، دێتەوە، ئەو کچە کۆتری جەردە، لە بنی دنیاش بێت، بۆ ناو لیسی خۆی کە لە باوەشم بۆم چێکردووە، دێتەوە.

ئای سەرکۆنەی خۆم دەکرد، دەمگوت:

دەبوو مینا کۆترە ئەویندارەکەی ئەنۆ بە دوای کۆتری خۆمەوە بم.

هەر کەسێ هەشتیەکی من ئەوینی لە دڵ با، شتێکی بە گۆڕێ وەردەکرد، هەمووی نەدەشاردەوە و لە پەنهانیی نەدەهێشتەوە، ئێستا بە خۆم دەڵێم:

دڵی من هەر دەبێ دەریایێ بووبێ! دەنا چۆن سەری نەکرد و...

لێرە لەجێتر نیە، با چیرۆکی کۆتری ئەوین ببیستین.

## کۆتری ئەوین

کۆترەکەی ئەنۆ لە چ کۆتران ناچێ، لە ساچمە و دارلاستیقی خۆشی ناگەڕێتەوە، مێیەکەی بخە ناو گڕی تەندوورەوە، بە دوایدا دەچێ، گەڕەک ناویان لێناوە کۆتری ئەوین.

چاودەنێ، لە کۆلانێ بە سەر سەری ئەنۆوەیە، سێبەری لێ کردووە، جاروبار لە سەر شانی هەڵدەنیشێ، دێتە سەر دەستی، کشەی لێ دەکات، لە گوپ خۆ دانە، هەڵنافڕێ. تا دەستی تێدایە هەڵیداتە ئاسمانێ، لە بەرد زووتر دێتەوە. ئەنۆ تاکەکەی لە ناو باخەڵی دەشارێتەوە، کۆتری ئەوین لە سەر سینگی دەنیشێتەوە و بە دەندووک دەیەوێ قۆپچەکانی بکاتەوە. دیسان هەڵیدەداتەوە ئاسمان و هەڵێ، لە بن دەستی کۆتر قوتارنابێ، ئەنۆ خۆی بە ماڵێکدا دەکات و توند دەرگا لە دوای خۆی دادەخات، کۆتری ئەوین بەر لەو گەیشتۆتە بن بێرایی و باڵی پێشوازی لێکدەدات.

کۆتری ئەوین لە دوای تاکەکەی نابێتەوە، بە دوای ئەنۆدا لە جامەوە دەچێتە ناو ریمێ، لە بازاڕێ بە سەر شانی ئەنۆوە دادەبەزێ، کۆلان کۆلان قەیسەری دەکات، ئەگەر باوەڕتان نایێ، بڕۆن لە مام خەلیلی چایەچی پرسن:

ئەرێ، وایە، کاتی خۆی کوڕێژگەیەکی رەشبوبرژ، لێرە چایەی خواردۆتەوە، کۆترێکی لەناو باخەڵێ بووە و کۆترێکیش بەوێنەی پانکەی بن ساپیتە بە سەر سەریەوە سووڕاوەتەوە؟

مام خەلیل ئەگەر پیری بیرینەبردبێتەوە، دەڵێ:

وابوو، ئەوە کۆتری ئەوین بوو، بە دەستی خۆم جامە ئاوم بۆی راگرتووە، گرتوومە و ماچیشم کردووە.

بیرمە کچ لە نێوان خۆیان دەیانگوت:

کوڕێکی وەک کۆتری ئەوینمان دەوێ.

چەند رۆژێکە کۆتری ئەوین گران چاو هەڵدێنێ و بە دوای تاکە شیرنەکەیدا باڵی ئەوین لێکنادا. چاودەنە سەر لیسێ، کز کەوتووە و چەند مات و کزە. هەر بۆیە، ئەنۆ دەڵێی مووی گونی رادەکێشن، گرژ گرژ، کز کزە، کەس لە سەر لێوی نابینی بزە. لێوەکانی ئەنۆ کە دەتگوت بە پەلکی هەنجیری رەش سواخدراون، لە ساتی چەقۆ وەشاندنیش بزەیەکی شیرینی پێوە بوو، بزەیەک لە سەر لێوی چ کچە دۆمێک نەنیشتووە، کەس لە سەر لێوی کچە ئەفریکاییشی نەدیتووە .

لە سەر لیس کەوتنی کۆتری ئەوین، بزەی شیرینی لێوی ئەنۆی هەڵفڕاند، دارلاستیقیشی بە دەستەوە نەهێشت، وەک بلێی بە باڵداران بڵێ:

لەگەڵ من نزا بکەن، بپارێنەوە. کۆتری ئەوینم بە ئاسمان بکەوێتەوە، مەرج بێ سێرەتان لێ نەگرم و لە منەوە بەردی مەرگتان بۆ نەیە.

ئێوە دەزانن، ئەو ئەنۆیە باڵداری بە ئاسمانی بەلاشاوەوە نەهێشتبوو، جگە لە پەڕەسێلکە و بارانبرە و حاجی لەقلەق، دەستی لە ئاسمان نەدەپاراست. هێندە کێشکەی کوشتووە، سەلیم قاقا هێندە رەشویرەی نەگرتووە، بەشی هەموو (کێشکەی کورای) شار دەکات و مەنجەڵ لە سەری دەڕژێ، کەچی بە چاوی خۆتان چاودەنێ، ئەوەتا لە سەرە کۆڵانی مە، هەوکی پڕ هەنسکە و بۆ کۆتری ئەوین دەگریێ و دەڵێ:

دختۆری تورەهات بارگیر چاکدەکاتەوە، ئاوڕ لە کۆتری من ناداتەوە.

بە قسەی خۆی، کۆترە نەخۆشەکەی بردبووە خەستەخانەی ئاژەڵان، لەوێ گاڵتەیان پێکردبوو، فریشتەیەکی سپی گوتبووی:

هەر کۆتر مابوو! سبەی هەندێک کوکوختێ و کێشکەی نەخۆشیش بهێنە!

ئەنۆ لە بن لێوانەوە گوتبووی:

حەیف، دارلاستیقم لە کن نیە، دەنا بە بەردێکی تیژ دەمزانی کوێت ماچ دەکەم.

بە دەنگی بڵندیش گوتبووی:

نا، جۆڕکێ مشکت لۆ دێنم.

فریشتەی سپی، بە ناوهێنانی جۆڕکە مشک، بە (وەی شێرە)یەک و

گەشکەیەک ئەنۆی بەڕێکردبوو.

ئـێ، دەردی کـۆتری ئەویـن بـێ دەرمـانە، پشـیلە رەشـە، ئەوەی هێنـدەی گیسکێ رسکاوە، چاوی لێ حیزکردۆتەوە و دەوروسوڕی دەدات. ئەو بابان وێرانە، خۆ ئەگەر کەمێک خۆی گرتبا، کۆتری خۆی دەخوارد و نەدەچووە بەر پەتی قەنارەش، بەڵام نەوس! وای لە نەوس، چەند کەسـی هاویشـتە گۆم و حەوز، ئەگەر سەربردەویستن، با پێکڤە سەربردەی پشیلە و قەنارە لە دوو سێ زارەوە ببیستین:

لە زمانی دایکەوە:

لە بن بیرایـی لە سـەر بەرمـاڵ بـووم، نـازانم گەیشـتبوومە رکـاتی چەنـد، هێنای، کۆتری دەردەداری لە جێی نێوچەوانم دانا و گوتی:

هۆدا، لە نوێژێدا، نزا لۆ کۆتری ئەوین بکە، بە خودا بڵێ، ئەنۆ دەڵێ:

ئەگەر چـاکی بکەیـتەوە، دارلاسـتیق فڕێـدەدەم، چیـدی خـوێنی باڵـداران نارێژم.

کـۆتری بە تەمـای نـزای مـن بەجێهێشـت، لە سـەر داهـاتنەوەبووم بـۆ کڕنووش، پشیلەی رەش لە باشووکە سووکتر پڕیدایێ، نوێژم بڕی، کەوتمە دوای:

خـت خـت، پش پـش، داینـێ داینـێ، واز لە کـۆتر بێنە، گۆشـتی نەرمکـت دەدەمێ...

پشیلە بە قسەی نەکردم، بە سێ دەنگا گازی ئەنۆم کرد، تا لە ئاودەستێوە دۆخین و دارلاستیق بە دەستەوە گەیشت، پشیلە زاری لە زگی نابوو.

هەشـت بە سـەر پشـیلە، چـت کـرد لە خـۆ! لەگەڵ کێدا لێت قەومـا، ئەنـۆ! بەلاشاوە دواتر بزن و شوانەکەی کردە پشیلە و ئەنۆ:

پشیلە رۆژی بێ، پڕدەداتە کۆتری ئەنۆ.

بەر لەوەی رەقیب بەزمەکە بگێڕێتەوە، با لە ئەنۆوە شتێک ببیستین:

کـاتێ کـۆترم بە دەوی پشـیلەوە دیـت، بەر چـاوم تاریـک بـوو، لە خـوێن بەولاوە هیچم نەدی، لە دڵێ خۆ گوتمە خوا:

وا دیار هەر خوێنی باڵدار نا، حەزت لە خوێنڕشتنی پشیلەشە.

بۆ یەکەم جار هەستم بە بێهێزیی دارلاستیق کرد، ئاخر بۆمبیشی پێوە بنێم، ئۆخەی ناکەم، لەو بۆمبانەی بەغدا بە سەفینیەوە دەنا.

رەقیب دەڵێ:

پشیلەی بەدبەخت، وە نەبوو، بە سەر بانان کەوێ و خۆ بزرکات، ئەو چۆلەوانیەی گرت، بە بەر چاومەوە ئەنۆ بووە سەگ و بە دوای کەوت، هەر بەراستی لە چاوی منەوە سەگێکی گەورەی پڕدەری پشیلەیەک راو دەنێ. راوە سە و پشیلە گەیشتە نزیک ماڵی پلکە بەندبێژ، دیتم پشیلە لە ناو چنگی ئەنۆیە، داویەتیە بەر گەزان .

ئێستا با هەموو چاودەینە، قەنارە، قەنارەیەکی بۆ پشیلە دامەزراند، لە قەنارەی بەعس دەچوو. نا پیشانینادەمەوە، ئەگەر ببینن، سەربردەی کۆتری ئەوین جوانیی تێدا نامێنێ و ئەنۆی شیرینیش خوێنتاڵ خۆی دەنوێنێ.

# کۆتری دڵ هاتەوە

سـەرێ لە ئـازادی دەدەمەوە، کـارت وەردەگـرمەوە، ئەو ڕۆژە لە ڕۆژژمێـری تەمەن ڕۆژێـکە کەس لە بەهەشـتیش ڕۆژی وا خۆشـی بەسەرنەبردووە. دەزانن چ هەواڵێکم بیست، چۆن شاگەشکەبووم، مینا کۆتر لە باڵم دا، ئەو ڕۆژە بە من لە وشە ناگیرێ، لە چێوەی خەیاڵیش جێینابێتەوە، حەیف، کەسیش چاوی لێم نەبوو، تا وێنەیەکی باڵگرتنم بکێشێت و پیشانبداتەوە.

ڕۆژی کارت بە پاشۆلێ کتێب و نیو دینارەوە لەگەڵ ئازاد خەتخۆش گەیشتینە ئازادی، نیو دینارەکە بۆ بەردەستەکان، ئۆخەیش پۆلی چوارەمی گشتیمان بڕی کە لای من قورسترین پۆل بوو، لە سەر دەرگا مامۆستای بیرکاری، دەستی خستە سەر شانم:

ڕێی بیرکاری بەرمەدە، دەبیە ئەندازیارێ، شار شانازیت پێوەدەکات.

ویستم بڵێم ناچمە بەشی زانستی، قسەکەم قووتداوە و سوپاسم کرد. ئێ، با زوو بگەمەوە گەڕەک، تا هەواڵە بەهەشتیەکە ببیستم، لە سەرە کۆڵانی خۆمان نا، ئەوی دی، لە ژنانی سەر کۆسپەی سەر دەرگا، هەواڵێکم بیست، چ هەواڵ، بۆ گەڕەک تاڵ تاڵ لە گوژارک تاڵتر، بۆ منیش قەندی چی، هەنگوینی چی، ترێی بەهەشتی چی، مەگەر لێوی کەویار شیرینیی وای پێوە بێ.

گەڕەک بەو هەواڵە تاسا، ئاخر هەموو ئەو کچەیان وەک کچی خۆیان خۆشدەویست، لە دڵیان گران بوو، وای بەسەربێ، ژن هەبوو سینەی خۆی دەکوتا:

وەیش، بابانت، چۆن دڵیان هات ئەو ناسک ونازدارە بەو دەردە ببەن؟!

هەبوو دەیگۆ:

لە بەهەشتیش کچی وا نابیننەوە، دەک جێیان دۆزەخ بێت.
بەڵام من دەمگوت:
جێیان بەهەشت بێ، بەهەشتیان بۆ من ناردەوە.
هاتنەوەی کەویار لەو گوڵەجووتیارە دەچوو، لە ناو پووش وپەڵاشی ژیانی من سەری دەرهێنابێ و مزگێنی بارانی ئاسوودەیی پێبێ.
مزگەفتێ نوێژ و دنیایێ نزام بۆ ئەو رۆژە بوو، بۆگەڕانەوەی وی بوو، حەزمدەکرد بچم زاری ئەو پیرێژنە بێ ددانە ماچ بکەم کە هەواڵەکەم لەوەوە بیست:
بە سەردان نا، بە یەکجاری هاتەوە.
هاتەوە، کۆتری دڵ هاتەوە، کەویاری من هاتەوە، پێم بە زەویەوە نەما، باڵم گرت، ئاسمانم کرد، هەستمدەکرد لە سەر حەوشە و بانی ئەوان کۆتر ئاسا بە تەقلە دەنیشتمەوە، بەڵام نەمدەدیت، ئەو کچە ماڵ تێکچووە خۆی لە کونێ ژۆرێ پەستاوە و سەر دەرناهێنێ، دێتە سەرم لە سیلەی خانووی خۆمانەوە پڕ بەگەرووم هاواربکەم:
**کەویار و کەویار، کەویارەی خۆمی**
**باڕێزەی شاخان کنێرەی چۆمی**
دەمەو ئێوارە لە سەر بانێ روو لە ماڵی وان، فووم بە شمشاڵدا کرد، پەنجەم بە بەزمی (کەویار و کەویار) بزواند. بیرتانە، کەویار بە منداڵی ئەو ئاوازەی شمشاڵی منی بەدڵ بوو، بۆم ژەند تا شل و کوت بووم، کەویار کەویارم بۆ کەویار ژەند.
لە کەویارەوە گۆڕیم بۆ (تۆلە جوانێ مەیرۆ) ئەو گۆرانییەی ئەو خۆشی دەگوتەوە.
ماڵێ وا تێگەیشتوون دڵخۆشیم لە کارتەکەوەیە، وەک چۆن لە شێوەنی کۆچی کەویار کەسم پێکنەکرد، لە شایی هاتنەوەشی وام کرد، خۆم و تەنیا، لە چاوە گچکەکەی خۆم لە شاییەکی خەیاڵی سەرچۆپیم گرتبوو، شاباشی گیانم دەکرد.
بە دزیەوە شەهرزادێکم هەڵدەدا و لە ناو خەیاڵێ پڕ زاخ دەبووم:

ئەو جارە دنیا هەستێ، لە دەستی خۆمی نادەم، دەبمە کۆترەکەی ئەوینێ و بۆ کۆتری خۆم دەگمێنم و بستێ لێی دوورناکەومەوە، بچێتە بن پەڕەگەی ئاسمانێش لە دوای نابمەوە، ئەوجارە شەرم زارم نابەستێ، رێک و راست دەچمە بەر دەمی و راست و رەوان پێیدەڵێم:

من تۆم خۆشدەوێ، کەنگێ بێمە داخوازی؟

باشە، با تۆزێ بێتەوە سەرخۆ و لێکجودابوونەوەکە کەمێ کەون بێ، بزانین چۆن دەبێ.

هەوکە هەندێ وردە سەربردە کە ئەوانیش لە دەوری ئەوین دەخولێنەوە، دەگێڕمەوە، لە قەدی قەلاتێوە پێدا دێم.

## تووتنفرۆش
## تۆرکەچنی قەد قەڵاتێ

ئەو سەربردەیە هی بەهاری پێش هاتنەوەی کەویارە، بڕواننە ئەو ژنەی قەد قەڵاتێ، ئەها وا لە ناو کەسکایی بەهار دەڵێی چینماچینە دەجوولێتەوە. پاش کەمێکی دی بە تێلەگەیێ تۆرکەوە لە دەرگای دیوی مزگەفتی شێخە رەشکەوە دێتەوە سەر جادە، لەوێ بە چاوی تووتنفرۆش چاودەنێ، دەبینن، شلێرەی پیاوە ئاسمانیەکە نیە، بەڵام لە بەگزادەی هەولێرە. ئەو ژنە خانەقاییە تۆزێ بە تەمەندا چووە، بەڵام تووتنفرۆشی بۆنخۆش گۆتەنی:

هێشتا تەڕی و جوانیی گەڕەکێک تازە کچی تێدایە.

تووتنفرۆش، پیاوێکی خڕکەلەی کەشخەیە، تووتنەکەی نا، خۆی بۆنێکی خۆشی لێدێ، تۆ وەرە بە دیار گونیە تووتنەوە دانیشە، بۆنیشت وا خۆش بێ! ئەوە مەتەلە و بە من هەڵنایێ. ئێ، تووتنفرۆش، شێت و سەودای ژنەی ناو تۆرکانی قەد قەڵاتە، وەک دەڵێن زۆر جار تووتن بە جێدەهێڵێ و کۆڵان کۆڵانی خانەقای لە دوا دەکات، کەچی بەراز ئاوڕدەداتەوە، ژنە ئاوڕی لێناداتەوە. گۆتەیەکی تووتنفرۆشی سەوداسەر کە لە دوورەوە بۆ ژنە خانەقاییەکەی هاویشتبوو، وەک تووتنی بۆندار بە کۆڵانی تووتنفرۆشاندا بڵاوبۆتەوە:

بۆنی پنچکە تۆرکەیەکی قەد قەراتێ کە پێی تۆی پێکەوتبێ، خۆشترە لە بۆنی بەهەشتێ.

با بچینە دووی، بزانین چ دەقەومێ.

رۆژەک لە رۆژان سەر لە سبیانێ، تووتنفرۆش لە چاوەڕوانی گراوی خۆی راوەستابوو، لە کوێ؟ لە سەری کۆڵانێ، کام کۆڵان؟ ئەو کۆڵانەی لە نێوان دوو مزگەفت، هی حاجی لەقلەق و شێخە رەشکە، لە جادەی دەلاڵخانەی دەکردەوە، رێک ئەو جێیەی هەنارفرۆشەکە، لە سەر عارەبانەی

سێ تایە، ڕەوسەیێ هەناری هەڵدابۆوە، هەناری سوور سوور، لە چارۆگەی کەسکوسۆر سوورتر، لە نینۆکی کچە قەڵاتیان سوورتر، لە دەسکی چەقۆی دەستی ژنەکەی ناو تۆرکان سوورتر، سوور لە شێوەی لێوی کەویار.

لەوێ تووتنفرۆش بە تەزبێحی دەنک سۆری هەناریەوە ڕاوەستاوە. ئەوجا لێرەوە ناچارین لە زاری هەنارفرۆشەوە سەربردەی تووتنفرۆش و ژنە خانەقایی ناو تۆرکان ببیستین، ئاخر سەربردەی ئەو کۆڵانە لە کن هەنارفرۆشە، سەربردەی تاڵ و شیرن و مێخۆش، تەنها سەربردە شیرنەکان هێندەی ژمارەی دەنکە هەنارە مێخۆشەکانی دەبێت.

هەنارفرۆش یەک ڕەوسەی هەناری هەبوو، بەڵام لە هەر لایەکەوە بۆی تێکردبای تامی لایەکانی دی نەدەدا. من درەنگ پێکەوتم، بە پەڕۆکێکی تەنکی سۆر لە ڕەنگی هەنار ناوبڕەی لە نێوان هەر سێ جۆری هەنار هەڵنابوو. بە خۆی ڕوو لە عارەبانە پشت لە خانەقا ڕادەوەستا، لای ڕاستی ڕەوسەی هەنار، تۆ بڵێ دەستی قەڵاتێ، شیرن شیرن چەشنی ماچی یار. دەستی چەپی، با بڵێین لای حاجی لەقلەقێ ترش ترش، لە ترشۆکەی بەهارانی دەو ئاوی بەستۆرە ترشتر. ڕووی دەڵاڵخانەی مێخۆشە، بە دڵی عەمۆ جەلیلی خۆمان، ئەو گوێ بە ڕادیۆوە دەیگۆتە هەنارفرۆش:

لەو لایەوە قیچەک تێکە.

ئێ، با گوێدەینە سەربردەی چەقۆ لە مست و تەزبێح لە دەست، لە زاری شیرنی هەنارفرۆشەوە:

تووتنفرۆش پێدەچێ لە سەر ئاوازەی دڵی، پەنجەی گەورەی دەنک تەزبێحی هەناریی، لە سەر پەنجەی دۆشاومژەی ئاودیوی دیوی گۆلمی بکات، ئەگەر باوەڕناکەیت، چاودێ، بزانە بە چاوان دەیبینی! ژنی ناو تۆرکان گەیشت، چاوم لێیە، نە سەری هەڵبڕی و نە تیچاوێکی دا کەس، خۆی لە تووتنفرۆش لادا و بن دیوار و دیوار، بەرەو دەرکەی قەڵاتێ باریکەی داین و چوو. تووتنفرۆش کەوتە دووی، منیش وەک دڵم تریواندبی شتێ دەقەومێ، هەنارم بە تەمای عەمۆ جەلیل جێهێشت و بە دوایاندا چووم، لە سەر قادرمەی قەڵاتێ، گرتی و گوتی:

بەگزادە، کوا چەقۆکەت؟ ئەورۆ من تۆرکەی بن پێتم.

ژنە دەستی بۆ بەرکی کەواکەی برد و قەڵەمبرە گەورە دەسک سۆرەکەی دەرهێنا، تووتنفرۆش مەچەکی تۆرکەچنی گرت و بەچەقۆوە لە سەر سینگی خۆی راگرت و گوتی:

لێدە، خۆت بکوژە.

تۆرکەچن:

خۆم؟! تۆ دەکوژم .

تووتنفرۆش:

نا، خۆت، ئاخر تۆ لە ناو دڵی منی.

ژنە ساردەبێتەوە، خۆی رادەپسکێنێ و بزەیەکی بۆ دەکات، بە قەلاتێدا هەڵدەگەڕێ.

زۆری نەبرد، تووتنفرۆش ژنی ناو تۆرکانی خواست.

من پازدە بیست ساڵێ دواتر، وانەم بە کچێکی ئەوانە گوتووە، ناوەکەی لە گیابەند نزیک بوو.

## بەزمی گدی

سـەربردەی گـدیش خۆشـە، ئەو وشـەی وەختـابوو دوو دڵ لێکبکـات، هەرچەندە گدی دواترە، بەڵام ترسام بیرمبچێتەوە، پێشم خست:
سـەگڤان کوڕی ئەو بەری زێیە، پشـتێکە ماڵیـان لێرەیە. بێـری کچـی ئەم بەری زێ لەمێژ نیە هاتینە شاری. قسەمان لە زێی بادینانە، دیـارە زێ نـابێتە دیـواری نێـوان دڵان. ئەو کـوڕ و کـچە یەکتریـان زۆر خۆشدەویسـت، خۆشویستنێ مەگەر وشە، دەنا شـەقامیش نێوانیـان ناکات. بەر لەوەی وشـە نێوانیان بکات با قسـەیەک لەو شـەقامە بکەم کە سـەیداوە و قەسرانی کەرت کردبوو، وەک دڵ کەرتی کردبوو. کوڕێکی بەری تانکیی ئاسمانیی سـەیداوە، شەیدای کچێکی ناو قەسرانی بەری گۆڕستان دەبێت، شەقامەکە نەیهێشت بە یەک بگەن، بابی کچە دەڵێ:
کچەکەم نادەمە کوڕی قوڕ، ئەگەر خوێن قەسرەکەم ببات.
کوڕە هیچی بۆ نامێنێتەوە، سەیداوەییانە دەڵێتە بابی کچە:
من خانووەکەم قوڕە، بەڵام تۆ دڵت قوڕە.
ئـێ، لە دڵقـوڕان و کـۆڵانی قـوڕان گەڕێ، بـا بچیـنەوە دەو زێ، سـەگڤان بە(گدی) گازی بێری دەکات، جارێ نیە دوو نیە، بێـری تـووڕە دەبـێ، دەگـاتە لووتی، دەڵێتە سەگڤان:
کوڕە خۆت گدیی کوڕی گدیی، چما من بزنم!
سـاردیەکی وا دەکەوێتە نێوان بێری وسەگڤان، بە گڕی ئەوینیش گەرم نابێتەوە. سەگڤان هەردوو بەری زێ دێنێتە تکایێ، بێـری نـابێتە رایێ، بێری بە شـێوەیەک بە رقـدا چـووە، تێگەیشـتن لە (گـدی)ش خـاوی ناکـاتەوە، گوتبووی:
نەک لەوبەری زێ، لە بەهەشتێش، گدی (ئازیزەکەم و ژیکەڵەکە و..)بێ، لە

کنه من هەر بۆ گازی کار و بزنە.

سەگڤان بە هەردوو دەست لە سەری خۆی دەدا:

ئای لەو گدیە جوانە، کێشەی لەگەڵ (سەگ)ی ناوم نیە، بە(گدی)ی ناو زارم لێم دەتۆرێ.

ئیدی بێری تۆرا، درەنگ زۆر درەنگ ئاشتبوونەوە.

ئەز بێری و سەگڤانم لە نزیکەوە دەناسی، کچێکیان بوو، نازانم لە تەسکەرە ناوی چی بوو، بەڵام منداڵی کۆڵان بە گدی گازیان دەکرد! بێری لە سەری خۆی دەدا، لەگەڵ گدی رانەهات و رانەهات. وێدەچوو چیرۆکی وی دەگەڵ وشەی گدی لە گازکردنی کار و بزن ئاڵۆزتر بێ. زۆر کەس دوژمنایەتییان لەگەڵ وشەیێ هەیە، تا مردن ئاشتنابنەوە، بێری یەک لەوان کەسان بوو.

دەڵێن چی، سەربردەی سماقفرۆشیش لێرە جێبکەینەوە؟ با لەدەستنەچێ.

# سماقفرۆش و جندۆکەکێش

سماقفرۆش، چتۆ سماقفرۆش! نە لە زەوی نە لە ئاسمانێ، وێنەی نەبوو، لە وێنەیەک دەچوو دە مانی و سەد داڤنشی و قەرەنی جەمیل لە کێشانی و بە دیاریەوە تەمەنیان بە سەربردبێ. کچی کافرۆش لە چاوە وی لە وێنەی کچی جندۆکە دەکات. ئەو وێنەیە لە سەرە کۆلانی دەڕاسەکەی سەیداوە، لە سەر لادیوارێ، دەڵێی بە تەباشیر و رەژوو نەخشاوە، بەلام وێنەی کچی جندۆکە نە بە باران نە بەهیچ رەشنابێتەوە، ئەوەش جێی پرسیارە. وێنەکە لە هەر لایەکەوە لێی دەڕوانی دوو چاوی کونەشووژنی، سەر قژن، زمان لە شێوەی زمانەگا، ددان لە شێوەی چیلکەداری ناو دووکەڵێ لێت دەڕوانێ.

ماڵی سماقفرۆشیش نزیک کۆنە دەڕاسەکەیە، ئەو ماڵە لە زۆزانەوە هاتبوون، باڵەکی، یان هی کوێستانی کێلەشینێ بوون.

سماقفرۆش هی ئەوە بوو بە دزیەوە لێ یبڕوانی و نەهێلی وا هەستبکات چاوت لە سەریەتی. هەر ساتێ چاوی وی کەوتە سەر تۆ، هەنیەی هێندەی پیرێ لۆچی تێدەکەوێ، رووی گرژ گرژ، چاوی ئاگری لێدەبارێ، لەوەوە گەرەک سماقفرۆشیان بە سەردا بڕی.

باشە ئەو کافرۆشە بۆچی بە تەماشاکردنی کوڕان دەبووە سماقفرۆش؟ ئەوە مەتەڵێ بوو بە کوڕی سەیداوە و بەلاشاوە هەڵنەدەهات. سماقفرۆش بە جوانی و رووگرژیی خۆی زۆرانی دین و دیوانە کردبوو، بەلام کەس بە دەردی جندۆکەکێش نەچووبوو. ئەو کوڕە ناوێکی وەک فەرهادی هەبوو، بەلام دوایوەی ئاشکرابوو ئەو وێنەکەی کێشاوە، بەو ناوە ناوی دەرکرد.

جندۆکەکێش دوو سێ جار ناردبوویە داخوازی، ماڵی سماقفرۆش سەیان تێبەردابوو. هەزار نامەی بۆ هەڵدابووە حەوشە، بە دەستی خۆی لە ناو تەنەکەی زبڵی سەر دەرگای ماڵی سماقفرۆش قل قل هەڵیدەگرتنەوە. چەند

کەرەتێ لە کۆلانێ رێی لێ گرتبوو، بۆی چەمابۆوە و یەک دوو نووکە چەقۆشی لە سینگی خۆی دابوو، خوێنی خۆی پیشان دابوو، کەچی سماقفرۆش باریکەی دابووین و ئاورێشی لێ نەدابۆوە. جندۆکەکێش ئەوەی بۆ سماقفرۆشی کرد، بۆ کچی قەدۆ و چەلەبیی کردبا، بە جلکی بەریەوە دەیاندایێ.

ئیدی جندۆکەکێش توورەدەبێ و بیر لە تۆڵە دەکاتەوە، بیردەکاتەوە شتێک بە سەر سماقفرۆشدا بهێنێ، کەس بە سەر کەسیدا نەهێنابێ. ئەوە بوو خۆی فێرە وێنەکێشان کرد و چوو وێنەی جندۆکەی لە سەر لادیوارەکەی روو لە ماڵی سماقفرۆش کێشا. حەفتەی جارێ دووش نوێیدەکردەوە، ناوی کچەشی لە ناو وێنەکە نووسیبوو، گەرەکیشی تێگەیاندبوو کە ئەوە وێنەی کچە سماقفرۆشە. دەستەخوشکەکانیشی هێندەیان گۆتبۆوە، کچە کەوتبووە گومانەوە، دیتبوویان چەند جارێ بە مەسینە و گەسکەوە چووبووە گژ وێنەکە، بەڵام دوای رەشکردنەوە، دیسانەوە وێنەکە لە پێشتر روونتر خۆی پیشانی رێبواران دەدایەوە.

بیستمەوە کچە کەسی رادەسپێرێ کە بڵێتە جندۆکەکێش، با وێنەکە بکوژێنێتەوە، بێتە پێشێ، بەڵام راسپاردەکە درەنگ دەکەوێ. جندۆکەکێش قادسیە دەیبات و تەرمەکەشی نەهاتەوە، سماقفرۆشیش کەس لە کۆلان نەیدیتەوە، هەندێک دەیانگوت بە دەردی (کەسکوسۆر)چووە، بەڵام وێنەکە تا درەنگ بە دیوارەوە ما.

## کەسکوسۆر
## هەر شێتەی لە ڕەنگێ

نـاوی کەسکوسـۆر هـات، نەبـادا نـاوی نەیەتەوە نـاو نـاوان، بـا بەسەریبکەینەوە و تیلمێکی لێ پیشانبدەینەوە، هەرچەندە جێی ئەو ئێرەش نیە:

هەبوو نەبوو، شار دوو کەسکوسۆری هەبوو، کەسکوسۆری چ جێ لە شتاقیان نەدەچوو. یەکیان ئاو، ئەوی دی ژن بوو، ئاوەکە جێی نەگۆڕە، قەلات بجـوولێ ئەو نـاجوولێ، لە بـاخی گڵکەنـد هێنـدە دوور نـیە، کەسکوسۆریی ئەو ئاوە لە درەنگانی ئێواران لە شێوەی تالە برژانگی بەهار دەردەکەوێ و گوڵەکانی گڵکەند چاوبڕکێی دەگەڵ دەکەن.

هەرچی ژنەکەیە، گەڕۆکە، هەر هێندەی پەلکی زەردی دەستی بای پایزی رادەوەستێ، لە ئاوەکەوە دێت و ناو قەیسەری و دەوری قەلات دەکات و بە جادەی نێوان گەڕەکی عارەبان و جووان، سەرێک لە گۆڕی عوزێر پێغەمبەر دەدات و دەگاتەوە منارەی چۆلی. بە تەنیشت سولتانی ژنان، تۆ بڵێ سولتان مـزەفەر دێـتەوە بەردەمـی سـەرا و لەوێـوە بـادەداتەوە بـۆ کـۆلانی سـەید خەنـجەر و بە بـاتەوە سـەردەکەوێتەوە لای دەلاڵخـانە، لە سـەر کۆسپەکەی دەرگای مزگەفتی حاجی لەقلەقێ پشووێ دەدات.

ئەو ژنە بەرگی باخی بەهاریانەی گڵکەندی لەبەرە، هەر گوڵێکت دەوێ، هەر ڕەنگێکت دەوێ، وەرە لەو ژنە بیبینەوە.

**کراسی ژنە شێتە کەسکوسۆرەکە، شیلانە،**
**کەوێکەی شلێر، سوخمە: شەوبۆ،**
**کەلانگوچکی درێژی لە ڕەشە ڕێحانە .**
**عەردی سوخمەی ژنە شێتەکە، گوڵەباخە**

**گوڵ گوڵ گوڵناریشی تێدایە**
**چارۆکەی گوڵە هێرۆیە، فۆتەی سەری، باڕێزەی شاخە**
**بەرانپیلی ژنە شێتەکە عەردەکەی وەنەوشە،**
**لێ پڕ پڕ لە وردە چاترە و نازنازە،**
**دەرپێکەی نازانم چ گوڵە،**
**لێ دەلینگەکەی خەزێمە و حاجیلە**
**سەر نینۆکی رەنگی شیرە**
**کەوشی پێی لە پەلکی دارهەنجیرە**
**بوخچەکەی گوڵگوڵی، بە کۆڵیەوە نازێ دەکات و پڕ لە وردە رازە**
**جاروبار دەسماڵێکی پڕ لە مێخەکی بە دەستەوە، دەبینم**
**لە پێش دەرگای یانە وەک بلێی سەرچۆپی گرتبێ، رایدەوەشێنێ**
**ژنان بەو رەنگە دەڵێن: چاوبازە**
**کەسکو سۆر هەر چوار وەرزە**
**کەسکو سۆر هەزار تەرزە**

ئەو ژنە وەک ئـاوەکە نـیە، لە تـاریکی و روونـاکی هەمیشـە لە رەنـگ دەدرەوشێتەوە، ئەو ژنە شێتە هەر ناوێکی هەبێ، لە کەسکوسۆر جوانتری لێنایە، شاریش بەو ناوە بەهاریە دەیناسێتەوە.

ژنەکە لە رەنـگ لە ئـاوەکە رەنگینتـرە، بەڵام شـار چەنـدی گەڕا، لە کەسکوسۆری جوانتر نەدیتەوە، بۆیە هەر ئەو ناوە ئاویەی بە سەردا بڕا، هێ لە هەندێ پێدەچێ کەینوبەینێ لە نێوان ئەو دوو کەسکوسۆرەدا هەبێ، جا ژن هەیە شاری بێت و شتێکی لەگەڵ ئاوی کەسکوسۆردا نەبێ!

ئاو دەمێکە تەڕایی نەماوە و لە رەنگ چۆتەوە، بەڵام ژنە بیرینەچۆتەوە، تیچـاوێکی هەر لەوێـیە، کەس هەیە لەبیـرییچێتەوە! مەسـتانی ژنـی حەمەد مەستان دەیگوت:

دەک شارەوانی دەستت ورد بێت، تەلاری خۆت بە سەردا بڕووخێت و جێت بن بەرد بێت، چۆن دەستت چوود کەسکوسۆر؟

شـارەوانی وادیـارە دوای شـارەوانە پیرەبـابیە قەڵاتـیەکە، لەوەتەی هەیە،

ناوە ناوە نەبێت، چاوی بە جوانیی شار هەڵنایە، ئەوەش لە دنیایێ تەنها شارەوانیی ئەو شارە ئەوهایە، لە شارەوانیی دژە شار گەڕێ، مەستانی ژنی حەمەد مەستان لە کن ژنان گوتبووی:

یەکەم بووک لە هەولێرێ بە قەمەرە بە دەوری ئاوی کەسکوسۆردا سووڕابێتەوە من بووم.

ژن هەبوو دەیگۆت:

دوورنیە ژنە کەسکوسۆرەکەش مەستان ئاسا، لە بەبووکچوونێ بە لای ئاوەکەدا چووبێ.

بەڵام ژنیش هەبوو:

نا، ئەو ساڵی کەسکوسۆر بە بووک چوو، ئاوی کەسکوسۆر نەخشەکەشی لە خەیاڵی کەسدا نەبوو .

کەم ژنە شاری هەبوو ئاخ و ئۆف بۆ نەمانی ئاوی کەسکوسۆر هەڵنەکێشێ، توورە نەبێت و (لە دەمی بات ریم) بۆ شارەوانی نەنێرێت، بەڵام توورەیی ژنی کەسوسۆر بێ وێنە بوو، ئەو لە رێی هەڵدانی خڕکە بەردێکەوە، روو لە شارەوانی دەیگۆ:

گوو بە توو، گوو بە توو.

کەسکوسۆری ژن بێ بەرد نەدەبوو، ئەو ژنە لەو شێتانە بوو کە پتر چووبوونەوە سەر هەیاسە شێت، نەک دارا شێت. ئێوە دەزانن هەیاس سەری بۆ کەس دانەدەنواند و بە هێز خۆی دەپاراست. هەرچی دارا بوو پەنای بۆ مووس لە خۆدان دەبرد. دابێ ئەو شارە ماوەیەکە وایە، شێتیش هێزی نەبێت لە بن دەست و پێ دایە. ژنە کەسکوسۆر لە رێی کوچکە بەردەوە سەر بە تیرەی هەیاس بوو، بەڵام کە گوێت لە جوێنەکانی دەبوو، لە دارا نزیکدەبۆوە. جوێنی ژنە دەتگوت باویلکەن لە لێویەوە هەڵدەفڕن. دواتر دێمەوە لای جوێنی باویلکەیی و خڕکەبەردی کەسکوسۆر، هەوکە دەچمەوە دیداری ئاوی کەسکوسۆر، بیرمە ژن هەبوو دەیگۆ:

تا مردن ئەو داخەم لە دڵ دەرناچێ، لە رۆژی بووکێنی ئەو پیاوە سەرکەستوورەم منی بە دەوری کەسکوسۆردا نەگێڕا.

بیرمە ژنێک لە زاری ژنێکەوە گێڕایەوە:
شەوی پێش گواستنەوە، کەسکوسۆر هاتە خەونم، رەنگەکی وەک بنیادەم هاتە قسە:
بۆوەی لە کن خەسووت شیرن بی، بێرەدا برۆ.
سەربردەی سێ مێردکەرە لە هەمووان بەزمترە، ئەو ژنە لە مارەکردنی یەکەم جاری، ئەوە نیە مەلا لێی دەپرسی:
کچم، رازی مێرد بە ....بکەیت؟
سێ مێردکەرە دەڵێ:
بەڵی، بەڵام بەو مەرجەی بە دەوری کەسکوسۆردا بمگێڕێ.
بیرمە شاتکە شێت بە سێ مێردکەرەی دەگۆ:
تۆ لە خۆشیی ناو قەمەرە و دەوری کەسکۆسۆر کردتە سێ.
ئاوی کەسکوسۆر کە هەندەک کەس (نافوورە)شیان دەگوتێ، کەوتبووە ناو گۆرانی و بەندیشەوە، هەموو شار ئەو گۆرانییەیان بیستووە:

**نافوورە دوور دیارە**

**جەژنی گوڵ و گوڵزارە**

ئەو گۆرانییە ئەو محەمەدە دەیگۆ کە (دڵدارم لە هەولێرێ)ی دەگۆ، بەندەکەش بەندی پلکە بەندبێژ بوو، رەنگە تەنێ گەڕەکێ مە بیستبێتیان:

**هات دەنگی زوڕناو دۆرێ**

**لە دەوری کەسکوسۆرێ**

**لە ناو قەمەرەی سۆرێ**

**بووک لە گوڵان دەنۆڕێ**

**زاوا سەر دەردەهێنێ...**

بەندی پلکەبەندبێژ درێژ بوو، درێژ وەکو رستەی حەوشەی ماڵی کەویار، ئەوەتا لە سەر بانەوە، دەبینم سوخمە و کراسەکەی ئەویشی پێوەیە، وای، من بۆ کوێ بامدایەوە! قسە لە کەسکوسۆری ئاو و شێتە.
جوێنی ژنە کەسکوسۆرەکە لەبیرنەکەم کە دەتگوت پشیلۆکەن و لە زاریەوە هەڵدەفڕین و لە پێش دەرگای مزگەفتی حاجی لەقلەقێ بە سەر

خەڵکوخوادا پەرتدەبوون. سپیترین جوێنی زاری وی (برۆ قووندەر) بوو، جوێنێکی سپی و سووک، رێک لە باویلکە دەچوو، کەس بەو جوێنە توورە نەدەبوو، زۆر کەس تامەزرۆبوو جوێنەکەی بۆ بچێ. ئەو دوو سێ فەقێ منداڵکارەش کە مێزەری سەریان لە رەنگی حاجی لەقلەق بوو، جوێنەکەی کەسکۆسۆریان لە دڵ خۆش بوو، دەچوون لە پێشی رادەوەستان، تا جوێنەکەیان وەرنەگرتبا، نەدەچوونە مزگەفتێ. تاقە کەسێ لەو شارە هەزار بەهەزارە بە (قووندەر)ەکەی زاری کەسکوسۆر تێکدەچوو، جومعە شێت بوو.

بەر لە چوونە رزگاری هەندێ شێتی دیش بەسەردەکەمەوە، لە شەهابەوە پێدادێم.

## بەڕکی شەهاب

تا ئێواری بڵێ: شەهاب، شەهاب...

کەس نایناسێ، لێ کە گوتت شێتی گندۆرە لەبەڕکێ.

کەس نیە وێنەی شەهابە شێتی نەهێتە بەر دیدە. ئەو کوڕە بەڕکی شەرواڵی ربە جۆیەکی دەگرت، بەوە دەزانم جارێک لە ناو گەنمفرۆشانی پشت سینەما حەمرا، بە دیار رەوسە جۆوە دانیشت و بە قۆغەکەی دەستی تێیکرد، جۆی لە بەڕکی کرد، هەر تێیکرد و پڕ نەبوو، جۆفرۆش پیلی گرت و گوتی:

+ ما خرا، رەوسەت لەبن هێنا.

- بڕۆ، قرچۆک...

کەس شەهابی بە بەڕک بەتاڵی نەبینیوە، بەڕکی وی لە تێکەڵەیی نەناسینەوە لە مەنجەڵەکەی حەمە شێت دەچوو.

حەمە وابوو، هەر شیوێکی هاتبا پێش، چ شل با چ پەیت، گوڕی دەکردە مەنجەڵی لێوار و بن بە تەنی. لەوەوە بۆ ناساندنی تێکەڵوپێکەڵیی شتێک و نەناسینەوەی، شیوی حەمەشێت کەوتە سەر زاری هەولێریان. بەڕکەکەش لەو شێوەیە، شەهاب دڵی هەر شتێکی گرتبا، چ رەق، چ نەرم، بەس پێوەچووبا، دەیخستە بەڕکی شەرواڵیەوە، لە دوورەوە بەڕکەکانی پێش خۆی بە دەردەکەوتن، چەتۆ سەرناس دەیگۆ:

دەڵێی لە ناو بێستانێ و لە گندۆرە دزین هاتۆتەوە.

هەر ئەویش (شێتی گندۆرە لەبەڕکێ)ی بە سەردا بڕی، ئەرێ بەڕکی شەهاب چی تێدابوو؟ وا باشە، بپرسین چی تێدانەبوو؟!

کەس هەیە دەستی بۆ بەڕکی شەهاب بردبێت و داری دەستی وی بە لاشانی نەکەوتبێ؟ باوەڕناکەم، داری شەهاب ئێشکگرێکە حەسحەسی ناو قەیسەریش بخەوێ، شەهابیش پرخەی بێ، ئەو دارە هەر بێدارە. بەوە

دەزانم، چەند بەرەبەیانییەک کە هێشتا چ وەستایەک نەگەیشتبووە مەیدانی کرێکاران و کرێکاری هەڵنەبژاردبوو، من لە وێستگەی ئامانەی بن دیواری قوتابخانەی ئەربائیلۆ، ریزی ئەو بانقە پڕەی بە سەر یانەی فەرمانبەرانی بەرک نیوە بەتاڵدا دەیڕوانی، دەمدیت. هەر لە بەر خاتری ئەویش رێی خۆم دەگۆڕی و کەمێک مەیدانم لە خۆم دووردەخستەوە، رێی من نێوان یانەکە و باخی شار بوو.

لەوێ رادەکشا، تەلیسەکەی تۆ بڵێی تێرکەکەی دەخستە بن سەری، بەرکەکانیشی تەواوێک لە خۆی دوور دەکەوتنەوە، لە دوورەوە دەتگوت دوو منداڵی خەپەن لەو تەنیشت و لەم تەنیشتی خۆی خەواندوونی. دەستی بە دارەوە قووچاویشی لە سەر سینگی لە ئامادەباشی بوو، هێشتا نیو دارتێل مابوو بیگەیێ، پرخەی خەوی دەتگەیشتێ.

خولیای گەڕانی بەرکی شەهاب لە سەرم گەڕا، هەر من نا، فازیل رێحانە گۆتەنی:

نیوەی شار چاویان لە سەر بەرکی شەهابە و حەزدەکەن بزانن چی تێدایە.

رێحانەش لە هەمووان پتر مەراقی لێدایە، سپێدەیەکی زووی هاوینی، ئێمە پاش بانگی دەروێش برایم لە بەلاشاوەوە بەرێدەکەوتین و نەرم نەرم بەرەو مەیدانی کرێکارانی بن قەڵاتێ دەهاتین. ئێ، لە جێی گۆرینێ شەهاب راکشاوە، رێحانە بە پێدزە، لە سەر پەنجە، چوو چوو، دەستی گەیشتە بەرکی و نەگەیشتێ، سەری داری شەهاب بە ئاستەم شانی گرت، گرتنەکە هی ئەوە نەبوو (وای) وا گەورەی لە زاری دەرچێ و حەسحەسمان بێنێتە سەر، بە تووڕەییەوە گوتی:

ئێوە بۆ گێچەڵ بەو شێتە دەکەن؟

زارمان تێکئالا، باش بوو شەهاب فریامان کەوت، بە حەسحەسی گوت:

خۆت شێتی، ئەتوو هەقت نەبێ، بەینی خۆمانە.

حەسحەس لە تەشکی خۆی دا و گەڕایەوە. ئای، چما شەهاب قسەی ئەوهاش دەزانێ! رێحانە برێک پارەی دەرهێنا و بۆی راگرت، شەهاب بە

تووڕەبییەوە:

بڕۆ بڕۆ پیسکە، لۆ خۆت بە سەموون و خۆشاوی بدە.

شەهاب پێدەچوو تەنها چەند شەوێک لەو وێستگەیە خەوتبێت، مێوانخانەی خۆی گۆڕی و لە ناو بازاڕ دوورکەوتەوە، شێتەکانی دی مێوانخانەی خۆیان نەدەگۆڕی. حەمەشێت دەچووە مزگەفتی شێخی چۆلی، پیرداود سەربانی مەچکۆ شێتەکەیدی، ناوم لەبیرچوو، عەلی ئیبادە بوو، کێ بوو، لە گۆڕستانێ دەخەوت، ئەوی دی بەر قاپیی مزگەفتی حاجی لەقلەقی گرتبوو، کەسکوسۆریش...

شەهاب نەدەکەوتە ئاقاری ئەو دابەش و تخووبکاریەی چەند شێتێک شەوان لە بازاڕێ دەیانکێشا، تخووبێکی وا پۆلیسیش نەیدەتوانی بیبەزێنێ، پاشان دێمەوەِ جێی شەوانی شێتان و تخووب و پاوانکاری شەوان. هەوکە باس باسی شەهابە شێتە، چاوم لە سەر بەڕک و گوشەکەی سەر شانیەتی کە زۆر جار شێوەی تێرکەی دەدایێ، تایەکی بە سەر سینگیا شۆڕدەبۆوە تایەکەی دی بە سەر پشتی. چاوم وا لە سەر گەسکە دەسکدارەکەی دەستی، لە شێوەی گەسکی دەستی ئەو کەسانەی هەندێ کەس گووڕێژیان دەگۆتنێ، هەندەکیش گوڵی شاری. چاوم لە سەر کڵاویەتی، کڵاوێک لە ڕەنگی گەڕێ، کەس نازانێ چ شێوەیە، نە رووسی، نە بێریەیی، نە کاسکێت، نە سەپانی، نە هاوینیە نە زستانی. چاوم لە سەر پێ و پێڵاویەتی، بە چلەی هاوینێش پێڵاوی لاستیق و دەلینگی خستۆتە ناو گۆریە، دەڵێی ڕێی کەوتۆتە قوڕ و لیتەی کەندە پیسێ. چاوم لە سەر ئەو دووسێ جلیکانە بەتاڵەیە کە بە دۆخین لێکی گرێداون و بە شانی داداون و وەک بلێی لە چۆلەوانیە و چاو لە ئاو دەگێڕێ. چاوم لە چاویەتی لە کۆتری زارەتریک دەچێ و جێ باڵیکی نیە بۆ نیشتنەوە، بەڵام لە هەموان پتر چاوم لە سەر بەڕکەکانیەتی.

تۆ بڕۆ لە ناو ریم و ئامانە لە شەهاب بڕوانە، هەینێ دەزانی بەڕکی وا گەورە نەبووە و نابێتەوە لە دنیایێ، من دوو سێ جار لە ناو ریمی تووشی بوومە. شەهابناسان دەزانن لە سەر سێ کورسی نەبێت، جێی نابێتەوە، یەک بۆ خۆی دووانیش بۆ بەڕکەکانی. شەهاب و بەڕکی ڕاستی دانیشتبوون،

بەرکـی چەپیشـی رێـی گرتبـوو، نەفەر بە پـازدان و خـۆ تیکـردنەوە لێـی ڕەتدەبوون، شوفێر لە ئاوێنەوە چاوی لێیە:

شەهاب، هەندەک خۆت خڕکەوە، جێی ئەو خەڵکە بکەوە.

شەهاب سەری دارەکەی گەیاندە بن ساپیتەی ریمێ و تەقەی لێوە هێنا:

خۆم لە ناو قوونت خڕکەمەوە!

دیتم نیو درهەمیەکی بە سەر سەران هەڵدا لە پێش شوفێر زرینگەی هات، گوتی:

قرچۆک، بە سێ نەفەرم دانێ.

شـەهاب شـێت بـوو، بەلام خەرجیـی خـۆی بە دەسـت و گەسـکی خـۆی پەیدادەکرد، سەردەمەکی گەسکی دەسکداری درێژی بە دەستەوە بوو، گوڵی شار بوو.

شـەهاب، مردنەکەی گەلەک کەسـەرداره، ئەوە درەنگترە، ئەگەر گەیشـتمە سەرە کوڵانی مەرگی وی، وەهای دەگێڕمەوە دەسەلاتداری شار ببێتە دڵۆپێ ئاو و رۆچێتە ئاوەڕۆی نزیک خولگەی بە تەمای خوای.

شەهاب لە نان پەیداکردنێ لە مەمەد دەچوو.

## کراسەکەی مەمەد

مەمەد ئەو کڵاو لەسەرە، کراسێکی درێژی لەبەرە، کەس نازانێ چ رەنگە، رەنگە سپی بێت و سپیبووبێتەوە، هەندێ سپیبوونەوەش هەیە، رەنگێ دەگرێ کەس نایناسێتەوە. ئەو مەمەدە هەر ئەو شێتەیە کە لە من و تۆ باشتر خومەینی وئاخوندی ناسیبوو، ئەوەبوو کە فڕۆکەی تارانێ دەهاتە ئاسمانێ، شاری دادەبێژا، غاری دەدایە ناو حەمرا نەک حەوشەی شێخەڵا، ئاخر دەیزانی ئاخوند دەست لە مزگەفت ناپارێزێ.

شێتی شار هەر یەکەو بە نیشانێ دەناسرێتەوە، مەمەد لە شتاقیان ناچێ، هێندەی سێ چار شێتان نیشانەی هەیە:

کڵاو، کراسی بێ رەنگ، کۆڵبەری، لیکاو، جوانترین نیشانەشی درووشمی سپی بوو.

مەمەد، لە پەیداکردنی نانیش نەدەکەوتە چێوەی چ شێتان، هەیاسە شێت نەبوو، تا بە یەک پەنجەی هەڕەشە، چی ویستبا، بکەوتایەتە مستی. حەمە شێت نەبوو، بێوەی روو لە کەس بنێ، لە زۆر سەرە کۆڵانەوە، لەگەنە شیوی بۆ بێ. بەخۆکەی بەستەزمانیش نەبوو، تا بە ژماردنی ناوی شێتان، دە عانەیەکی دەستکەوێ. کەسکوسۆریش نەبوو، تا لە مزگەفتی حاجی لەقلەق و شێخە رەشکەوە، لە خواوە بابۆڵەیەکی بکەوێتە کۆشێ. مەمەدە شێت لەوە رەنگە بکەوێتە سووچێکی چێوەی شەهابە شێت و خالیدە شێتی رێی عەنکاوەوە. شەهاب بە گەسکدانی جادە و مەمەد بە کۆلکێشی، بە رەنجی شانی نانی بە دەستدەهانی. هەوکەش گرتەی فەردە برنجەکەی جادەی مەیدانی کۆترانم لە چاوە، ئەها:

دنیا هەورولێڵە، جادە تەڕە، لە پشتەوەی ترومبێل فەردەی راکێشا و خستیە سەر شانی، لە تەلەزمێ، شتێ، گیربوو، دڕا، برنج رژا، بەلاداهات و لە

دەستی کەوت، کەشیدە لەسەر بە سەریدا نەڕاندی:

مەمەد، دنکە برنجێک ناهێنی، فەردەیەکت لە چڵکاوێ ڕۆکرد.

مەمەد مڕانـدنێک مڕانـدی، مەگەر لە شـێرەوە مـڕەی واتـان بیسـتبێت، تێنەگەیشتم چی گۆت، بەڵام هەر دەبێت گوتبێتی:

حاجی گنجی، هاییت لە بەر زاری خۆت بێ، بۆت دەبڑێرم.

دەبێت وای گوتبێت، ئاخر دیتم دەستی خستە بن کڵاوەکەی سەری، چنگێ چارەگ و نیو دیناری دەرهێنا و لە شێوەی شاباش بۆ خاوەن برنجی هەڵدا.

گوێم لە پیاوێکیش بوو:

حەیف، مەمەد، شنگ و هێزت لەبەر نەما، فەردەت لە دەست دەکەوێت، سەردەمانێک هێزی دوو هێسترت تێدا بوو، دەستاڕی شارت دەگێڕا.

دەستاڕی شار؟

ئەها، لەوێ، لە پێچی پێنج عەلی سەرەو ڕێی سەفین پێچبکەوە، بە پێی مەمەد پێنج خولەکێ کەمتر بڕۆ، بە سەریا دەکەوی. لەوێ، من نەمدیتبوو، لێ لە زۆرانم بیستبوو، شتێ لە شێوەی ئاش نا، دەستاڕ هەبوو، هەندێ کەس دینگ و هەندێکیش دەستاڕیان دەگۆتێ. بەشێکی باراشی شار لێرە لێدەکرا، دەستاڕ ئەگەر بەرزە هەبا، بەرزە، ئەگەر نا زەلام رایدەکێشا، ئەوجا دەڵێن:

ئەو مەمەدە کە ئێستا فەردە برنجێکی بۆ ڕاناگیرێ، ئیشی دوو هێستری کردووە و بە تاقی تەنێ ئەو دەستاڕەی گێڕاوە.

مەمەد جاروبار لە ڕێپێوان و ڕژانە سەر جادانیش بۆ یەکی ئایار با، یان تەمووزەکـان و ئەوانـی دی بەشـداریدەکرد، بەڵام درووشـمێکی هەڵـدەگرت، کەس درووشـمی وای نەدیـوە. دەهـات پـارچە مقەبـایەکی وەک کراسـەکەی بەری گریزاوی و لیکاوی، گەزێ کورتتر، نیو گەزێ بەرینتر، جوان دەیگرت و بە سینگی خۆیەوە دەنا، قیت قیت لە نـاو جادە دەڕۆیی. درووشـمی سـەر سـینگی مەمەد کەس نەبـوو تەماشـای نەکـات، کەسـیش نەبـوو پیتێکـی لـێ بخوێنێتەوە، ڕەنگە بیرتان بۆ خەتناخۆشی بچێ، نا، هیچ، مقەبا پیتێکیشی لە سـەر نەنووسـرابوو، هەیـنێ بـۆ مقەبـای هـیچ لەسـەر نەنووسـراو دوو خوێندنەوە هەبوو، هەبوو وای بۆ دەچوو:

مەمەد شێت نیە، درووشمێکی لە دڵە ناویری بیڵی، ناچار بەو شێوە دەریدەبڕێ.

هەبوو دەیگۆ:

شێتە، شێت هەر ئەوەی لێدەوەشێتەوە.

دەگێڕنەوە، جارێک کوردە بۆرەیەکی بەعسی، هەر بە ڕێوە لە سەر مقەباکەی سەر سینگی مەمەد دەنووسێ:

بژی سەرۆک سەدام.

دەڵێن مەمەد بێوەی تەماشای نووسینەکە بکات، مقەبای تێهڵداوە، بە تووڕەییەوە کراسە درێژەکەی هەڵکردووە و ناو جادەی بەجێهێشتووە و هاتۆتەوە سەر شۆستە.

کراسەکەی مەمەد کەس نازانێ چ ڕەنگە، بەڵام دیارە خەتخەتە، کراسێکی عارەبیی درێژ دەگاتە سەر گۆزینگی، چاکەتێکی ڕۆژاوایی، ئەویش قۆڵ و سەردەستەکانی ڕەنگی دیار نیە. مەمەد هەر ڕەنگێ لەبەر بکات، دوای شەو و ڕۆژێ بە لیک دایدەپۆشێ. مەمەد وەک دەڵێن مەگەر بۆ دەزنوێژ وەرنا ئاو ناناسێ، لە ساتی دەزنوێژهەڵگرتنیش، من بە چاوی خۆم لە (شێخ مستەفا) دیتوومە، دوو سێ مستە ئاو بە چاوی خۆیدا دەپژێنێ و لەگەڵ لیکاودا بە بەرۆکیدا دێتەخوارێ، لەبیریدەچێ پێی تەڕبکات، دەچێتە سەر بەرماڵێ، نوێژکەر لێی دووردەکەونەوە، ئەو مەمەدە وەختایەک لە مزگەفتێ بانگیدەدا، جوانیشی دەلەراندەوە.

مەمەد شێت نەبوو، بەڵام شار شێتی بە سەردا بڕی، بەوە بزانن شێت نەبوو، ناوی لە لیستی شێتەکانی بەرخۆکەدا نەبوو. مەمەد هێندەی سێ کۆڵبەر کۆڵی دەکێشا، بەڵام کەمی دەهاتە بەرکێ، زۆر جاریش لێیان دەدزی. مەمەت چاوتێر بوو، دەڵێن جارێک ئەستووکی گەرمی پڕ حەڵوا بۆ هەیاس رادەگرێ، وەریدەگرێ و بەرێزەوە دەستی سوپاس دەخاتە سەر شانی، ئەوەش لە هەیاس نوێ بووە، پێشترێ و دواتریش کەس شتی وای لە هەیاس نەدیتووە.

## هەیاس و کوڕە ئاسن

هەیاس هاتەوە ناو ناوان، بیرتانە لە باسی هەیاس لە زەواری هەیاس راوەستاین و تەواومان نەکرد، هەوکە کژیەتی:

شار هەموو لە پشت بەستەپیازەوە پێدا وەرە، تا دەگەیتە بن کلکمشک، لە دار خورماکەوە شۆڕبەوە، سەر قەڵات بکەوە کۆڵانی مەیفرۆشی شێخانەوە، بڕۆوە سەربازخانە، هەموو فەرموودە سەربازییەکەی هەیاسیان بیستووە:

منداڵی کوورانم لەگەڵ بێن، بەغدا دەگرم.

بەڵام چ گەرەکێ جگە لە کووران، هۆی فەرموودەکە نازانێ، بۆچی بۆ گرتنی بەغدا، منداڵە کوورانی بەگەڵ خۆی دەدا، تۆ بڵێی منداڵی وێندەرێ لە هی جێیان نیشانشکێنتر و چەقۆوەشێنتر و بوێرتر و خاوەن هەرێتر بن؟ نا، با ئەمن پێتانبڵێم:

ئەنگۆ ئەو کوڕە دەناسن، کوڕی قورس و ئاسن، ئەو کوڕەی لە هەڵگرتن و هەڵدانێ، ناوی لە بەغدا دوورتر رۆیشتبوو، ساڵەکی بە هەڵدانێ پشتی هەموو عارەبی لە عەرد دا، ئەو جەبارە پاڵەوان بوو، کار لە جەباری هیندیان و هەمزە پاڵەوان نەبوو، پووشۆ گۆتەنی:

شاخ لە پشتێ دەکات و لە دۆڵی دەپەڕێنێتەوە.

دەگێڕنەوە، ساڵی پێش ئاشبەتاڵێ، لە پێشمەرگایەتی ئەو کوڕە ئاسنە لە سەر پشتی کەرێک دەیەوێ لە رووبارێک بپەڕێتەوە، هەرچی دەکات، بە هەچە هەچە و نەقیزە هەوڵدەدات، بەلاشە.

دادەبەزێ، بە راکێشانیش کەر دەغەزرێ و ناوێرێ لە رووبار بدات، ناچار کەرەکە کە هێندەی هێسترێکە لە پشتێ دەکات و دەیپەڕێنێتەوە، دەڵێتە کەر:

لە وشکانی تۆ لە پشتێم بکە و لە رووباریش تۆ وەرە پشتێ من.

ئەوجا ئەو کوڕە ئاسنە ئەگەر کوورانی نەبا، هەیاس منداڵە کوورانیی نەک بۆ گرتنی بەغدایێ لە راوە جورجیش پێکنەدەکرد، ئاخر هەیاس لەشکری بە پیاو نەدەزانی، ئەوجا منداڵ!

کوڕە ئاسن، تۆ بڵێ زەواری هەیاس، وەهای پیشانی هەیاس دا، لە سیمای هەر منداڵێکی کووران کوڕە ئاسنێ ببینێ. با لە سیلەی خانووێکەوە بە چاوی پووشۆی کوورانی چاودەینە شەڕی کوڕە ئاسن و هەیاس، لە زاری ئەوەوە کە درۆم لێ نەبیستبوو، ببیستین:

بە ترسەوە دەمرۆنیی، وا دیارە هەیاس خودا لێی گۆڕی، ملی بە ملی کوڕە ئاسنەوە نا، لە بەرایی پێکداهەڵقژانێ من وام دانابوو بای هەیاس بێ، ئاخر تا هەینێ کەس نەیتوانیبوو، پشتی هەیاس لە زەوی دا، کێ دەیوێرا لە دڵی خۆشی ناوی بە خراپە بێنێ، بەرخۆکە بە شێتایەتی خۆی ناوی بە بسمیلاوە دەهێنا. کەسیش شەڕی کوڕە ئاسنی نەدیتبوو، کوڕێکی لاشەڕ، گێچەڵیشت پێکردبا، ئاوەڕینەدەدایەوە، بەڵام ئەوجارە شەڕ توند بەرۆکی گرت و ئەویش لێی هەڵنەهات، خۆ هەیاسیش لە خۆڕا بەگژ کەسدا نەدەهات، تێنەگەیشتم لەسەر چی بەرۆکی کوڕە ئاسنی گرت.

ئێ، هەر هێندەم دیت، هەیاس وا لە سەر دەستی کوڕە ئاسن، لە حەوایێ وێنەی فرفرۆکە دەسووڕێ، لەوانەیە بیست سی جارێ لە سەر سەری خۆی سووڕاندبێتی، چ سووڕانێ، دەست و لاقیت نەدەدی. لە هیکەوە، زرم، ترسام و چاوم داخست، چاومکردەوە، دەبینم، خۆی تەکاند و چاوی بە دەوری خۆیدا گێڕا، فیزماڵی دایێ و چوو. منداڵە کوورانی زاریان کردەوە هۆیهای لێبکەن، هەیاس ئاورێکی دایەوە لە هی ئیزرائیل دەچوو، منداڵ هۆیهایان لە هەوک وشکبوو، کوڕە ئاسنیش لێی خوڕین، دواتر کوڕە ئاسن گوتبووی:

لێم نەگەڕا، دەنا هەیاسم خۆشدەوێ و هی ئەوە نیە ئەوهای بەسەربێ.

چیرۆکی هەیاس لێرە تەواو نابێ، ئێستا شتێ لەو شێتە دەگێڕینەوە کە بۆ بژێوی پەنای بۆ ناوی شێتان دەبرد.

## بەرخۆکە

بە ژماردنی ناوی وان رۆژانەی خۆی پەیدادەکرد، ئەو شێتە ناوەکەی بە خۆیەوەیە، بەرخۆکە، بۆ ناوی هەر شێتێ، تەنێ یەک فلسی دەوێ، دە عانەی بدێ چل شێتت بۆ دەڵێ، ئاسان و پاسان، وێنەی دەنکە تەزبێح ئاودیویان دەکات، تەنها لە ناوی دوو شێتان گرێی تێدەکەوێ، لە ناوی جووجک کەمێ رادەوستێ و دەڵێ:

عەسکەر کوشتی، عەسکەر کوشتی.

لە هەیاسیش هەموو گیانی دەلەرزێ و (ب س م ی ل ا) یەکی پساوە، لە شێوەی تەزبێحی پساوەی بە سەر زاردا دێ، بەرخۆکە لە هیچ ژماردنێ، ناوی مەمەدی نەدەگوت، لێیان پرسی:

بۆچی ناوی مەمەد ناڵێی؟

دەیگۆ:

ناوی ئەو لە کنە من نیە.

بەوە ئیسپاتی کرد کە مەمەد شێت نیە.

رۆژێ لە پەنای تەیمانی باخی شار، لە ناو تەزبێحفرۆشان، بایی دوو سێ درهەم ناوی شێتانی ریز کرد، ناوی شێتی وای دەگۆ ئێسکیشی نەمابوو، ناوی شێتی واش تازە بە جادە کەوتبوون و هێشتا شار نەیناسیبوون، بەرخۆکە هەمیشە خۆشی دەخستە ریزی دواوەی ناوان و دەیگۆ:

بە خۆشم.

ئۆجا بەر لەوەی ناوی خۆی بڵێ، حەمە رەزا بە سەردا هات و بەرخۆکە دەستی بۆ درێژکرد و گوتی:

ئەوەش، ئەوەش...

وا دیارە ناوی وی لەبیرکردبوو، حەمە رەزا شێت لە شێوەی کەڵەشێری شامی گڤبۆوە و بە کەپوو گوتی:

لۆ مەلیک چ عەیبی هەبوو؟!

حەمە رەزا، گن بوو، خەڵک باش تێینەدەگەیشت، بەرخۆکە منداڵانە پێکەنی و گوتی:

ئا، مەلیکیش، مەلیکیش.

نەخۆ بەخۆکە سەر بە چ کۆلانێکی دی نەکاتەوە، بە چەند پەیڤێکی رۆندکاوی مەرگەکەی دەگێرمەوە، کە لە مەرگی چ شێتێکی دنیا ناچی، ئەنگۆ لە من باشتر دەزانن، بەرخۆکە بەرخێ بوو لەو گۆرە، زیانی قەرسیلیشی نەبوو، کەس دڵی نەدەهات، نەک دەستی لێ راستبکاتەوە، بە توندیش قسەی دەگەڵ بکات، کەچی لەو ساڵەی پێشمەرگە باری کەوتە لیژی و سەری سەربەسەر زێرِی دەکرد، ئەو ساڵەی جاشە کورد، بۆ بەجاش مانەوەی خۆی، ژنی خۆی لۆ عارەبان دەبردا دەگێرِنەوە:

جاش، دوای برِێ، وا بۆ راوە پێشمەرگە وەک چاویەشە بن بەرد بن بەرد دەگەرِێ، چەند جاشێ دوایوەی نائومێد دەبن و تێدەگەن سەری پێشمەرگە خواردنی وان نیە، بیریان بۆ سەری شوان و شێت و دەرۆزەکەر دەچێ، دێن پوختە بەرخۆکە گۆشاوگۆش سەردەبرِن و بە ناوی سەری پێشمەرگەوە، دەستەودیاری دەیبەن بۆ حوکمەت.

وا تێبگەم ئەو جاشەی سەری برِی، خالقێ لە ناوەکەیدا هەبوو.

ئیدی بەخۆکەش چووە ریزی گەشمردانەوە، ئێ...

## حەمە رەزا و قازی

حەمە رەزا شێت، مەلیکی زاری بەخۆکە بە هەندی هەڵنەگرت و بە ناو ئاپۆرەی کۆلانی دەلالخانەدا، رووە و قەلات ملی نا، تا گەیشتە سەری کۆلانێش سەری دیار بوو، ئاخر ئەو پیاوە بەژنی نیو دارتێلی بوو، تا بزر نەبووە، وا چاکە بیخەینە چەند رستەیەکەوە:

حەمە رەزا شێت، رستەیەکی هەبوو، رۆژ نەبوو، نازانم شەو، بەلام بە رۆژ، هەزار کەڕەت دەیگوتەوە:

لۆ، مەلیک چ عەیبی هەبوو؟

حەمە رەزا، تا دڵ دەیگرێ، رکۆنی، لێ رک لە کێ؟ لە مەهابادییان پتر رکی لە حەمە رەزا شا و رەزای بابی دەبۆوە، ئەو حەمە رەزایە لە بەژن بێ رەزایە، لە بن قەلاتێ، روو لە رۆژهەلاتێ، هەزار تفی بۆ شاهنشا دەنارد و گنانە دەیگۆ:

قازی محەمەد لە خودا قازیتر بوو.

حەمە رەزا شێت، لە ئاغایان پتر دژی کۆماری کەریم بوو، هەمیشە نزای بۆ گەڕانەوەی سەردەمی پاشایەتی دەخوێند، وام بیست، پاشاویستیی وی لەوەوە هاتووە کە لە سەربازیدا لە سەر ئەوە بووە پلەیەک بەرزبکرێتەوە و ببێتە شتێ، رووخانی پاشایەتی بە سەردا هاتووە و کۆمار جێی گرتۆتەوە، مرازی نایەتەدی و لە هەینێوەش بە جادە کەوتووە.

بەلام کەس لەوە نەگەیشت بۆچی وێنەیَ پاشای ئۆردەنی بە سینگی خۆیەوە هەڵدەواسی، سەر سینگی حەمە رەزا شێت سەد وێنەی پێوە بوو، لە ناویان هەنیەی پاشا حوسێن وەک نالچە دەبریسکایەوە، چاوی قازی محەمەدیش، ئەوەی بە سەرکۆتی گرتبووی دەدرەوشایەوە، ئیدی ئەو حەمە رەزا شێت بوو، دژە کۆمار و پاشا ویست بوو، لە سەر هەندێش لەگەڵ سالح ستالین لە ملە بوون.

## سالح ستالین

ئێوە ساڵحە شێتتان دیتبوو، ئەها هەمیشە داسوولکەیەک و دوو سێ گەسکی بە دەستەوە بوو، بیرتانکەوتەوە؟

ئەو ساڵحەی زۆر جار پەڕۆکێکی سۆر سۆر، لە ئاڵای کۆمۆنیستان سۆرتری لە مل دەئاڵاند و پاشۆڵێ حەتحەتۆکەی بە سینگی خۆیەوە دەکرد، لە ناو حەتحەتۆکانیش وێنەی ستالینی سەرۆکی رووسیا، لە دوورەوە بە سمێڵ دەناسرایەوە، ئەو پیاوە کوشتەی ستالین بوو، کێ زاخی دەکرد لە کنە وی ناوی بە خراپە بهێنێ. ئەو ساڵحە دەڵێم، هەوریی دەبەست و سبەینان زوو بەر لە تاو کەوتنێ، هێشتا شەبانە نەچووبوونەوە ماڵێ، دیتبوویان لە خولگەی کۆترەکە بە دیوی چاخانەی قەرداران، روو لە جادەی شێخی چۆلی و منارەی چۆلی، دەستی دەخستە بن گوێی و تێیهەڵدەکردە:

**حەیران دەڵێم**

**قەراج قەراجە، قەراجۆک لە غێمێ...**

حەیرانی خۆش دەگۆ، من جارێک گوێم لە دەنگی وی بووە، لە قەیسەری لە کۆڵانی پەنیرفرۆشان، تێیهەڵکردبووە:

**حەیران، کیژۆرە ئەسمەرێ...**

ساڵحە شێت، تۆ بڵێ ساڵحە داس، یان سالح ستالین، سێ زمانی وەک بلبل دەزانی، کوردی و عارەبی و تورکمانی، بە کیهە لەوانە قسەت دەگەڵ کردبا، بە وی دەهاتە گۆ. بە هەر سێ زمانیش بە سێ دەنگا جوێنی بە کۆماری و پاشایەتی دەدا و بە رووسیایدا هەڵدەگۆ. سالح لە زیندانێ، لە بن قامچی و ئەشکەنجەدانێ شێت بوو، گرتنەکەی ساڵحە شێت بە سەرە داوێک دەگەیشتەوە هەستانەکەی حەسەن سەریع.

جگە لە ستالین جاروبار وێنەی مەلا مستەفاشی دەخستە ناو

حەتحەتۆکانەوە، جارێک کەسێک دەڵێتە سالح ستالین:

سالح، سەرۆکی کوردان قەینا، بەڵام ئەو سەر کۆتە سمێڵ قیتە چیە بە سینگتەوە؟

سالح بە تووڕەییەوە:

برۆ منداڵ، تۆ چ تێدەگەی؟

پەنجە دەخاتە سەر ستالین و دەڵێ:

ئەگەر ئەوە نەبا،

کەمێک رادەوەستێ، پەنجە هەڵدەگرێ دەیخاتە سەر مەلا و دەڵێ:

ئەوە هەر نەدەبوو!

هەبوو لە دوورەوە، دەیگۆتە سالحە شێت:

کوا چەکوچ؟ داس بێ چەکوچ نابێ، ستالین بەوە رازی نابێ.

سالح ستالین، لە داس و گەسکی دەستی نزدەبۆوە، لەپڕ داسەکەی هەڵەشەقاند و بە دەوری خۆیدا دەسووڕایەوە، تیژ دەیقووچاند.

سالحە شێتیش رکۆنی بوو، رکی لە پیاوی میری دەبۆوە، بەو با سەگی گڕووی بە تەنیشتدا هاتبا، پۆلیسێک، چەکدارێک لێی نزیک نەکەوتبا. وا بزانم هەر لە داخی ئەو دوو بێریە سۆرەی لە نزیک چاخانەی سەید سەلیم رادەوەستان، بە کوردی و پڕ بە گەرووی دەنگی هەڵدەبڕی:

داکم قوربانی مەلای رووسی بێ.

هەینێ ناوهێنانی ئەو مەلایە وەک تریاکی بەرکی کاکە شێت، بڤە بوو.

## کاکە شێت

ئەو کاکە شێتەش فرۆکەی کۆماری بەکر- سەدام لە ناوپردان شێتی کرد. بەر لە شێتبوونی، خاوەن دوو ژن و خەیاڵی جوان بوو، پێدەچوو بۆ نەبیستنی قرەقرِی ژنەکانی، ناوە ناوە خەیاڵی دەبوو، چ خەیاڵێ، جۆگەی چلکاوی لێ دەبووە زێی بادینان. کاکە شێت پێش شێتی، بۆ مەبەستی خەیاڵبوون و مەستی، کەم پەنای بۆ بادە دەبرد، شتەکی دی هەبوو، هەینێ کەم تەیراوەبی دەیناسی، خەڵک ناویشیان نەبیستبوو. شتێ بوو هەر هێندەی قلە قشپل، رەنگ بۆر، بە قاچاخ لە لای مووسڵەوە دەهات، حەشیشیان دەگۆتێ، کاکە شێت لەوەی دەخوارد، بە قلێ دوو، وەها مەست دەبوو، خۆی لێ دەبووە دوو، هەر یەکەو بۆ هۆدەی ژنێکی دەچوو، لە سەر بانەوە بینیبوویان و بیستبوویان، کاکە شێتی پێش شێتی، وا لە حەوشە لەگەڵ خۆی قسەدەکات و خۆی دابەشدەکات:

تۆ برِۆ کن....

تۆش برِۆ کن...

ناوی ژنەکانی دەڵێ، وا دیارە پێکنایەن، پشتیان تیدەکات و دەرگای حەوشە دادەخات و دەچێتە کۆڵان، پاش پشوویکی باش دیتەوە و دەبێتەوە نوورەدینەکەی پێش تریاک.

سەربردەی نوورەدینی پاشتر کاکە شێت لە زاری زرارەوە خۆشە:

دەمەو ئێوارانێ، لەو بەرەی (کورد و عارەب) پێدەچوو باشیان لێدابێ، لێدان لەو شتە بۆرەی هەر هێندەی قلە قشپلێ دەبوو، دەست لە ناو دەست لە دەو جۆگەی چلکاوێ کە جووجکەش دەیتوانی بە سەریا بازبدا، ئەوان تێدامابوون، بە ترسەوە دەهاتن پێیان دەخستە رۆخی جۆگە، جۆگەلە بواری نەدەدا، پاشەوپاش دەکشانەوە، دیسان نزیکدەبوونەوە، دەگەڕانەوە، بەو

هاوینە جۆگەلەی چڵکاوی کۆڵانێکی تەیراوە لە نوورەدین و برادەرەکەی بۆتە بەستی شەرغەی بەهاران، بۆتە زێی بادینان و بوار نادا بپەڕنەوە بەری مەبەست. ئەو سەر و ئەم سەریان دەکرد، چاودەگێڕن، ئێ ئەوە خوایە، تەنکاییەک، پردێک، بەردەبازێک، ببیننەوە، نیە. لە چاوی وان چتۆ لافاوێک هەستاوە! شار لە سیەکانی سەدەی بیستەمیش لافاوی وای نەدیوە، لافاوێ بۆ پەڕینەوە پاپۆڕی دەوێ.

ئەو دوو بە ترياک مەستە، دەترسێن و دەکشێنەوە، گوێم لێیە دەڵێن:

با بچینە کۆڵانی مزگەفتێ، لەوێ پاپۆڕ هەیە.

کاکە شێت پێش شێتبوون، لە دەمی مەستبوون، وابوو، جامیلکە ئاوێکی لێ دەبووە دەریاچە، تەیراوەی لێ دەبوو چەند دوورگەیەکی لێکدی دوور، بە دوای بەلەم و پاپۆڕدا دەگەڕا، دوای شێتبوونیش بە پەڕی کلکی کەڵەباب، باڵی بۆ خۆی چێدەکرد، باڵی لێ دەڕوا، دەیگۆ:

دەبێت لە فڕۆکە بڵندتر بفڕم.

کاکە شێت گوێی لە گڕەگڕێ دەبوو، خێرا خۆی دەدایە پەنایێ، بە ناولەپ سێبەری لە چاوی دەکرد و بە ترسەوە لە کەلێنی پەنجانەوە ئاسمان دەگەڕا، کاتێ پێدەکەوت فڕۆکە نیە، دەکەوتەوە ڕێ، ئەگەر فڕۆکەش با، چاوی دادەخست، کەڵەباب ئاسا باڵی لێکدەدا و هەوڵی فڕینی دەدا.

کاکە شێت هەترەشی لە فڕۆکە چووبوو، دەڵێن شێت بە هۆی چیەوە شێت بێ، بەو دەگرێ. کاکە شێتیش بە فڕۆکەی گرت، منداڵە تەیراوەیی بیریانە، ئەو شەوەی شار بە چیا کەوت، کاکە شێتی دوو ژنیش بەگەڵ کەوت و چەکی پێشمەرگایەتی هەڵگرت.

پێش هەرەسێ، ئەو ساڵەی چیا نەما، جێ نەما، فڕۆکەی بەغدا داینەبێژێ و نەیکاتە سەرەند و بێژنگ، کاکە شێت کە چ نیشانەی شێتایەتی تێدا نەبوو، لە ناوپردانێ، لەپڕ فڕۆکە دەگرن بەری ئاسمانێ، کاکەشێت دەکەوێتە بن بۆردومانێ. ئیدی لەوێ بە تەواوی بە چیا دەکەوێ! لەگەڵ ئاشبەتاڵێ، بێ خۆ رادەستکردنەوە دێتەوە، ئیدی لەو ساڵەوە تا ئێرە، کۆڵان کۆڵان تەیراوە و شار دەکات و بە ماڵ و کن ژنەکانی ناکەوێتەوە.

ئەو حوکمەتە وایە، زۆر کەسی شێت کرد و زۆریشی بە شێتی کوشت، ئەنگۆ راوە شێتتان لەبیرە؟ سەد خۆزگە بە راوە سەگ! پاشتر راوە شێتم بیربهێننەوە.

## شێتی بادە لە بەرکێ

لە بادەخۆرەکانەوە پێدادێم، شێتی بادەخۆر زۆر بوون، لێ هەوکە بیرم بەربادە و کەمیانم لە یادە. ئەها ئەو هەمیشە مەستە، ناوی نازانم، لێ چ قەیدیە، با شێتی بادە لەبەرکێ ناو بێ، ئەو شێتە لە دارا شێت نەدەچوو، پێدەچوو شتێ لە ئایین و نەریتی لە مەژی مابێ. دەچووە پەناوپەسیوان، دوور لە چاوان، سەری شووشەی دەکردەوە، نەرم بە لێویەوە دەنا، بلەز گەزەی لە سەلکە توور یان گێزەر دەدا.

شێتی بادە لە بەرکێ، ویسکی و تووری لێ نەدەبرا، تاقە شێتی شارە، بادە بە دەرۆزەکردنی ئێخستبێ، دەگەڕا، لە تاریکیەوە بۆ تاریکی، مەست مەست مەیدانی کرێکاران و شێخەڵا و ناو قەیسەری و بن قەڵات دەگەڕا، لە من نیو درهەم، لە تۆ درهەمێ، لەوێهێ روپیەیێ، پارەی دەناسیەوە، کاتێ دەیدی بایی چارەگێکی لە بەرکێیە، یەکپێ دەگەیشتە بادەفرۆشەکەی ریزی بەنزینخانەی کۆن، ئەوەی پشتی لە بن لەیلووکان بوو، بە زۆری لەوێی دەکڕی، چارەگێ ویسکی دەخستە بەر باخەڵی.

ناسیارێ گێڕایەوە:

رۆژێ چارەگێ ویسکیم بۆی راگرت، گۆتی:

لایبە، ناخۆمەوە.

چەندی کردم و کۆشام، لێی وەرنەگرتم، پارەی چارەگێکم بۆی راگرت، خستیە گیرفانیەوە یەکپێ هەیپەی لێکرد، تا گەیشتە بادەفرۆشەکە نە ئاوڕیدایەوە، نە دەستی لە کەس پانکردەوە.

شێتی بادە لە بەرکێ دواتر، دوایوەی شار بە دیوی ئازادی و گرانیدا وەرگەڕا، مێزی گواستەوە کۆڵانە تەنگەبەرە لاچەپەکەی پشت پایزە، پایزە ئەو کتێبخانەیەی سەرشارە لە سەرهاتی شار. رەنگە لە (کۆڵان کۆڵان گێڕانەوە) نەگێڕدرێتەوە، ئاخر هەزار و یەک سەربردەیە... بادە لە بەرکێ

لەوێ ڕۆژێ یەک دوو چارەک ویسکی بە سەلکە توورێکی سۆری گەورەوە هەڵدەچۆڕاند. ئێ، جارێ لە پایزە و کۆڵانی تەنگەبەر گەڕێ، ڕۆژێ کەسێ لە بادە لەبەڕکێ دەپرسێ:

شێتە، بۆچی عارەق دەخۆیتەوە؟

شێتی بادە لە بەڕک وا باگۆی دەداتەوە:

ئەگەر عارەق نەخۆمەوە، شێت دەبم.

نازانم کێ بوو گێڕایەوە:

ڕۆژێ لە بن پەرژینی باخی شار، جومعە گێچەڵی پێدەکات، داخوا گێچەڵی شێت بە شێت چۆن بێ! داوای پارەی لێدەکات، شێتی بادە لە بەڕکێش لەو دەمە عانەیەکی لە بەڕکی نیە، ناچار چارەگە نیوەکەی دەداتێ، جومعە سەری دەکاتەوە بۆنی دەکات، یەعی دەکات و دەیڕێژێ، باشە بۆ نەیخواردەوە؟ خۆ ئەویش دەیخواردەوە.

بادە لە بەڕکێ خوای نامێنێ، تا هێزی تێدایە مستێ لە سینگی جومعە دەدات، ڕەنگە ئەوە یەکەم مست و دوا مستی ئەو شێتە بووبێت، ئاخر لە دوای بەرخۆکە لە بەرخۆکەیی چ شێتێ نەدەگەیشتە ئەو شێتە.

ئێ، جومعە ملی خۆی شۆڕدەکات و دەڕوات، جارێکی دی زاخ ناکات خۆ لەو شێتە بدات.

## جومعه و عه‌مۆ جه‌لیل

جومعه له شێتان ده‌چوو، شێتانه‌ش ده‌ژیا، به‌ڵام شێت نه‌بوو، دارا زۆر له‌و شێتتر بوو، ئیدی شێت بێ و شێت نه‌بێ، به جومعه شێت ناوی رۆیشت.

ئه‌و شێته ناوه خڕکه به‌ردی ده‌ستده‌دایێ، به‌ڵام نه‌ده‌وێرا رایوه‌شێنێ، شێتێکی نه‌وێرۆک بوو، چاوت لێ سوورکردباوه، سه‌ری داده‌خست و باریکه‌ی ده‌دایێ و ده‌چوو، به‌ڵام زانیبای لێی ده‌ترسی، گیڤده‌بۆوه، خۆی لاترقه‌وچ ده‌کرد، به‌ردێکی راده‌ئاراند، به‌ڵام به مه‌به‌ستی ترساندن نه‌ک لێدان. جومعه هه‌میشه به‌ردی له ده‌ست و به‌ڕک بوو، به‌ڵام پیاوی راوه‌شاندن نه‌بوو، له‌وه پێچه‌وانه‌ی حه‌سه‌ن په‌نجاو پێنج بوو، ئه‌و حه‌سه‌نه بۆ هه‌ر به‌ردێک دانه‌وییبێته‌وه، رایوه‌شاندووه و نیشانیشی پێکاوه، دوایی ئه‌و په‌نجاوپێنجه‌م به‌بیربهێننه‌وه.

جومعه زۆری ده‌خوارده‌وه، به‌ڵام که‌می پێوه دیار بوو، پتر شێتایه‌تیه‌که‌ی خۆی ده‌رده‌خست، عه‌مۆ جه‌لیل کاتێ جومعه‌ی ده‌دی، له دووره‌وه که‌پووی خۆی ده‌گرت و ده‌یگۆ:

عاره‌قخۆره پیسه‌که هات.

ده‌یانگۆته عه‌مۆ جه‌لیل:

ئه‌رێ، جومعه دینه، یان نا؟

عه‌مۆ جه‌لیل:

ب خودێ ئه‌ز دین بم، ئه‌و عاره‌قخۆره دین نیه.

عه‌مۆ جه‌لیل ده‌ڵاڵخانه‌یێ سه‌ربرده‌ی هه‌یه، رۆژه‌کی من له‌وێ نه‌بووم، ئه‌وجاری ئۆباڵ به ملی گۆتیاری:

جومعه ده‌ست ده‌خاته سه‌ر شانی عه‌مۆ جه‌لیل و ده‌ڵێ:

رادوێن فرێده، بگره ئه‌و خڕکه به‌رده، مندالّه شاری له به‌رد نه‌بێ

ناگەڕێنەوە، وریابە، سوارت دەبن، ها!

لەو دەمە حەسەن سیساوە تێهەڵدەکاتە حەیرانێ، عەمۆ پتر دەنگی دەداتێ و وا باگۆی جومعە دەداتەوە:

لاکۆ لاکۆ، حەیران چێترە لە بەرد، کەس بە گژ حەسەندا نایێ، قوونیش بە بەرد پاسناکرێ.

پاشتری عەمۆ جەلیل بە خۆ و رادیۆوە لە زۆر سەرە کۆڵان دەردەکەوێتەوە، ئێستا باس باسی شێتە بادەخۆرەکانە، نەبادا جومعە نەبینمەوە، بە سەر چەند ساڵێکدا بازدەدەم:

ئەو ساڵەی بەغدا لە هەولێر راونرا و لە مووسڵ و مەخموور و کەرکووک خۆی گرتەوە، جومعەی چەمبەری دەچێتە مووسڵ، لەوێ جادە جادە چاوی دەگێڕا، زانیبای کەسێک هەولێرییە، بەرۆکی دەگرت و دەیگۆ:

نیو دینارم نەدەیتێ، دەڵێم ئەوە پێشمەرگەیە و بە گرتنت دەدەم.

کابراش خواخوای بوو لە کۆڵی بێتەوە، بە کرێی پارەکەی لە مستی دەنا .

دارا گۆتبووی:

ئەو قووندەرە لە مووسڵی بێتەوە، بە عارەق دەیخنکێنم!

## دارا و باده و مووس

دارا، وای دارا! عارەق هەر لە تۆ دێ دارا، دارا لە خوێن چووبۆوە سەر بابی، بەڵام دوو خوێنی جوایەز، بابی دارا تا لە خوێنی خۆی گەوزی تفەنگچی بوو، تینووی خوێن بوو، خوێنی خەڵکی، دارا کوشتەی بادە و خوێنە، خوێنی خۆی.

شار دەزانێ دارا کوڕی حەمەی سابیرە، ئەو جاشەی لە سەردەمی زوو، سەردەمی بەرایی جاشایەتی نوێباو، ڕۆژەکی لە تۆڵەی کەسەکی، بە ناو شار دەکەوێ، هەر کێ ڕانکوچۆغەی کری لە بەر دەبێ، تەقەی لێدەکات، ئیدی شارێکی لە خۆ کردە دوژمن، ئەوجا زۆر کەس دەڵێن:

ئەو دارایە شێت نیە، لە ترسی دوژمنەکانی خۆی و بابی، تۆ بڵێ لە ترسی شار خۆی شێت کردووە.

ئیدی، شار وەک شێت هەڵسوکەوتی لەگەڵ دەکات، ئەو شێتە کەڵەگەتە بە زۆر نیشانە دەناسرێتەوە، جوانترینیان شووشەی عارەقی دەستی، خوێنی سەر سینگ و قۆڵی، بەوانە مینا گای قەش لە دوورەوە دەناسرێتەوە.

دارا شێتێکی لاشەڕە، بە گژ خۆیدا نەبێ، بە گژ کەسدا ناچێ، بەڵام هەرچی شێتی شارە، جگە لە هەیاس کە منەتی پادشاش نازانێ، لێی دەترسن، شێتەکان لێی دەترسن و لە دوورەوە کە دەیبینن، ڕێی خۆیان دەگۆڕن، ئاخر کێ هەیە لەو پیاوە بەژن دارتێلە، لە خوێن هەڵکێشراوە، شووشە لە دەستە، پەڕۆ لە سەرە نەترسێ. هەرکاتێ دەتدی، دەتگوت هەر ئێستا لە شەڕی سابیر سارووخ هاتۆتەوە، ئەنگۆ ئەو سارووخە دەناسن، وا نیە؟ ئەوەی تەیراوە دەڵێم، ئەوەی هەر کێ چووبێتە شەڕی وی، بە برینی شەش چەقۆوە گەڕاوەتەوە، لە سابیر گەڕێ، سەرباسمان دارایە. ئەرێ ئەو پەڕۆیەی بۆ لە سەر دەبەست؟ پێدەچوو چاوی لە پرووسلی کردبێ!

دارا زۆر دەخـواتەوە، لە حەمەد مەسـتان و خەیـامی هەولێـریی پتـر دەخـواتەوە، لە مەحمـوود زامداریشـی تێپەڕانـدووە، شێتی بـادە لە بەرکێش لەگەڵی دەرناچێت، مەگەر عەلی ئیبادە لە بادە باری ببات و بای لێ ببڕێ. دارا لە نـاو جـادە و بە دەم ڕۆیشـتنەوە دەخـواتەوە، بـادەخۆر هەیە خـۆزی پێدەخوازێ، خۆزی بە ئازادیی وی دەخوازێ، بە دڵی خۆی دێ و دەچێ و دەخواتەوە، کەس ناپرسێ:

لە کوێوە بۆ کوێ؟

کەس ناڵێ:

ئەو گووەت بە سندان بێ.

دارا جاروبار دڵی خوێن دەخوازێ، دێ بە دەمە مووسـێ سینگ و قـۆڵی خۆی بە خـوێن دێنـێ، خـوێن چۆڕاوگە دەبەستێ. بڕواننە سـەر رووومەت و باسک و سینگی، تەمەنێ برینی پێوەیە، هەمـوو کەرت کەرتە، خـوێنی چەند ساڵ لەوەوپێشی پێوە وشکبۆتەوە. من زۆر جاران بە خوێنی تەڕەوە دیومە، بەڵام چ جارێ هێندەی بن درەختەکە خوێنی لە بەر نەڕۆیی.

بەر لە پیشاندانەوەی دیمەنی بن درەختەکەی کۆشکی باکوور، دیمەنی بن درەخـتەکەی نزیـک شـیراتۆن، ڕێـی دەرگـای ڕۆژهەڵاتـی بـاخی گڵکەنـدم بیرکەوتەوە:

لەوێ وێنەی دوو هـاوڕێی گیانیی ئەمەکدار لە شـانی یەک دانیشـتبوون، سـەگەکە پێـدەچوو حەزی لە خـواردنەوە نەبێـت، بەڵام دارا بە زۆر دەرخواردی دەدات و دەڵێ:

برادەر، ترسی بڕانت نەبێت، زۆری تێدایە، نابڕێ، بێ منەت بخۆوە.

داخـوا لە کەینێـوە بە زاریەوە دەکـات، سـەگی هـاوڕێ دەڵێـی سـەری گێژدەخوات، چاوە زەردە جوانەکانی کەوت و پێ لە کلکیشـی بنێی هەڵنایە. لەگەڵ ئـازاد خەتخـۆش لە دوورەوە تەماشـای ئەو دوو هـاوڕێ بـۆ یەک ئەمەکدارە دەکەین، زۆری نەبرد، سە سەری خستە سـەر رانی دارا و کپ کەوت، گۆتمە خەتخۆش:

تۆ حەز دەکەیت، سەگەکە بی، یان دارا؟

گۆتی:

ئەدی تۆ؟

گۆتم:

سەگەکە.

ئێ، با بچمەوە کۆشکی باکوور، ئەو کۆشکەی سەردەمانێ بادەی وێ، تامی بادەی بە هەشتی دەدا. لە گەرماوی ئیسکان دەهاتمەوە، دارا لە بن درەختەکەی سەر سیلەی کۆشکی باکوور راوەستاوە، چاودەنێ، بەو چێشتەنگاوە چەند بەربادە، پشت بە درەختەوە، تەنیشت لە بارەکە، بە سینگی رووتەوە روو لە جادەی گەرماوە، دەستێکی مووس دەستێکی شووشەی بادە، دەمە مووسێ دەگەیەنێتە سەرووی گۆی مەمکی، خوێن فیچقە دەکات، قومێک لە شووشە دەدات، نیوەی قووتدەدات و نیوەی تفدەکاتەوە سەر برینەکەی، خوێن و بادە تێکەڵ دەبن.

ئەو شێتە بە شێوەیێ مووس لە خۆی دەدات، پشکە خوێنێ لە لەشی نەمێنێ، وەک بڵێی بیەوێ لەو خوێنە پاکبێتەوە کە هەستدەکات لە تاوانەکانی باوکیەوە هاتۆتە لەشیەوە.

من لە تیەوە تیچاوم لە سەریەتی، جێی مووس دەگۆڕێ، لەو جێیانەی زاری ناگاتێ، دێ، چۆڕێ لە گۆلمی دەکات و پێیدەبرژێنێتەوە، دارا شێت تێکەڵی خوێن و بادە دەبێت، رەنگێکی گرتووە تەنها لە خۆی دێت، دارا شێت تینی راوەستانی تێدا نامێنێت، لە جێی خۆی دادەنیشێت، بەڵام دەستی مووس و بادە لە کار ناکەون.

ئەرێ بۆ کەسێ نایێ دەستی بگرێ، ئەو شێتە خۆی کوشت، هێندەی جوانەگایێ خوێن لە بەری رۆیشت، تۆ بڵێی خەڵکیش وەک من لێی بترسن و نەوێرن لێی نزیکبکەونەوە؟ دیتم یەک بە خۆی راکشا، تەنها سەر شان و پشتە سەری بە درەختەکەوە ما، ئەو هێندە بادەیەی مابوو، بە سەر زاریەوە کرد، دەستی پێ تەڕ دەکرد و لە لەشی خۆی هەڵدەسوو.

نە دڵم دێ بەجێیبێڵم، نە دەوێرم لێی نزیکببمەوە، چاوم لە سەری ناترووکێنم، ئەها هەست و خوستی نەما، دووربێ نەمردبێ! پیاوێ بە

دیاریەوە راوەستا:

تۆ گیایەک بوویت، لە سەر بنجی خۆت نەڕوایت.

ئاهێکی هەڵکێشا و ڕۆیشت.

ژنێکی سەر بە عەبا، ئاوڕی لێدایەوە:

پشیلەکە، ئەوە گیانیَ چەندەمە دەیدەیت؟

حەیف، بە بەر چاومەوە دارا شێت دەمرێ، و هیچم لە دەستنایە.

من هێشتا لە دووری وی راوەستاوم، دیتم پیاوێک بە مەسینە ئاوێکەوە هات، بە دەم دەموچاو و سینگ خاوێنکردنەوەی:

بابی بابم، بخۆوە بخۆوە، بەڵام ئەوها نا، لۆ خۆت دەکوژی؟ خەڵک دەخواتەوە بە گوڵ دەگرێ، تۆ بە مووس!

گازیکردم یارییدەم، بە ترسەوە بە هانایەوە چووم، لە دەمی قیتکردنەوە، نازانم چۆن خۆی سووڕاند و کەوتە باوەشی من، منی تازە لە گەرماو هاتوو لە خوێن هەڵکێشرام، سەرەتا وام زانی دەمە مووسێکی گەیاندۆتە منیش، بە پرتاو لە خۆم دوورخستەوە و دوورکەوتمەوە، دارا قیتبۆوە، شێتانە نا، مەستانە کەوتە قسە، هێندەی تێگەیشتم:

من دەزانم چ رۆژێ دەمرم، جارێ زۆرم ماوە.

وابوو، زانیبووی زۆری ماوە، هەندێ شێت دەزانن، چ رۆژێ دەمرن، بۆ ئەو زانینە، دەبێت بگەمەوە عەلی ئیبادە و ناچارم دیسان بە سەر ساڵانێکدا بازبدەم.

# ئیبادە و دارا

عەلیێ هەیە ماڵ لە گۆڕستانی شێخی چۆلی، بە دیار گۆڕی حەمە شێتەوە دەڵێی مجێورە، نەوزادە شێتی شێتی چایە، لە خۆڕا نەیگوتبووە ئیبادە:

هێندەی تۆ لە گۆڕستان بمێنمەوە دەبمە گۆڕ.

ئیبادە وا باگۆی دابۆوە:

شێتە لە جێی قۆریەک چایە، سێ بیرە بخۆوە، با مێشکت بێتەوە جێی خۆی.

جارێ لە شێتی چایە گەڕێ.

ئەو ئیبادەیە برادەری گیانی بە گیانی دارایە، لە دنیایێ نەبووە و نابێتەوە دوو شێت هێندە دۆست و تەبا بن. ئیبادە لە خواردنەوە رەنگی دارا نیە، هێرە بە بیرە دەکات، پێش خۆی تارومار دەکات و خۆشی وێران دەکات، بیست بیرەیان لە پێش ریزکردووە، دەمژمێرێکی نەبردووە، هەموو ئیبادە کردووە، هەر لە هەندێشەوە، ئەو ئیبادەیەی بە دواکەوتووە.

لەو ساڵانەی دوایی دارا و ئیبادە زۆر پێکەوە دەگەڕان و لە گۆڕستانی چۆلی لە خەوتنێ گۆڕێکیان نێوان بوو، لە چاخانەی قامیشان چایەکیان بە نیوە دەخواردەوە، لە بوتڵێ بادەیان دەخواردەوە و لە مزگەفتی کوورەچیانی گەڕەکی جووان پێکەوە دەچوونە سەر پێشاو.

بەر لەوەی تاریکی بە سەر گۆڕستانی چۆلیدا بکشێ، دەگەیشتنەوە سەر گۆڕەکەی حەمە شێت، ئەوانە بێ یەکتر خەویان لێ نەدەکەوت، بە دەم گێڕانەوەی سەربردەی رۆژانەی خۆیان خەو دەیبردنەوە، ئەگەر شەوەکەش سووی ساردبا، لەوێ ئاگری شوان نا، هی شێتانیان دەکردەوە، رووناهییان دەبەخشیە گۆڕەکەی حەمە شێت.

ئێوە بیرتانە، کامیان پێش کامیان مرد؟

تا بەبیرتان دێتەوە، سەربردەی مردنەکە، گفتوگۆی مردنی نێوان ئەو دوو هاوڕێ ئەمەکدارە شێتە دەگێڕمەوە:

+ ئەوشۆ تۆ نابێت لێرە بیت.

- ئەوە چ قسەیەکە دەیکەیت؟

+ بە راستمە.

- حیز گەواد، پێدەچێ ئەوڕۆ بوتڵێکت زیاد خواردبێتەوە.

+ نا، بە قەد دوێنێ.

- ئەدی جانم، لۆ قسەی قۆڕ دەکەیت؟

+ قۆڕ نیە، من ئەوشۆ دەمرم.

- کەواتە تۆ ئەوڕۆ باشت نەخواردۆتەوە، ها ئەو نیو بوتڵەش بە سەر دەوتەوە بکە.

+ گوتم دەمرم، تێبگە کەرە.

- شێتە، حەمە هەواڵی مردنی داییێ؟

+ کاتم نەما، زوو لێرە دوورکەوە.

- سەرخۆش لە دەنگتڕا دیارە، دەڵێی بەراستتە؟

+ زوو، تا پێت تێدایە هەڵێ.

- بەڵام لۆ بەجێت بهێلم؟ دلم نایە.

+ شێتە، ئەگەر بزانن تۆ لەگەڵم بووی دەتگرن؟

- کێ دەمگرێ، لۆ دەمگرێ؟

+ پۆلیس، دەڵێ تۆ کوشتووتە، بڕۆ با تووشی (مەحەتە) نەبی.

.....

تۆ بڕوانە ئەو شێتە چەند دوور روانیویەتی.

کێ مشتومڕی نێوان دوو شێتە سەرخۆشەکەی گۆرستانی بە زیندوویی هێشتەوە؟

دەرۆزەکەرەکەی ماڵ لە گۆڕستانێ، لە دوورەوە خۆی لەو دوو شێتە گرتووە، مشتومڕی نێوانیانی بۆ مێژووی شار تۆمارکردووە.

سبەی دەمی نیوەڕۆیێ، قورئانخوێنێ بە سەر تەرمی شێتێکدا دەکەوێ،

سەری بە سەر گۆڕێ کردووە و پێی لە سەر گۆڕێکیدی، شێتێکیش بە سەریەوە، گری گری، دەگری.

ئەو رۆژە خەڵک لە مزگەفتەوە بۆ گۆڕستان نا، لە چۆلیی گۆڕستانەوە بۆ چۆلیی مزگەفتێ تەرمێکیان بە سەر شانەوە بوو!

بە سەربردەی شێتان سەرم ئێشاندن، با پەنجاو پێنجەکەش بگێڕمەوە، لە شێتان دووردەکەومەوە، بەڵام شێت بنی نایە، هەر سەرە کۆڵانی بگری شێتێکی تێدایە، بۆیێ تووشیان دەبینەوە.

## پەنجا و پێنج

هەر شێتە و بە شتێ دەگرێ و تێکدەچێ، حەسەن بە پەنجاو پێنج تێکدەچوو، لە خۆی هەڵدەدا، دەتگوت ئەسپی سەروەشێنە، بە چ رانەدەوەستا، خڕکە بەردی وای رادەئاراند، بە کەر کەوتبا، جێی دەکردە ئەو جێ. ئەو شێتە لە رێیان زۆر بە پارێزەوە دەڕۆیشت، دەتگوت دنیا بۆسەی بۆ داناوەتەوە و هەستیپێکردووە.

تا درەنگ نەمدەزانی منداڵە شاری، پەنجاو پێنجیان لە کوێ هێناوە، بە حەسەنە شێتیانەوە ناوە، خۆ نە عەگالی لە سەر بوو، نە چ جێیەکی بەو ژمارە بەدە دەچوو، ئەوجا بەر لە حەسەن، بەری خۆ دەنە دەو کەندی کەندە پیس و بەزمی عەگال بەسەرەکە ببینن.

مام عارەبی کەندە پیسی ئەو بەری، کاتێ وێکەوت، پەنجاوپێنج بۆتە عەگالی سەری، پیس دای لە سەری، لێ خۆی دایە بەرێ، هێندە بە سەر خۆی نەهێنا، لە بن لێوانەوە شتێکی دەگۆ، لێ کەس تێنەدەگەیشت جوێنە، ئان تووک، نازانم بابم بوو ئان کەسێکی دی، گۆتی:

ئێرە جێی عەگال نیە، فڕێیدە.

عارەب چەفیە و عەگالی فڕێدا، لە جێی وی، جەمەدانی دانا، لە شێوەی عارەبی شامی بەستی، ئیدی پەنجاو پێنج بە عارەبەوە نەما. بەڵام هی حەسەن لێی نەبۆوە، شەرواڵی بە پانتۆڕ گۆڕی، نە پینە ما نە چش، کە چی پەنجاو پێنج رۆژ دوای رۆژ پینەتر.

منداڵە رواندزی باش بیریانە پەنجاو پێنجیان لە کوێی شەرواڵەوە بە حەسەنەوە نا.

ئەو رۆژەی حەسەن لە بەری کاولۆکانەوە پێی نایە ئاقاری شاری وەستا و پاشا، کەژ بەهار بوو، چیای ئەوبەری نێرگزجاڕ بوو، حەسەن نە خڕکە

بەرد، نە دار، تەنێ چەپکێ نێرگز بە دەستەوە، بۆیە شیرنە چاو مەستەکەی ماڵ لە سەر خەڕەندێ گوتەنی:

دەبوو ناوی وی بە حەسەن نێرگز بکەوێتە سەر زاران و ناو ناوان.

بەڵام وای لە منداڵی چاو زیتی کۆڵانی پشت ئاشێ، نزانم چ زوو، نیگایان کەوتە سەر ئەو دوو پینە خڕەی سەر شەرواڵی حەسەنی گوندی، کوڕێکی جانتا بە شانی لا شان بە ئارد، هەر لەوێ دوو پینەکەی کردە دوو (٥) و بە حەسەنیەوە نووساند، پێش حەسەن، پەنجاو پێنج گەیشتە ئێرە.

حەسەن وەک دەڵێن: لە خەوێش چاوی زەق و گوێ قولاخە، خەوی گەلەک سووکە، بە دەنگی پێی پشیلە بە ئاگادێت.

جارێک نەبێ، گوێیان رادەکێشا، نەدەبزووت، ئەو جارە من دیتم، لە کۆڵانی تەنیشتی عەبۆ، سەری بە تایەی پێشەوەی عارەبانە سێ تایەکە کردبوو، ئەوەی مەنجەڵە نۆکاوی لە سەر بوو، چ نۆکاو! هەر بە هەڵمەکەی دوو نانت لوول دەدا. حەسەن پەنجاوپێنج لەوێ پاڵکەوتووە و پرخە پرخی لە ناو دەنگە دەنگی دەلاڵخانە دەنگدەداتەوە.

هەر کی بە تەنیشتیا رەتدەبێ، پەنجاو پێنجێکی تێدەگرێ، بەلاشە، حەسەن وەئاگانایێ، دواتر دارا گێڕابوویەوە:

حەسەنی چەمبەری بەردێکی بۆ کەسێ هاویشت، بە من کەوت، گوتم:

حەسەن لە سەرت ناچێ.

لە کۆڵانەکی لەگەڵ ئیبادە گرتمان، پەنجاو پێنج سەرە شووشە ویسکیم بە دەویەوە کرد، وەها خەوت، بە هەزار:

هۆ پەنجاو پێنج، هۆ...

بەئاگانەیەتەوە.

ئاخر من دەڵێم دارا شێت نەبوو!

با واز لە شێتان بهێنم، بچمەوە رزگاری، بەڵام بەر لەوێ حەزم لێیە شتێ لە شارستان و کرمانجان بگێڕمەوە، ئەوە دەبوو زووتر کەوتبایەتە کۆڵان کۆڵانەوە، بەڵام نازانم بۆ، هەر ئەوڕۆ سبەیم لێکرد و هێندە دواکەوت.

## شارستان و کرمانج

ئێمه سێ کەسین:

شارستانێک و شاریەک و کرمانجێک.

شەڕەکە شەڕی شارستان و کرمانجە، منی شاری بوومە ناوبژیوان، باپیرم بوو بە منی دەگۆ:

کوڕم، تۆ شاری، نە شارستانی، نە کرمانج.

بەر لە گێڕانەوەی شەڕەکە وا چاکە بگەڕێینەوە بنج و بنەوانی ئەو کێشەیەی شار.

زوو، زۆر زوو لێرە، لەو دەڤەری هەولێرە، ئەوەی هەبوو شارستان و کرمانج بوو، خەڵک چ موسڵمان با، چ دیان و ئێزیدی و یارسان و جوو، ئەگەر ئاکنجیی شار با، شارستانیان دەگۆتێ، لە دەرێی شار با، ئەوا کرمانج بوو، ئیدی هەبوو نەبوو، کرمانج و شارستان هەبوو، لە ناوەخۆ شتەک نەبوو بە ناوی هەولێری، تورکمان هەر لە گۆڕێ نەبوو. ئاخر شارستان و کرمانجەکە هەمووی کورد بوون، بەڵام عەنکاوە، نە شارستان نە کرمانج، عەنکاوەیی بوون.

دواتر لە ناو شار لە تەنیشت شارستان شاری پەیدا بوو، ئەوانە لە شارستانی درنگتر هاتبوونە شار، واتە بوونە سێ:

شارستان، شاری، کرمانج

شاری هێ لە هەندێ نەریت، لە ئاخافتنێش لە هەندێ دەنگ و وشە و رستە کرمانجایەتی خۆیان پاراست، لە ئاخافتنێ هەر لە رستەی دووەم و سێیەم لەگەڵ شارستان لێکدی جیا دەکرانەوە، بە تایبەتی لە دەنگی(ڵ) شارستانەکە لە شێوەی بەری بادینان گوێدەکرد و(دڵ) دەکردە (دل)، شاریەکەش هەر بە شێوە کرمانجیەکە، دەشتەکیکە، گوندیەکە گۆیدەکرد و دڵەکە هەر (در) مایەوە –قسەمان لە هەندێ گوندیی لای سەرێ نیە کە

کیشەی (ڵ و ڕ)یان نیە – هەشبوو دەمێک بوو هاتبووە شار، بەڵام پێی شەرم بوو پێیبڵێن شاری، دەیگۆ:

من کرمانجم.

ئەو جۆرە بەزۆر یان لە ناچاریەوە هاتبووە شار، لەگەڵ شار هەڵینەدەکرد، بە هەوای گوند دەژیا، دەقی بە شارەوە نەدەگرت، هەمیشە چاوێکی لە ڕێی دەشتێ بوو.

ئێ، درێژەی نەدەمێ. بەرە بەرە لای هەندێ کەس وشەی هەولێری جێی شارستانی گرتەوە. کاتێ دەیانگوت هەولێری، شاری و دەوروبەری شاری نەدەگرتەوە. دواتر لەوەش بەرتەسکتر بۆوە، هەولێری بە واتای تورکمان دەهات، کرمانج ئەوەی داهێنا، بە زۆر تورکمانی بە سەر شارستاندا بڕی، شارستانەکەش تاک تاک نەبێ کە حاشایان لە تیرە و ڕەچەڵەکی خۆیان کردبوو، ئەوانی دی هەموو، بەو ناو بەسەردابڕینە تووڕە دەبوون، کاتێ پێت دەگوتن:

تۆ تورکمانی.

جوێنێکی گەورە بوو، هەڵدەچوون، خۆیان لەگەڵت دەگۆڕیەوە، لە دەستیان هاتبا، چی خراپە بوو پێیاندەکردی، وەک چۆن بە بەر چاومەوە کوڕە شارستانەکە بە کوڕە کرمانجەکەی کرد، ببینن:

بارام گۆتیە بەهجەت:

تازەم زانیوە، تۆ تورکمانی

بەهجەت هۆپەکی لە خۆی زانی:

هەر ئەوە مابوو، تورکمانی چی؟!

بارام:

ئەوێ ڕۆژێ لە ناو قەیسەری، لەگەڵ داکت بە تورکمانی قسەتان دەکرد.

بەهجەت:

ئەوجا چیە، ئێمە زۆر جار لە ماڵێ، لە بازاڕێ بە تورکمانی قسە دەکەین، بەڵام کوردین و...

بارام، ئەوەی پێ قووتنەدەدرا، پێیوابوو خێزانێک کورد بن و کوردی

بزانن، نابێ لە نێوان خۆیان بە تورکمانی باخڤن. من ئەوەم لا ئاسایی بوو، دەمزانی لە شار زۆر خێزانی لەو شێوەیە هەن، تورکمانی وەک بڵێی بۆتە زمانێ ماڵێ، گوتمە بارام:

ئاساییە، ئێوەش ئەگەر تورکمانی بزانن، رەنگبێ جاروبار لە ماڵێ قسەی پێبکەن.

بارام کە دیار بوو زۆر رقی لە تورک و تورکمان دەبۆوە، گوتی:

نا، من گووی وا ناخۆم.

لە سەری رۆیی و روو لە بەهجەت:

هەرچی بڵێی، هەر تورکمانی.

بەهجەت:

لە تۆ و لە بابیشت کوردترم.

بارام:

حیزە تورکمان، تۆ لە من کوردتری؟!

بەهجەت پشتە دەستێکی لە ناو دەوی بارام دا، بارام چەقۆی دەرهێنا، لەوێ نەبام، خوێن دەڕژا، ناوبژیم کردن، بارام هاواریدەکرد:

بەرمدە، تورکمانی حیز وای لێهات، دەست لە من بەرزبکاتەوە!

بەهجەت زۆر تووڕە بوو:

ئەگەر کوردبوون وەک تۆ بێت، من کورد نیم، تورکمانم...

بارام:

نەمگوت، ئەدی نەمگوت تورکمانە!

ئیدی ئەوها بوو، کرمانج هەبوو، شارستانی بە زۆر دەکردە تورکمان!

وەک چۆن کوردی موسڵمان کوردی جوولەکە و فەلە و ئێزیدی لە خۆی دوورخستەوە و دووردەخاتەوە.

حەیف، ئەو شارستان و کرمانجە قادسیە بۆ خۆی بردنیەوە.

ئێستا بەرەو رزگاری دەچم.

## بەرەو رزگاری

لە ژیانی من کەم جێ هەیە هێندەی رزگاری، سەرڕێژ لە یادگاری، ئەو ڕۆژەی ناوم لەوێ دەرچوو، خەنی بووم، ئاخر دەزانن کەوتوتە کوێ؟

ئەگەر لە کۆڵانەوە روو لە دەرگا دوو دەریە گەورەکەی راوەستی، ئەوجا بە دەستی راست، بیست سی شەقاوێ راستەوراست پێ هەڵێنە، وا دەبینی کە کۆلان داخراوە و ناچاری بە گەڕانەوە، نا، بە دەستی چەپ کۆڵانێک هەیە، لە دنیایێ یەک کۆلان لەو تەنگەبەرترە، ئەویش هەر لە سەیداوەیە، لەو گەرێ.

ئەو کۆلانە لە شێوەی پیتی(T)ی لاتینیە، لێرەوە لە سەرە کورتەکەیەوە برۆ، ناچاری بە سەرە درێژەکەی پێچ بکەیتەوە، چوونکێ سەرە کورتەکەی تری داخراوە، ئەگەر قەڵەوێک رێی بەوێ کۆڵانێ کەوتبا، لە سەرە کۆڵانێ فیکەی ئاگادارکردنەوەی لێدەدا، نەبادا کەسێکیتر لەو سەرەوە بێت، مەگەر بە سەر پشتی ئێکتردا رەتبن. ئەز زارۆی ئەو کۆڵانەم، ئەوجا جارێ لەوە گەڕێ، دەگەڕێمەوە رزگاری.

پێشتریش گۆتم، لە وانەی زانستی، نەخاسمە بیرکاری، لە سەری سەرێ بووم، نەخۆشی و دەورنەکردنەوەش نمرەی نەدەهێنایە خوارێ. لە وانەی وێژەییش، نەخاسمە لە ئینگلیزی مینا میزی حووشترێ...تەمبەڵ نەبووم، بەڵام پێشان لە کوێ ئێستا لە کوێ!

لە زێوەرەوە تا ئازادی هەر مامۆستایەکی بیرکاری، وانەی پێگوتبم، گوتوویەتی:

نەکەی رێی بیرکاری بەردەی، دوور نیە ببیە زانای بیرکاری!

گوێم نەدایە قسەی شتاقیان و رێی بیرکاریم بەردا، گوێم لە هۆش نەگرت و بە دوای دڵ کەوتم، چ بکەم، دڵی من زانستی نەدەویست، حەزم چووە

بەشی وێژەیی. ماڵاوا ئازادی، سڵاو رزگاری، رزگاریی نێوان کۆڵانی منداڵیی گەڕەکی قوڕان و ناو قەسران، گەڕەکی هەنار و پرتەقاڵان، قوتابیانی ئەوێش زۆرتری شەرواڵ سووڕاوی، دەلینگ قوڕاوی، لاشان بە گێچی، لامل بە چەمەنتۆ یان بە بۆیاخ، بڕێکیان رێکپۆش، پۆشتە و پەرداخ.

هەوکە وەرز پایزە، ساڵ، پێمان ناوەتە ساڵی دووەمی شەڕی نێوان عارەب و عەجەمان، ستەدەش هەر سەدەی ناو گۆرانییەکەی خارە تایەری خۆمان:

**سەدەی بیستەمە کوردە غیرەتێ**

**لە خەو راپەڕە، عیلمێ سەنعەتێ**

ئێ، زانستەکەم بۆ جەماڵی هاورێم بەجێهێشت، ئەو کوڕە لە جەڕومەنگەنەی بیرکاری هەر لە شەیتان نا، لە مامۆستاشی دەبردەوە، لە یەک هەناسە گرێی ئاڵۆزترین هاوکێشەی دەکردەوە، تاقە کەس بوو پێشبڕکێی منی دەکرد و رێگەی نوێی دەدیتەوە.

دەگەڵ ئازاد خەتخۆش و دڵشاد و سەلاح و عەدنان و حوسێن لێوبەبزە و ئەوانە هاتینە بەشی وێژەیی، ئێمە حەزمان دەکرد لە ئازادی وێژەیی بکرێتەوە، ئەوە بوو یەک دوو پۆل واژۆمان کۆکردەوە و دامانە پەروەردە، بەلام حوکمەت خۆشیی لە وێژەیی نەدەهات، وەک بڵێی دەترسا لە وێژەییەوە کوودەتای بە سەردا بکرێ، بە چ حاڵ لە رزگاری کردیەوە.

بەر لەوەی رزگاری بگێڕمەوە، دەگەڕێمەوە ئازادی و کووران، شتێکم بیرکەوتەوە سەربردەی بزە دەگێڕمەوە.

## بزەی عیزەت

با بزانین، بزە حوسێنی بە چ دەردێک برد و دواتریش عیزەتی چۆن بە دەستی برای جاشەکە ئەوەی نازانم سەید کێیان دەگۆتێ، بە کوشت دا.

حوسێن دەمولێوی نەختێک بە لای چەپدا لارە، لاربوونێک هەر لە خۆی دێ، خستوویەتیە باری بزە، بزەیەکی شیرین، زۆر کەس ئاواتەخواز بوون خوا بە دەردی حوسێنیان ببات و زاریان نەختێ لار بکات، کەچی(ست)ی لێو کشتەکیی دەنگ کەویاری، بە بزەی لێوی حوسێن تێکچوو، پێدەچوو لە جوانیی خۆیەوە چاوی بەو جوانییە هەڵنەهاتبێ! روو لە حوسێن:

کوڕە، بە چی پێدەکەنی، چ مەیموون هەیە لێرە؟

حوسێن هۆپێک لە خۆی دەزانێ و بە دەنگێکی نەرم:

مامۆستا، من پێناکەنم.

مامۆستا بە تووڕەییەوە، لێشی نەدەهات:

بە پێکەنینەوە دەڵێی پێناکەنم، شەرمێ لە خۆ ناکەی!

حوسێنی لێوبەبزە هەردوو دەستی لە باری ناچاری و پاڕانەوە رادەگرێ و دەڵێ:

مامۆستا، بە خودای ئەمن پێناکەنم.

مامۆستا چۆن باوەڕبێنێ؟ ئەوەتا حوسێن بە لێوی تژی لە بزەوە نکوولی لە پێکەنین و بزەی خۆی دەکات، نزانم نە فارس نە بلەی باڵا دارتێل بوو هەڵیدایێ:

مامۆستا، ئەو حوسێنە لەوەتەی لە دایکی بەربۆتەوە وایە.

نیوەی پۆل هاتنە تکایێ، کەچی مامۆستا بە (پێمەکەنە، کوڕە پێمەکەنە)ی گرتبوو، تکای کەسی نەگرت و نەهاتە رایێ، بزەی حوسێن سەربردەی ناسکی لێدەکەوتەوە، بەڵام هی عزەت!

ئەمن کاتێ کتێبی (خەندە لێو)م خوێندەوە، لە خەندەکەوە نازانم بۆ حوسێن و عیزەتم بیردەکەوتەوە، ئێ، بەزمی بزەی حوسێنی لێوبەبزە لە ئازادیەوە دەگاتەوە رزگاری، بەلام بزەی عیزەت دوای کووران دەکوژێتەوە، تا هەوالی مەرگی نەهات بزەکەی نەهاتەوە دیدەم و نەمدیتەوە.

عیزەت و دوو برای جاشە سەیدەکە و من و دوو برا دژە جاشەکە هاوپۆل، تۆ بلێ هاو قوتابخانە بووین. روخساری عیزەت وێنەی گولی گولەباخی باخچەی مالەکەی ئەوبەری قوتابخانەی کووران، لە گەشانەوە و پێکەنین بوو، دەموچاوی ئەو کورە لە ساتی بوومەلەرزە و قەلاقووچکانێی دنیاش لە پێکەنین نەدەکەوت.

دەگەل دوو برای جاشە سەیدەکە هاوپۆلین، یەکیان جاروبار پشتێنی کەسکیش دەبەستێ، نێوانمان خۆشە، دێتە بن گوێم و دەلێ:

ئێمە نەوەی ئیمامی عەلیین.

دەلێم:

من خۆشیم لە عارەب نایێ.

دەلێ:

لە تۆ کوردترم، سەیدێکی کوردم.

دەلێم:

ئەوها بلێی قەیناکە.

دەلێ:

دەزانی رۆژانە خەلک دێن و ئاوی مالی ئێمە وەک موتفەرک دەخۆنەوە.

دەلێم:

بەلام دەلێن براکەت جاشە.

دەلێ:

وا مەلێ، لە داخی جەلالیان چەکی هەلگرتووە.

ناگەینە یەک، بەلام بەینمان تێکناچێ، لەوە گەرێ. قسە لە عیزەتە، با لەبیرینەکەم، ئەو کورە لە روخسار رێک دژە من بوو، منی مرومۆچ، ئەوی پڕ پێکەنین، زۆر جار خۆزگەم بە روخساری وی خواستووە، بەلام کاتێ

هەواڵـی مەرگـیم بیسـت، گـوتم، بـاش نەبـوو وەک وی نەبـووم، خـۆزگە مرومۆچتر دەبووم. ئای عیزەت لە سەر بزەیێ دەستڕێژێکت گرتەوە، بزانە چۆن:

جاشـەکە لەو دەشـتەی خـواریێ، لە شـەڕی پێشـمەرگە دەشـکێ و برایەکیشی تێدەچی. خۆی و برا و دەستەکەی، حەمەی سابیر ئاسا خوێن بەر چاویان دەگرێ، لە سـەر ترومبێلێ دەست لە سـەر پەلاپیتکەی تفەنگێ دەگەنەوە گەڕەکێ. کێ دەوێرێ تەماشایان بکات، عیزەت نەبێ، ئەو بەدبەختە لە پێش دەرکێ، سـەر هەڵدەبڕێ، نـابێ لەبیـری مـابێ، لێو بە بزە و دەم بە پێکەنینە، برایەکی جاش و جاشـی کوژراو بـزەی عیـزەت دەبینـێ، یەک و دووی لێناکاتن، بە دەم:

قاحپەباب، برام شەهید بووە و تۆش پێدەکەنی؟

یەک دەستڕێژی پێوە دەنێ، عیزەتی لێو بەبزە وەکات گیانی دەفڕێ، بەلام لە سەر تاتەشۆریش بزە لە سەر لێوەکانی هەڵنافڕێ، عیـزەت چـوو، لە سـەر بزەیێ ئاوەو ئاو چوو.

## رێی رزگاری

ئێ، دەچمەوە رزگاری، رزگاریی سەردەمی مە کەوتبووە ناو مالان، مالانی سەیداوەی قوڕ و ناو قەسران دەوریان دابوو، لە رووی سەربازیەوە جێیەکی لە باری هەبوو، لە یەک لاوە ترومبێلی دەگەیشتێ، کوڕەکانی خۆی دەپاراست، سەیداوە، رزگاریی لە سەر سەر راگرتبوو، خۆی پێوە بادەدا، بەعس بۆ کەوتنی چ رێ نەما، پەنای بۆ نەبا، لێ سەیداوە ساوا ئاسا لە ئامێزی خۆی دەگرت، لە رۆژانی تەنگەتاوی و هەلات هەلاتێ، دەرگا یەکدەریەکانی خۆی بۆ کوڕانی رزگاری دەخستە سەر پشت و لە ناو بەرمیلی ئاو و بن ئەستێرک دەیشاردنەوە، ئەو کوڕانەی دەتگوت خودا بۆ خۆپێشاندان و درووشمکێشان بە دنیای وەرکردوون.

کوژانی رزگاری، لە سەیداوە و بەلاشاوە و گلکەند و سێتاقان، لە باداوە و ئیسکان و کۆماری و ئازادی و خانەقا و گەڕەکی جووان، ئەو جێیانە و گوندانەوە هاتبوون، لە سەیداوە شێخ جەلال گۆتەنی (کۆماری رزگاری)یان پێکەوەنابوو، کۆمارێک دوو سال و شتێ بووە گرێ لە سەر دلی پەروەردە و ئەمن و پارێزگاری شار.

داخوا کەسێ پەیدا دەبێ، بێ و رزگاری و کوڕە پڕ زاخەکانی بگێڕێتەوە؟ لە خەسرەوەوە پێدا بێ، ئەو کوڕەی بە (سەپان)ی گەشمردە بوو...

هەر رۆژێکی رزگاری کتێبێکە، هەر کوڕێکی چیرۆکێکە، ئەز دەروەستی گێڕانەوەی نایێم، پتر حەز لە خوێندنەوەی رزگاری دەکەم، نەک گێڕانەوەی. هێندەم لەدەستدێ، خۆم بە نیوەچلی و چەند گرتەیەکی پیشانبدەمەوە، لە رێی رزگاریەوە پێدا دێم:

بۆ گەیشتن بە رزگاری دوو رێ هەیە، رێی باشوور، تۆ بلێ رێی خۆپێشاندان. رێی باکوور، من دەلێم رێی مندالی، حەفتەی سبەینانی دوو رێی

خۆم دەگۆڕی، لە سەر جادەی خڕی شەستمەتری، لە سەرە کۆلانی مالی هەقایەتبێژەوە، لای ئەو کورەی لە کتێبەوە دەفڕی، دەستی چەپم دەگرت، بە کۆلانی مام دێوانەی زوڕناژەنەوە دەگەیشتمە کۆلانی مندالی، ئەو کۆلانەی لە دنیایێ یەک کۆلان هەیە لەو تەسکتر. لەوێوە لە کۆلانی مندالیەوە سەرم دەردەهێنا و دوو سێ دارتێلێ بە دەستی راست، دەرگای رزگاریە، شێخ جەلال دەیگۆ:

هەبێ نەبێ، لەو کۆلانە شتێ هەیە.

دەمگوت:

تەنێ مندالیمی تێدایە .

باوەڕی نەدەهات، ئاخر هەبوو لەو کۆلانی مندالییەی من، باخی بەی دەرنی، گەزەی نەرمی لە سێوی لاسوورە دەدا، دەستی بۆ بارێزەی کەس نەدیتی دەبرد. ئەو کۆلانە تەنگەبەرە ئاوا بوو، کچ تووشی کوڕ ببا، بە سانایی لە دەستی دەرنەدەچوو.

هەر ئەو کۆلانەی مندالیم، لە هەلات هەلاتێ، رێی کوڕانی رزگاری بوو، زۆریان لەوێوە خۆیان دەخزاندە ئامێزی سەیداوە و لە چاوی ئاسایش و پۆلیس وندا دەبوون و بە موختاریش نەدەبینرانەوە. کۆلانی مندالیی من، جاشیش نەدەوێرا خۆی پێدا بکات، دەترسا بکەوێتە بۆسەی شۆڕشەوە، هەینێ لە دیدی میرییەوە، ئەو کۆلانە دەروازەی یاخیگەرێتی بوو.

کۆلانی مندالی، زوو، هێشتا رزگاری هەلێنەدابوو ئالای کۆماری، دوو یان سێ جاش و سێ چوار پیاو خراپی لێ کوژرابوو، یەک لەو جاشانە زووە، لە بیرەوەریی من نیە، هێشتا بابم نەبووبووە مراوی، پاشترێ بابم بۆی دەگێڕامەوە:

لە سەر بان خەوتبووین، تۆ تازە سەر پێیان کەوتبووی، لە باوەشی من خەوتبووی، لە هیکەوە زرم، تەپەیەک، تۆ زیڕاندت، سەرم شۆڕکردەوە سەر کۆلانێ، مانگەشەوێکە دەرزی لە سەر زەوی هەلگرەوە، دەبینم زەلامێ راکشاوە، دەنگی پێیەکیشم بیست، بە دیوی مالی موختاردا هەلدەهات.

لەو سەربردەیەی بابم گەڕێ، دوورو درێژە، بنکەی پۆلیس و ئەو شتانەی

به دوادا دێ. ئیدی کۆلانی منداڵیم پڕ سەربردەیە، جێی ماچ و ڕاموسانە، جێی پیاوکوشتن و بۆسە دانانەوە و خۆ شاردنەوە و ئەو شتانەیە، بۆ منیش پتر جێی چاوشلکانێ و تیرامانە.

ئەزێ تا دڵ دەڵێ زێ، تا سەیداوە حەز بکات، دڵم بەو کۆلانە و خانووە قوڕەی منداڵی خۆشە، زۆر جار خۆم هەڵدەدا و دەستم دەگەیاندە ئەو بنە کاریتەیەی کە قولانجێ لە دیوارەوە هاتبووە دەرێ، دەمناسیەوە کامە کاریتەیە، ئەوە بوو کە سەرەکەی لە دیوی بێرایی لە سەر پەنجەرەکە نزیکەی باڵێک هاتبووە دەرێ، بابم بزمارێکی درێژی لێ کوتابوو، زۆر کەرەت ساقۆ درێژەکەی پێوە هەڵدەواسی، جارێک گۆتمە شێخ جەلال:

- دەزانی ئەو کاریتەیە، ناوی چیە؟

+ چما کاریتەش ناوی هەیە!

- هەیەتی، ناوی کاریتەی ساقۆیە.

لە دیوی بن بێراییەوە ناوەکەی با هەر کاریتەی ساقۆ بێ، لێ لە دیوی کۆلانەوە ناوی دەنێم کاریتەی خەسرۆ، دەزانن بۆ؟ ئەنگۆ خەسرۆ دەناسن، ئەو کوڕەی دواتر دەبێتە سەپان و بە (ئالا)یی مالاوایی دەکات و دەچێتە گەشتی گەشمردان، ئەو کوڕەی دەبێتە گولەستێرە و لە ڕیزی (گولەستێرەکان...)یش ناوی هەس، کاریتە نەبا، خەسرۆ لەو کۆلانە دەکەوتە دەستی حوکمەت.

جارێ لەو جارانەی ڕزگاری ڕادەبێ و دەنگی (سەدام نزیکی مەرگە) گەڕەک گەڕەک دەڕوا و دەگاتە ئەمن و پارێزگا. چەکدار دەڕژێنە سەیداوە، خەسرۆ لە خۆدەربازکردنێ ڕێی دەکەوێتە وێ کۆلانێ، ڕوو لە هەر لایێ بکات، دەکەوێتە چنگ و بن لوولەی تفەنگان، سەر هەڵدەبڕێ، دیوار بڵندە و ناتوانێ هەڵگەڕێ، چاو دەگێڕێ، سەرە کاریتە دەبینێ، خۆ هەڵدەدات، دەستی دەگاتێ، سمۆرە ئاسا هەڵدەگەڕێ و بانە و بان دەڕوات، ئیدی سەیداوە دەیشارێتەوە. خەسرۆ کە زانی من منداڵی ئەو خانووەم، زۆر جار دەیگۆ:

دەستی بابت ماچ دەکەم، ئەو دەیزانی ڕۆژێ دێ، من لێرە لێم دەقەومێ، بۆیێ کاریتەکەی قولانجێ لە دیوار هێناوەتە دەرێ.

ئێ، بەر لە هەر شتێ، هەوکە گرتەی کورتی هەندێ مامۆستا پێشاندەدەمەوە:

## فەرموودەی فەلافل

زوو، کتێب لەوێ، تەنێ فیلم میسری بوو، لێ هەوکە لە سایەی سەری سەدام و قادسیە، فەلافل میسری، دختۆر میسری، مامۆستا میسری، چما چ ما نەبێتە میسری! رزگاریی ئێمەش بێ بەش نەبوو لە میسری.

مامۆستایەکی وردیلەی رەقەڵەی رەشتارە، دەماری ملی لە دوورەوە دیارە، رۆیینی کتومت عادل ئیمامە، شێوەشی لەوی دەکرد. دەم بە ئایەتەوە بە ژۆرێ دەکەوت، دەچوو، روو لە پەنجەرە، پشت و تەنیشت لە پۆل، دەستی نزا و چاوی لە ساپیتە، بە دەنگی نزمی مەیلە و عەبدلباستانە، هەشت نۆ دە ئایەتی بە گۆی میسرییان دەگوتەوە.

دوو سێ قوتابیی کارخانچی، لە بەر خۆیانەوە فەرموودەی (فەلافل..)یان تێکەڵی ئایەتان دەکرد، وەلێ مامۆستا خۆی تێکنەدەدا و لێی تێکنەدەچوو. دوای وێرد خوێندنێ، روو لە پۆل، دوو سێ رستەی عادل ئیمامیانەی هەڵدەدا، من تێنەدەگەیشتم، داخوا جوێنێ یان ئامۆژگاری، روخساریشی پیشانی نەدەدا داخوا توورەیە یان نا.

پارچە تەباشیرێکی لە بەرکی چاکەتەکەی دەردەهێنا، دەهاتە سەر رێزمانی عارەبی، ئەویشی بە زاری میسری راڤەدەکرد.

مامۆستای میسری زوو وازی لە پۆلی ئێمە هێنا، لێ گەلێ، تۆ بڵێ پۆلێ سەربردەی بۆ جێهێشتین، بیرمە پرسی:

کێ فەرموودەیەکی ئەزبەرە؟

کورێ هەبوو، ئەها ئەوەی گەمەی (میرم...)ی لەگەڵ جەلیلەفەندیی هونەر دەکرد، دەستی هەڵبڕی:

فەلافل وە ئەنتە ماشی.

مامۆستا رستێ ئەستەغفیرولای هەڵدا، تێهەڵچۆوە و بەلام پێدەچوو هزری هەر لای فەرموودەی فەلافل بێ، ئاخر تیچاوێکی هەر لە سەر کوڕە فەرموودەبێژەکە بوو، مامۆستای میسری قسە خۆش و گاڵتەچی بوو، جەلیلە فەندی ئەویشی فێرە (میرم) کردبوو.

## جەلیلی وێنە

جەلیلێ هەیە، سێ پاشناوی هەیە: ئەفەندی، وێنە، میرم.

مامۆستای وانەی وێنەیە، بەڵام چ وانە و وێنەیێ! پێش ئەو وانەی وێنە چش بوو، وێنەی وانەی کوردیی پێشان چش بوو، لەویش چشتر. جەلیلە فەندی هات و کردیە وانە، بردیە ریزی بیرکاری و دیرۆک و ئابووری و ئارەوی.

پێش وی وانەی وێنە ئەوهابوو، مامۆستا دەیگۆ:

بە دڵێ خۆ، وێنەک بکێشن.

خۆی لە سووچێکی پۆل رادەوەستا، یان لە ریزی پێشەوە پێ لە سەر پێ دادەنیشت و چاوەڕێی دەنگی زەنگی دەرێی دەکرد.

وێنەی زۆربەمان دیاربوو، سێ چوار ژمارە هەشتمان بە دوای یەکتر رست دەکرد، شاخێ قیتدەبۆوە. لە ناوەراستێ یازدەیەکی لارمان شۆڕدەکردەوە، ڕوو ـار خوڕەی دەکرد. لەو تەنیشتەش لە لوولەی سۆبەیەکەوە چرە دووکەڵ دەچووە ئاسمانێ، ئەوەش گوند بە قەد شاخەوە.

جەلیلی وێنە، وانەی وێنەی گۆڕی، گوتی:

وێنە بەر لە کێشان نووسینەوەیە، دەی بنووسن:

نووسیمان، ساڵێکی نەبرد دەفتەرێکی پێپڕکردینەوە، من تا درەنگیش دەفتەرەکەم پاراست و ناوە ناوە دەمخوێندەوە و لێیەوە فێردەبووم، فێری هێل و هێلکێشان، فێری رەنگ و رەنگکردن و تێکەڵکردنی رەنگان، فێری فلچە گرتن و فێری سێبەر و سێبەردانان، فێری...

وێنەی کردە وانە و خۆشەویستی کرد، چ مامۆستایەکم نەدی، هێندەی جەلیلی وێنە، بۆ وانەی وێنە دلسۆز بێ و وێنەی خۆش بوێ و قوتابی فێربکات. ئەگەر جلەوی پۆلی لە دەست نەدابا و کەمێک توند با، زۆرتری

فێره وێنه دەکرد.

بۆ خەمڕەوێنیش هەندێ کەسی فێره (میرم...) کرد!

میری سەر زاری جەلیله فەندی، مەپرسە چ میره، سۆرا و بادینان و سەراوبن بکەی میری وا نابینیەوە. میرێکه له هەندێ وانه شێوەی پیشەقان دەگرێ، له هەندێ وانه دەبێته سۆندەی ئاوێ، له هەندێکی دی له شەرما وەها کورژدەبێتەوە، هێندەی کڵاوه بەڕوویکی لێ دەمێنێتەوە.

میری جەلیله فەندی، جەلیلی وێنه، ئەگەر کەسێ هەڵکەوێ و له رووی بێ، هی ئەوەیه کۆڵان کۆڵان بیگێڕێ و بیگێڕێتەوە. زۆر برادەر باسی میری سەر زاری جەلیلی وێنەیان دەکرد، بەڵام من تا به گوێی خۆم نەمبیست، باوەڕم نەهات، ئەها چ بەو قوتابییه دەڵێ:

+ بلێ میرم

- میرم

+ دەستت له کیرم.

- ئای مامۆستا ئەوە چ دەڵێی!

+ چ بووە؟ حەزدەکەی ئەو جاره من دەڵێم میرم!

لەوە ناوی بووبووه میرم، کەسم نەدی هێندەی جەلیلی میرم، گاڵتەچی و قسەخۆش، چاوەی مامۆستایانی کردبووه چاوەی پێکەنین. بەزمی ئەو چاوەیه رۆستەمه فەندی بیگێڕێتەوە خۆشە، ئەوەی باجەلانێکی پیوه بوو، کۆمەڵێ نامیلکه شیعریشی به چاپ گەیاندبوو، له زاری باجەلانەوە:

تازه هاتبوومه رزگاری، جەلیله فەندیم نەدەناسی و نەدیتبوو، هێشتا دانەنیشتبووم، روو له من:

+ مامۆستا، دەستت پاکژه؟

- بەڵێ، ئێستا شووشتمە، لۆ؟

دەستی بۆ ناو گەڵی خۆی برد:

گوتم، به ئەرکی نەزانی، ئەوەم لۆ بگره.

هاته سەرم، تا پشته دەسته بیخەوێنمه دوڕ دەوی، تەمەنەکەی دەستی گرتم، دیتم هەموو له پێکەنینا کەوتنه سەر پشت و ئەویش بزەیەکی کرد و

گوتی:

وا دیاره، دەستت پاکژ نیه، بیهێنه، دەستی من پاکژه.

جەلیله فەندی کەسی نەدەپاراست، هەموو خەڵکی دەکرده میر، هەرکێی دەدی دەیگۆ:

میرم

چاوەڕێی وەڵامەکەی دەکرد، کەم کەس زاخی وەڵامدانەوەی تێدابوو، بەڵام هەر کێ بە وی گوتبا: میرم

بێ یەکو دوو وەڵامی پڕ بەپێستی خۆی دەگۆ. جەلیلی میرم، بەو میرمە، فشەی بە میری دنیا دەکرد، زۆر جار لە بەر خۆیەوە دەیگۆ:

هەرچی میره، دەستی لەو کیره.

ئەو جەلیله میرمە، تەنێ شەرمی لە مامۆستای مێژوو (محەمەد ئیسماعیل) دەکرد و نەیدەویرایێ. جەلیلی وێنه پاشترێ لە چاوەی وێنه بە دیار (بڕووخێ بەعس) و لەگەڵ گۆشتی مەڕی گێژ دێتەوە ناو کۆڵان کۆڵان، نا، وا چاکە لێره جێی ببێتەوە، نەوەک بڕوات و بیرمنەکەوێتەوە.

مامۆستای وێنه، چەندێ دەستڕەنگین و نوکتەباز و زارشیرن بوو، هێندەش ترساو، ترساو لە بەعس، کەسێ بە خراپە باسی حوکمەتی کردبا، ئەو گوێی خۆێ دەگرت. کەسێ ناوی سەدامی بە باش و خراپ بە سەر زاردا هاتبا، ئەو لە جێی خۆیەوە، خودا بیپارێزێکی هەڵدەدا. جارێک قوتابییەک بە پێکەنینەوە گوتی:

مامۆستا، مەڵێ خودا بیپارێزێ، بڵێ دروودی خودای لە سەر بێ.

مامۆستا، رووی گرژکرد و توند گوێی خۆی گرت و پاش کەمێ، بە پێکەنینێکی شیرنەوە، پرسیارە تەڕەکەی خۆی هەڵدا و وەکات هەندێ قوتابی بە وەڵامی لە پرسیار تەرتر گرتیانەوە. مامۆستا، هەر کاتێ باسی سیاسەت و حوکمەت کرابا، بە (میرم) و ئەو پرسیارە و هی لەو بابەتە، بابەتی دەگۆڕی:

بە من بڵێن، چەند شت خۆشە لە دنیایێ:

نیو پۆل دەنگ:

مامۆستا، سێ

مامۆستا قایشی پانتۆڕەکەی هەڵدەکێشا:

ڕۆیشتنی...

نیوەی پۆل:

سەرەو لێژ

مامۆستا:

خواردنی گۆشتی...

نیوەی پۆل:

مەڕی گێژ

مامۆستا بە ئاماژەی پەنجە، نیشانەی بۆشایی دەکێشا (....)

نیوەی پۆل:

ژنی درێژ.

ئیدی حوکمەت لەبیردەچوو، خەیاڵ بۆ ناو رانی ژنی درێژ دەچوو.

ئێ، مامۆستای وێنە لە فێرکردنی وێنە تاکی نەبوو، بیرمە قوتابیەکی هەستاندە سەر تەختەڕەش و گۆتی:

وێنەی ژنێک بکێشە لە سەری تا کەمەری دیار بێت، بەژنیشی درێژ بێت.

قوتابیەکە گوتی:

مامۆستا، بێجگە لە چاو نازانم چ جێ بکێشم.

مامۆستا بە پێکەنینەوە:

میرم! چاو بە تەنێ، چ لێبکەم؟ دەستت بدە من فێر دەبیت.

تەباشیری خەست ناو دەستی وی و دەستی ویشی خستە ناو دەستی خۆی و گوتی:

دەستێ خۆ شل کە و جوان وردبەوە بزانە لە کوێوە بۆ کوێ دەست دەجوولێنیت.

خولەکێکی نەبرد، ژنێک نەخشا، لە شێوەی کچی کافرۆش، هی ئەوە بوو لە جام و چێوەی بگری، ئەوجا گۆتی:

دەی ئەو جارە، خۆت بیکێشە.

قوتابییەکە سەرەتا جوانی هێنا، بەڵام دوایی تێکیدا.
مامۆستا گوتی:
بە چەند جارێک فێردەبیت، بەڵام ئەگەر ئەو چەند لاپەرەی بۆم نووسیون ئەزبەری بکەیت و خوو بدەیتە وێنەکێشانیش.
قوتابیەک گوتی:
مامۆستا، من بە چ بزانم ئەو ژنە بەژنی درێژە؟
مامۆستای وێنە:
ئێ، بڕوانە سەر شان و قۆڵ و باسک و... وا دیارە ئەو شتانەی بۆم نووسیون، نایخوێننەوە.
+ ئاخر، ژن هەیە، قۆڵ و باسکی درێژە، بەڵام ران و لوولاقی کورتە.
مامۆستا پێکەنی:
میرم...
سەرکەوت ئەو کوڕەی هەموو گاڵتەیەکی لەگەڵ مامۆستا هەبوو، بە دەنگێکی نەوی:
دەستت لە ... م
ئیدی پۆل لە پێکەنین لە سەر پشت کەوت و زەنگ لێیدا و کەس وەڵامی مامۆستای نەبیست.
مامۆستای وێنە، هەموو ساڵێ لە چالاکی قوتابخانەکان یەکەم دەبوو، خەلاتی وەردەگرت، قوتابخانەکانی دی شەڕیان لە سەر دووەم و سێیەم دەکرد، چوونکێ دەستیان لە یەکەمبوون شووشتبوو، هەموو لێیان مسۆگەر بوو بۆ جەلیلە فەندیە.
لە پێشبڕکێی وێنەی جەنگیش یەکەم بوو، جەنگی قادسیە، هەرچی هاتبوو، بە وێنەی سەدام و بە دەبابە و فڕۆکە و مووشەک و چەک و سەنگەر و سەربازەوە هاتبوو، جەلیلە فەندی، بە فەردە گەنمێکەوە، فەردەیەکی داخ سۆرەوە چووبوو، لەوێ لە راڤەکردنی وێنەکەی خۆی گوتبووی:
شەڕ بە بێ ئابووری، بە بێ نان ناکرێ، من بەو فەردە گەنمە پاڵپشتی جەنگ دەکەم.

ئیدی بە فەردە گەنمێ گرەوی بردەوە.

ئێ، لە مامۆستای وێنە گەڕێ، هەوکە بـا یەک دوو گـرتەی ئەو دوو مامۆستایە پیشانبدەمەوە.

## خانی عەزیمە

باجەلانی شاعیر وانەی کوردیی بە بەشی زانستی دەگۆتەوە، لەو بەشە دوو سێ قوتابی هەبوون، ئیسلامیان هێند بەتوندی گرتبوو، خەنەتیلە وا بەرد ناگرێ. باجەلانیش بە ئەحمەدی خانی گرتبوو، هەمیشە پێیدا هەڵدەگۆ، لە پێداهەڵگۆتنێش، ناوە ناوە دەیگۆ:

ئەحمەدی خانی عەزیمە، زۆر عەزیمە.

کوڕێک لەو کوڕە توندڕۆیانە، لە بەر دەوی قیتدەبێتەوە و دەڵێ:

مامۆستا، تەنها خودا عەزیمە، ئەحمەدی خانی چیە!

باجەلان دەڵێ:

+ کوڕم، عەزیم واتە زۆر مەزن، زۆر کەس مەزنن.

- نا، وشەی عەزیم تەنها بۆ خودا بەکاردێت.

باجەلان توورە دەبێ:

کوڕم، تۆش حوشترێکی عەزیمی.

باجەلان، کوردایەتیی لە سەر دەڕژا، لە خۆپێشاندانەکان هانی قوتابیی دەدا، ئەوە بوو کەوتە زیندانێش.

ئەویش شەرمی لە محەمەد ئیسماعیل دەکرد و دەست لە سەر سینگ بۆی رادەوستا.

## کژیەتی

زۆر بەوێڵ و گران و سەنگین، شەیتان شەرمی لێدەکرد، زۆر توندیش بوو. لە وانەی وی، پۆل هەناسەی لە خۆی دەبڕی، خۆ ئەگەر لە کەسێک قسەیەک، جوولەیەک، پێکەنینێک، ئاوەڕدانەوەیەکی دیتبا، بیستبا، بە سەری پەنجەی دۆشاومژەی ڕێی دەرێی نیشاندەدا، پۆل دەبووە ماستی مەیبو. جارێک لە سەر سووکە ئاوڕدانەوەیەک ڕێی دەرێی نیشانی منیش دا، لە سەر دەرکردنەکە نا، لەوە لێی تووڕە بووم، وانەکەیم لە کیسچوو، بە من با، لە سبیانێ تا نیوەڕۆیێ لە وانەی وی دانیشم.

قسەیەکی جەلیلە فەندیم بیرکەوتەوە، لە ناو ژاوەژاوی پۆلێ، هاواریکرد:

کوڕە، هەی هەمووتان میرم! ئەگەر پیاون، لە وانەی مێژوو ئەو هاتوهاوارە بکەن، بە خودای دارتێلتان تێدەبڕێ.

وا بوو، محەمەد ئیسماعیلی مێژوو لە ناو پۆلێ زۆر توند بوو، بەڵام خۆشەویست بوو، وانەی وڵاتپەروەری و ڕاستگۆیی دەگوتەوە، بوێر و سەرڕاست بوو، لە بەر چاوان کتێبی دیرۆک و جوگرافیای عارەبی بە درۆ دەخستەوە.

بیرمە لە کتێبی جوگرافیا، دێڕێکی نزیک لەوە هاتبوو:

لە سەرمانە داروباری وڵات بپارێزین و نەهێلین ئاگر و دەستی بڕینەوەی بگاتێ.

مامۆستا کاتێ گەیشتە سەر ئەو دێڕە، جوگرافیای تێهەلدا و گوتی:

بیرمە هەر لە پشت کارگەی جگەرەوە تا بن پیرمام دارستان بوو، فڕۆکە و سەرباز هەموویان گڕ دا...

ڕوو لە کتێبەکە:

تف، ئەدەبسز، شەرمیش ناکات قسەی وا دەنووسێت.

باسی سوڵتانێکی ئۆسمانی دەکرد، کە کوڕی بە سەر بابەوە، برا بە سەر براوە، هەموو بە سەر هەمووانەوەی کردبووە سیخوڕ و دەسکیس، دەیگۆ:

ئیستاش وەکو هەینییە، هەموو لە هەموو دەترسێین.

مامۆستای دیرۆک، دیرۆکی درۆی دەگۆتەوە، بەڵام بەر لە گۆتنەوەی بە رستەیەکی تایبەت بە خۆی، تێیدەگەیاندین کە درۆیە، دەیگۆ:

کتێبەکە وا دەڵێ.

ئەو (کتێبەکە وا دەڵێ)یە واتە درۆیە و باوەڕی پێمەکەن. ئەو رستەیە هەموو رزگاریی گرتەوە، لە رزگارییەوە پەڕیەوە دەرێ، لە زۆر جێ لە جێی(درۆیە) دەمانگۆتەوە، ئەگەر کەسێک درۆیەکی کردبا، لە جیاتی بڵێین:

درۆیە

دەمانگۆت:

کتێبەکە وا دەڵێ.

ئیدی تێدەگەیی.

لە سەر ئەو قسانە پەروەردە گواستیەوە قوتابخانەیەکی دی، بەڵام کوڕانی رزگاری تێکڕا هەستان و گەڕاندیانەوە، دواتر ئەو سەربردەیە بە درودراو دەگێڕمەوە و دەگەڕێمەوە لای مامۆستای دیرۆک. هەوکە هێندە دەڵێم و بەس:

نیشانەکانی خۆپێشاندان لە رزگاری دەرکەوتبوون، گوتمان با پرسێکیش بە مامۆستای مێژوو بکەین، داخوا چ دەڵێ:

-مامۆستا، خۆپێشاندان بکەین، باشە یان...

+ بە دڵی خۆتان، نە دەڵێم باشە، نە دەڵێم خراپە، بەڵام دەڵێم کژیەتی.

مامۆستا هێشتا نەگەیشتبۆوە چاوەی مامۆستایان (بژی هێزی پێشمەرگە سەدام نزیکی مەرگە) لە هۆبەی وێژەیی بەرزبۆوە و رزگاریی گرتەوە.

(س)ە فەندی تووشی حەپەسان بوو:

ئەوە چیە، کوڕە ئەوە چیە!

شتێ لەو مامۆستایەش ببیستن.

## ـ بریندار و سەر و دە نمرە

وا تێبگەم فیزیا یان کیمیا دەڵێتەوە، لە زاریڕا دیارە هی ئەو بەری زێی گەورەیە. قسەی لە دوایە، گوایە بەعسیە، دەڵێن زۆر زۆردارە، دەڵێن زللەی وا لە قوتابی دەدا، خوێن لە لووتیەوە فیچقە دەکات. ئەو رۆژە نووکە پێنووسێکی لە سەری یەکێ راکردبوو، بە پڕەپڕ گەیاندبوویانە خەستەخانە، کەم کەس هەیە لە رزگاری چارەی ئەو مامۆستایەی بوێ، بەوەی باشە وانە بە ئێمە ناڵێ.

لە دەمی خۆپێشاندانێ، سێ چوارێ ویستیان لە پەنایێ بیگرن و تۆڵەی سەر دەرێ و بەر دەرێی لێبکەنەوە و بۆ رزگاریی تەمبێ بکەن. پیدەچێ هەڵویستی چاوەڕوان نەکراوی مامۆستا، سارد و پەژیوانی کردبنەوە، ئەو جارەی رزگاری دەوردرا و بەر گوللە درا و چەند قوتابیێ بریندار بوون، ئەو مامۆستایە لە ناو پۆلێ گوتبووی:

ئەو قوتابیانەی لە خۆپێشاندانێ بریندار بوون، لە منەوە سەر و دە نمرەیان دیاری بێ.

راستی کرد و نمرەکەی دانێ.

مەلا سەعدەدین گوتبووی:

پیاو هەیە خراپیشە، بەلام چاکەشی لێ دەوێشتەوە.

## مەلا و فەلە

ئەو مەلایە هەر مەلاکەی گورینە، ئەوەی زوو زوو دارشتنەکەی ئازادیی بیردەهێنامەوە و دەیگۆ:

کورە، لۆ مامۆستای دی وا نەنووسی، چونکی وەکی من تێیناگەن!

مەلای ئازادی و رزگاری و دواتریش کۆلیژ، مەلایێ بوو لە ئایین کراوە لە کوردایەتیش پڕ، ئەویش دەگەڵ خۆپێشاندان بوو، ئەو جارەی من لە رابوونەکەی جادەی باتەی بن قەڵاتێ، حەیزەرانی دەستی وەلەکە عارەبێ، وەک فڕفڕۆکە سووڕاندمی و نازانم چۆن بەردەست نەکەوتم، تا حەفتەیەکیش دەشەلیم، کاتێ مەلا بەوەی زانی، گوتی:

کورم، هەستدەکەم زۆر پەلی، وریای خۆت بە، تۆ نابێ لەناوچی، کورد پێویستی بە هی وەک تۆ هەیە.

لە دلێ خۆ گوتم:

باشە کورد چ پێویستیەکی بە من هەیە!؟

مەلای جبە لەبەری مێژەر لە سەری رزگاری، لەگەڵ مامۆستا ئەفراهام و پەترۆسی فەلە بەزمی خۆش بوو، دەیگۆتە ئەفراهامی کۆمەڵایەتی:

پێدەچێ، لەو دنیاش پێکەوە بین، بەڵام نازانم دۆزەخە یان بەهەشت؟

ئەفراهام دەیگۆ:

ئەگەر لەگەڵ من بێ، بەهەشتت مسۆگەرە، بادە لە تێری، بەڵام بێ حۆری.

مەلا سەعدەدین بزەیەکی شیرنی دەکرد:

ئەگەر ئەوها بێ، هیچمان نەکرد.

با ئەفراهام پتر بناسین.

# ئەفراهام

(س)ی موحەمەدی و ئەفراهامی عیسایی.

شێخ جەلالی هاوڕێم بە کەنینەوە دەیگۆ:

گیا لە سەر بنجی خۆ دەڕوێ، هەر کەسەوە دەچێتەوە سەر پەیامبەرێ خۆ.

(س) گرژ و تووش و دەستوەشێنە، بە قوتابی بگرێ، تا نەینێرێتە فریاکەوتن، دەست لە سەری هەڵناگرێ، لێ ئەفراهامی کۆمەڵایەتی کە پەنجە و لەپی دەڵێی بێ مادۆنیی خودا گەورە بوونە، نەرم، لە هەرمۆتەییان نەرمتر، ئەمن دەمگۆتە شێخ:

ئەفراهامی عەنکاوەیی دەستبوەشێنێ، بە زللەیێ سەد سەر دەپەڕێنێ.

شێخ لە سەر شێوەی کێو و بەرفرەکە دەیگۆ:

خوا تا دڵ نەبینێ، دەست و پەنجە ناڕوێنێ.

ئەفراهامە فەندی کوردیەکەی باش نەبوو، نزانم کێ بوو دەیگۆ:

ئەفراهام لە زمان عەنکاوەیی و لە دڵیش هەرمۆتەیی.

مامۆستا بەترۆسی هەرمۆتەیی بە کوردی گۆتبوویە ئەفراهامی عەنکاوەیی:

تۆ بە کوردی وانە دەڵێیتەوە، کوردیەکەت وەک قشپلی بن سێرێ دووکەڵ دەکات، ماخرا، خۆ فێرکە، فێر...

ئەفراهام بە زمانی فەلان گۆتبووی:

مانگی هەزار وشەی کوردی ئەزبەر دەکەم، بەڵام کاکە ئەو زمانە زێیە، دەریایە، بنی نیە و بنی نایە!

ئەفراهامی فەلە، تا بڵێی دژە بەعس بوو، لە منیش (کوردستانی)تر بوو، بەڵام شێت نا!

لێره دهمێنمهوه، دێمهوه دیداری مامۆستایان و رزگاری، لێ ههوکه شتێ له شـێتبوونی خـۆم و سـهربردهی ههنـدێ شـێتی شـار و کـچه فرێـوهکه دهگێڕمهوه.

## چوومە ناو چێوەی شێتان

(دەنگی لاوان)ی غەمگینی سلێمانی نەبا، کەس کەس نەیدەزانی ئەز زار لە هۆزانان دەدەم، ئەو غەمگینە دەڵێم کە مام گیوی خۆمان ئەو نازناوەی پێوە کردبوو. ناونیشانی ئەو گۆڤار و پیاوەم لە ناو باخچەی گلکەندێ، کوڕە مەلایەک دایمێ، ناوێ وی محەمەد بوو، وەختایەک هاوکار و پاشترێ کرمانجی کردە نازناوێ خۆ. هەینێ وا بوو، کەس نەدەبوو نازناوی نەبێ، منیش سەرم تێدا مابوو، نەمدەزانی چ بۆ خۆم هەڵبژێرم، گەڕام، گەڕام، لە (شێت)م باشتر نەدیتەوە.

بیرمە بۆ غەمگینم وا نووسیبوو:

سلاو بۆ تۆ، تکایە لە بن هۆزانێ من تەنێ (شێت) بنووسە، بەسە.

ئەو غەمگینە خواگیرە هاتبوو ناوی خۆم و بابم و باپیرم کە بە هەرسێکمان پێنج ناو دەکات، بە خەتێکی دڕشت دڕشت، لە تەنیشتە وان کەوانەیەکی گچکەی کردبۆوە، نازناوەکەی تێپەستابوو، سەرەڕای هەندێش کوردستانێکی قیتی پێوە نابوو، ئەو جارەی هاتە رزگاری، بە شەرمەوە لێم پرسی:

-- مامۆستا، لۆ...؟

+ کوڕم، هەر شێتە و شێتی شتێکە، تۆ هی کوردستان بە.

- با قسەی تۆ بێ.

رەنگە شێتەکە پتر پێوەندی بە کەویارەوە هەبووبێ، نەک کوردستان، بەلام لە قسەی غەمگین دەرنەچووم، ئیدی غەمگینی دەنگی لاوان، نازناوێکی پێوەنام تا درەنگ پێوەم ما و لێم نەبۆوە.

دەنگی لاوان وەرزانە دەردەچوو، دەگەیشتە زۆر قوتابی و قوتابخانە، بیرمە من ناونیشانی خۆم وا دەنووسی:

هەولێر- رزگاری- قاتی سەرێ- هۆبەی وێژەیی

ئەز ل ویرێ، هۆزانەکم بلاوبۆوە، لە خۆشیا هێندەی نەمابوو باڵم لێ بڕسکێ، لێ شاردمەوە و نەمهێلا پێوەم دیار بێ، ئیدی لای هەندێ هاوڕێ و ناسیار ئاشکرابووم، ئازادی خەتخۆش کە دە دوازدە ساڵە پێکەوەین و هاوپۆلین، شانمی راتەکاند:

+ تۆ شەرمت بە خۆت نیە!

- لۆ، چم کردیە؟!

+ هێشتا! بە من بڵێ لە کەنگێوە دەنووسی و منیش ئاگام لێ نیە؟

- لە سەردەمی مەلا مستەفاوە.

بەلاشاوەیی ئەو دەستەواژەیان زۆر بەکاردەهێنا و سالانی پێش نسکۆی(١٩٧٥)ی دەگرتەوە، ئیدی لە لای ئەو برادەر و ناسیارانەی دەنگی لاوانیان دەخوێندەوە، ئاشکرابووم، بیرمە شیعرەکەشم کردبووە دیاری بۆ مندالانی دیاربەکر.

خەتخۆش بە خەتێک دەتگوتە چاپە، شیعرەکانمی لە دەفتەرێکی سی پەڕی نووسیەوە، لە بەر خاتری خەتەکە رۆژانە دەمخوێندنەوە، فازیل رێحانەش دیتی، گوتی:

من زوو دەمزانی شتێکت لە بن سەرە، بەلام نەمدەزانی چیە.

لەو سەروبەندە، سەروبەندی هاتنەوەی کەویار، ئەوە نەبوو هاتەوە ماڵە بابان! خۆی لە دوڕ ژۆرێ نا و بۆردومانی فڕۆکەی ئێرانیش نەیهێنایە کۆلانێ. کورتیلە شیعرێکم بۆ وی نووسی، ناوم نابوو (شێتێ لە سەر بانەوە)، حەزمدەکرد ئازاد بۆم بنووسێتەوە، بەلام ترسام ئاشکرابم، خۆم بە خەتێکی درشت لە سەر پارچە مقەبایێ نووسیمەوە، شەو درەنگانێ، بە بەنێ لە پارچە شیشێکم بەست و دوور لە چاوان هەڵمدایە مالّی یار.

سپێدە زوو، هێشتا خۆر لە چ جێ گزنگی نەدابوو، بە کتێبەوە چوومە سەر بان، چاوێکم وا لە حەوشەی ماڵی کەویار، دەی بێت و مقەباکە هەڵگرێتەوە و بیخوێنێتەوە، بەلام ئەوە خوێندیەوە، تۆ بلێی منی تێدا ببینێتەوە؟ نازانم، مەگەر بە دارخورماکە، دێڕێکی نزیک لەوەم بۆی نووسیبوو:

**له بیرتچوو**
**له بن دارخورماکه**
**لێوت بۆ من رەنگی خورمای گرتبوو؟**

له سەر بان دەست بە کتێبەوە، دەمێنمەوە، تاو کەوت و درەنگ کەوت، لەو دوورەوە چاودەگێڕم، نابینمەوە، شیعرەکەم نابینمەوە، له کوێ کەوتووە، نەکەوتبێتە حەوشەکەی ترەوە؟

خۆزی دووربینم پێدەبوو، ئەها کەویار هاتە حەوشە، دەی، سەرهەڵبڕێ و بمبینێ، دەی دانەوێتەوە و شتێ هەڵگرێتەوە، له بن دەرگا بزربوو، دیارە چۆتە ئاودەستێ، وای له من، گەڕایەوە، گەیشتەوە بن بیرایی، دەستەکانی له پێشەوە راگرتوون، لێمەوە دیار نین، تۆ بڵێی دارخورماکەی هەڵگرتبێتەوە، تۆ بڵێی منی له سەر بانەوە بینیبێ!

تووڕەبووم، هاتە سەرم ماڵیان بەر بەرد بدەم، وام کرد، له پارچە کاخەزێ خورماکەم نووسیەوە:

**لەبیرتچوو**
**له بن دارخورماکه**
**لێوت بۆ من رەنگی خورمای گرتبوو؟**

کاخەزم له بەردێکی گچکە پێچا، بەردم هاویشتە ناو کەوڵی دارلاستیقێ، توند رامکێشا و هاوێژتم، نیشانە راستە، بەلام کورتی کرد، زرم بە دەرگەی حەوشێ کەوت، لەو دەمە منداڵێ هاتە دەرێ، وا تێبگەم وا بە دوای کاخەزە بەردینەکەدا دەگەڕێ، دەترسم هەڵیگرێتەوە و فڕێیدا.

سەر بان بەرنادەم، شمشاڵم هێنا و کەویار کەویارێم هەڵدا، جاروبار له سەر ستارەوە ملەقوتێ دەکەم، ئەوە خوایە، کەویار گوێی له ئاوازەکەی خۆی بێت و بێتە دەرێ، مینا جاری گۆرین، بە لەنجەولاری کەویار کەویاری بە کۆلانێدا بێ و بسوورێتەوە، ئەو جارە بۆ حندرحۆپانێ ئەودیوی ئاشەکە نا، بۆ بن هەیوانێ، بۆ نیگایەکی قووڵی پڕ راز و نیاز، نەهات کەویار نەهات.

سەر بان بەرنادەم، ئەها کچەکەی هاوسێیان بە سۆندەوە هاتە دەرێ، پێش دەرکێ دەڕشێنێ، ئای، رووی سۆندەی کردە پێش دەرگای ماڵی

کەویار.

خودایە خورماکە تەڕنەبێ و نەتوێتەوە، دەی، کەویاری من سەرێ بێنە دەرێ.

نەهات، چێشتانە، کۆڵان پڕ بوو،ماڵیان ورد و درشت هاتنە کۆڵان، کەوی من نەهات و نەهات، تۆ بڵێی نەخرابێتە بیرکمەوە!

+کوڕم، تۆ شێت بووی، بۆ لە سەربانێ دانیشتووی؟

-من...

ئۆی، چ وەختە، ویستم بڵێمە داکم:

بەڵێ شێتم، شێتی ئەو کچەم کە لە بن دەستمە و دەستم نایگاتێ.

نەمگوت، هیچم نەگوت، بە شمشاڵ و کتێبەوە هاتمە خوارێ، لە دڵێ خۆ گوتم:

کیژێ، هی خۆمی و ئەو جارە لە دەست خۆمت نادەم.

لێ زوو پەژیواندەبوومەوە، ترسم لەوە بوو، دەست بە ڕوومەوە بنێ و بڵێ: شتی وا مەڵێ، من و تۆ خوشک و براین.

بویێ نزامدەکرد، بۆ هەتایێ لە ماڵە باوان بمێنێتەوە، نەچێتەوە باوەشی کەس، وێنەی جاری جاران بێتەوە کۆڵانێ، جاروبار سەرێ بە ماڵی مە دابگرێ و منیش لە بن چاوانەوە تێرتێر لێی بڕوانم، هێندە و بەس.

هەواڵێکی گوێزانی لە کەویارەوە دێ.

## ئەو پایزەی دنیام لەدەستچوو

سەربردەی منیش نزیکە لە هی فەقێی ناو گۆرانییەکە، ئەوەی حەسەن زیرەک نەمریی دایێ، ئەو فەقێیە دەڵێم کە لە مزگەفتێ (خەتم)ی دەکرد و لەپڕ هەواڵیان دایێ، دۆستەکەیان بردووە. منیش لە مزگەفتێ دەهاتمەوە بە سەر کۆچی ئەودا کەوتم، نەبادا رۆژێ بێ، منیش بکەومە گۆرانییەکەوە! با هەڵەی تێنەکەوێ. سەربردەی من بە مزگەفتەوە لەو سەروبەندە نە نوێژێکی تێدایە نە ئایەت خوێندنێ، ئەز نە فەقێ بووم، نە ئۆلدار، بۆ دوو مەبەست دەچوومە مزگەفتەکەی دەروێش برایم:

دڵم پێیدەکرایەوە، نەخاسمە لە وەرزی گەرما، بەر بێرایی دوور و درێژەکەی هی ئەوە بوو، لە سەر پشت لێی راکشێیت و بە دیار بای کوێستانیی (کونەبا)وە خەیاڵت لە شێوەی باڵدارە هەمەڕەنگەکان بە ناو پەلکی داراندا بەرەلا بکەیت، لە شەقەی باڵ بدەن، دنیا بکەن، بگەڕێنەوە و بە دیار ردێنی دەروێش برایمەوە هەڵنیشنەوە، من بە دیتنی ئەو دەروێشە دەفژەنە، حەیرانبێژە، هەستانبێژە، بانگخوێنە لە کەس نەچووە، فێنک دەبوومەوە، زۆر جار تەنها بۆ دیتنێکی لە دوورەوەی وی سەرم بەو مزگەفتەدا دادەگرت.

بۆ خوێندنەوەش فازیل رێحانە گۆتەنی:

ئەز ماڵی خوام کردبووە کتێبخانەی گشتی.

هاموشۆکەرانی ماڵی خودا، هەر نەخوێندەوار نا، خوێندەوارانیشی هەر وا تێگەیشتبوون، من کتێبی ئۆلی دەخوێنمەوە، ئاخر ئەو کتێبەی بە دەستمەوە بوو، هەمیشە بەرگەکەی ئایینی بوو، وا تێبگەم لە کتێبێکی ئایینیی مودەریسی مەزن، بابی حەمەی مەلا کەریم دەڵێم، کردبۆوە، بەرگی ئەوم لێکردبۆوە و لە کتێبی مارکسیی و قاچاخم هەڵدەکێشا، بیرمە رۆژێک

ئەفەندییەک دیاربوو چەندان جارکتێبەکەی بە دەستی منەوە دیتبوو، پرسی:
ئەری، ئەوە چ بوو، ئەو کتێبە تەواونەبوو؟
زمانم تێکئالا، بیرمنەماوە چیم گوت، بەلام بیرمە وەرامی راستم نەدایەوە، ئێ خۆ نالێم، هەر حەفتەی یان چەند رۆژ جارێ، کتێبێکی جیاواز، کتێبێکی دوور لە ئایین، دێتە ناو ئەو بەرگەی ئایینەوە، بەرگەکەی کتێبی عەبدلکەریم مودەریس بۆ من گەلەک بە کەڵک بوو، یەکاو یەک بوو، لە پرس و ترسی دووردەخستمەوە:
پرسی پیاوانی ماڵی خودا، ترسی پیاوانی حوکمەت، خەتخۆش بە پێکەنینەوە دەیگۆت:
+ مارکس بچێتە بەهەشت، تۆ ناچیت.
- لۆ؟
+ مارکس لە ناو ماڵی خودا دەخوێنیەوە.
- من بەهەشتیم، ئەوە نیە مارکس دەخەمە ناو جبەی مودەریس و دەیبەمە ماڵی خودا!
وای، چەند دوورکەوتمەوە لە کۆچی کەویار، دووریش نیە ئەو دوورکەوتنەوە، بە مەبەست بێ و نەمەوێ بە سەر کۆچەکەیەدا بچم، من نەبێ، کێ بەرگەی کۆچی وا لەپڕ دەگرێ!
لە مزگەفتی دەرویش برایمەوە بە کتێبەوە هاتمەوە، ناوی ناو بەرگی کتێبەکەشم لەبیرە، دواتر دەیلێم و بۆی دەگەڕێمەوە، لە خوار دارتێلی یاد لە نزیک ئەو گۆمەی مانگی تێدا خنکا. دیتم، لە کۆلانێ، لە راستی ماڵی کەویار دوو سێ قەمەرە راوەستاون، یەکیان لە هی بووکێ دەچێ، ئەوە چیە، دەبێ کێ بە بووک بچێ؟ ئەها، وێدەچێ ئەو بێوەژنە تەڕ و پڕە بێ کە مێردەکەی لە سەرێ تیاچوو، لەو رۆژانە جاشێک مارەی کردۆتەوە، بڵێی ئەو بێ بە بووک بچێ؟ بڵێم چی! لە خۆوە دڵم کەوتە قرت و پرت، تا پێدەکەوم، با سەربردەی مانگی خنکاو ببیستین:
منداڵ بووم، هۆشم هێندە بڕی دەکرد، بە هاواری مانگەوە بچم، هەیوەشەوێکە لە گۆڕاییە کەسکەکەی ئەو بەری کەندێ، لە دوورەوە

خەزێمەت لە حاجیلە جیادەکردەوە، بەهار ڕەنگە لە بەرایی گوڵاندا بووبێ، دەنگێک لە قورینگ نا، لە هی کەو دەچێ:

هاوارتە لە من، مانگ کەتە گۆمێ!

یەکێ بەرەو گۆمی شەختە، ئەو گۆمەی مانگ وا لە بنیدا لە تاو خنکان دەلەرزێ، هەر من نا، زۆرێ دی بە دەوری گۆمدا دەخولێینەوە، نزادەکەین و لە ئاسمان دەپاڕێینەوە، دەستێ بنێرێ و مانگ هەڵکێشێتەوە، بەڵام ڕەنگە هەر من و دەنگە کەویەکە بووبین، شانۆی ئەو مانگەشەویە بەهاریەی بەلاشاوە بە ڕاست تێگەیشتبین، هەر من و کەویار تەنێ مانگی بن ئاومان دیبێ و بیرمانچووبێ، سەرهەڵبڕین و لە ئاسمانێ مانگ ببینینەوە.

گۆتم:

چا نیە زستان نیە، دەنا گۆم شەختەی دەکرد، مانگ دەیبەست و دەمرد.

کەویار دەڵێ:

دەڵێن مانگ گەرم گەرمە، بکەوێتە ناو سەهۆڵاویش هەر گەرمە.

گۆتم:

کچێ، وا دەخنکێ، هەلێکی دی مانگ نابینینەوە.

گۆتی:

وا مەڵێ، لەوانەیە مەلە بزانێ...

بە مەبەست بە دیار گۆمەوە خۆم دواخست، ئێرە ڕێی بووکێیە، دڵم چووێ ببینم، ئەو ژنە لەو گۆڕە، بێ سۆراو و سپیاو، بێ خۆ ڕازاندنەوە گەلەک جوان بوو، داخوا لە بن تاراوە چۆنە؟ ئاخر ژنی بن تارا، حەمەد مەستان گۆتەنی:

دوێنێ کفنی دڕاندبێ، یان هەر لە ناو گۆڕێ هەستابێتەوە، ئەوڕۆ بچێتە بن تارا، پڕدەبێتەوە لە جوانی، لە شێوەی مانگی پڕ گەشدەبێتەوە، تارا هەمیشە ژن جوان نیشاندەدا، مەیموون بێنە و تارای پێدادە، دەبێتە دادە سەلما.

ئەو دادەیە، کار لە سەلمای مەلای جزیری نەبوو، بە پیری و دوای هەشت نۆ دە مێرد، شێخی لە ئایین وەردەگێڕا، بەپیری و بێ سۆراو و سپیاو

دەچووە شەڕی ئەو جوانانەی بۆ شاجوانی دەچوونە پێشبڕکێ، داخوا بە گەنجی چۆن بوویێ! بەڵام ناگاتە کەویارەکەی من!

سەرم بە سەر گۆمی شەختە، گۆمی مانگی گۆرین، شۆڕکردەوە، خەیاڵ بردمیەوە لای مانگی خۆم، ئەو مانگەی ماوەیەکە لە ماڵێ خۆی بەند کردووە و لە منی سەرگەردان هەڵنایە. گڕەی تڕومبێل هێنامیەوە سەرە کۆڵان و دیار گۆم، تڕومبێلی بووکێ نەرم نەرم هات، بووک کەوتە دەستی من، لە بن تارایەکی تەنک تەنک، مانگێک دەرکەوت، وای! ئەوە چ دەبینم؟ چاوی من بۆچی ئەو بووکە لە شێوەی کەویار نیشاندەدا، چاوم تریفەی مانگ بردوویەتی، یان خەون دەبینم؟

تا لە بن تارای تەنکەوە تیچاوێکی نەدامێ، باوەڕم بە چاوی خۆم نەکرد، چ تیچاوێ، تیرێ، چ ئەنگاوتنێ، چ کوشتنێ، من لەوێ لە دەو ئەو گۆمەی ئەوێ ساڵێ مانگی تێکەوت، کەوتم و هەوکەشپێوە راستنەبوومەوە، هەو بوو، بە چ جێ نەیناسمەوە، بە چاو دەیناسمەوە، لە ناو گەڕەکێ چاو من چاوی کەویارم دەناسمەوە، هەو بوو، مانگی من بوو، بە تەنیشت گۆمەکەدا ئاوا بوو، مانگی من ئاوا بوو...

ئەو رۆژە شتێکی ئەوتۆی دوای ئاوابوونی مانگم بیرناکەوێتەوە، چۆن لە سەر سووڕاوم، لە کوێ کەوتووم و چۆن هەستاومەتەوە، بیرمناکەوێتەوە رۆیشتووم و بە کوێدا بەگژ کێدا هاتووم، چۆن بزربووم و خۆم دیوەتەوە، نە هەینێ و نە ئێستاش گرتەیەکی گچکەی ئەو رۆژەم بیرناکەوێتەوە، بەڵام دەمەو ئێوارە، کە سەید مارف کەوتە بن زەردە، زەرد زەرد هەڵگەڕا، خۆم لە ناو کێلەکانی دیتەوە.

وا دیارە لە دوای کۆچی وی، بەشی من هەر گۆڕستانە، هانام بۆ تۆ هێنایەوە، پیری من، پیری سوارچاکان، لەو لێقەومانە کوا کەس؟ هەر تۆم هەس و بەس، پیری من، سەرهەڵبڕە، بمبینە، ئەوشۆ، ئەو شەوە دەمەو پایزیە، وێنەی شەوی گۆرینە، شەوی دەمەو هاوینی ساڵێ چووی، پیری من، تۆ بڵێ من، داخوا رەوایە؟ لە ساڵ و شتێ دوو کۆچ، دوو کۆست، کۆچ و کۆستی یەک کەس! ئەو کچە بۆ وای لە من کرد! خۆی بەرەو شەوی ماچ و

راmووسان و سەرجێیی، منیش هەڵدەداتە ناو گۆڕستان و بن کێلان.
پیری من، ئەو کۆچە پایزە تووشە، داری خەون و خەیاڵی کەسک کەسکمی هەڵوەراند، گوێم لە وڕە و خشەی هەڵوەرینە، ئەوشۆ بە دیار تۆوە، چ دوورنیە ئەو کزەبایەی کە نازانم لە کیهە لاوە هەڵیکردووە، مەرگی من بنووسێتەوە. پیری من، جێمکەوە، لە دوای کۆچی وی، من لە چ جێ ئۆقرە ناگرم، دنیا هێندە گچکە بۆتەوە، جێی پێیەکمی لێ نابێتەوە، کەلێنێ بخە گۆڕەکەت و دێمە ماڵەکەت و ئیدی دنیا جێی من ناکاتەوە...
لە تاریکایی گۆڕستانا وا لە دیداری پیری سوارچاکانم، دەرگای گۆڕی بۆم کردەوە، بە دیاریەوە دانیشتووم، من دەپرسم و ئەو بێدەنگ، چاوەڕێم شتێ بڵێ، ئەگەر رووناکیەکە لە گۆڕ دەرینەهێنابام، من دەڵێم دەهاتە گۆ و شتێکی دەگۆ.
رووناهی لە بەری مزگەفتەوە هات، خۆم دایە پەنای کێلی، رەنگە لایتی ترومبێلی پۆلیس بێ، هەوبوو، دوو سێ دەستریژیان بە گۆڕستانەوە نا، چەند گوللەیێ لە نزیکە من کەوتنەوە، ئەوشەوی تێدەچم ئەوشۆیە! ئەو فریشتە سەرڕشکنە، چی بەسەرهێنام!
تا پێش چەند ساتێ، ژیان تاڵ تاڵ، گووژارکێ بوو لەو گۆڕە، خۆزگەی مردنم دەخواست، لەگەڵ گیزەی گوللە، ژیان بۆوە هەنجیرە رەشە، ئەو جۆرە هەنجیرەی ئەو گەلەک حەزی لێبوو، بیرمە بە منداڵی زۆر جار لەو هەنجیرە بەشی منیشی دەدا و جارێک گوتی:
ئەو قلە بخۆ، لۆوەی زارت وەک وی شیرن بێ.
ئای گووژارکی گەورەیی، چ دەبوو نەگەیشتباینە ژەهری گەورەیی! هەر لە سەردەمی هەنجیرە رەشەکەی منداڵی، شیرن شیرن ژیابایین! من ئەو جارەش وەک جاری گۆرین، کۆچی یەکەم، خۆزگەم بۆ منداڵی خواستەوە، ترسی مەرگ هەڵینەقەندبام، لە سەر گۆڕی پیری سوارچاکان گرتە گرتە منداڵیی خۆم و ئەوم نیشانی خۆم دەدایەوە، وا تێبگەم تەنها بە گرتەی قامیشەکە راگەیشتم، ئەویش هێند بلەز بوو، پێناچێ چ چێژم لە نیشاندانەوەی دیتبێت:
لە سەردانێکی بەستی شەرغە فێری سوارسوارانێی مایینەقامیش بووم،

بیرمە منداڵە گوندی دەیانگۆ:

قامیش مێیە.

دەمگۆ:

لۆ مێیە، لۆ؟

دەیانگۆ:

مێیە و تەواو، بە دوایدا مەچۆ.

بە دوایدا نەچووم، مێبوونی قامیش بۆ من کێشەیە، ئاخر قامیش تەنێ دەبێتە مایین، خۆشت بکوژی ئەسپێکی لێ چێنابێ، منیش هەینێ حەزم لە سواری ئەسپ بوو، لە شاریش، لە بەلاشاوەش قامیش نەبووە ئەسپ، دەی تەراتێنێ بە ماییانیش خۆشە.

قامیشی تەڕی درێژ بە رەگەوە هەڵکێشە، سەرەکەی گەورە و ناڕێکە، بۆی دانیشە، هەندێ چەقۆکاری تێدا بکە، شێوەی سەری مایین وەردەگرێ، ئێمە وامان دەکرد، بە بەنێ، دۆخینێ، شتێ قەراسەمان بۆی چێ دەکرد، سواربە و بازۆ، سوار بە کۆلانێ وەردەبوون، چاودەنە ئەو سوارە سووکەلانە، لە هەمووان تیژتر دەبەزی، دەیناسنەوە؟ قامیش و مایینەکەش سەر بە رەگەزی ئەون، دەیناسنەوە؟

لە کەویار زیاتر کێیە؟

ئەو کچە وەها دەبەزی، هەر بە راستی قامیش دەبووە مایینەشێ، چ سوارێ بە تۆزی پێشی نەدەگەیی، لەو هەموو سوارسوارانێیە، من یەک جار گەیشتمە وی، بە هەڵە پێم کەوتە سەر کلکی مایینەکە، سوار گلا، جوێنێکی مزری کوڕانەی دا، دواتر بە جوێنەکەی خۆی پێدەکەنی.

شیرینتر وشەی لە مەیدانی سوارسوارێنێی ئەوێ سەردەمێ، سەردەمی منداڵی لە گوێمدا بزرینگێتەوە، وشەی زاری ئەو ژنەیە کە لە منداڵیمانەوە حەزیدەکرد من و کەویار بۆ یەک بین، ئەها، لە پێش ماڵی وان، سواری قامیشین و جلەو شۆڕکە و بازۆ، کەویار دەرپەڕی و من لە دوای، ژنەی زار شەکر، بە پێکەنینی شیرنەوە روو لە من:

دەی بتبینم، ئەو جوانە مایینە بگریەوە، لێت مارە دەکەین، ئەگەر نا،

دەیدەینە سوارێکی تر.
کەوتمە دوای، نەمگرت، بە من نەگیرایەوە.
لە ناو گۆڕستانێ بە خۆم دەگوت:
دەبوو هەینێ زانیبام ئەو کچە بۆ من نابێ، سواریکیتر دەیبات، ئەها، دەستی گرت و سواری قەمەرەی کرد و بە بەر دەمی مندا بردی.
تەقە لە سەر مایینی قامیش هێنامیەوە سەر گۆڕی پیری سوارچاکان، نەیهێشت بگەمەوە گەمە منداڵییەکان و بە تەنیشت کەویارەوە گوتەکان دەوربکەمەوە و کردەکان بلێمەوە.
چەند فیشەکێکیدی بە کێلەکانی گورستانەوە نران، ترس دەوری دام، ویستم هەڵێم، چۆکم شکا و تینی هەستانی تێدا نەما، خۆم سپاردەی پیری سوارچاکان کرد و لە ناو پووشوپەلاش راکشام و خۆم لەگەل گوڕ کردە ئێک، سەرم سپاردە کێلی لای سەری پیری خۆم.
لە شەڕەتەقە تەنها بەردە سەر دەپارێزێ.
ئەو قسەیەی پیری سوارچاکانم بیرکەوتەوە، ئەوجا ئەگەر ئەو بەردە کێلی وی بێ، لە تۆپیش دەتپارێزێ.
تەقە وەستا، دەنگە دەنگ و رووناکی نەما، هەستام و بێ خۆتەکاندن و مالاوایی، یەکپێ خۆم گەیاندە ناو ماڵەکانی موفتی، لە سەرە کۆلانێ لە بن تیشکی کزی گلۆپێک کەسێکم دی، بە منداڵ دەچوو، وەک من بن دیواری گرتبوو، وا دیارە ئەویش زارەتریک بووە، بە دوایدا چووم، لێم بزربوو، لە سەرە کۆلانێکی دی هاتەوە پێشم، ئەو لە تاریکایی و من لە رووناکایی، لەهیکەوە هاتە قسە:
+ کوڕە، کەنگێ وازم لێدەهێنی؟
- کوڕە، فازیل ئەوە تۆی!
هەوە، بەو نیوە شەوە، جگە لە فازیل رێحانەی قۆدی بۆیاخ لە دەست، کێ خوا لێی گۆڕیوە بێتە کۆلانێ، هەوە منداڵە هەلاتووەکە رێحانەیە، ئاخر گەڕەک و ئێوەش دەزانن ئەو کوڕە لە هۆش گەورە، لە زاخ پڕە، هەر بەژنی منداڵێکی هەبوو.

ئەو هەر وا تێگەیشت بە وێنەی جارانی گۆڕین من بۆ پاسەوانی لەو هاتوومەتە دەرێ، چ بزانێ ئەوشۆ کۆچی کەویار منی رەوانەی گۆڕستان کردووە، باشبوو تاریکی سیمامی داپۆشی و ئەو شێواویمی نەدی، دەنا دوور نەبوو هەستی بە شتێک کردبا.

ئەو شەوە فازیل رێحانە دیواری مزگەفت و دار و دیواری گەڕەکی موفتیی بە (بڕووخێ سەدام) نەخشاندبوو، منیش گۆڕستانی سەید مارفم پڕکردبوو لەئاهو نزا، گۆڕی پیری سوارچاکانم لە فرمێسک هەڵکێشابوو، ئەو شەوە ئەو شۆڕشگێڕێکی سەرسەختی بزێو، من دڵشکاوێکی بێ سەر، نەمدەزانی پێیەکانم بۆ کوێم دەبەن، ئەو شەوە تووشی ئەو نەبام، کێ دەیزانی سەرم بە کوێدا دەکردا!

چۆن لە هاوڕێکەم دابڕام و چوومەوە ماڵێ؟ لەکوێ بووی و بۆ وا درەنگ هاتیەوە؟ گوتەیەک، گرتەیەکی ئەو شەوەی ماڵێم بیرنایەتەوە، هەر ئەو شەوە نا، تا رۆژی حەفتیانەش، بێ سەر سووڕاومەتەوە، بۆیە چەند گرتەیەکی گچکە نەبێ، شتێکی ئەوتۆم بیرناکەوێتەوە.

هەوکە، هەوکەی دوای تەمەنێک، هەوکەی دانیشتن لە سەر کۆمپیوتەر، کەویاری رۆژی حەفتیانە دەبینم، چ کەویارێ، نایەتە گێڕانەوە و نیشاندانەوە، چەندی دەکەم ناخەوێتە ناو رستانەوە، ئەها، لەرزینی دڵ پەنجەی گرتەوە، پەنجەکانم لە سەر دوگمەی نووسین دەکەونە لەرە لەر و پیتەکان تێکەڵ دەبن، وا چاکە بە سەر ئەو حەفتیانەدا بازبدەم، ئەگەر نەهاتمەوە سەریشی، چاوەڕێ مەبن.

مەپرسن، ئەو پایزە، پایزی کۆچی کەویار، چۆنچۆنی لە من چوو، ئەو کەویارەی وا تێبگەم ئێستاش نەیزانی کوڕێکی رەشوبرژی گەڕەک، کوڕێکی هاوڕێی منداڵیی، ئاگری بۆ گرتووە و سووتانێ دەسووتێ، لە سووتانی کەس ناچێ، کەس نازانێ وا بسووتێ، سووتانێ کەس هەستی بە کڵپە و دووکەڵی نەکرد، کەویار نازانێ، نابێ زانیبێتی، کوڕێک هەیە، بۆ وی پڕاوپڕ لە ئەوینە، بەڵام ئەویندارییی نەزانی!

ئەو پایزە، لە من چ پایزێ بوو، لە درەخت رووتتر بوومەوە، بە چاوی

ئایندەش دەمڕوانی کەچی بایی پەلکێ کەسکاییم لە ژیانی خۆم نەدەدیتەوە. جاروبار بە خەیاڵ دەگەڕامەوە پێش کۆچەکە، دنیا چەند کەسک بوو، ڕۆژ بۆ من گزنگی خۆی دەداوە لە قەڵاتێ، زەردەپەڕ بۆ من ئاسمانی دەنەخشاند، زوو زوو دەچوومە سەر بان روو لە ماڵی وان، بۆ خۆم دەفڕیم:

سێ چار پەلە هەورێ سەرقژنی سپییات، هەموو دەمەو ئێوارانی پایزان، لە دیوی ئاوابوونی قەڵات، فێربووبوون بە بەر چاوی خۆرەوە دەستی یەکتریان دەگرت و دەیانگرت بەری ئاسمانێ، هێشتا دەروێش برایم دەستنوێژی بانگدانی هەڵنەگرتبوو، ئەوان زەردەپەڕیان چنیبوو، لەو سەرەوە بە شەش حەفت رەنگان شاریان دەنەخشاند، هەر ئەو هەورە زەردەپەڕیانە، لەگەڵ گەردوگوڵی بەیانی خۆیان دەگەیاندەوە بانیەکانی کەسنەزانێ، دیوی هەڵهاتن، لە سایەی ئەوانەوە شار لە گزنگی چەند رەنگی چاوی هەڵدەهێنا.

هەینێ وابوو، نازانم کێ گۆتەنی:

دڵەکان تژی ئەوین بوون، هەلاتن و ئاوابوون رەنگین بوون.

دوای کۆچی کەویار، ئەو دێرەم دزی، نە بە کۆتر نە بە کەسدا نەمنارد، لە بن زگی پووشکاخەز نووسیمەوە و دوور لە چاوان بە دوای کۆچی ویدا هەڵمدا، گەیشت؟

بەرێ خۆ دەنێ، باڵی لە تەلی چ دارتێلێ گیربووە!

ئەو پایزەی دنیام لە دەستچوو، حەفتەیەک دوو، جوان بە سێوەم گرت، لەگەڵ خۆم دەمگێرا، دەمبردە ناو گۆڕستانیش، لە نزیک گۆڕی پیری سوارچاکان، خۆم دەدایە پەنایێ و دەنگمدەدایێ، ئەویش سێوەی دەویست، بەڵام (داد..)ەکەی من بۆ وی نا، بۆ هەڵفڕینی دنیا و چۆلبوونی بەلاشاوە بوو:

**...ئەرێ گورێ،ێ ێ ێ**

**ئامان گور لە خەوێ هەردەستی**

**شەنگ و شۆڕێ، بەژن برندێ، پشتی دەبەستی**

**ئەرێ برادەرینە**

**ئەگەر هەنێێ گورە جوانێ لەبۆ من بمێنی**

**بەوێ مانگی لە چواردەی**
**کە وەتانێ لە بەینی هەور و ساماری جۆخین دەبەستی**
**داد، گورێ**
**لە باخانم نەماوی**
**خۆشی لە ساران...**

جارەکی لە پەنای کێلێ سێبەرێ گەیشتە سەرم، بێ سەرهەڵبڕین ناسیمەوە، فازیل ریحانە بوو، توومەز بە شوێن دەنگی سێوەدا هاتبوو:

تۆ! من بزانم تۆ عەشق لێیداوی.

زۆر هەوڵیدا، هیچی لێم هەڵنەکڕاند.

لە شەوانی ئەو پایزە کۆچە خەونی وەهام بە کەویارەوە دەدی، تا چەند رۆژیش هەر وام دەزانی راستیە، ئاخر لە خەونەکەدا چەند جارێ بەئاگادەهاتمەوە، لە هەر خەوتنێکەوە خەونەکە خۆی تەواودەکردەوە، جاری وا هەبوو، لە بەئاگاهاتنەوەدا، دەنگێک کە لە دەنگی باڵدارێک دەچوو، دەیگۆ:

زوو بخەوەوە، یار چاوەڕێتە...

دەخەوتمەوە و دەگەیشتەوە سەرم، خەونێک لەو خەونانەی تا هەوکەش لە خەون روونتر لەبیرمە و هەمیشە خۆی تازە نیشاندەداتەوە، خەونی ناو تووترکانە.

لەو خەونە لە دەو چەمێ، هەورێکی بارانیی نەوی لە سەرمان بوو، شۆڕابەی دیار بوو، ئەها دایکرد، لە ترسی تەڕبوون، بە جووتە کەویتینە بن چەند بنە تووترکێ، هەر چۆن خۆمان دەجوولاند، تووترک لە لەشمان رادەچوو، بیرمە ئەو دنک دنک (توو)وەکەی دەخستە زاریەوە و سوورایی بە لێوی سووریدا دەهاتە خوارێ، منیش(درک)م لە باسکی دەردەهێنا، لەوێ زاخم دا بەرخۆم و بۆ یەکەم جار راست و رەوان گوتم:

کەنگێ دەگەڕێیتەوە لای من؟

بە دەم تووترک خواردنەوە، دەنگێک:

گۆچان بچێنە، وەکو داری شەکرانێ شیندەبێ، پێکەوە لە بن سێبەرەکەی دادەنیشن...

## داری شەکرانێ

لەو خەونەدا سێ چوار جارێ بەئاگاهاتمەوە و خەوتمەوە، خەونەکە وێنەی نەوار، نازانم کێ چەند جار دەیگەڕاندەوە و لێیدەدایەوە و (گۆچان بچێنە)ی دەگوتەوە.

باشە چیم لێ کەم دەبێ، با بیچێنم، بەر لە چاندنی گۆچان، حەزم لێیە سەربردەی داری دارەشەکرانێ بگێڕمەوە، ئەو سەربردەیەی بە مندالّی من و کەویار پێکەوە لە جارێ زیاتر، لە زاری پیرێژنەکەی دەڤەری زرارەتی بیستبوومان و من لە فیلمی هیندی پتر چێژم لێ وەردەگرت:

دارەک هەیە، بە داری شەکرانێ نێوی رۆییوە، کاوێزاغا کەسکتری کردووە، سیساوەییش بەوەی خستوویەتیە نێو حەیرانی، شەکری پێبەخشیوە. دارێ شەکران گەلەک بە تەمەنە، کەس نزانی چەند پشتە، لێ هەمی دەزانن ئەو دارە بەرز و پڕە کە نیوەڕوی هاوینان ئەگەر گوند لە بنی بخەوێ، کەس تاوی وێ ناکەوێ. دەزانن ئەو دارە کەسک و هەمیشە تەڕە لە گۆچانێکی زەرد و هیشکەوە شینبووە و بە ئاسمانی زرارەتیا هەلّچووە؟

گۆچانی ئەو تولازەی براژن واچەی بۆ هەلّبەست و برا کوشتی.

سەربردەی داری شەکرانی، هەر لە زاری پڕ شەکری پیرێژنی زراریان دێ، بیگێڕنەوە:

زوو، گەلەگ زوو، خواپێداویش شەکر و چای نەدیتبوو، هێشتا کاوێزاغا نا، بابی ویش لە پشتی بابی بوو، هێشتا نیوەی هەولێری لە سەر قەلاتێ نەهاتبوونە خوارێ، دارەکەی دارە شەکرانێ سێبەرێ خۆی دەداوە سەر گوند و ئاقارێ.

پیرێژنێکی دەوروبەری دارەشەکرانێ کە تەمەنی لکێکی دارەکەی هەبوو، ئیوها دیرۆکی داری بۆ ژنانی کۆلان دەگێڕایەوە، مندالّیش بازنەیان دەبەست

و کەویار لە من پتر تامەزرۆی زاری پیرێژنی زراری و داری شەکرانی بوو. ئەو ژنە زارقەنــدە گــوێی خــۆی دەدایە حەســەن سیســاوە و زاری بــۆ سەربردەی داری شەکرانی دەکردەوە:

ژنەک هەیە، نە بـکەی نە بخـۆی، هەر لەو بڕوانــی، تــا دەســت هەڵبـڕی کەڵەگەت، چاو بنپیاڵە، گەردن کێلە، ئەوە چەرخی رووومەتی، مێوژ بخوات لە گەردنیەوە دیارە، سینگی کوارگی کەمایە، ئەوژنە مینا مینایە، مانگێکە لەو گۆڕە. برای خۆی عاشقی دەبێت، مێردەکەشی گەلەک قۆزە، بەڵام چ لە دڵ دەکەی! ژنە دڵی بە شووبراکەیدا دەچێ، شووبرای شوانیش وا شەرم دەکات لەبەر کچانی گوند چاو هەڵبێنێ، ئەوجا براژنی خۆی؟

براژن زۆر دەوروسوڕی شووبرا دەدات، شووبرا سەر بەرزناکاتەوە و خۆی لە گێلی دەدات. براژن ئارامی نامێنێ، رۆژەک مێرد لە ماڵ نابێ، لە شووبرا دەچێتە ژۆرێ، باوەشی بۆ دەکاتەوە، شووبرا دەپاڕێتەوە، براژن ئەوین لە سەری داوە و پاڕانەوە راینـاگرێ، شووبرا هەڕەشەی لێ دەکات، ئەوین هەلیگرتووە، هەڕەشە چیە! هەر چۆن دەبێ، شووبرا خۆی لە دەستی براژن دەرباز دەکات.

براژن هەست بە تێکشکان دەکات، زۆر لە شووبرا پڕدەبێت، مێردەکەی بە سەر توورەیی و شێواویی ژنەکەیدا دێتەوە، ئۆجا چەندی خۆشدەوێ! پیاو نیە لە دنیایێ هێندەی وی ژنی خۆی خۆشبوێ، لە ژنە دەپرسێ:

- بە من بڵێ، چ بووە، کێ توورەی کردووی؟

+ چ بڵێم! ناگۆترێ.

- ناگۆترێ؟ ئەو چ قسەیەکە!

+ براکەت، براکەت پڕی دامێ...

مێرد خوێن بەر چاوی دەگرێ، لە سێتێر زیاتر چاوی هیچ نابینێ، هەڵیدەگرێ و بە ئاقار دەکەوێ، لەو جێیە، لەو بەرزاییەی ئێستا داری شەکرانی گرتووە، تووشی براکەی دەبێت، دەڵێ:

تۆ پڕ دەدەیتە براژنی خۆت؟

برای گۆچان لە دەست، دەڵێ:

برام، شتی وا نەبووە.

برای سێتیر لە دەست:

زارت هەڵنەهێنی، خۆت ئامادەکە بۆ مردن.

برای گۆچان لە دەست، چەندی هەوڵدەدات پاکیی خۆی بسەلمێنێ و ڕووداوەکە چۆنە وای بگێڕێتەوە، برای سێتیر لە دەست کەڕە و هیچ نابیستێ. برای گۆچان لە دەست تێدەگات، کار لە کارترازاوە، ڕۆژی هاتووە، دەڵێ:

باشە برا، ئەو سینگی من و ئەوە گوللەی تۆ، بەڵام ڕاسپاردەیەکم هەیە، ئەگەر بۆم جێبەجێ بکەیت، لە بەهەشتیش لە چاکەت دەرناچم.

برای سێتیر لە دەست دەڵێ:

بە تەمای بچیە بەهەشت؟! دەی ڕاسپاردەکەت بڵێ.

برای گۆچان لە دەست:

هەر ئێستا، دوایوەی من گیانم دا، ئەو گۆپاڵە لێرە بچێنە، تا حەفتەیەک پاسی بکە و و نەهێڵی کەس هەڵیکێشێ.

برای سێتیر لە دەست:

سەگباب، ناپاکیم لەگەڵ دەکەیت و دەمکەیتە پاسەوانی گۆچانیش؟!

برای گۆچان لە دەست:

برام، گوێبگرە، دوای حەفتەیێ ئەو گۆچانە دەبێتە درەخت، لە سێبەرەکەی دەحەسێنەوە.

لەو ساتە سێتیرەکەی لە سەر ڕادەگرێ، برای گۆچان لە دەست دەڵێ:

پەلە مەکە، دوا قسەم دەکەم، ئەگەر گۆچانەکە شیننەبوو، نیشانەی ئەوەیە من ناپاکیم لەگەڵ تۆ کردووە، بەڵام ئەگەر شینبوو، دڵنیابە من پاکم و دەستم بە ژنی تۆ نەکەوتووە.

برای سێتیر لە دەست بێزار دەبێت لەو قسە هیچانە، زرمەی لێوە دەهێنێ و بە جێی دەهێڵێ، ڕاسپاردەکەی بەجێناهێنێ. شەو براکەی لە خەونێ گۆچانەکەی بیردەهێنێتەوە، دڵی نەرم دەبێت و دەچێ لە شوێنی خوێنەکە گۆچانەکە دەچێنێ و پاسەوانی لێ دەکات، ڕۆژی شەشەمی پاسەوانی،

دەبینی:

گۆچان گۆپکەی دەرکردووە، سێ رۆژ نابات، دار کەسک کەسک دەچێتەوە.

ما، برا خاک و خۆڵی زرارەتیان بە سەر خۆدا بکات، ژنەکەشی پێ لە هەموو شتێ دەنێ.

هەندێ کەس بەو دارە دەڵێن: داری بەهەشتێ.

منیش گوتم، با بە قسەی کەویاری ناو خەونێ بکەم و بچم گۆچانێ بچێنم، چاندم، لە سەر بانێ لە ناو تەنەکەیەکی پڕ خۆڵ چاندم، دوو سێ حەفتە لەوێ مایەوە، جاروبار لە ناو کەمەی گۆچانەکەوە دەمڕوانیە کۆنە هەوار.

بە داری دارەشـــــەکرانێ، داری بەهەشـــــتێ، دارەکەی دارەبزمــــــارەم بیرکەوتەوە، ئەویش بە بزمارێک دەگاتەوە کەویار، با سەردانی بکەم.

## بزمارێ بە دارەبزمارەوە

ئەو دارە داری دارەبزمـارە، هێنـدەی دارەکەی دارەشـکرانێ نـاودارە، ئەو دارەش داری دەرمـانە، هـی مـرازە، دارەبزمـارە جیـایە لە خـڕ داری مـرازان، وارێن:

هەگەر بزمارەکی لێ دانەکوتی، ببیە شێخی بزماریش، مرازت ناهێتە دی، نزات ناگیرێ.

داری بزمـارگر زۆر کۆنە، هـی تەمەنـی مـن و تۆ و بـاب و باپیرمـان نیە، دەڵێن:

زوو، هێشتا کاوێزاغا رێی بێرە نەکەوتبوو، ئەو دارە لێرە هەبوو، رۆژێک شـێخێ رێـی دەکەوێـتە بـن وێ دارێ، کـوت کـوت، بزمـارێ لە قەدی دار دادەکوتێ و سـاقۆکەی پێـوە هەڵدەواسـێ، خەڵـک بزمـاردەکەی شـێخ دەبیـنن، ئیـدی لێـرە و لەوێ، هەر کـێ بزمـارێکی دەسـتدەکەوێ، لە داری دادەکـوتێ، زۆر نابات، بزمار کاری خۆی دەکات، دەبێتە دەرمانی سەرئێشە و ددانئێشە.

هەبوو دەیگۆ:

شێخ ددانی دێشا، بزماری لە دار کوتی، وەکات ژان شکا.

نەنە خەجێ کە سەربردەی دارەبزمارە لە کن وی بوو، دەیگو:

هەنگینێ هەگەر بزمار دەستکەوتبا، لە ئاقارێ مە ددانێشە نەدەما.

لێیان پرسیبوو:

ئەدی نابێ بزمارێک دەرکێشیەوە و دایکوتیەوە؟!

نەنە خەجێ:

نابێ، دار بزمار دەناسیتەوە و...

ژنێکی گەڕەک دەڵێ:

نەنە خەجێ تێکچووە، بە دەردی کەسکوسۆر چووە.

خەڵکی بەری چیای پیرمامە، دەو رووباری بەستۆرە، لێ بەینێکە دوورە لە زێد وماڵیان، ئەوەتا لێرێهێ، لە گەڕەکێ مە، لەو سەرەیە، نەنە خەجێ لەگینە گەیشتبێتە بن هەشتا، ئاخر لە گرانیی گەورە خۆی گۆتەنی:

پڕ باخەڵم مەمک بوو.

بەڵام هێشتا ناسک و تەڕە، وێنەی گوڵە شەستپەڕە، چاودێ، روومەتەکانی وارێی باوێژەن و پێش کەمێ لە دار بەربوونەتەوە. نەنە خەجێ، وێدەچێ کار لە خەجێی سیامەند نەبووبێ، بە گۆتەی هەندەکان بێ، ستیی کەریمیش لە جوانیدا نەیدەگەیشتێ، بەڵام چۆنە نەکەوتۆتە ناو لاوک و حەیرانەوە، نەخاسمە لاوکی کاوێژ؟ ئەوە جێی و گومان و پرسە، بە گۆتەی خۆی بێ، ناوی لە ناو لاوکی کاوێژدا هەیە، بە خەجێ نا بە ناوی دی.

رەنگ نیە لە کنە وی بزمار و دارت لە زاری بێتە دەرێ، وەکات دەگاتەوە کلکەی پیرمام و لەوێوە بە بزمارێکەوە دەچێتە بن دارەکەی دارەبزمارە و لەوێوە هێند بە درووداو دارەبزمارە دەگێڕێتەوە، تۆ لێرەوە کوتەکوت دەبیستی، دەبینی، ریزە بزماری قەدی دارەکە دەبینی، هەڵفڕینی فرندەی ناو پەلک و سەر لقان دەبینی، دوای داکوتانی بزمار، دەگەڕێنەوە و هەڵدەنیشنەوە و لەگەڵ نەنە خەجێ دەکەونە خوێندن و جریوە، وەک بڵێی ئەوانیش دەگەڵ وی نزا بخوێنن. خۆ نەنە خەجێ کاتێ لە بن لێوانەوە نزا دەخوێنێ، وای خودایە، چەند لە جریوەی کێشوولە دەچێ، هەمووشی بۆ گەیشتن بە کاوێژاغایە، نەنە خەجێی سەر کۆسپی دەرکێ کە لە باری دانیشتن و لە دوورەوە لە پنجە گیایەکی نێرینەی بەهارێ دەچێ، بە زاری خۆی دەڵێ:

بزمارێ من نە بۆ سەر بوو، نە بۆ ددان، بۆ دڵێ خۆ بوو، تا کاوێژم بە دەستهێنا، جۆرکێ بزمارم لە دارەبزمارە داکوتا.

نەنە خەجێی بسک سۆری سەر بە خەنە، لە دڵەوە دەڵێ:

من مامزەکەم، مامزەکەی ناو حەیرانێ، ئەوەی ئاقاری دارەشەکرانێ، من جوانەکەم، هێ ناو (چ بکەم کەمەرە لە پشتان)، من حەفسەکەی ناو لاوکی

گەنج خەلیلم، من...

ئەرێ نەنە خەجێ لەو پایزە تەمەنە بۆ وا بە دارە بزمارە و بە کاوێزاغای گرتووە و دین و حەیرانی بووە، تۆ بڵێی لە نێوانیان کەینوبەینێ هەبووبێ، یاخود یەک لایەنە بووە و کاوێز هەر نەشیدیتووە، یان هیچ لە گۆڕێ نەبووە و وەک دەڵێن هەر شێتە و بە شتێ دەگرێ، ئەویش بە ئەوی گرتووە. نا، ئەوە نابێ، ئەو سووتان و هەڵقرچانە، لە خۆوە نیە، ئاگری ئەوینێ هەبووە.

هەیە دەڵێ:

کاویزاغا کە کون بە کون لە دوای جوانان و گەردن کێلان گەڕاوە، لە ئاقاری بەستۆڕە و دارەبزمارە و دارەشەکرانی زۆر گەڕاوە، هەر دەبێ لە سیلەی خانووێ، لە بن کەپرێ، لە زارکێ رەشماڵێ، چاوی بەو خەجێیە ناسک و نازدارە کەوتبێ و لاوکێ، بەستەیەکی بە سەردا هەڵگۆتبێ.

هەیە دەڵێ:

وێدەچێ ئەویندار بووبن و شەو ژوانیشیان کردبێ، ئەو ژنە لەخۆوە قسە هەڵنابەستی، ئەوەی ئەو هەموو سالە لە ترسان لە دڵی خۆ بەندی کردووە و کەس لێی نەبیستووە، هەوکە بە گۆڕێی وەردەکات و دڵی خۆی دادەکەوێنێ.

پیرێژنێک گێڕابوویەوە:

کاوێزیان دارکاری کرد و لە جێ کەوت و مرد، خەجێ خۆی لە قوڕێ گرت و تا درەنگیش لەگەڵ دەستەیێ ژنی ئەو ناوە، سالی جارێ دوو سەردانی گۆڕەکەیان دەکرد لە گۆڕستانی هەرشەمێ.

دەڵێن دوای مردنی کاویزیش، سەری لە دارە بزمارە نەبڕیوە و ناوە ناوە بە بزمارێکەوە چۆتە دیداری. دیتوویانە زۆر بە رقەوە بزمارەکەی لە دارێ داکوتاوە. پرسیویانە:

بۆچی وا بەتوندی و گرژی؟

وا باگۆی داوەتەوە:

ئەوە بۆ سەر دڵی بکوژی کاوێزێ، خودایە نەگاتە هێوارێ، دە خوێنی خۆی بگەوزێ.

نەنە خەجێ، کاتێ دەکەوێتە تەمەنەوە روو لە خودا دەکەوێتە پاڕانەوە و

نزا:

خودایە، بیناییم لێ دەستێنی بستێنە، ڕۆییینم لێ وەردەگریەوە، وەگرەوە، هەرچیت ویست، بیبە، تەنها بیستن نەبێ، من بێ بیستن هەڵناکەم، بێ لاوکی کاوێزی دڵ هەڵناکەم.

وا دیارە خودای نەنە خەجێ دڵی ناشکێنێ، بەو تەمەنەشەوە گوێی لە گوێی من و کەویار سووکترە، لە هەر کوێوە دەنگی کاویزاغا بێ، دەڵێ:

منداڵینە، وس بن، لاوکۆی مە لاوکان دەچڕێ.

دوایوەی کاوێزاغا لە لاوکی خۆی دەبێتەوە، نەنە خەجێ فرمێسکی چاوان دەسڕێتەوە و دەڵێ:

هەرکێ نیازی وەک نیازی منی لە دڵە، با بچێتە لای دارە بزمارە.

لە گەڕەکی مە سێ چوار ماڵێک هەبوو، ساڵی جارێ دوو سەردانی دارەبزمارەیان دەکرد، کەسوکاریشیان لەولا هەبوو.

ئێ، ئەو دەمەی کەویارم لە دەستچوو، نەنە خەجێی شاجوانی خێڵی هەرکیان لە گەڕەک نەمابوو، بەڵام دارەکەی دارە بزمارە لە خەیاڵی من گەشتر و پڕ بزمارتر بوو. من کە بۆ گەڕانەوەی وی، وام لێهاتبوو هەندێ کات دەهاتە سەرم پەنا بۆ نووشتە و کشتەکانیش ببەم، هەرچی بە خەیاڵمدا دەهات، ڕێی تێچووبا، دەمکرد. خولیای دارەبزمارە لە سەرم گەڕا، ڕاستیت دەوێ من گاڵتەم بەو دار و بزمارە دەهات، بەڵام وەک بڵێی بۆ هێوربوونەوەی دەروون بێت، گوتم با سەردانی بکەم.

باش هات، خۆم بەگەڵ ماڵە ناسیارێ دا و گەیشتمە دارە بزمارە، پایزە، زەوی زەرد و پووشاوی، دارەکە کەسکە وێنەی کەوێکەی نەنە خەجێ، یەکەم جارە ئەو ناوە دەبینم، دار چەند گۆڕێکی بە دەورەوەیە، دار لێرە و لەوێ ریز ریز بزماری پێوە، ئیدی منیش بزمارێکم لە ریزی بزماران داکوتا، بزماری گەڕانەوەی کەویار.

کۆچی کەویار، لە زۆر شتی کردم و بە زۆر شتی دادام، چەندان جار ڕێی مردنی پیشاندەدام، لە داخی کەویار بۆ ماوەیێ فووم بە شمشاڵیشدا نەکرد، لێی تۆرام، بە داو و بزمارێکەوە بە دیوارەوە هەڵمواسی، تا داوەتەنە تەونی

به دەورەوە نەچنی، پەنجە و لێوی منی نەدیتەوە. کۆچی کەویار چەند دەفتەری پێم پڕکردەوە و ڕەشکردەوە، درەنگتر بۆ ئەوینی وی گەڕەکم خستە ئەو شیعرەوە و زۆر دواتریش بەو شێوە دامڕشتەوە:

**گەڕەکی مە، چ ئاسمانی بوو!**
**بەهاران**
**قەرتارە قەرتارە**
**پەڕەسێلکەی بە سەرماندا دەڕژاند**
**ڕست، ڕست**
**پەلکەزێڕینەی لە تەمەنمان دەنەخشاند**
**چ ئاسمانی بوو، گەڕەکی مە!**
**هاوینان**
**هەزار و یەک ئەستێرەی بۆ دەژماردین،**
**بە دەم شەماڵەوە**
**لە ناو جۆلانەی تریفە دەیخەواندین.**
**گەڕەکی مە، چ ئاسمانی بوو!**
**پاییزان**
**ڕەزە کێ و هێشووە ماچ بوو.**
**کزەیی هەڵیدەکرد**
**بۆنی بارانی دەگرت، سۆزی لێ شین دەبوو،**
**چەند لە من و کەویار دەچوو!**
**گەڕەکی مە، چ ئاسمانی بوو!**
**زستانان**
**ساقۆی بەفری لەبەردەکردین**
**هەموومانی دەخستە بەر ئاوێنە و**
**لە چێوەی ئەوینی دەگرتین**

سەربردە زۆرن، دەبێ کەمێ لە کەویار دوورکەومەوە، بەلام وا تێبگەم

سەربردەی من سەر بەبن دەریاشدا بکات، بە سەرەداوێ دەگاتەوە ئەو کچە دڵ و ژیانبەرە.

سەرێ لە جوانەکەی گردی جووانی کۆیێ دەدەمەوە.

## کەویار

## جوانەکەی گردی جووان، پێکی قەڵاتی و...

بەر لە دیداری جوانەکەی گردی جووان، بۆ تاوێ دەگەڕێمەوە تافی منداڵی و ناو تڕومبێلی ڕێی کۆیێ.

لەو سەر زەمینە پان بەرینە، بۆ منداڵ جێیەک نیە بگاتە کۆشی دایک، بەڵام لە ناوتڕومبێلێ وا نیە، جێیەک هەیە گەلەک لەوێ خۆشتر، ئەویش سەر کوشینە. لە هەولێرەوە بۆ کۆیێ جێی من سەر کۆش بوو، تا دەگەیشتمە بن دارەکان، چاوم لەوە بوو، جێیێ چۆل بێ و خۆم بگەیەنمێ! لاقی لێ ڕاکێشم و باڵم بکەمەوە، بە دڵێ خۆم شان بسووڕێنم و تەنیشان بگۆڕم، چۆل نەدەبوو، نەدەبوو، لە ڕێیێ کەسێ دادەبەزی، دوو سوار دەبوون.

کاتێ دەگەیشتمە بن ریزە داران، ئەو دارانەی لە دۆزەخی سەر کۆشی ناو تڕومبێلی پڕ لە حەفتوهەشتێ، لە چاوی منەوە دەبوونە کولانێک لە کوڵانەکانی بەهەشتێ، خەنی دەبووم، ئۆخەیش، خۆ گوڵ بووم، ئێستا لە زیندانی سەر کۆشی دایکی ناو تڕومبێل دەرباز دەبم و وێنەی باڵداری سەر درەختان لە شەقەی باڵی ئازادی دەدەم.

ئەو لە کۆشنانەی ناو تڕومبێل، منی لە تڕومبێلی ڕێی کۆیێ تاراند، بە من با بە کەروبار بچمە کۆیی، نەچمە سەر کۆشی دایکمی ناو تڕومبێل. هەر لە بەر خاتری هەندێ حەزمدەکرد زوو گەورە بم و لە سەر کۆشی دایکم جێم نەبێتەوە.

بیرم دێتەوە جارێک بەر لەوەی سوار بین، گۆتمە دایکم:

نایەمە سەر کۆشت.

گۆتی:

باشە، من دێمە سەر کۆشت.

گۆتم:

وەرە

گۆتی:

کورِم، ئەگەر لە تەنیشتم دانیشی، دەبێت پارەی تۆش بدەم.

گۆتم:

بیدە، لە سەر کۆشت دانانیشم و تەواو.

دایکم زانی داومەتە لاملی، ملیدا و پارەکەی دا.

بیرمدێ، جارەکی کێشەی سەر کۆشی دایکمم بۆ کەویار گێڕایەوە، چاویم دی پڕ ئاو بوو، گوتی:

ئەمن داکم لە ناو ئاگریش بێ، لە سەر کۆشی تێرنابم.

تا هەنگینێ نەمزانیبوو، ئەوە ژنەی کەویار پێیدەڵێ دایە، زڕدایکی بوو، هێشتا لە ناو لانکێ دەبێ دایکی خۆی دەگاتە ئەو دنیا.

ئێ، با بگەینەوە جوانەکەی گردی جووان، ئەز بە هۆی شوانی ماڵ لە گردی بە چاوی خۆم مانگی سەر عەردم دی، ئەو کوڕە ڕەشتارە نەوەی مینکەی شمشاڵژەنی ناودارە، ئەو شمشاڵەی دەروێش عەودوڵای گۆران و قاڵە مەڕەی هەمووانی بە شاگرد نەدەگرت.

نازانم شوان بۆچیماڵیان کەوتە ئەوێ، ئێ، لەوە و لە شمشاڵ و مینکە گەڕێ، سەر باس و باسمان جوانی جووانە، مانگ و بای باواجیە.

هەر کەڕەتێ ڕێم کەوتبایە بەفری قەندی، دەچوومە سەردانی شوانی ماڵ لە گردی، گردی جوان! ئەو کوڕە ئاوزای من بوو، تازە خەتی سمێڵمان دانابوو، لەوێ، لە حەوشەیێ، کە دەرگاکەی دەڵێی بە مەبەست و بۆ بای باواجی هەمیشە لە سەر پشتە، ژنێک ڕوو لە کۆڵان، شانی بە کۆڵەگەی بەر بێرایی داوە و تەواو لاربۆتەوە، ژن چ ژن! سوێند بە سەر جوانیی ئەو ژنە بخۆی، لێت ناکەوێ، ئەوە تیلمێ مانگە و لە شێوەی سێ شەوەیی، کەمێ ڕێکتر لێی بڕاوە و بزانە بۆ کێ داگیراوە و لەو گەڕەکە دانراوە، خۆ کاتی شنە لە پرچی دەدا و دەیدا بە لادا، مانگ جۆخین دەبەستێ و چاو ئەبلەق دەبێ و شەقاو دەوەستێ.

ئەریٚ بۆچی هەر پێم دەخستە کۆلانی مانگەوە، هەستمدەکرد با لە باواجیەوە هەڵدەکات!

نەوەکەی شمشاڵژەن، لێرەوە (جوو)ی لە (گرد) کردەوە و بە هۆی ئەو جوانەوە بە کەتیرەی جوانی (جوان)ی پێوە لکاند و هەوکەشپێوە لێی نەکردەوە، منیش هەر یە (گردی جوان)م گۆ دەکرد و نەدەهاتە سەر زارم بڵێم (گردی جووان).

رۆژەک لە رۆژانی زستانێ، لەگەڵ شوانی ماڵ لە گردی جوانێ. لە کۆلانی مانگ بە بن نمە بارانێ، نەرم نەرم دەهاتینە خوارێ، لە پڕ لە پشتە مە، ماڵی مانگ بووە قیژەقیژ و هاتوهاوار، دەنگێکی باریکی ژنانە:

هاوارتە لە من ......سووتا.

ناوێکی ناسکی گۆت، گەڕاینەوە، چ ببینین! لا شانێکی مانگ ئاگری گرتووە و رادەکاتە کۆلانێ، ژنێک لە دەرگاگەی بەرانبەریان بە پەقرەجێ ئاوەوە گەیشتە سەری، پێیدا کرد و کوژاندیەوە، ژنێکی دی گەیشت، هەر لە کۆلانێ هێندەی بڵێی یەک و دوو، بەرۆکیان دادڕی و سینگ و مەمکی کەوتە ئەو گۆڕە، من زوو رووم وەرسووڕاند، کۆلان هەموو بە سەر مانگی سووتاو وەربوون، ئێمە دوورکەوتینەوە.

+ ئەوە لۆ رووتیان کردەوە؟

– لە جێی سووتانەکە پەڕۆی سووتاوی پێوەنووساویان لێ کردەوە.

لە سەردانێکی دی مانگی سەر گردی جوانم دیتەوە، لە جاران پڕتر و تریفەدارتر، چ جێی سووتانیشی پێوە دیار نەبوو.

هەر بۆ وەبیرهێنانەوە، پاشترێ کاتێ بیستمەوە ئەو گردی جووانە پێشترێ گۆڕستانی جووان بووە، پاشترێ، پاش کۆچی جووان بۆتە گەڕەکی موسڵمانان، رێی ئەو گەڕەکەم دانەدەگرت، هەستمدەکرد بە سەر ئێسک و پرووسکی جوو دێم و دەچم، لە سەرهەندێ ئەگەر کوو، وەرنا نەدەچوومە وێرێ.

لەو سەردانە نەوەکەی مینکەی شمشاڵژەن، دوو خەونی گێڕایەوە، لە خەونی دووەمیان هاتە سەرم بکەومە سەری و مارکوژی بکەم، وای

گێڕایەوە:

+ ئەریَ تۆ، چ خەونت بەو سینگ و مەمکەوە نەدی، کە ئەویَ جاریَ لێرە، دیمان؟

- نا، دیارە تۆ پێتەوە دیوە؟

ئا، چ خەونیَ! بە راستیش با، هەر هێندە دەبوو، ئەوە من لەگەڵم کرد، مەگەر مێرد وا لە ژنی خۆی بکات، وای شەیتانیبوونێکی خۆش بوو، حەفتەی شەویَ خەونێکی وا ببینم، ژن ناهێنم!

ئەو کوڕە هێند بە تام باسی خەونەکەی دەکرد، ئیرەییم پێیدەبرد و زارم ئاوی دەکرد، هێندەی نەمابوو، لەو گۆڕە....بەڵام بە سەر خۆم نەهێنا و گۆتم:

+ پێدەچیَ، جاری یەکەمت بیَ، شەیتانی بیَ؟

- یەکەمی چی! جاری یەکەم لەگەڵ کچەکەی گەڕەکی ئێوە بوو.

+ کیهە کچ؟

- نازانم ناوی چیە،ماڵیان لە کۆلانی پشت ئێوەیە، ئەویش گەلەک جوانە، هەمووی جارێک دوو، لە دوورەوە دیومە، بەڵام لە خەونەکە بووە دۆستی حەفت ساڵەم و جێی سەرە پەنجەیَ لە لەشی نەما ماچی نەکەم.

نەوەی مینکەی شمشاڵژەن، گەلەک بە درورداو شەیتانیبوونی خۆی لەگەڵ کچەکەی بەلاشاوە دەگێڕایەوە، هی ئەوە بوو، لە زاری خۆیەوە و وەک خۆی بینووسیەوە، بەڵام کاتیَ زانیم کچی ناو خەونەکەی وی (کەویار)ی منە، چاوم چووە پشتی سەرم، هاتە سەرم بە سەریا هاواربکەم، هاتە سەرم بە چەپەڵۆکان بکەومە سەری، هاتە سەرم بڵێم:

کوڕە، ئەوە تۆ چ دەڵێی؟ ئەو کچەی تۆ خەونی وات پێوە دیوە، ژیانی منە، جارێکی دی نەکەی هەڵەی وا بکەی، خەونی پێوە ببینی، وێدەچوو هەستی بە تووڕەبوون و تێکچوونی من کردبیَ، پرسی:

+ دەڵێی کەینوبەینێکت لەگەڵ ئەو کچە هەیە؟

- نا، هەر ناشیناسم.

چەند خۆش باوەڕی بەو درۆیەی من کرد و پتر لە سەر خەونەکە رۆیشت، خۆم گرت و قسەم بە لایەکی دیدا برد.

لە بەر خۆمەوە دەمگوت:

وەرە خوایە، ئەو کچە دەبەیتە ناو خەونی کێ؟ کەسێ نە دەیناسێ نە هیچ، منیش هەموو ژیانمی تەنیوە، کەچی بەو شێوە نایێنێریە ناو خەونی من، خودایە بۆ؟!

پێم ناخۆش بوو، کەویارِ لە خەونیش بچێتە باوەشی هیچ کەسێ.

لە کۆیێ دەمێنمەوە و لە کەویاریش دوورناکەومەوە.

چاقم بەوە نیە، وەی لێ زاڵمی پیاوی ئاسمانی، لە چ سەربردەیەکەوە مینا ئاوی حەمامۆک سەری کردووە، بە دوای ئەوەشدا ناچم کە هەر ئەوینداری بن داران نا، باڵداری سەر دارانیش لەگەڵ (وەی لێ)دا خەیال بردوویەتیەوە و بە دوای مەحبووبە گچکەلانەکەی خۆیدا تا زرمەی بە هۆشداهاتنەوە، پێ بە پێ، هەڵفرِ هەڵفر رۆیشتووە.

نا، بە دوای سەربردەی زاڵمە شیرنەکەدا ناچم، من سەربردەی ئەو کورِە دەگێرِمەوە کە ئەوەتانێ لە سەر بانەکی بڵندە، لەوێوە (وەی لی زاڵم)ی کردە سەربردە، سەربردەیەک کەس کەس نەیبیستووە، نەگەیشتەوە پیاوە ئاسمانیەکەش.

دەیگێرِمەوە، سەربردەی کورِی سەر بانێ دەگێرِمەوە، لێ ئەگەر کەسێ، بە دیار هەستانی وەی لی زاڵمەوە و لە ناو باخچەی هیران و نازەنینێ، پێکی قەلاتیانەی هەڵنەدابێ و لە هەیبەسولتانەوە لەگەڵ پەلە هەورێکی دەمەو پایزی دانەبەزیبێ، لەوێوە نەگەیشتبێتەوە بناری پرِ لە دار و باڵداری باواجی، رەنگە ئەوسەربردەیەی بەدڵەوە نەنیشێ کە کورِەێ دەستی زاڵمێکی شیرین لە (وەی لێ زاڵم)دا بە ئاوی دادا، من گەیشتمێ و نەمهێشت بیرچوونەوە بیبات.

تۆ ئەگەر کەمێ سەرگەرمی و رێگاشت دەچێتەوە باواجی، گوێدێ:

**وەی لێ زاڵم**

**بە مەحبووبە گچکەلانەکەم دەڵێم**

**کەلە شیلانەکی باریکە**

**مەمکێ ئەو بابان وێرانەی لە بۆ من بمێنێ**

**بەوێ سێوێ لاسوور کە**
**ئەوەتانێ لە باخچەی هیران و نازەنینێ**
**تازە فەریکە...**
**وەی زاڵم غەمێ من...**
**کیژ دەڵێ:**
**هەتیمە لاوە،**
**ئەگەر ئەمن ڕۆژەکی ئەتۆ نەبینم،**
**بە نوێژی نیورۆیێ، لێم دەکەیە**
**شەو و دەیجوور و تاریکە...**

ساڵ وێدەچێ دەمێ بێ پێی نابێتە ڕەزبەر،، ئێمە لە ناو ڕەز و باخی هیرانێ، پێک لە پێک دەدەین، من و شوفێرەکە نا، بەڵام ئەوانی دی هێند ناسک مەستن، بوونەتە لیمۆی پڕی تەڕی ناسک، تەڕ تەڕ لیمۆی پەیڤیان لێوە دەتکێ.

لەوێوە لە ناو ڕەز و باخەوە، بە مەستی مەی و وەی لێ زاڵم هەستاین و سوار بووین، لە سەر قسە و دڵی کوڕی سەربانێ، دامانەوە ڕێی کۆیێ، من جاری ئێکێمە لەگەڵ ئەو ئەویندارە مەستە بێمە سەیرانێ، بەڵام بیستبووم، ساڵی دوو سێ جار ترومبێلێ دەگرێ و لەگەڵ دوو سێ برادەر سەیران و سەردانێکی لەو شێوەیە دەکەن.

دەنگی کوڕی سەربانێ تۆزێ نزیکە لە دەنگی پیاوی ئاسمانێ، لە کوڕە هەریریەکەش شاگردانەتر (وەی لێ زاڵم)ی وی دەڵێتەوە، هەر دەبێ وابێ، ئاخر زاڵمەکەی وی لە ناز لەو زاڵمترە!

بە وەی لێ زاڵمی کوڕی سەر بانێوە گەیشتینە هەیبەسوڵتان، تۆ وەرە ناو خەیاڵی مەستانەوە، ببینە چۆن پەلە هەور دەبێتە پەرەشووت، لەو ئاسمانەوە دەتفڕێنێ و دەتڕفێنێ و نەرم نەرم دێ و لە ئاقاری حەمامۆک بەئەسپایی دەنیشیەوە.

هەوکە بە بناری باواجیەوە، دەورمان لە کوڕی سەربانێ داوە، ئێرە دەسپێکی چیرۆکەکەیە:

کوڕی سەربانی لە گردی جووانی کۆیێ تیری ئەوینی وێ دەکەوێ، لە ناو گڵکەندی هەولێری دەکەوێ، ئەو کوڕە ئەویندارە،ماڵیان لە گەڕەکی پرتەقالان، تۆ بڵێ مامۆستایان، نزیک سەید مارف، چەند کۆڵانێ لە سەرێی رادارە، ئەو رادارەی چەند گەڕەکێکی لە هاتنی فڕۆکە مەرگهێنەکانی ئیمامی خومەینی ئاگاداردەکردەوە، بیرمەنیە لێرەوە چۆن دەگاتە گردی جووانی ئەوێ، چۆن چۆنی تیری ئەوینی ئەو کچە زاڵمەی ئەوێی وێدەکەوێ، ئەوەی وەک ناوی خۆم و کەویار لەبیرمناچێتەوە، ئەوەیە:

کوڕی سەربانێ دەهات لە پەنای کێلێکی سەید مارف، لەو کێلانەی لە بڵندی دەچنەوە سەر بەژنی شەمی ژوور سەری دێوانە، دوور لە چاوان، چاوی منی لێ دەرچێ، چەند پێکێکی قەلاتیی هەڵدەدا، دوایوەی تەواو خەیاڵ دەبوو، مالاوایی لە من دەکرد و گۆڕستانی بەجێدەهێشت، زۆری نەدەبرد دەگەیشتەوە سەربانی ماڵی خۆیان و تێیهەڵدەکردە:

(وەی لێ زاڵم..) بانە و بان دەڕۆیشت و باڵی دەگرت.

بەر لەوەی بە دوایدا بچین و بزانین لە کوێ دەنیشێتەوە، حەزم لێیە، پێکی قەلاتیتان نیشانبدەمەوە، ئەو جۆرە پێکە نازانم کێ ناوی لێنا، بەڵام لە داهێنانی حەمەد مەستانە، دەگێڕنەوە:

زوو، رەنگە سەردەمی پاشایەتی بووبێ، ئەو مەستانەی خۆمان، زۆر حەزیکردووە لە قەدی قەلاتێ هەر جارەی روو لەلایێ: قەیسەری، منارە، مزگەفتی حاجی لەقلەقێ، سندیباد و گەرماوی عەلیاغا و ئەوانە دانیشێ و بە دڵی خۆی بخواتەوە. ئێ، ئەوەش بۆ هەینێ کاری نەکردە بوو، کێ زاخی ئەوەی هەبوو لەو گوزە و بە بەرچاوی شارەوە بادە هەڵبدا. ناچار، دەهات، بادەی بە وردە سەهۆڵەوە دەکردە ناو دێمکەوە، دیمکەی ئاو خواردنەوە ناڵێم، ئەوەی ئاوی گەرمی تێدەکرێ و بۆ سەرمادەرکردن و گەرمبوونەوە لە سەر زگ و پشت دادەنرێ، قۆغەیەکی دەخستە بەر پشتێنی، بادە لە دیمکەوە بۆ ناو قۆغە، لە قۆغەوە بە هەڵدانێ بۆ زاری مەستان، ئیدی نازانم کێ، ناو لەو قۆغەیە ناوە، پێکی قەلاتی. ئێمەش هەر کاتێ پێکی خەستمان کردبا، یان وەکات هەڵماندابا، دەمانگۆ:

دەی، پێکی قەلاتی...

ئێ، پێکی قەڵاتی لەوێ، دەگەڕێمەوە دیار کوڕی سەربانێ، کوڕی هەمیشە مەستی کچە جوانەکەی گردی جووانێ. دوای هەڵدانی چەند پێکێکی قەلاتیانەی ناو کێلان، دەگەیشتەوە ماڵێ، لەوێوە، لە شانشین یان هەورەبانەوە، روو لە وراتی کۆیێ، تێیهەڵدەکردە:

**وەی لێ زاڵم...**

**دارە خڕکەلەی بەر ماڵان**

**هەتا عەیامەکی زۆر لۆ من هەر داربی**

**ئەمن دەچمەوە سەر بانەکی بڵند**

**بەڵکو دوو چاوی مەحبووبە گچکەلانەکەی خۆم لێ دیار بی**

**وەی زاڵم، غەمێ من...**

کوڕێ سەر بانێ، زۆر کەڕەت هەر بەو چەند پێکە قەڵاتیەی ناو کێلانەوە، لە سەر بانی خۆیانەوە، باڵی دەگرت و ڕێی جۆت دارتێلانی دەگرت و لەو کەندەی لە حەسارۆکانەوە لە گلکەندی گەڕەکی دەکردەوە، دەپەڕیەوە، گوێی نەدەدایێ تەڕوتووشیە، کەند هەستاوە، هەرکاتێ لە سەری دابا، هەڵدەفری و لە سەر ڕێی پاسی کۆیێ دەنیشتەوە، من چەند جارێ لەو ڕێیە دیومە، دیومە سوار بووە و ڕۆیشتووە، بەلام نازانم بۆ، جارێک هەیپەم لێنەکرد و لەگەڵی نەچووم.

لەوێ دیبوویان، لە بەری بەفری قەندیەوە، روو لە گردی، پڕ بە گەروو (وەی لێ زاڵم)ی بۆ زاڵمەکەی خۆی چڕیوە، دەڵێن:

زاڵمەکەی سەر دەرگاش، زاڵمی زاری ئەوی بیستووە، هوردە فرمێسکانیشی بۆ داباراندووە.

کوڕی سەربانێ هەر لەگەڵ ئەو پاسە دەهاتەوە کە پێیدەچوو، رەنگە هەر ئەو ڕۆژەش گەیشتبێتەوە گلکەند، گلکەندی باخ دەڵێم نەک گەڕەک، لەوێ پشتی دەدایە قەدی ئەو دارتووەی کە هێندەی قلە تووەکانی، باڵداری دەگرت، روو لە چاڵە گوڵدانیەکەی ناوەڕاستی گلکەند، بە دەنگێکی مەیلەو نووساو، دوو سێ کۆپلەی وەی لێ زاڵمی دەگۆت و کپ دەکەوت، بیرمە جارێک من

بەئاگام هێنایەوە، گوتی:
سوپاس زوو گەیشتی، کەوتبوومە چاڵێکی قووڵەوە...
کوڕی سەربانێ، کوشتەی خەونێکی خۆش بوو، نەیدەدی و نەیدەدی، خەون بە زاڵمەکەی خۆیەوە، لەوەیان بە من دەچوو، ئاخر منیش شەو و رۆژ نزام دەکرد، لە خەونێکدا کەویار بکەوێتە ئامێزمەوە، زۆر کەڕەت دەمگۆتە کوڕی سەربانێ:
- وا لە خۆت مەکە...
+ تۆ نەکەوتوویتە ئەوینەوە، بۆیە...
چ بڵێم، خۆ ناڵێم، منیش کەویارێکی هەڵفڕیوم هەیە.
ئێ، چەند وەرزێ ئەوە پیشەی کوڕی سەربانێ بوو، لە ناو کێڵانەوە دوای چەند پێکێ، باڵ لێکدە بۆ سەر بانێ، لەوێوە هەڵفڕە لای زاڵمەکەی گردی جووانێ، هەر بە فڕین بگەوە باخی گڵکەند لە وێ لە بن درەختە باڵدارگرەکە بنیشەوە، ئەگەر قادسیە نەیبردبا، رەنگە لە هەڵفڕینی خۆی نەکەوتبا، قادسیەی شەڕ کێی هێشت؟ کوڕی سەربانێی برد و کەس نەیزانی بە (وەی لێ زاڵم)ەوە لە کوێی ناشت، نەشمزانی (زاڵم)ەکەی گردی جووان، داخوا رۆژی نیورۆیێی لێ بووە شەو و دەیجوور و تاریکە؟
قادسیە بە سەدامەوە گۆڕ بە گۆڕ بێ، وازی لێبێنە، هەوکە بۆ تاوێ مەست مەست دەچمە دیداری کەویار و ئیدی بڵێم تا کەنگێ نایبینمەوە.
رەنگبێ جاری ئێکەمم بێ، لە ماڵێ و دوور لە هەموو چاوێ بخۆمەوە، پێکم هەڵدا و بە گۆرانییەکی مامڵێم گرت، گۆرانییەکەم لا نیە، دەنگیشم هی ئەوە نیە بیڵێمەوە، پەنام بردە بەر شمشاڵ، ئەو شەوە پەنجەکانم بە کونی شمشاڵەوە بە دڵی من دەجووڵانەوە، بادەش هەناسەمی سوارنەدەکرد:
سەری مەستم خستە سەر رانی و بە پەنجە و لێو (سەر لە سەر رانی)م بۆ دەگوتەوە، لە (شووی کرد بە رەقیب) هەستمکرد درەنگە و (شەو و شەوگارم شەقکرد)ووە و خەونە، بەڵام خەوتمەوە، دەمێ وەئاگا هاتم، دەبینم شووشە بەتاڵە، ئەویش (دیارە وەفای نەماوە) و منیش (بە برینی خۆم نەزانی)وە، بەڵام بە (با بڕوات بە نەعلەت بێ) تێکچووم، گوتم:

نا، من وا نالێم، دڵم نایێ.
گۆرانی گەیشتە:
**تازە ناکەم دڵداری**
**شەرتە دەچمە بیابان**
**نامێنمەوە لە شاری**

منبش هاتە سەرم، بەو نیوە شەوە لە ماڵی بێمە دەرێ و بەرەو ئاقاری گۆڕستان، بەرەو پیری سوارچاکان سەری خۆم هەڵگرم.
کۆچی دووەمی کەویار، لە ناوەوە لە وەلی دێوانە دێوانەتری کردم، بەڵام خۆم بەرزەفت دەکرد و بە سەر خۆم نەدەهێنا، رەنگە هێندەی گەمەکانی مندالی دێرە هۆنراوەم بۆی هۆنیبێتەوە، بەڵام پیشانی کەسیشم نەدەدان، وام هەستدەکرد، هەر کەسێ بیانبینێ، کەویاریان لە ناو دەبینێتەوە و ئاشکرا دەبم، پێشموابوو ئاشکرابوونی ئەو کەین و بەینە، رێک وێرانبوونی دنیای بە دواوەیە، باشە بۆ؟ هەوکەشێپۆە تێنەگەیشتم.
لە دوای کۆچی دووەمی کەویار پتر بە فازیل رێحانەوەم گرت، رۆژێک نەمدیتبا، هەستمدەکرد شتێکی گەورە لە شێوەی کەویارم بزر کردووە، ئەویش وابوو، بە واتای وشە و پتریش ئێمە برادەری گیانی بووین، لە سەرە کۆڵان دانیشتن و چوونە سینەما و پیاسەی سەر قەڵات و ناو قەیسەری و ئۆرزدی باگ و دەڵاڵخانە و کتێبخانەی گشتی و زۆر جار چوونە کرێکاری و ئەوانەمان پێکەوە بوو.
دوای کۆچی دووەمی کەویار، پتر لەو ئەدەبەی هەینێ بە نارەوا بە پووچگەرایی و ئەوانە ناوی دەهات، نزیکبوومەوە. هەندێ دەمەتەقێی ناو (لە چاوەڕوانی گۆدۆ)م ئەزبەر کردبوو، لەو سەروبەندە لە کنە من پێشەنگی نووسەران سارتەر بوو، یەشار کەمال و گۆرگی لە چاو وی فەریکە نووسەر بوون.
کۆچی دووەمی کەویار، رۆژانە بەرەو هەڵدێر و زێی هەڵدەدام، بەڵام هەر جارەی شتێ دەیگرتمەوە و بە ژیانی دەبەستمەوە.

کۆچی کەویار وای کرد، خۆزی، سەد خۆزی بە کەریمەکەی ناو داستانی
کەریم و ستی بخوازم، ئەدی شێخی رەشوانێ!

## هاوارم بۆ شێخی ڕەشوانێ

لەو سەروبەندە بە بیستنی هەر سەربردە، بەستە، حەیران، لاوکێکی ئەویندارێ، گریانم دەهات، دوور لە چاوان هووردە ڕۆندکانم دادەباراند، بووبوومە یەکپارچە لە سۆز و سۆزدارێ. ئەو ڕۆژەی شتێ لە سەربردەی دوو ئەویندارەکەی لای ڕەشوانێم بیست، نم نم، دڵۆپ دڵۆپ، هەورێ فرمێسکم ڕشت، دنیایێ سەرکۆنەی خۆم کرد، دەستی خۆم دەشکاندەوە و دەمگۆ:

ئەگەر کەسێ، تەنها کەسێ بەو کەین و بەینە، بەو ئەوینەی منی زانیبا، دوور نەبوو بۆ من ڕۆڵی حەیرانبێژەکەی ناو سەربردەکەی دیتبا، نەیهێشتبا ئەو کۆچەی کەویار سەریگرتبا، کۆچەکەی دوێنێ پێرێ.

دەمگۆ:

هیچ نەبا، دەبا ئەوینی خۆم لەو ژنە زارشەکرە گەیاندبا کە پێدەچوو هەستی بە شتێک کردبێ، ئەوە نەبوو چەند جارێ ڕوو لە ئێمە گوتبووی:

چەند جوان لێک دێن.

جارێک زوو هێشتا زۆر منداڵ بووین بە گوێی خۆم بیستم گوتی:

دەڵێی کەریم و ستین.

دەبوو چیم لە دڵ بوو بۆ ئەو ژنەم بە گۆڕێ وەرکردبا، دەبوو بەر لەو کۆچەی کەویار کۆچی دووەمی بەو ژنەم گوتبا:

من لە منداڵییەوە شێت و سەودای ئەو کچەم، هاوارە، چارەیێ.

دڵنیام دەبووە حەیرانبێژی ناو سەربردەکە و نەیدەهێشت کەویارم لە دەستبچێ، لە خۆم گێژ و وێژێ، لێم گەڕێن خۆم بە خۆمم کرد بەردبارانم بکەن.

با لێرە سەربردەی ئەوین و حەیرانبێژەکە بگێڕمەوە، دیارە دواتر رێکتر و وردتر، لە زاری فەرهاد موکریی زارشەکرەوە، ناسکتر بیستمەوە و من وام داڕشتەوە:

هەبوو نەبوو سالانی زوو هێندەش زوو نا، کەریم و ستیی ئەو دەشتە هاتبوونە کوشتنێ، وەک دوو ئەوینداری بە مراز نەگەیشتوو کەوتبوونە ناو لاوک و حەیران و بەیتان، لە کۆڕ و ئاقاران دەهاتنە چڕین و گۆتنێ. لەو سەروبەندە لە بەری زرارەتی، ئەو بەرەی داری شەکران، داری بەهەشتێی لێ شینبوو و تا درەنگیش ئەویندارا‌ن لە سێبەرەکەیەوە بە دزیەوە دەستەسڕی مرازیان بۆ لک و پەلکی هەڵدەدا. لەو کەند و چۆمەی ئەوێ، لەو خاکە خوێنگر و ئەوینگرەی ئەوێ، ئەوینێ لە شێوەی دارەکەی بەهەشتێ گۆپکە دەکات، بە بای داراوس، ئەو بایەی دەڵێێ لە (لێ لێ دۆتمام)ی کاوێزەوە هەڵدکات، زاردەکاتەوە و کەسک کەسک دەپەیڤێ، لێ پەیڤینێ هێ لە پێناو و حەیرانبێژێ، ناهێلن کەس ببیستێ، ئاخر دەترسن بە دەردی ستێ و کەریم بچن. بەرایی ئەوینی ئەو دوو ئەویندارە، ئەوینێکە لە شێوەی ئەوینی مەم و زینێ، بەرێ دواییەکەی لە سایەی حەیرانبێژەکە و شێخەکەی رەشوانێ بەرەواژ دەبێتەوە، بەرەواژیی هەرچی ئەویندارە خۆزی پێدەخوازێ، کورتەی سەربردە هۆسایە:

بە زۆری و بە کوتەک کچەی ئەویندار دەدەنە پیاوێ، ماڵ لە گوندێکی ئەودیوی رەشوانێ. کوڕەی ئەویندار چی لە دەستنایێ، لە پەنایێ دەکەوێتە قورپێوانێ، لە رۆژی گواستنەوە حەیرانبێژی گۆڕین هەوساری ماییني بووکێ رادەکێشێ، بە دەم رۆیشتنی کەژاوەوە بە دڵی پڕ کەسەر و هەوکی پڕ گریانەوە تێهەڵدەکاتە حەیرانێ، کاتێ دەگاتە گوندی رەشوانێ و راستی ماڵی شێخی رەشوانێ، دەنگ هەڵدێنێ و شەش جار لە سەر یەک و جار لە دوای جاریش حێلتر و گریاناویتر، ئەو کۆپلەیە دەڵێتەوە:

**سبەینەیە، سبەینەکی سارە**
**لە سەر بسک و پەرچەمی نازدار حەیرانێ**
**کەتیە هوردە خوسارە**

**شێخەکەی ماڵ لە بەغدایێ گەلەک دوورە دەنگم نایگاتێ.**
**هاوارتە لە من، هاوارە**
**شێخەکەی ماڵ لە رەشوانێ، هاوارە، هاوارە، هاوارە...**

لە جاری حەفتەم کەسێ پیلی دەگرێ و دەڵێ:

شێخ تۆی دەوێ.

کەژاوەی بووکێ رادەوەستێ، حەیرانبێژ دەچێتە خزمەتی شێخ، شێخ دەپرسێ:

تۆ وێدەچێ کێشەیەکت هەبێ؟ ئەوەی دەیڵێی حەیرانێکی ئاسایی نیە، وا نیە؟

حەیرانبێژ:

شێخم، نازانم چ بڵێم.

شێخ:

کوڕم، چیت لە دڵە بە گۆڕێی وەرکە.

حەیرانبێژ، ورد و باریک ئەوینی کوڕ وکچەی بۆ دەگێڕێتەوە، شێخی رەشوانێ کە لە کن کوێخا و ئاغاش قسەی دەڕوات و کەس قسە لە قسەی ناکات، گازی بووکی ئەویندار سەر ماین دەکات و لە دوای کوڕە ئەویندار لە بن دیوار کەوتوو دەنێرێت.

کاتێ پێدەکەوێ ئەو ئەوینە وێنەی ئەوینی کەریم و ستی و مەم و زینە، دەنێرێتە دوای ماڵی بووک و زاوا، لەوێ سێ بەردە بە زاوا فڕێدەدات، هەر لەوێ ئەو دوو ئەویندارە پێکدی شاد دەکات.

ئەوینی من چەند هێندەی ئەوینی کوڕەی ناو سەربردەیە، بەڵام کەویار، چ ئاگای لێیە! لە دڵێ خۆ دەمگۆ:

حەیرانبێژێکی لەو رەنگەشم هەبا، نەیدەتوانی چارەی دەردی دڵی من بکات، ئاخر کێ دەڵێ دڵی کەویار من نا، وێنەیەکی سووتاوی منیشی تێدایە!

ئەوینی من لە هی ئەوان نەدەچوو، لە هی فەرهادیش نەدەچوو، ئاخر راستە شیرین دڵی بە فەرهادەوە نەبوو، بەڵام خۆ دەیزانی دڵی فەرهاد لەو پتر کەسی تێدا نیە.

بەڵام کەویــاری مــن ئەوەشــی نەزانــی کە کەســێ هەیە لە فەرهــاد سووتاوتر، ئەرێ کەویار هیچی لەو ئەوینەی من دەزانی؟!

## خۆزی بە کەریم و ستی

بە بیستنی داستانی کەریم و ستیش دەگریام و هەزار خۆزگەم دەخواست کەریمی ناو ئەو داستانە بام و کەویاریش ستی، قیرسی مردن، خۆ لە دڵێ وی جێم هەبوو، خۆ لە ساتی مردنێ خوێنم تێکەڵی وی دەبوو.

ئەو جارەی لە زاری ژنە زارشەکرەکەوە بیستم، من و کەویاری بە کەریم و ستی چوواند، مندال بووم، شتێکم لە ئەوین نەدەزانی، بەڵام سەربردەی ئەو کچ و کوڕەم بیستبوو، بەستە و بەندم لە بارەیانەوە بیستبوو. زۆر جار لەگەڵ کەویار و منداڵان هەندێ لەوانەمان لە کۆڵانێ دەگوتەوە، بۆیە لیکچوواندنەکەم لە دڵ خۆش هات، لە هەر شتێ ناوی ئەو و من پێکەوە هاتبا، لە دڵم خۆش بوو.

کەس نەبوو شتێ لە داستانی کەریم و ستی نەزانێ و نەیڵێتەوە، بەندی پلکە بەندبێژیش تێکەڵی ئەو بەستە و بەندانە بووبوو کە بۆ ئەو دوو ئەویندارە بە مراز نەگەیشتووە لە خوێن گەوزاوە گوترابوون، بەڵام خەڵکی گەڕەک بەندەکانی پلکە بەندبێژیان دەناسیەوە، هی وی لە سەر زاریان خۆشتر دەهات، بەندەکی وی گەلەک درێژ بوو، هەر هێندەم لە یادە:

**کەریم کێوا چی، کەریم کێوا چی؟**
**دەورەیان دایە پەنجا تفەنگچی**
**کەریم بوێرە کەریم بوێرە**
**بەئاغا و نۆکەر دەکاتن هێرە**
**لە شاربزری شەڕ و هەرایە**
**ستی کورە بێ، تفەنگ وەستایە**
**هاوارە ستی، هاوارە ستی**

**کەریم سێ گوللە بە سەری کەتی**
**ستی دەڵێتە ئاغا و بابێ خۆ:**
**هەگەر نەمکوژن گوو بە ریشی نگۆ**
**دوو کوشتە هەوکە وا لە ناو شاری**
**کەریمی ئازا، ستی نازداری**

ئێمەی منداڵ لە پلکە بەندبێژ جوانترمان دەگۆتەوە، لە گۆتنەوەش هەر کاتێ ناوی کەریم دەهات، کەویار پەنجەی دەخستە سەر من، دەبوو منیش لە ناوی ستی پەنجەم بۆ وی درێژ کردبا!

من لە پشت حەسارۆکان شوێنی کوشتنی کەریم و ستیم دیتبوو، کەڵەکە بەردێ لە شـێوەی مەزاری پیاوچاکـان بەڵام پەڕۆی کەسـکی لە سـەر هەڵنەدرابوو، خەڵک دەیانگۆ:

برایماغا و کەمەربەستانی لێرە ستی و کەریمیان کوشت.

ئەنگۆش لە داستانەکەوە ناوی ئەو برایم ئاغایەتان بیستووە، ئەها ستی دەڵێ:

**برایماغای بێ دینە**
**سواری قەمەرەی شینە**
**ستی چاوکار گازدەکات:**
**کەریم دەستان هەرینە**

با بە چەند رستەیێ ئەو دەستانە ئەویندارییە بگێڕینەوە کە برایم ئاغا لە خوێنی وەردا:

ستی جوانترین کچی دەشتی کەندێناوەیە، بەژن زراڤی، کەزی زەری، چاو کالی، سۆر و سپی، کەپوو قەسپیی لێو کشتەکی. کەریم کوڕێکی کەڵەگەتی، چاو برۆ رەشـی گەنـم رەنگی خـوێن شـیرین، مێرخـاس و نیشانشکێنیشـە. ئەوینی ئەو کوڕ و کچە کار لە هی مەم و زین و خەج و سیامەند و ئەوانە نیە، هەر دەبێ بە ئەوینـی کەریـم و سـتی نـاوی بـێ، لەولایەشـەوە ئاغـای گوندی کە دەسەڵاتی حوکمەتێکی هەیە، چاو دەبڕێتە ستی.

کەریم دەچێتە داخوازی، بابی ستی کە لە قسەی ئاغا دەرناچێ، نایداتە

کەریمی کرمانج و سەی تێبەردەدات.

چارە؟ کەریم و ستی شەوێک سەری خۆیان هەڵدەگرن، برایماغا و بابی ستی بە دەستەیێ تفەنگچیەوە دەکەونە سۆراغیان و بە هەموو جێیەکیشدا بڵاویدەکاتەوە:

هەرکەسێ ئەو کوڕ و کچە راگرێ، هەر مەلایێ لێکدیان مارەبکات، خوێنی خۆیان لە ملی خۆیان.

ئەوەش دەڵێ:

هەر کەسێ شوێنی کەریم و ستیمان پێبڵێ، پاداشت وەردەگرێ.

ستی و کەریم، دێن، گوند گوند دێن، دەگەنە شار، لەوێوە بڕۆ بڕۆ، دەگەنە حەسارۆکانی ئەو سەرە، بە دزیەوە خۆ داوێنە ماڵی پلکێکیان.

سەرکاری گوند کە ئەوە دەزانێ زمانیان لێدەدات و لێیان لە هەرا دەدات، ئەها:

**سەرکار مەلاقادرە، حیزباب توخمی سەگساری**

**کەریم و ستیان دەرکرد، بەهەلهەلەی منداری**

برایماغا بە کۆمەڵێ چەکدارەوە دەگات و دەوری گوند دەگرن، شەڕ دەستپێدەکات، کەریم شەڕێ دەکات، لە شار دەنگدەداتەوە، دڕ بە دوژمن دەدات و ڕێی دەرچوون دەکاتەوە، گوللەیێ بە رانی دەکەوێ، ستی بە چەفیەی خۆی بۆی دەبەستێ، کەریم ناکەوێ، لە شەڕی خۆی ناکەوێ، بە تەقە تەواوێ دووردەکەونەوە، حەیف تفەنگ لە کار دەکەوێ، ئاغا لە دووربینەوە ئەوە دەبینێ.

کەریم لە دەو رێ ترومبێلێ دەبینێ، وا تێدەگات هی پۆلیسە، بەتاو بەرە و لای دەچن، ستی زووتر هەستپێدەکات هی پۆلیس نیە برایماغای تێدایە، ئەو جا لەوێیە دەڵێتە کەریم:

**دەست هەرینە...**

بەڵام بە چی؟ تفەنگ دارێکی رووتە.

دەوریان دەدەن، چەکدارێ لە دواوە دوو فیشەک دەنێ بە سەری کەریمەوە، وەکات گیانی دەردەچێ، برایماغا دەڵێتە ستی:

سواربە، تۆ ناکوژم.

ستی کە خۆی لە خوێنی گەرمی کەریم وەرداوە، تف لە چاوی ئاغا دەکات و دەڵێ:

پشتی کەریم ژیان! گوو بە تۆ، گوو بە ژیان.

دیسان روو لە ئاغا:

تف لە تۆ، لە بنەچەت، ناپیاو، گەواد، بمکوژە.

ستیش دەکوژن، درەنگ پۆلیس دەگات و کەریم و ستی دەهێننەوە شار، ئەو رۆژە شار بۆ مەرگی ئەو دوو ئەویندارە لە سەر چاو دەکەوێت.

ئەوجا، تۆ بەرێ خۆ دێ، ئەمن خۆزگەم بە کەریم دەخواست و دەمگۆت:

بریا منیش ستیم هەبا، کەویاری من ستی با.

بێ تامم کرد! وا چاکە لە باسی کەویار دوورکەومەوە، هەوکە دەچمەوە رزگاری، بەلام بەر لە رزگاری ئەی رەقیبێ هەیە، ئەوە زۆر زۆر کۆنە، زۆر کۆنتر لە ئەی رەقیبی زانکۆ و ئەوانە.

## ئەی رەقیب بۆ عزەت دووری

لەو سـەروبەندە لە رێپێوانـانی نـاو جـادە، لێرە و لەوێ، لە رێـڕەو لادان روویدەدا، لەو رێڕەوەی میری بە دڵی خۆی بەرایی و دوماهی دەنەخشاند و هێلی بۆ دەکێشا، هەندێ قوتابی ئەو هێڵەیان دەبەزاند و ئەوەی لە دڵیان بوو، بە دەنگـی بەرز دەیـانگوتەوە. کەم رێپێـوان هەبـوو، ئەی رەقیبێکـی لێـوە بەرزنەبێتەوە و بۆ تاوێ درووشـمە میرییەکـان کپ نەکات، ئێمەمانـان لەوان رۆژان لە خودامان دەویست، بەعس رێپێوان رێکبێخێ و خەڵک بهێنێتە جادە، تائێمەش خۆ تێپەسـتین و بە ئەی رەقیبێ رێـڕەوی رێپێوان بـۆ خۆپێشـاندان بگۆڕین.

چەنـد وێنەیەکـی لە رێـڕەو لادانێکـی گەورەم لەبیـرە، ئەوەی جـادەی ئەنجوومەنی یاسادانانی هەینێ و ئەنجوومەنی وەزیـران و پەرلەمـانی پاشـی، ئەها:

قوتابخانەکان لە خڕ لاوە، یەک بە جادە پانە و پـان دێن، دەڵێن سـەدام لە ئاسمانی شارە و هەر دیتت دابەزی، بەعسی لە جادەوە بە:

**بیل روح بیل دەم**

**نوفدیک یا سەدام**

خۆشهاتنی دەکەن و پڕ بە گەرووی جادە درووشمی خۆیان دەڵێنەوە:

**ئەلف جیم شەدە**

**حزبل بەعس وەردە**

زۆر نابا لە دژە بەعسەوە، لە زاری کچ و کوڕانی شاری:

هە چەرمە چەرمە   هێ

کەپووی بابت بە چرمە  هێ ...

بە سەر دەنگی بیژۆکی (روح و دەم و حزب و وەردە و شـەدە و مەدە)

زاڵ دەبێت. هەنگینێ ئەو چەرمە چەرمەیە، تیزکردن بوو بە درووشمەکانی بەعس، هێ لەوەش بەرایی و خۆ ئامادەکردن بوو بۆ ئەی رەقیب. بۆ وەرگرتنی تامی زار بوو، بۆ ئەوە بوو تا بزانرێ چەند کەس سوار و لە سەرپێن بۆ گۆتنەوەی ئەی رەقیب، ئەو ئەی رەقیبەی بەعس بە بیستنی لەرزی دەهاتێ، شێت و هار دەبوو، دەست و پێی تێکدەئالا، شێتانە و لەرزۆکانە دەوروپشتی خۆی دەڕشاند.

بیرمە ئێمە لە بەری چاخانەی بایزەوە، ئەو چاخانەی هێندی منارە ناسراوبوو، دەپەرینەوە بەری ئەو بەری، جادە لە چەرمەوە گۆڕا بۆ ئەی رەقیب، چ ئەی رەقیبێ! گەیشتە قەلاتێ و لە لوولەی منارەی چۆلیەوە گەیشتە ئاسمانێ، ئەگەر لەو ساتە سەدام لە ئاسمان بووبێ، بیستوویەتی.

لە گەرمەی ئەی رەقیبێ، ئەو ریزە ترومبێلە گەیشتن کە دەبێ سەدام لە ناو یەکیان دانیشتبێ، بەلام سەت حەیف و مخابن، سەدام حوسێن ئەی رەقیبی ئەوە رۆژەی هەولێری نەبیست، ئاخر خۆی نەهاتبوو، حیزە دووریی بۆمان ناردبوو، هەینێ هەندێ کەس ناوی ئەو عزەتەیان بەو شێوە گۆ دەکرد.

بە گۆتەی گۆتیاری، دووری کاتێ ئەی رەقیب دەبیستێ، رەنگی دەپەرێ و دەڵێتە نازانم کێ:

هەڕوو بزانە ئەو گەوادانە چیان دەوێ!

شاتکە شێت گۆتەنی: ئێ، حیز گەواد، هێشتا نازانی چیمان دەوێ؟

لەوە گەڕێ، ئیدی وەلەکە بەعس بە دار و تفەنگ بە ناو وەربوون، کچ و کورانی ئەی رەقیب پەرتەیان لێکرد و هەر دەستەی بە لایەک و کولانێکدا هەلاتن.

بیرمە لە گەڵ هەمزەی بەلاشاوە و دلشادێک و یەک دووانێکی دی دامانەوە پشت ئەمنخانە، هەلێ، یەکپێ و یەکپشی گەیشتینە پشت سینەما سەلاحەدین، لە وێوە بە تەنیشت مەزاری سولتان مزەفەری هەمیشە مشت لە ژن، تۆ بلێ سولتانی ژنان، پەڕینەوە بەری گەڕەکی عارەبان، لە بیرمان بێ، چەند وەلەکە بەعسیێ بە دوامانەوەن، هەلێ، لە کولانی تەکیەی شێخ محێدین،

برادەرێ گوتی:

با بچینە ناو تەکیە.

ئەوی دی گوتی:

هەڵێ، تەکیە دادمان نادا.

وا تێبگەم ئەو شێخ محێدینە بوو، کاتی خۆی فەتوای حەرامکردنی نەورۆزی دا.

لە باتەوە خۆمان بە قەیسەریدا کرد، قەیسەری جێی خۆ بزرکردن و بزربوونە، قەیسەری لە چاوی بەعسی شاردینەوە.

وێنەیێ بۆ لەبیرنەچوونەوە:

دوای نیو تەمەنی لەو بەروارە، لەگەڵ جادەیێ مامۆستا چووینەوە نزیک هەمان جێی ئەو شارە، ئەو جارە بۆ نان بوو، بۆ وەرگرتنەوەی مووچەی دزراو بوو، دیسان چەکدار بە ناو وەربوون، وا دیارە دەسەلات هەر دەسەلاتە، بە چەندان (دووری)شەوە!

## رزگاری دەڕژێتە جادە

رزگاری لە منی سەر سەرڕێژ لە سەربردە بۆتە بەلاشاوە، لە خڕ لاوە سەردەکات و نازانم لە کیهە سەرەوە بەری لێبگرم و بیگرمەوە و بیگێڕمەوە، دەڵێن چی، هەر لە ئەی رەقیبەوە پێدا بێمەوە؟

ئەو دوو ساڵەی ئەوێ، ئەو رزگاریەی کە بە هەوکی سەیداوە ناونرا، ئەی رەقیبی لێنەبڕا، وای لێهاتبوو، مامۆستایەک تووڕەی کردبایت، بە گۆتنەوەی (ئەی رەقیب) نارەزایی خۆت دەردەبڕی.

ئەو بەهارەی زانکۆ رژایە شەقام و مەرگی سەدامی گۆتەوە، رزگاری وەکات بە ئەی رەقیبەوە هاتە گۆ، لە دەرگا و پەنجەرەوە زایەڵەی ئەی رەقیبی زاری وی گەیشتە کۆڵان کۆڵانی سەیداوە، خۆ بەر لە رابوونی زانکۆش، رزگاری جاروبار ئەی رەقیبی لێوە بەرزدەبۆوە. رزگاری بوو ئەی رەقیبی وەبیری زانکۆ هێنایەوە. بەر لەوەی زانکۆ بە ئەی رەقیبەوە بڕژێتە جادە، رزگاری لە ناو جادە سەرپێ کەوتبوو، بە ئەی رەقیب زمانی پژابوو. دواتر بیستمەوە هەندێ قوتابیی زانکۆ لە نێو خۆیان گوتبوویان:

زانکۆ بە ئامادەییەکیشی تێنابێ!

بیرمە لە قاتی سەرێ، لە هۆبەی سەری ئەو سەری، هۆبەی وێژەیی، سەریکرد و هێندەی بڵێی یەک و دوو سەرێ و خوارێی گرتەوە. بەر لە هاتنە خوارێ، سێ چوارێ سەرمان بە هەورەبانەکەدا گێڕا، کورسی و مێزی شکاوی تێدابوو، دلشاد، ئەو کوڕەی دواتر حەیرانی کردە پاشبەندی خۆی، پێچکە مێزێکی دەستدایێ، لە رۆژێکی وا پڕدانە دار چی کەمتر نیە لەوەی کلاشینکۆفت بە رووی بەعسا هەلگرتبێ، منیش چاوم لەو کرد و خوترمەیەکم دەستدایێ. دەنگی وی لە هەموان حێلتر بوو، هەر لە خۆی دەهات، کاتێ دەیگۆ:

حیزبی بەعس فاشیە، سەدام حوسێن نازیە.

لە هاتنە خوارێ، ئەی رەقیب پێبلکە پێبلکە هەڵدەکشا، لە خوارێ هەر زوو هەردوو فەرهاد و ئاسۆ و محەمەد کرمانج و زۆری دی وەریانگرتەوە، یووسفێکیش بە دەنگێک ئەی رەقیبەکەی وەرگرتەوە، لە گەرەک دەنگیدایەوە. نەبادا بیرمبچێتەوە و نەیەتەوە ناو گێڕانەوە، لێرە کەوانەیەکی لە پێشاندانەوە بۆ دەکەمەوە:

ئەوە یووسفە سەر بەگۆبەندەکە نیە، بەڵام سەرچیخ نەچووبم، سەر بە پارتەکەی ویە، یووسفی نەوەی عەزیزە، کوڕێکی باریکەڵەی کەڵەگەت، ئەز چاکوچۆنیم لەگەڵ نیە، بەڵام دەزانم یووسفێکی رەفتار جوانی شیرن گفتارە، کوڕێکی تا بڵێی زیخ و پڕ زاخە، لە باری (ئا) ئاوە و لە باری (نا) بەرد و شاخە، لێت بزر بێت، لە ناو خۆپێشاندانان دەیبینیەوە، لە چاوی بەعس ناگەڕێتەوە، ئەورۆش لە رزگاری، لە رژانە جادە، بوێریی خۆی پیشانی دۆست و دوژمن دا.

ئەها، کوڕانی رزگاری وێنەی پۆلیی داربەڕوو رژانە ئەو گۆڕەپانەی دیوی ژۆرێ، ئەو جێیەی ناوە ناوە ئالای سەدامی لێ هەڵدەکرا و پێیدا هەڵدەگۆترا، لەوێ و لە حەوشە گرن و ناکوژێنەوە.

رزگاری، لە چاوی منەوە هەر دەمەی شێوەیێ دەگرێت و هەموو شێوەکانیش لە بەرایی شۆڕشێک دەکەنەوە، چاودێ، هەوکە پەنگ دەخواتەوە و لە سەر سەرکردنە، لەوێ رزگاری گێژدەدا و بە یەک دەنگ، دەنگی لافاو، مەرگی سەدام دەڵێتەوە، رزگاری بەری پێناگیرێ دەڕژێتە جادە.

بەر لە رژانە جادە سێ گرتە هەن، هی گێڕانەوەن:

ئەها، مامۆستای وانەی (پەروەردەی نیشتمانی) تۆ بڵێ پەروەردەی بەعس، لە ناو پۆلێ، پۆلی ئێمە، بە دیار هەشت نۆ دە قوتابیەوە، وانەی خۆی دەڵێتەوە، ئەو مامۆستایە بیستبووم، لە قسەشیرا دیاربوو کە وەک زۆری دی پەنجەمۆری بۆ بەعس کردبێ، مامۆستایەکی تابڵێی نەرم و بەرێزیش بوو. ئێ، ئەوانەی ناو پۆلێ وەک بڵێی لە رزگاری نەبن، لە دەرێی ئەی رەقیب و برووخێ خۆیان دابووە پەنایێ، دەرگا و پەنجەرەیان لە سەر خۆ

داخستبوو.

من زۆر لێیان پڕبووم، خۆم پێنەگیرا، وەک دەڵێن دامە کەراتی و بە دارەوە لێیان وەژۆر کەوتم، هێندەم لەبیرە گوتم:

نامەردینە، ئەوڕۆ ڕۆژی وانە خوێندنە؟

مامۆستا هەر خۆی لە گوورەش نەبرد، تەماشایەکی کردم و نەرمە بزەیەکی کرد و هیچی نەگۆ، قوتابیەکانیش سەری خۆیان داخست، منیش بە کڕی پشتاو پشت کشامەوە و تێکەڵی برووخێ و نزیکە مەرگە و ئەی ڕەقیب بوومەوە.

ڕاستیت دەوێ، پاشتر لەو کردەیەی خۆم پەژیوانبوومەوە، لە بەرخۆمەوە دەمگۆت:

باشە، من چیشم بە سەر خەڵکەوە هەیە، بۆ دەبێت......؟

لە پێش لای هۆدەی بەڕێوەبەر، کۆمەڵێ قوتابی لە سەنگۆی دەورگیراوی زارەتریک دەچن، کوت کوت پێ لە زەوی دەکوتن و هەڵدەرزن، دەنگدانەوەی ئەی ڕەقیب نەبا، گوێت لە چۆقە چۆقی ددانیان دەبوو، وا دیارە چاو لە کەلێنی دەربازبوون دەگێڕن، لە تەنیشت منەوە، دەنگێک هەر دەبێ جەلال تۆ بڵێ یاشێخ، بووبێ، ڕوو لە زارەتریکان:

داوەشێن، بەفرتان لێ باریوە؟ وەرن خۆتان بە ئەی ڕەقیب گەرمبکەنەوە.

مامۆستا (.....) گوێی خۆی گرتووە، وێدەچێ لە دڵی خۆی بڵێ:

من نەک هەر نەمگوتووە، نەشمبیستووە، کەسێ گوتبێتی:

سەدام نزیکە مەرگە...

هەرچی مامۆستا محەمەد ئیسماعیلە کە کەس بە پێکەنینەوە نەیدیبوو، ئەوەتا ڕووی بزەی گرتووە و زەردەی لێ نیشتووە، لە خۆشیا چاوی پڕ ئاوبووە، ئەو مامۆستایە لە ناو پۆلێ بە ئاشکرا سەرکۆنەی سەرانی بەعسی دەکرد، گوێی نەدەدایە گرتن و لە کونەڕەشەکردن و مردن.

وانەیێ بەر لە سەرکردن، بیرمە کۆمەڵێ نەخشەڕێژ، نەخشەڕێژی خۆپێشاندان سەریان بە سەر یەکتر کردبوو، لەوانەی ناویان لە یادگەم ماوە ئەمانە بوون:

دڵشـــاد حەیـران، شـێخ جەلال، خەسـرۆ، موحســین حەمەد، بەختیــار، نەجات...کوڕێ لەوانە، یان کەسێکی دی، گوتی:

دنیایە، کەسمان بەگەڵ نەکەوێ و تەنیا بمێنینەوە، تێدەچین، دەبێت زوو خۆمان دەربازبکەین و...

کوڕێکی دی:

خەمتان نەبێ، رزگاری لە سەرپێیە.

من گوتم:

سێ پۆل هەستێ سەروزیادە.

دەمژمێری دەستپێکردن دیاری کرا، ئەوە بوو دەستپێکرد و سەری کرد و هەموو پۆلەکانی گرتەوە و دەرگا شکا و رژانە جادە.

ئەو کوڕە کێیە چۆتە سەر دیواری حەوشە؟ بە دەنگێکی حێل لە جاڕدەر حێلتر:

جادە، جادە، ئەوەی لەژۆرێ بمێنێتەوە، نامەردە...

کوڕێکی دی:

لە هاتنە جادە، دەردەکەوێ کێ مەردە.

هاتنە جادە، گەمە نیە، کوڕی پڕ زاخ و گیان لە سەر لەپی دەستی دەوێ، هـاتنە جـادە، واتە مـاڵاوایی و نەهـاتنەوە، هـاتنە جـادە واتە رێـی زینـدان و مردن...

بیرمە زۆریی رزگاری رژایە جادە و بە رێی باشووردا شەپۆلی دا، ئێوە دەزانـــن، رزگـــاری روو لە رۆژهەلاتە و لەگەڵ ریـــزە مـــاڵی روو بە رووە، دەرگـای بەرانـبەر دەرگـای مـاڵی پلـکە فـاتمە، رێـی بـاکووری ئەو کـۆڵانە تەسکەیە کە لە شێوەی پیتی تی لاتینیە، پیاوی قەڵە و ئەگەر تیواوتی نەڕوات شانی لە دیوار دەخشێ، ئەو کۆڵانە وەک گۆتم کۆڵانی منداڵیی منە.

رێی باشوور پان و بەرشەقە و لەو جادەیە دەکاتەوە کە لە هۆڵی گەلەوە دێ و دەگـاتەوە خـولگەی کۆشـکی بـاکوور، کـوڕانی رزگـاری بەو رێـیەدا شەپۆلیان دا، بەو رێیەدا درووشمی هاتنی پێشمەرگە و مەرگی سەدامیان دا.

دڵم دەخوازێ نەبادا وەک چۆن لەبیری خەڵک چوونەتەوە لەبیری منیش

بچنەوە، ناوی کوڕە ئازاکانی ڕزگاری بنووسمەوە، بەلام وای لە بیرکۆلی، بیرم بەر بادە و ناوی کەمیانم لە یادە، بۆیە وا چاکە واز لە ڕیزکردنی ناوان بێنم، ئەگەر ناوێ بە زۆر خۆی نەخستە ناو گێڕانەوە، من بە دوایدا نەچم، دیارە لە ڕەوتی ئەو گێڕانەوە هەندێ کەس بە ناوەوە خۆ داوێنە نێو گێڕانەوە.

ئێ، ڕزگاری ڕووەو ڕۆژ ڕێی گرت، ڕۆژ لە تاقی ئاسمانێ کەمێ بە لای منارە و قەلاتدا لاربۆتەوە، کۆلان لە (بڕووخێ و بژی) دەنگدەداتەوە، خەلک لە سەر دەرگاو و پەنجەرە و سەربانەوە، خەلکی بەری تانکی و ناو قەسران درووشمەکانی کوڕانی ڕزگاری دەلێنەوە:

**بژی هێزی پێشمەرگە**
**سەدام نزیکە مەرگە**

**حیزبی بەعس فاشیە**
**سەدام حوسێن نازیە**

**شاری قەلا و منارە**
**نایترسێنێ قەنارە**

**کوردستان هی خۆمانە**
**با لێی دەرچێ بێگانە**

بیرمنەچێ، لە(ئازادی) و (چیمەن) و قوتابخانەیتریشەوە هەندێ هاتبوون، پێشتر زانیبوویان، لەوانەی لەوێ لە یادگەم ماون، جەمالی ئازادی و...

بیرمە لە حالگرتوو گەرمتر داهاتبووم، گوللەش ساردی نەدەکردمەوە، لە پێشەوە پشتاوپشت دەڕۆیشتم، دەستم هەلدەشەقاند و مەرگی سەدامم دەگۆت و دەیانگوتەوە، پێدەچوو لە خۆپێشاندانێ ویستبێتم چاو لە شێخەشەلی هەولێر و هەندێ کەسی ناو ڕۆمانەکانی مەکسیم گۆرگی و ئەوانە بکەمەوە، هەر لەو سەروبەندەش بوو (دایک)م بۆ جاری دووەم و

سێیەم خوێندبۆوە، ئەو دایکەی زۆر کەس لە ڕێی ویەوە بووبوونە شۆڕگێڕ وکۆمۆنیست، ئەو دایکەی زۆر کەس لە چۆکی خۆیان دەدا و دەیانگۆ:

حەیف، دایکێکی وامان نەبوو!

من تا پشتاوپشت نەکەوتمە ناو چلکاویّ، هەر پشتاوپشت ڕۆیشتم، لەو سەرە کۆلانە، ئەها دیواری ڕزگاری لە کویّ دوماهی دیّ، لەویّ لە ناوەندی کۆلانیّ گۆماوێکی گچکە هەبوو، زۆر پیس، مراویش بێزی نەدەهات خۆی تێوەردا، کەوتمە ناوی و خۆم لە قوڕەشینیّ هەلێنا، بەلام وەک ئەوەی گۆلمە ئاوێکی پاکم پیدا بکەن وابوو، گوێمنەدایێ و ڕۆیشتین، دواتر قوڕەشینەکەم بیربهێننەوە .

بیرمە لەو سەرە کۆلانەی کە بە چەپدا پێچبکەیتەوە دەتباتەوە بن تانکی، ئەو تانکیەی سەردەمانێ هەموو سەیداوەی ئاودەدا، مام سمایلی کەرتکە چاوم دیت، بە دوو دەستان لە سەری خۆی دەدا، ئەو پیاوە دەلێم لە بڕینی یەکەم خشتی سەیداوە لەگەل بووە، زۆر کەس دەیانگۆ:

دەبوو ئەو گەڕەکە ناوی سمایلاوە بێ، نەک سەیداوە.

ئەو پیاوە لەوەتەی لەبیرمە، گەسکێکی دەسکداری بە دەستەوەیەوە و جادە و کۆلانان پاکدەکاتەوە، ئێ، لە سەری خۆی دەدات و دەلێ:

کوڕە، ئەنگۆ بزنن و نانی شوانتان خواردووە؟ کوڕە، ئەی هاوار، ئەنگۆ گیانی خۆتان لێ بەلایە؟ کەس بە دەستی رووت بە گژ فیرعۆندا چۆتەوە؟ لە بەرتان بمرم، وەکات پەرتەی لێبکەن، دەنا هەوکە خوێن هەردەستێ و سەران دەبات.

ڕزگاری لافاوە، هەستاوە، ڕزگاری خرۆشاوە و کێ گویّ دەداتە قسەی مام سمایل، دیارە کەسی ژیر، لەو پیاوە تێدەگات و دەزانێ چ دەلێ، ئاخر بە هەموو فیرعەونەکان بە قەد لایەکی سەدام فیرعەون نەبوونە، ئاخر ئەو سولتانە ئۆسمانیەی کاتی خۆی برای لە سەر برا کردبووە سیخوڕ، لە چاو سەدام بە ئاوی حەفت زێیان شۆراوەتەوە، هەر ئەو مامْ سمایلە گوتبووی:

هیتلەر لە چاو سەدام ئیمامی عەلییە.

هەر لە مەڕ سەدامەوە، لە سەر لادیوارێکی نزیک پردی گامێشەوانان،

شتێکی نزیک لەوە نووسرابوو:

ئەو خـوێنڕێژە تـایبەتە و لە خـوێنڕێژان جیـایە، چـوونکێ شـتێک لە خوێنڕێژیی خڕ خوێنڕێژانی تێدایە.

ئەمن سەدامی سالی هەشتا و دوو و سێی سەدەی بیستەم دەلێم، ئەوەی چەکفرۆشانی دنیا، وەهایان پفدابوو، شیر و تیری لە دنیا دەسوو، ئەوەی سـەرانی عـارەب، جگە لە قەزافی و ئەوی دی هەمـوو پێلاویـان بـۆ دادەنـا، ئەوەی سـوپایەکی هەبـوو، بەشـی داگیرکردنـی نیوەی دنیـای دەکرد، ئەوەی بەندیخانەی وای هەبوو، دەرگای هاتنە دەرێی نەبوو.

سـەدامێک ئەگەر چـاوت هەلە بکـات و نیگـایەکی خراپـی تێبـڕی، لە بـن قەنارەی مووسلێش خۆت نەبینیەوە، ئەوە شتێکت تێدەبڕێ تاو ماوی بلەنگی. ئەگەر بە ناوی رووت ناوی بلێیت و (خودا بیپارێزێ)ی پێوە نەنیی، دەتخـاتە کونەڕەشـە و بـێ سەروشوێن دەمێنـیەوە. وا تێبگەم کەس نـاتوانێ سـەدام بناسـێنێ، جـگە لەوانەی لەو سـەردەمە ژیـاون و زەبرێکـی ئەویـان دیـوە و نەبوونەتە دار و دەستەی وی.

ئەوجا مام سمایل ناهەقیەتی بە کوڕانی رزگاری بلێ:

ئێوە نانی شوانتان خواردووە؟

ئیـدی رزگـاری بە دەسـتی رووت، بە چەپلە و هۆیهـا، بە ئەی رەقیـبەوە دژی ئەو خوێنڕێژە رژاوەتە جادە و مل دەنێ، بزانین دەگاتە کوێ؟

بەرایی رزگـاری گەیشـتە سـەر جـادەی سـەرەکی، جـادەی هۆلی گەل بۆ گەرماوی ئیسکان و خـولگەی کۆشـکی بـاکوور، لەوێ لە دەسـتی چەپەوە، لە جاشـخانەکەوە، چەنـد دەسـتڕێژێ هـات، بە نیـازی کوشـتن نـا. سـەرۆک جاشەکە، عومەر نـازانم یـان دەگۆتێ، لە بەرەی رزگـارییەوە چەنـد دەنگێکی حێل، روو لە جاشان:

شەرم بتانگرێ، تەقە مەکەن، ما ئێوەش کورد نین؟

تاهو واهـا! با هەر کورد بن، خۆ هێندەی کورد کوردی کوشـتووە، سـەدام تا هەبێ، هێندە کوردەی نەکوشتبوو، هێ لەوە کە گوتت جاش، دەبڕێتەوە!

رزگاری دایەوە دەستی راست، خۆ نەخشـەکەش هەر وابـوو: هۆلی گەل،

خولگەی ئاوی کەسکوسۆر، لەویوە پێچدەکاتەوە بەرە و بازاڕ و قەلات، بەڵام داخوا نەخشەکە نەخش دەهێنێ!

لە پڕ، لەپرتر لە لێدانی بوومەلەرزە، لە پرتر لە داگردنی تاوە تەرزە، حوکمەت لە خڕ لاوە، بە چەک و خوترمەوە رژایە جادە، رشاندیان، رزگارییان رشاند، بەڵام بۆ سەر سەر و بن پێ، دیار بوو نەیاندەویست، وەها زوو، جۆگەی خوێن هەستێ، تەقوهۆڕیکە، دەڵێی شەڕی سێکانیانی بەری تەقتەقە، خزمێ لەو سەروبەندە، شەڕی سێکانیانی بۆم گێڕابۆوە، ئەوەی دە دوازدە گەشمردەی دا، حەیدەر کەریمی وەرگێڕی شەکسپیریش لە ناو ئەو شەهیدانە بوو.

بۆوەی بزانین لەو جادەیە، وەلەکە عارەب و جاشوولکەی کورد و چەتەی سەدام چەند فیشەکیان تەقاند، هەر دەبێ ژمارەی کوڕانی رزگاری بزانین، ئەوانەی خۆیان نەدزیەوە و هاتنە جادە، ئەوجا هەر کوڕێ جارانی سی بکە، ئاخر بۆ هەر کوڕێ، سی فیشەک تەقێنراوە.

رزگاری وەستا، کەلکی لە روو وەستان نەما، چوونەپێش بوێری نیە، پەرتەلێکردن تاکە رێیە، بوێر ئەوەیە خۆی دەربازبکات و نەکەوێتە چنگی گورگی جادە، بابم ناوی لەو چەکدارانەی کە لە ناو جادە خەڵکیان قۆڵبەست دەکرد و دەیانڕفاند، نابوو:

گورگی جادە.

ئیدی بووە هەڵات هەڵات، هەر دەستە و بە کۆلانێک و لایەکدا، هەر کەسە و خۆی کوتایە حەوشە و ماڵێک، ئەو ماڵانەی بۆ کوڕانی گیان لە سەر دەستی رزگاری، هەمیشە دەرگایان لە سەر پشت بوو، ئەو رۆژە مەگەر چۆن دەنا هیچ ماڵێکی گەڕەک دەرگای دانەخستبوو، لە سەر دەرگا منداڵێکی ساوایان دەخستە باوەشت، تا بە گورگی جادە و کۆلانان بڵێن:

ئەو کوڕە، هیچی لە هیچ نیە، هی ئێمەیە و...

یان لە بن بێرایی چاکەت و بێجامەیان لە سەر دەست بوو:

دەی، زوو خۆت بگۆڕە، با وا تێبگەن کوڕی ئێمەیت و پێت لە ماڵێ نەچۆتە دەرێ.

ڕۆژی دوایی، هەر کوڕە و چیرۆکی خۆی، منداڵی ساوا و چاکەت و بێجامە و چوونە ناو بەرمیلی ئاوێ و ئەو شتانەی دەگێڕایەوە، گێڕانەوەیەک سەختە بە من بگێڕدرێنەوە.

لێرەوە، تەنها خۆ دەربازکردنی خۆمم لەبیرە، ئەز دامەوە کۆلانێ، لە کۆلانەکانی ناو قەسران، ڕوو لە ڕزگاری، لە سەرە کۆلانی، بە کەلێنی گوللەدا خۆم بە ماڵێکدا کرد، سەرە ژنێ بە شارستان دەچوو، بە ئاماژەی دەست هۆدەیەکی پیشاندام، بە زاری دایکانەوە گۆتی:

کوڕم، وەڕە، بڕۆ ناو کانتۆڕێ.

کەوتمە دلەڕاوکێ، بچم، نەچم؟ نەچووم، ترسام گورگی جادە بگەنە سەرم و لە ناو کانتۆڕێ قیڕەبڕم بکەن، قسەی ژنەم شکاند، پێبلکەم دیتەوە، بە چەند شەقاوێ گەیشتمە سەر بان، لەوێوە بۆ سەر دیوار و سەربانێکی تر، لەوێشەوە بۆ حەوشەیێ، کوڕێ گوتی:

وەرە چاکەت و بێجامەت دەمێ.

نازانم بۆ بە قسەم نەکرد، سوپاسم کرد و وەک پەلیک دەرپەڕیم، ئەو کۆلانە تەقەی لە سەر نیە، سووڕامەوە و گەیشتمەوە سەرە کۆلانی ڕزگاری، کۆلان چۆلە، بیرمکردەوە باشترین پەنا ڕزگاریە، ئەگەر بگەمەوە ئەوێ، ترسی گرتنم لە سەر نامێنێ.

وام کرد، خۆم بە ڕزگاریدا کردەوە، تێکەڵ کوڕانی دوور لە (بڕووخێ و بژی) بوومەوە، خۆم بە ئاودەستێدا کرد و لە پشتێن بۆ خوارێم لە بن ئاو هەڵکێشا و لە قوڕەشینە پاکبوومەوە، گوێم لێبوو کوڕێ لە بن لێوانەوە:

لە ترسا میزی بە خۆیدا کردووە!.

هەوکە ڕزگاری دەڵێی خۆڵ و دۆی بە سەردا کراوە، لە زۆر چاوان ترس و لەرز دەخوێنمەوە، وەک بڵێی حوکمەت تۆڵەی کوڕانێ بە جادەکەوتوو، ئەو کوڕانەی سەریان بەخشیە ڕەشەبا! لەوانەی کڵاوی خۆیان گرتووە بکاتەوە، من ئەو ترسەم نەبوو، ترسی من لە مامۆستای (پەروەردەی نیشتیمانی) بوو، ئەوەی پێش کەمێ لە ناو پۆلێ، لێیان وەژۆر کەوتم، تۆ بڵێی سەرزم لە قوڕێ ڕانەکات؟

زۆری نەبرد، پیوەربوون، چەند ئەفەندیەکی دەمانچە لە نێک پیوەربوون، لە ساکەگۆڕەکە ئەوەی ناوە ناوە ئالای عێراقی لێهەڵدەدرا، هەمووومانیان کۆکردەوە، عارەبی کەوتە قسە، یەک دووانێ گوتیان:

عارەبی نازانین، بە کوردی قسان بکە.

عارەبیش کوردیی نەدەزانێ، کوردێ لە خۆیان بۆی دەکردینە کوردی، تەواوێ بە ئێمەیاندا هەڵدا، لە سەر ئەوەی لە قوتابخانە ماوینەتەوە و بە گەڵ ئەو ئاژاوەگێڕانەی بە جادە کەوتوون، نەکەوتین، باش بوو زۆریان نەڕێسا و وازیان لێمان هێنا.

من بیرم هەر لای مامۆستای پەروەردەی نیشتمانیە، ئەها، ئەوەتێهێ لەو سەرەوە راوەستاوە، دەترسم، بە ئاماژەیەکی وی، دوو گورگی جادە پەلامارمبدەن و کەس بە زیندوویتی نەمبینێتەوە، باشە من خوا لێی گۆڕیبووم؟ نەدەبوو روو لە رزگاری بکەمەوە.

نەبادا ئەو مامۆستایە، چیدی نەیەتە ناوگێڕانەوەی من، بە دوو سێ رستە مالاوایی لێدەکەم:

نە ئەوکات و نە دواتریش، بە روویدا نەدامەوە، لە جاران پتر رێزی دەگرتم، منیش بە شەرمەوە سڵاوم لێی دەکرد و منەتباری بووم، ئەو مامۆستایە، دیار بوو هەر بە واژۆ بەعسی بوو، وەرنا لە زۆرانی دی باشتر بوو، پاشتر بیستمەوە، برایەکیشی لە ریزی کۆمۆنیستانە و لە چیایە و ناوی پێشمەرگایەتیی برووسکە و گەیشتە ریزی گەشمردانیش.

ئێ، بۆ سبەینێکەی پێکەوتین دەستەیێ قوتابی گیراون، لە گەڕێکی تر دەگەڕێمەوە لای گیراوان .

ئێ، لە گەڕێکی تری خۆپیشاندانی کوڕانی رزگاری لەو ساکە گۆڕەی ئالای عێراقی لێیە، لە بن ئالایەکی تر یەکتردەبینینەوە، ئێستا دەچمە خۆپیشاندانەکەی لای خولگەی کچ و گۆزەی بن قەلاتێ، هی جادەی باتە.

## ئەی رەقیب
## لە باتە و خولگەی کچ و گۆزەوە

زۆر زووتر لە وادەی خۆی گەیشتین، بیرمە فازیل ریحانە گوتی:
وا چاکە بایی دوو سێ جەم بخۆین.
بیرمنیە من بووم، ئان شێخ جەلال:
وا دیارە گیرانت بۆ خۆت مسۆگەر کردووە.

خواردمان، لە بەرانبەری سینەما حەمرا، لە بەرکی ریحانە لە تێری بابۆڵەی چەورمان تێکرد و لە چاخانەی عەبۆش چایەی شیرن و بەرەنگمان بە سەرداکرد. لە مزگەفتی حاجی لەقلەق بوو، یان شێخە رەشکە دەستمان بە ئاو گەیاند. بە بن قەڵاتێدا گەیشتینە جێ، خولگەی کچ و گۆزە، خۆ دەزانن کام کچم مەبەستە؟ ئەوەی لەو سەرەی جادەی باتە، بە دیار قەڵاتەوە گۆزەیەکی وێنەی خۆی ناسکی لە سەر شانە. لەوێ گەلێ برادەر و ناسیارم دیتەوە، لەوانە لوقمان و هەردوو یووسفەکە و یووسف عوسمان و ئەوانە...

ئێستا چاومان لە سەر دەمژمێری دەستمانە، ئەها، میل گەیشتە سەر دەمی رابوون و هەستان، بە دەستی رووت هەستانەوە و سەرهەڵدان بە رووی ئاگر و ئاسنی رژێمێ کە لە کوشتن و برین نموونەی لە دیرۆکدا کەمە. لەو شەقامە کە بایی شارێک گورگی جادە دەوری داوە، بەگژداچوونەوە لە دەست کێ دێ؟ کچ و کوڕی خۆی دەوێ، کەسێکی گەرەکە یەکپارچە جەرگ بێ، کەسێ مەرگی خۆی لە سەر لەپی دەستی دانابێ، کەسێ لە چاوی شێر نا، لە چاوی بەعس نەگەڕێتەوە.

منیش وەک ئەو خەڵکە، هەست بە ترسێکی ئەوتۆ ناکەم و چاوەڕێی تەقینەوەم، تەقینەوە بە رووی بەعس. رەنگبێ برێ لە نەترسانەکە بۆ پیاوی ئاسمانی و شڤان پەروەر بگەڕێتەوە، ئەها، کاتێ پیاوی ئاسمانی

تێیهەڵدەکردە:

**لە زڕەی زنجیر دڵت نەلەرزێ**

**پێوەن بۆ لە شە، نەوەک بۆ گیان...**

دەهاتە سەرت بە پێی خۆت بەرەو (ئەمن)ی هەولێر و خاسەی کەرکووک و قەنارەی مووسڵی بچی، ئەدی شڤان پەروەر؟

وەی وەی، لەو شۆڕش و سەرهەڵدانە! لەو پفدانە! پفدانەکە هی حەمەد مەستانە، لە کن زۆر کەس گوتبووی:

ئەو شڤانە ئیشی پفدانە، بە سروودان کوڕ وکچان پفدەدات و رەوانەی بن قەنارەیان دەکات.

لەو دەمەو عەسرە بەهارییەی لای کچە گۆزە لە شانەکەی بن قەڵاتێ، وێدەچێ منیش یەکێک بووبم لەو پفدراوانە! لەو ساڵانە سروود و سترانەکانی شڤان هێرەیان دەکرد، خەڵکیان بە ئاگر و ئاسن دادەدا، نەوارەکانی بە قاچاخ دەستاودەستیان دەکرد، هەر کێ لە دەستی گیرابا، دەگەیشتە بن قەنارە، یان کەمێک وێروەتر. بیرمنەچێ لە ناو دەلالخانێ، کوڕێ هەبوو، دواتر کامەران سەرسپیان دەگۆتێ، نەواری شڤان لە کنە وی دەستدەکەوتن، زانیبای کەسێ جێی ترس نیە، دەیفرۆشتێ.

ئێ، لەو بەری خولگەی کچ وگۆزە، زەنگی سەرهەڵدان لێیدا، رەنگبێ ئەوەیان دەمژمێر پێنج بووبێ، ئەو پێنجەم بە ناولەپ و پێڵاوی کچەکانەوە لەبیرماوە. هەنگێ کچان ئەو کچانەی بۆ ئازادی ترسیان کردبووە کالە و لە پێیان کردبوو. هەندێ لەو کچانە بەر لە هاتنی دەمی زەنگی سەرهەڵدان، لە ناو بازاڕ دەسووڕانەوە و بە ئامـاژەیێ کە هەر لە خۆیان دەهات، شوێن و کاتی خۆپێشاندانیان لە کوڕانی شار دەگەیاند. بە نموونە: ئەگەر دەمەکە پێنج و شوێنەکە جادەی باتە با، ئاماژەکە بەو شێوە دەبوو:

ناولەپی خۆی بۆ چەند چرکەیێ لە راستی چاوی کوڕە رادەگرت، ئاشکرایە ناولەپ خڕە و لە شێوەی ژمارە (ە)ی خۆمان. دوایوە دەستی بۆ پێڵاوەکەی دەبرد، دیارە پێڵاویش هێمای جادەی باتەی ناو شارە. ئەوجا هەینێش تازە دەم گۆڕین داهاتبوو، دەمی هاوینە و زستانە. کچە پەنجەکانی

لە شێوەی باوەشێنەی نوێباو دەکردەوە و باوەشێنی لامل و گەردنی خۆی پێدەکرد. تۆ وەرە، ئەو ئاماژانە وەرگێڕە سەر وشە، رستەکە وا دەردەچێت:
دەمژمێر پێنجی هاوینە لە جادەی باتە.
ئەوجا هەبوو، لەو ئاماژەیەی کچانی کالە لەپێ تێنەدەگەیشت، بە گەشکەی وەردەگرت و دەیگۆ:
باشە من چیم کردووە، ئەو کچەتیوە گەشکەم لێ دەگرێ!
ئێ، زەنگەکە دەنگی کچێکی کاوبۆ لەبەری، کالە لە پێ، زانکۆیی بوو.
ئێستاش (بڕووخێ)ی زاری کچەی خولگەی کچی گۆزە لە سەر شانێ، لە گوێمدا لە ئەی رەقیب زەلالتر دەزرینگێتەوە. بڕووخێی زاری کچە زار لە زاری وەرگرتەوە، جادە سەراپا بووە بڕووخێ، بووە مەرگی سەدام، ئەی رەقیب هەڵیکرد و بە وێنەی بای شەماڵ کوڵان کوڵان خۆی کرد بە کۆلانەکانی قەیسەریدا، بە کۆلانەکانی عارەباندا، ئەو گەڕەکە دەڵێم کە زوو، بە هاتنی دوو ماڵە عارەب ناوی کۆنیان لە سەر هەلگرت و عارەبی وەرگرت.
ئەی رەقیب دایەوە لای چاخانەی قەرداران و کۆتری ئاشتی و پەڕیەوە بەری جووان، تۆ بڵێ تەعجیل. ئەی رەقیب تێدەسووڕێ و لەو لایەوە لە کۆنە هەواری شێخە شەل (کتێبخانە)وە بەرەو کۆنە هەواری مام گیو (چاپخانە) و مزگەفتی قیبلە خوار شۆڕبۆوە. لێرەوە بە هەردوو دیوی کونی عەشتاردا بە قەلاتدا هەڵگەڕا، دەبینم لە پەنجەرەکانی سەر سەرێ، ژن و منداڵ بە چەپڵە دەیگرنەوە.
لە هێکەوە لە خڕ لاوە پێوەر بوون، گورگی جادە بە دار و چەکەوە پێوەربوون. چاودەنێ، زرموهۆڕێکە گوللە لە حەوایێ وێکدەکەون و جادە بن قەوان کەوت، خوێن رژا. دەنگێک لە گوێی من لە دەنگی شێخەشەل دەچوو، ئەنگۆ ئەو شەلە دەناسن، ئەها، ئەو پیاوە قەلاتیەی لە سەردەمی پاشایەتی، لەو شارەدا یەکێ بوو لە پێشەنگانی خۆپێشاندان، ئەو دەنگە شێخەشەلیە، هاواردەکات:
کەس هەڵنێ، لێیاندەن...
لێدانی چی! بە چی؟ دەستکردنەوەش جێ و شەڕی خۆی هەیە، ئا،

پێکدادان روویدا، هەندێ کەس دەستیانکردەوە و مست و شاپیان وەشاند، بەرد و شتیان راوەشاند، هەبوو بە بەڕکی پڕ بەردەوە هاتبوو، تا بەردێکی لە بەڕکی ما، شەڕی کرد. چوار پێنج گرتە لە هەینێوە تاکو هەوکە لە چاومن و رەشنابنەوە:

ئەها، ئەو کوڕە شەرواڵ خوارە، لە فرۆشگای سەر سووچی بن مێوانخانەکە پڕیدایە کیلۆ و تایەکی تەرازوو، بە دوای یەکدا رایئاراندنە بێریە سۆرێ، خۆی لانەدابا، سەری دەپەڕی، چەکدارەکەی پشتە وی بە دەسترێژێ باگۆی شەرواڵخواری دایەوە، بەڵام نازانم کێ کردی! سەری کرد و بەر نەکەوت.

نەختێک سەرتر بە لای چاخانەی باکووردا، لە سەرە کۆڵانی پاچەکە، پرچی کچێ لە دەستی دووسێ گورگی جادەیە، کۆمەڵێ کوڕ پێدەچوو زانکۆیی بن، بە هانایەوە چوون، بە خوترمە و چەک رێیان لێگیرا و نەگەیشتنێ. من لەوێ لیدانێکی باشم خوارد، دارێکم وێکەوت، تا درەنگیش جێی بە رانمەوە دیار بوو. کەوتم، مەمنوونم بە دار، چانەبوو گوللە نەهات، هەستامەوە و بە شەلە شەل هەڵاتم، نەمزانی کچە چی بە سەرهات.

لەو سەرە کۆڵانەی بۆ تۆمارگەی مشکۆ پێچدەکەیتەوە، دیتم دووکانداری بە سەر دوو سێ کوڕدا دەراب دەهێنێتە خوارێ، لە سەری کلیلدان و بەجێیهێشتن. ئەو شەوە بیرم هەر لای کوڕانی لە دووکانکراوی دەڕاب لە سەر داخراو بوو. سبەی زوو، بە خۆم نەوەستام، چوومەوە بەردەمی ئەوێ، پیاوەکە لەوە نەدەچوو، پیاوخراپ بێت و بە گرتنی داین.

لە بن پێی کچەی گۆزە لە سەر شانێوە، دوو سێ چەکدار سێرەیان لە بڵندایی قەڵات گرتووە، دەبینم پەنجەرەکان یەک لە دوای یەک دادەخرێنەوە و سەربان و شانشینان ژن و منداڵیان پێوە نامێنێ.

لە سەرە کۆڵانێ نزار، نزاری مەیخانە دەڵێم، ئەوەی جاروبار بە یەک دوو بیرە هێند ناسکی دەکردینەوە، لە پیاسەی بن نمەی بارانێ، بە سەر هۆزاندا دەتواینەوە. لەوێ پیاوێکی جوامێر جەمەدانی کردبووە ئاڵا و بە دەم هەڵاتنەوە، دەمێ لەگەڵ هێمن بەگژ میرغەزەبەکەیدا دەچۆوە و دەمێ لەگەڵ

دڵدار کورد زیندووەی دەگوتەوە.

گرتەی جادەی باتە و خولگەی کچ و گۆزە و بن قەلاتێ گەلەک زۆربوون، بەڵام هەوکە بیرم بەربادە و هەر هێندەم لە یادە. ئێ، هەموو حوکمەت رژایە ئەو ناوە، دەستکردنەوە و مانەوە، بوێری نیە، لە ترێ سەی چوونە. کچ و کوڕانی بە گڕ بە عسدا چوو، پەرتەیان لێکرد، بووە هەلات هەلات، هەندێ کەس نەبێ، کەس نەبووە کەسی کەس، منیش لە برادەرەکانم دابڕام.

ئێستا لە پشت ئەو پیاوەم کە جەمەدانیەکەی کردبووە ئالا، دامەوە کۆلانی نزار، کۆلانی بادە، یەک بەو کۆلانە خەڵک هەڵدێ، بە سەر سەرانیشەوە گوللە گیزەی دێ. گەیشتمە کۆلانی تەکیەی سەید خەنجەرە، کێیە! دەمویست پەنای بۆ ببەم، پەژیوانبوومەوە، دەستی چەپم گرت و پێم پێوەنا. زۆری دەرگاکان لە سەر پشتن، خەڵک خۆیان تێدەکوتن، بەلام من نازانم بۆ رێی چوونە مالانم دانەدەگرت، دەنگێک لە ناوەوە دەیگۆ:

لامەدە، برۆ.

قسەی دەنگم نەشکاند و هەڵێ، هەوکە لە کۆلانێکی تەنگەبەرم، لەو کۆلانانەی بە تۆبزی دوو کەسی پێوەدەچێ. لێرە ئێمە چوار پێنج هەلاتووین، هەلاتووی دەستی گورگانی جادە، یەکیانم ناسیەوە، یووسفە، ئەو کوڕەی دوای ئازادی، دەستی لە دنیا بەردا و ئاگری لە خۆی بەردا، لە پشتمانەوە، پێ پێ، دەنگە دەنگ و دەنگی تەقە دێ، دەنگەکان عارەبین، لە عارەبیەکەی غەزالی نا، لەوەی سەدام.

دامانەوە کۆلانێکی تەنگتر، لەو سەرە کۆلانە لە مالێکەوە، غەزالی هەڵیکردبووە (گولی یا حلوو..)، تاهوو واهـ کاتی ئەوەیە! لە هەر کوێ دەنگی وی هاتبا، پێی رۆیشتنم نەدەما و هەناسەم لە خۆم دەبڕی، کەچی هەوکە لە ترسی مەرگ پێ هەڵدهێنم و لێی دووردەکەومەوە.

نزا بکەن، کۆلان دانەخرابێ، ئاخر لەو گەڕەکەش کۆلان هەیە، تەنها رێی چوونی هەیە، دەرچوونی نیە و لەو سەرەوە دەبێت رێ و رێ بگەرێیتەوە. هەندێ گەڕانەوە هەیە خۆشە، راوە کەروێشکیشی تێدایە، ئەو کەروێشکانەی لە دەمی سەر دەرگا شووشتن و داهاتنەوە دەردەکەون، راوی ناسک، ئەو

راوەی نە داوی تێـدابوو، نە تەقەیـێ، پشـکە خوێنێکیشـی لێـنەدەڕژا، لە سەربردەیەکی دی راوە کەروێشکان دەبینی، هەوکە دەمی گێڕانەوەی راوی ناسک نیە.

ئێستا ئێمە خۆمان نێچیرین، نەک نێچیروان! گەڕانەوەی ئەورۆ بۆ ناو دەوی گورگی جادەیە، بۆ کونەڕەشەیە، ئەو کونەی لەو چەند رۆژە دوایی، نەخاسمە ئەورۆ داخوا چەندی وەک ئێمەیان تێئاخنیبێ.

لەو کـۆلانە چـاو دەگێـڕم، دەرگـایێ نـابینم لە سـەر پشـت بێـت، خـری داخراون، دەڵێی کۆلان کەسیان لە ماڵ نیە، هەڵگەڕان بە دیواریش ئاسان نیە. دوو سـێ دەرگـا مـابوو، بگەیـنە سـیلەی دوا خـانوو، وای، قەومـا، کـۆلان داخراوە، بە دەرگا و دیوار نا، بە دوو هەیتەی کەتەی تەژەی چەک لە مست، چ لە سوارکردنی چەک ترسناکترە! کاتێ بە رووی تۆدا بێ، لەگەڵ راکێشـان و سوارکردن و خوڕین:

ئۆگەف..

بە عارەبی (بوەستن)ێکی وایان لە زار دەرچوو، کەمێک شل بایت، خۆت پیسدەکرد. من پێشتری (ئۆگەف)ی وا توندم لە زاری چ عارەبان نەبیستبوو، هەر مـن دەزانـم چ ئۆگەفێ بـوو، لەگەڵ ئەو ئۆگەفە، نـازانم ئەوان، بەڵام مـن لێرەوە پسام، ئەورۆژی پێیدەچین ئەوڕۆیە، لەوەیە دوا هەناسـەمان کەوتبێتە ئەو کـۆلانە تەسکوتریسـکە، لەو سـاتە سـەرەمەرگیە، دوورنـیە قسـەی بـابمم بیرکەوتبێتەوە، ئەوەی دوێنێ بوو، یان پێرێ:

کوڕم، وریای خۆتان بن، بەرگەی جەرگسووتانێکی تر ناگرم.

ئێستا شتێ بڵێم، رەنگە باوەڕنەکەن و بە فیلمی هیندی تێبگەن، یان بەوەی کە دەڵـێ: خـودا یەکە و دەرگـا هەزار، یـان بە چیـرۆک و گرێـدانەوە بـۆ درێژکردنەوەی رووداو بە لایەکی دی، چۆنی لێکدەدەنەوە، گەردنتان خۆش و ئازاد، ئەوەی ئێمەی لە هەیتەی عارەب و مەرگ یان گرتن لە سەر دەستی عارەبان رزگارکرد، ئەوە بوو:

لە دەسـتی راسـت، رێک لە تەنیشـتە مـن، ئەو جێیەی لە لوولەی تفەنگی هەیـتەوە چـاوەڕێی گەیشـتنی ئیـزرائیلم دەکـرد. دەسـتێ، نـازانم دەسـتی

ئاهورامەزدا بوو، کێ بوو دەرگای بە رووی ئێمەی زارەتریکدا کردەوە، لەو کردنەوەیە دەچوو، دواتر لە فیلمێ دیتم کە بە رووی یووسفی لە زولێخا هەڵاتوودا کرایەوە.

دەرگا کرایەوە و خۆمان تێکوتا، باڵمان گرت، تا هەیتە گەیشتنە حەوشە، ئێمە بانە و بانمان دەکرد.

هەوکە لەو جادە دەپەڕینەوە کە کۆترەکە دەگەیەنێتە شێخی چۆلی، لێرەش هەلات هەلاتە، پەڕیینەوە بەری جووان، نازانم بۆ ئەو گەڕەکە هەر بە جووان دێتە سەر زارم، تۆ بڵێ تەعجیل، لەوێ بە کۆلانی تەکیە و مزگەفتەکە، موفتیە، کیهانە! دامانەوە ئەو دەستەی کە دەتباتەوە بەری کنێستە کۆنەکەی جوولەکان. لەوێ پێدەچوو رێ گیرابێ، کەمێ کشاینەوە و بۆ سەر کەندە گەورەکە شۆڕبووینەوە، ئەوەی زستانان و بەهاران هێند هەردەستێ، گەڕەک وەها کەرتدەکات، مەگەر بە بەلەم پێکبگەنەوە، بەوەی باشە ئێستا ئاوی کەمە، چڵکاوی مالانە.

کەند قووڵە، قەراخی بە بەرد هەڵچنراوە، چ چار نیە، دەبێت خۆ لێدەین و بپەڕینەوە، ئاخر پردەکەی سەرێ پری چەکدارە، نزیکبوونەوە لێی کەوتنە ناو زارە، زاری گورگی جادە. تۆ چاودێ ئەو هەموو خەڵکە، منداڵ و گەنجە خۆ بە کەندێ دادەن، هێند زۆرن، وەک بڵێی نیوەی شار لە پەڕینەوەدا بن، وێدەچێ خۆپێشاندانەکە گەلەک لەوەگەورەتر بووبێت کە لە منەوە دیاربوو.

هێشتا دەنگی تەقە دێ، نزیکە و گیزەی گولله دێ، لەو شوێنەی من لێی راوەستاوم، بە خۆ شۆڕکردنەوە بەژنێ پتری دەمێنێ پێت بگاتە زەوی. لە کەوتنە خوارێ، جێی دارەکەی جادەی باتە، وە ژان کەوتەوە، تا ئەوێ ژان و شەلینم لەبیرچووبۆوە، ئێستا زۆر ژان دەکات و جوان دەشەلم. هەر چۆنێ بوو، بە سەر چەند بەردەبازێ بازمدا و پەڕیمەوە، لەو بەر لە چەند جێیەک رێی سەرکەوتنەوە هێندە بلند نەبوو، پشیلە ئاسا هەڵگەڕاین.

ئۆخەیش، ئەوجارەش دەرچووم و نەکەوتمە دەستی میرغەزەبان. هەناسەبڕکێمە، ئارەقەی شین و مۆرم دەرداوە، پشوویکی باشمان دا و پشیەکمان هاتەوە بەر، یووسف بوو یان کەسێکی دی:

پەرتەی لێبکەین باشە، سێ چواریێ پێکەوەبین، تووشمان بن، راپێچماندەکەن:

بەر لە پەرتەکردن، وێنەیەکی ناسک هەیە، بە ئێوەشی پیشاندەدەم:

ئەها، چاودەنە ئەو پەنجەرێهی، کچێ سەری دەرهێناوە، لەو مانگی گولانە ملی لە شێوەی گوڵەشلێرە لار کردۆتەوە. نزیکبووینەوە، پتر سەری دەرهێنا، وای خوداوەندی جوانی، ئەوەت بۆ کێ هێناوەتە دنیا؟ یەک دوو بەرکۆژەی کردبۆوە، سینگی کوارگی کەما بوو، چاوی گەلاوێژی، برژانگی پرژی رەژگوڵی، کەپوو بندقی، دەمولێو لە وێنەی زنەی کوێستانێ.

لە پڕ پرچی کردەوە، تۆپی کردبوو، پرچ شۆڕبۆوە، چ پرچێ، لە هی ناو گۆرانییەکە درێژتر:

**پرچی دوو گەز و نیوە**

**یارم بەفرە و باریوە**

پرچ چ پرچ، دەتگوت گیابەند و خاوە، کوڕێ دەڵێ:

ئەوە بۆ ئێمەی هەڵدا، تاپێیدا سەرکەوین!

ئێمە هێشتا لە بن پرچی بووین، حریتەیەکی لێدا لە تاق و پەنجەرانی گەڕەک زرینگایەوە، هێشتا پێکەنینی نەپسابۆوە، بە جامە ئاوێ جوان رشاندینی، حەسساینەوە، ئەو کچەتیوە بۆ وا دەکات؟ درەنگ پێکەوتم، لەو کۆڵانە کچێکی جوان هەیە، باری دەروونی تەواو نیە و هەر جارەی بە شتێ دەیگرێ.

ئێ، لە کچە گەڕێ، لە کوێ بوو سەرم لە گەڕەکێ هێنا دەرێ؟ لە سەرێی خولگەی بە تەمای خوداێ، نزیک ئەو سەموونخانەیەی کە لوولەیەکی شتێ لە منارەی چۆلی نەویتری بە سەرەوەیە، وا تێبگەم تۆش ئەو لوولەیەت دیتووە، دەڵێی پەیژەی ناو خەونەکەیە بە حەوادا چووە، ناوی لوولەی دووکەڵە، دووکەڵێ دەنێرێتە ئاسمانێ، هەر دەمەی بەشێوە و رەنگێ، تەنک و سپییات، چڕ و قەترانی، دووکەڵ هەر جارەی دەچێتە دەستی بایێ، با هەر جارەی دەیبا بۆ لایێ، لەو دووکەڵە سەماکەرەوە بۆنی سەموونی گەرم بە سەر شاردا دەپژێ، چ سەموونێ! وەرە بە چاوی من برۆنێ و بە زاری پلکە

شامی بکە تامی. ئەو پلکە شامیە کوشتەی ئەو سەموونە بوو، دەچوو دوو بەرە نانی بۆ ماڵان دەکرد، تا دوو لەو سەموونەی پێ بکڕێ، لە پێش دەرکێ، منداڵانە بە دەستیەوە دەگرت، هێند جوان بۆ زاری دەبرد، هێند بە تام دەیچوو، حەزت بۆی دەچوو، بە زگت دەدا.

هەبوو ئەو سەموونە گەرمەی دەخستە ناو نانی تیریەوە، دەتگوت بابۆڵەی پڕ گۆشتە بایدەدا.

ئەرێ پلکە شامی و لوولەی دووکەڵ بۆچی لێرە قیتبوونەوە؟ لە کوێوە لە سەربردەی بەگژداچوونەوە دەکەنەوە؟ ئا، لەو بەری لوولەی دووکەڵێ، دیتم دوو کوڕ، یەکیان سەموونی بە دەستەوە بوو، سێ چوار چەکدار تێیانوڕووکان و هەڵیاندانە ناو ترومبێل و بازێ، من بن دیوار و دیوار باریکەم داین.

لە سەیداوە هەندێ لە برادەرەکانم دیتەوە، شێخ جەلال و موحسین حەمەد و فەرهاد و عیسا و ئەوانە، کەوتینە قسەوباس و پرس:

کێ گیرا؟ کێ بریندارە؟ شەهید هەیە؟

پێنەکەوتین.

دەگەڵ فازیل ریحانە، بە دڵێکی خۆشەوە، هێشتا زەردەی مابوو، گەیشتینەوە بەلاشاوە، لە نزیک ماڵێ، پلکە شامی، بە رووێکی خۆشەوە:

ئەوە بەربووی؟ وەی چەندم پێخۆش بوو.

هۆپێکم لە خۆم زانی، بەربوونی چی؟ دیتم، ماڵێ لە سەر چاو کەوتوون، چەندی دەمگوت:

چ بووە؟ چ بووە؟

کەس ورتەیەکی لێوەنەدەهات، درەنگ پێکەوتم، برای لە خۆ گچکەتر (عەلی)م، لە بەگژداچوونەوەیەکی تر هی لای گەڕەکی رووناکی و ئیسکان، گیراوە، دواتر گیراوەکانی ئەوێش دێنەوە ناو گێڕانەوە.

هەر لە جادەی باتە، کوڕ و کچێکی زانکۆیی ناویان بە گەشمردە کەوتە سەر زاری شار، هەندێ دەیانگۆ:

ئەو دووە دڵخوازی یەکتر بوونە.

ئـا، یەک دوو ڕۆژ دواتــر، نــۆزدە کەســەکەی گەڕەکــی عارەبــانیش دەنگیـدایەوە، ئەوەی دوای دامرکـانەی جـادەی بـاتە، پەنـا بـۆ ماڵێک دەبەن، ماڵەکەش پوختە زمانیان لێدەدات و ئەمنیان بە سەرەوە وەردەکات، دوو لەو نۆزدەیە (ئازاد و کامەران)ێکی ڕزگاری بوون.

ئێسـتا کـات کەمـێ بـۆ دواوە دەگەڕێـنمەوە، جاروبـاریش پێشـی دەخەم، هەندێ سەربردە دەگێڕمەوە و پاشان بۆ نـاو خۆپێشـاندانەکان دەگەڕێمەوە، دەڵێن چی، بچینە گڵکەندی گوڵ و گەڵا و باڵدار و...

گڵکەنـد، بـاخێکە لە یـادەوەری، لە پـایزی تەمەنـیش هەر بەهـارە و کەسـک دەچێتەوە، نە گەڵایەکی زەرد دەبێ، نەگوڵێکی هەڵدەوەرێ، نە چۆلەکەیەکی بە نیـازی نەهـاتنەوە هەڵـدەفڕێ. هەوکەش کووکـووی کوکوختیـانی، ئـاوێزان دەگەڵ نـمە بـاران و گـڤەی بـای ئێـوارانی، ئـاوازە دەدەنە ڕسـتە ڕسـتەی گێڕانەوە. گڵکەندی یـادەوەری، لە سـەد سـەرە کۆڵانەوە دەردەکەوێ، لە هەر سەر بە سەردا گرتنێ، سەری سەربردەیێ دەکاتەوە، سێبەری درەختێکم بۆ ڕادەخات، بە بۆنی گوڵێکی دەمگرێت، تا نەینووسمەوە بەرمنادات.

## پیاوە سپییەکە

وەکوو پێشتر گۆتم، لە گلکەندێ بە قەد پەلکی داران، باڵی باڵداران، وەختە بڵێم هێندەی قلە تەزرە و نمەی باران، حریتەی نازداران سەرم سەربردەی تێدایە. ئاخر سێ ساڵی ئامادەیی و دوو سێ ساڵی کۆلیژ، لە شەقاوەکان پتر، لە پیاوە سپییەکە پتر دەهاتمە باخی گلکەندێ، لەو باخە هەندێ نووسەری دنیام ناسی، لەوێ دوای کەمێ دەورکردنەوە، کتێبی قوتابخانەم دەخستە بن چۆکم، چیرۆک و رۆمان و شیعرم دەکردەوە. پیاوی سپی کتێبێ بوو لەوانە، ئەمن دەمویست ئەو سپییە بکەمە چیرۆک، سەرتیپی هاورێم بە پێکەنینەوە دەیگۆت:

مەیشێوێنە، ئەو پیاوە خۆی چیرۆکە.

وا چاکە لە پیاوە سپییەکەوە پێدا پێم:

پیاوە سپییەکە، لەو دیوی زەریا ئەوین لێیدا، پەلە هەورێک دابەزی و لە خۆی پێچا و دایەوە رێی گەڕانەوە، سپی سپی، لە بەفر سپیتر هات، ئەها، وا لە سەر شارە، نەوی زۆر نەوی، بەرێ خۆ دەنێ، شۆڕابەی دیارە، باری، پیاوێک سپی سپی بە سەر قەڵاتدا باری.

لە باخی شارەوە پێدا هات، گەیشتە باخی گلکەند، چاودەنێ، بەو چلەی هاوینە هەر گوڵ نا، پەلکیش رەنگی بەفری گرت، باڵداریش بەفریان پۆشی، دیڵە ترەکیەکەی بن سیمی دیوی گەڕەکی جوولەکانیش بە گوجیلەوە تێکەڵی رەنگی پیاوە باریوەکە بوون.

دەگاتەوە سەیداوە، بە دیتنی وی گەناوری دەو گۆمە پیسەکە لە هیکرا دەبنە پەپوولەی سپی سپی و بە سەر گۆمدا کەپرۆکە دەکەن.

لە سەرە کۆڵانی خۆیان ژنانی کۆڵان لە بن لێوانەوە:

ئەو پیاوە بەفری لێ باریوە.

خۆشکی پیاوە باریوەکە بۆیان راستدەکاتەوە:

ئەو پیاوە بەفرە و باریوە.

ژنان بە دوای خوشکدا دەیڵێنەوە:

بەفرە و باریوە...

کۆلان کۆلان، گەڕەک گەڕەک دەنگدەداتەوە، لەو رۆژەوە شار ئەو پیاوە باریوەی بە (پیاوە سپییەکە) ناودێرکرد، ئەو پیاوەی بە دەم رێوە دەست بە بەرکیدا دەکات و گۆلم گۆلم سپی لەو شێوەی چۆن جۆتکار زەوی تۆو دەدات، ئاوا سپێتی بە شاردا دەوەشێنێ، دار و بەردی لە سپێتی هەڵکێشا، بەڵام لەگەڵ مرۆڤ هیچی پێنەکرا و بە رەنگی خۆیان مانەوە.

ئێرە دەسپێکی سەرهاتی پیاوە سپییەکەیە.

بە زاری خۆی دەیگۆ:

هەر جارێ پێم دەخستە دەریا، گۆمە پیسی گەڕەکم بیردەکەوتەوە، گۆم لە من دەبووە دەریا، دەریایەکی کەفچڕێن، لە کەفی بیرە سپیتر.

ئەوجا هەبوو لەو گۆتەیەوە، لە هەور و بارینی دووردەخستەوە و دەیبردەوە رێی دەریا:

دەریا و دەریا هات، سوور و رەش و سپی و هەموو رەنگی بڕی، نە پێی بە وشکانی کەوت، نە پێی لە زەوی بۆوە، تا گەیشتەوە ئێرە.

پیاوە سپییەکە ناوی ناو تەسکەرەی، ناوی سەیداوەیی، کاکە زیادە. هی سەر شیعر، کاکە زیاد لادێیی، بەڵام کێ بەو ناوە ناوی دەهێنێ؟ هێ لە چەند کۆلانێکی سەیداوە، چ کەسێ بەو ناوە دەیناسێ؟ شار بە پیاوە سپییەکە ناودێریکردووە، لە زاری منداڵانیش جاروبار، بە پیاوی سەر مانگ ناوی هاتووە.

بۆ پیاوە سپییەکە، چوار وەرزەی ساڵ زستانە و بەفری لێ باریوە، چ زستانێ، قەندیلیش زستانی وای بە خۆیەوە نەدیوە، ئەها بەو خەرمانانە، چاودەنێ چی لەبەرە:

ساقۆی دوو سێ بەری سپی، کڵاوی تووکنی سپی، پەنجەوانەی زستانەی

سپی، تەنها دەموچاوی دیارە، هەموو سپی، تەنها چاو و برۆ، سمێڵ و ردێن ڕەش ڕەش، لە دوورەوە کتومت کونە ئەشکەوتێکی بەفرنەگرە بە دیوی نسێی شاخێکی بەفرینەوە.

هەمیشە لە سەر پێیە، وەک بڵێی لە سەر گەشتە، لە سەر فڕینە بۆ ئاسمان، بۆ سەر هەیڤ و مەریخ و ئەستێران، منداڵانیش هەر لەوەوە لە دیتنی وێنەی لەو شێوەی ناو تەلەفزیۆنێ، ناویان نا، پیاوی سەر مانگێ.

پیاوی سپی بێ ئەندازە شاراوە و پڕ رازە، لە بن هەر بنە مووورتکێ، کۆڵانی مووورتکانی گڵکەند، بە شێوەیێ دەیگێڕنەوە، لە هەر گێڕانەوەیەکیش بۆنی مووورتک دێ، بۆنی (لۆڤا)ی لێدێ، پێناچێ کەس لە زاری خۆیەوە بیستبێتی، هەر گۆتەیە:

پیاوە سپییەکە، لە سپێدە باشی لۆڤاوە، بۆنی مووورتکی پێداپژاوە.

ئەوە نیە ئێستاش کاتێ دەگاتە یەکەم سەرە کۆڵانێ مووورتکان، دادەچەمێ و بە خەیاڵی سپێدە باشەکەی ئەو سەری دنیا، ئەو دیوی زەریا، تێر بۆنی مووورتک دەکات.

هەمیشە قیتە، تەنها لە ئاست بنە مووورتک، بەرێزەوە دەچەمێتەوە.

هەر بە گۆتەی گۆتیاری:

لۆڤا، کچەکەی ئەو دیوی زەریایە، ئەوەی تیری ئەوینی وەشاند و کوڕە شاعیرەکەی دەو کەندی سەیداوەی بەو دەردە برد و لە چلەی هاوینێش بەرگی بەفری لەبەرکرد.

ئەز پیاوە سپییەکەم پێش سپی بوون دەناسی، هاوینان بە تویێ کراسێ دەگەڕا، هەمیشە دوو سێ کتێبی لە بن هەنگڵ بوو، من لە چاو وی منداڵ بووم، بەڵام چاکوچۆنی گەرممان هەبوو، دوای سپیبوون کە دیتمەوە، بۆ چەند ساتێ هەر وا تێگەیشتم بەر لەسپیبوونە.

سەرچیخ چووبووم، هەو نەبوو، پیاوە سپییەکە لە کوێ، کوڕی بەر لە سپیبوون لە کوێ؟ نێوان ئەو دووانە زەوی و ئاسمانە، ئەدی بەفر لە ئاسمانەوە داناکات!

ئێستا دڵێکی هەیە، لە جلک و بەرگی سپیتر، دڵێک چ دوور نیە لە کۆتر

بچیٚ، کۆتری سپی، لەو کۆترانەی لە ناو هەوری سپیش لە ڕەنگی خۆیان ناچنەوە و لە بینابیدا سپی دەچنەوە، سەرتیپی هاوڕێم دەڵێ:

دڵنیام ئەگەر گوێ بەسنگیەوە بنێی، گمەگمی دەبیستی.

نەیناسیمەوە، بەڵام لە سەردەمی پێش ناسین، لەگەڵم گەرمتر بوو.

پیاوە سپییەکەی لەو دیوی دەریاکان، لەودیوی دەریای سپییەوە، هاتوو، سەرهاتی ئەو چەند ساڵەی ئەودیوی لە بن دەریا ڕازئامێزترە، هێند تژی ڕازە، ڕەنگە خۆشی سەرەدەری لێ دەرنەکات و پەی پێنەبات، بۆیە کە پرسیاری ئەوێی لێ دەکەیت، وەک ئەوەیە لە سەر بانێ کەوتبێتە خوارێ، رادەچڵەکێ، سەر بادەدات، شتێ دەڵێ، خۆیشی تێناگات، یەکسەر قسە بۆ لایەکی دی دەبات، پرسیم:

چۆن بوو، خوێندنت تەواونەکرد؟

کەمێ داما:

ئەگەر لە ئینگلیزی شتێ تێنەگەیشتی، پرسیار بکە.

ئەو ئەوهابوو، زۆر جار لە بن درەختێکی پڕ گەڵا و جریوەی گڵکەند، سێ چوار قوتابی دەوریان دەدا و وانەی ئینگلیزیی بۆیان ڕاڤەدەکرد، دیتبای کەسێک نەخۆشە، دەیپشکنی و داودەرمانی بۆ دەنووسی.

هەر لەگڵکەندێ، ڕۆژێ برادەرێ، گوتی:

دکتۆر، نەخۆشم، شتێکم بۆ بنووسە.

سەیری ناو چاوی کرد، گوتی:

تۆ بەڵات نیە، دەتەوێ گاڵتە بە زانست بکەیت.

پیاوە سپییەکە چاوی لە سەر ئەو هەڵگرت و لە ناو چاوی من ڕایگرت، گوتی:

تۆ نەخۆشی.

چۆنی زانی؟ وا بوو، ئەو ڕۆژە من کەمێ نەساغ بووم، پەنجەی خستە سەر دەمارێکی دەستم، پێڵووی چاوی هەڵدامەوە، بە سەری پەنجە، پشت و زگ و سینگ و قوڕگی پشکنیم، لە پەڕە کاخەزێ شتێکی نووسی:

بچیە هەر دەرمانخانەیێ، واژی من ببینن، دەتدەنێ.

چووم و ورمگرت و چاکبوومەوە.

پیاوە سپییەکە لە ولاتی نەمسا قوتابیی کۆلیژی پزیشکی بوو، تەواوی نەکرد، وازی لێهێنا، گەڕایەوە، بۆچی؟!

ئەوە پرسیارەکەیە، ئەوە ئەو رازەیە، کەس نازانێ، لێرەوە سپیبوون سەرهەڵدەدات، پیاوێک رەنگی بەفر و گوڵی سپی دەگرێت، کاکەزیاد لادێیی گەڕەکێ چۆن بووە پیاوە سپییەکەی شار؟

ئەو پیاوە لە ساتی سپیبوونەوە تا ئێرە، کتێبێکی گەورەیە، کتێبێک تەنها یەک دوو دێری لێ خوێندراوەتەوە:

ئەوینی لۆڤا لێیدەدات، ئەوینێکی سیامەندانە، بەڵام کچە ئەو ئەوینە رۆژهەڵاتیە بە هەند هەڵناگرێ، بەگەڵ کوڕێکی دی دەکەوێ، بەوە لادێییەکە دەکەوێتە سەر جادە.

حوکمەتی بەغدا، ناچاری دەکات لەوێ جێینەبێتەوە، دەگەڕێتەوە، دەیخاتە کونەڕەشەوە و ئەشکەنجەی دەدات.

لەو کتێبە ئەوەی ناوی پیاوە سپییەکەیە، هەر هێندە و بەس.

گلکەند دارماڵە لە کتێبخوێن، لە ناو ئەوانە کتێبخوێنێ هەیە هێندەی خوێندۆتەوە، بە دنیاخوێن ناوی رۆیشتووە.

## دنیاخوێن

جستانی هەشتا و شتێکە، ڕۆژێکی تووشە، هەورێ بەری ئاسمانی گرتووە، بایی حەفتەیێ بارانی پێوە، بایەک هەڵیکردووە، لە بای بەفر دەچێ و سەرماوسۆلەی سەفینە شێتەی لە دەستە و کۆڵانەکانی قەیسەری دەتەزێنێ.

ئێمە لە باخی گڵکەندەوە دێین، ئەو باخەی جوانیی زستانانەی لە هی بەهارانی کەمتر نەبوو، بۆیێ سەرمان لێی نەدەبڕی و پێیەکمان هەر لەوێ بوو. لەوێوە دێین و لە مام خەلیلی بەر با خۆ ناگرین، هەڵێ بۆ عەبۆی لە بۆن و گەرمی ناندێنی، ئەو ڕۆژە بە (دڵ...) و نانی گەرمەوە خۆمان پێداکرد. ئەو ڕۆژە من نووسەرێکم ناسی سەد ساڵی ڕێک بوو، لە ڕۆژێکی بەفراوی مردبوو، رووسی بوو، ناوی وی دۆستۆڤسکی بوو، من لە ناو رووسینووسان شتێ لە گۆرگی و شۆلۆخۆف و جەنگیز ئیتماتۆف و پۆشکین و ئەوانەم خوێندبۆوە، بەڵام لە بارەی ئەو بەڵایەوە وا تێبگەم تەنێ ناویم بیستبوو، ئەوجا بزانە بۆ بە بەڵا ناوی دێنم؟ بەڵام با بزانین کێ تووشی ئەو بەڵایەی کردم؟

لە باخی گلکەندێ ناوێکیان دەگۆت و وا دەیانناساند:

هەموو دنیای خوێندۆتەوە، کەس ناوێرێ بە کتێب بەرانگژی بێتەوە.

ناوی هەر نووسەرێکی دیاری دنیا بێنە، یەک یەک ناوی کتێبەکانی هەڵدەدا.

لاپەڕەی کتێبێکی نووسەرێکی ناودار بکە سەرباس، بۆ وی لێیگەڕێ، پەڕ پەڕ هەڵیدەداتەوە.

ئەو دنیاخوێنە داخوا کێ بێ؟

ڕۆژێ بە دیار سەبەتەی گوڵەوە، چاڵە گوڵیەکەی باخی گڵکەند دەڵێم، هاوڕێیێ گوتی:

+ ئەها، ئەوەی دێ، ع. ع. یووسفە

- ئەوەی کتێبی بە سینگەوەیە؟

+ ئا، هێ لە کتێب، شتی دی بە دەستیەوە نابینی.

ئۆی، ناسیمەوە، ئەو کوڕەیە کاتی خۆی بە کتێبەوە دەهاتە ناو شینایییەکەی بابم و...

دوای ئەو دیتنەوەیە، دوو سێ جارێ، لە لاوە گوێم لە و دنیاخوێنە رادەگرت، ئەوە چ بوو؟

دەڵێی ئەوەی بیستبووم، راست دەرچوو، نازناوی دنیاخوێنی جوان لێدێ.

ئەو دنیاخوێنە، لە چاو ئەو هەموو خوێندنەوەیە کەمی دەنووسی، ئاخر هەبوو، چوار کتێبی نەخوێندبووەوە دووانی نووسیبوو، دنیاخوێن، ئەو قسانەی لە بارەی کتێبانەوە دەیکرد، خەتخۆش گۆتەنی:

بیاننووسێتەوە، دەبنە چەند کتێبێکی باش.

زۆری دەخوێندەوە، زۆری دەگوتەوە، کەمی دەنووسی و شیعرەکانیشی لە شیعری چ شاعیرێکی هەینێ نەدەچوون.

دنیاخوێن بە شێوەیێ ناوی هەندێ نووسەر و کتێبی دەگۆ، بە دەست خۆت نەبوو حەزت دەچووێ و دەهاتە سەرت، هەر ئێستا بە ناو کتێبخانان بگەڕێیت و وەدەستیبێنی. نووسەرێ لەوانە دۆستۆڤسکی بوو، کتێبێ لەوانە تاوان و سزا بوو، من لەو دنیاخوێنەوە بوومە سەوداسەری ئەو نووسەرە بەڵایە، نازناوی بەڵاشم هەر لە زاری دنیاخوێنەوە بیست، ئەو کاتێ باسی مەزنیی نووسەری تاوان و سزای دەکرد و وشەی نەدەما بۆ نیشاندانی گەورەیی وی، دەیگۆ:

کوڕە، ئەوە بەڵایە بەڵا.

ئیدی لەوەوە خولیای خوێندنەوەی نووسەرە بەڵاکەم لە سەر گەڕا، کێشەی گەورە ئەوە بوو، ئەو بەڵایە بە کوردی نەیبوو، دەبوو پەنا بۆ عارەبی ببەی، عارەبیەکەشم دەرۆستی هەموو کتێبێ نەدەهات، نەمدەوێرا خۆ لە (تاوان و سزا) بدەم، چوومە گژ (دڵێکی لاواز)، لەبەر گچکەیی ئەوەم هەڵبژارد.

لەو رۆژە تەڕ و تووشەی ناو باخی گڵکەند، لە شێوەی دنیاخوێن، دڵێکی لاوازم لە بن ساقووە بە سینگمەوە نووساندبوو، یەک دوو رۆژ پێشتر خوێندبوومەوە، لەوێوە تا ناو قەیسەری و عەبۆ، باس باسی دڵێکی لاواز بوو، لەویَ بەدەم چا خواردنەوە، وردودرشتی دڵەکەم گێڕایەوە، سەرتیب گۆتی:

ئەوە تۆی وا بە درێژی رۆمانێک دەگێریەوە؟ هەبێ نەبێ، شتێک تۆ بەو دڵە دەبەستێتەوە!

راستی گۆ، شتێک هەبوو، پاڵەوانی ئەو رۆمانە بە هۆی خۆشەویستنی کچێکەوە، ئیش و کاری فەرمانگەی لە بیردەچێتەوە...

لەوەوە خۆم دیتەوە و کەویارم بیرکەوتەوە.

ئێ، ماڵت ئاوا دنیا خوێن، بێ ئەوەی بمناسیت و قسە بۆ من بکەیت، ئەو بەڵایەت پێناساندم و دوای دڵێکی لاواز (تاوان و سزا)شم دی و لە کەوەرۆژێکی باخی گڵکەندا پیاسەیەکی لای (قومارچی)یەکانم کرد و ئیدی ساڵ ساڵ پێداهاتم و کەم کتێبی ئەو بەڵایە هەیە، بەسەرمنەکردبێتەوە.

## وانەی مامۆستای گەشمردە

لە گلّکەنـد دەمێـنمەوە و کەمێکـیش بـۆ دواوە دەگەڕیـمەوە، بـۆ بەر بە چیاکەوتنی ئەو پیاوەی چەند خولەکێ قسەی بۆ کردین، بەلاّم بایی کتێبێکی گەورەی پێبەخشـین. نـاوی وی حەیـدەر بـوو، مامۆسـتا بـوو، نووسـینیشـی هەبـوو، ئەو مامۆسـتایە لەو چەنـد خـولەکە، لە زسـتانێکی گلّکەنـدی هەمیشـە بەهـــار، لە رۆژێکـــی کەوە رۆژدا وانەیەکـــی ســـانا و ســـووکی پێگـــوتین، تێگەیشـتنی ئـاوخواردنەوە بـوو، بەلاّم ئەزبەرکردنـی لە بەردکێشـان قورسـتر بـوو، ئەزبەرتـدەکرد، لە خەون زووتـر لەبیرتـدەچۆوە، وانەکە لەمەڕ زمـان و بیرکردنەوە و رۆشنبیری و ئەو شتانەوە بوو، دەیگۆ:

تۆ لە ئاخافتنی، بۆ نموونە ئەو دەستەواژانەت بێنە سەر زاری:

(قووندەر، خوشک حیز، شیر حیز، ئەژداد حیز، قاحپەشیر، قاحپە داک، لە گۆڕی بابت بەم، داک و خوشکت وا و وا لێدەکەم...)

بزانە ئەو وشانە، ئەو رستانە ئاستی تێگەیشتنی تۆ دیار دەکەن، کە چەند دواکەوتووی، با هەزار کتێبیشت خوێندبێتەوە، وریا بن، زمانی خۆت پێتدەڵێ: بیرکردنەوە و تێگەیشتنت چۆنە...

لە دوای وانەکەی مامۆسـتا حەیـدەر، مـن هەوڵمـدەدا لەو جـۆرە جوێنـانە دووربـکەومەوە، بەینـێ خـۆم بەرزەفـت دەکـرد، لە هـیکەوە یەک لەوانە دەردەپەڕی، بەلاّم زوو وانەکەی مامۆســـتام بیـــردەکەوتەوە و تـــۆبەیەکی زمانەوانیم دەکرد.

کەس نەبـوو لە وانەی حەیـدەر کەریمـی کۆمۆنیسـت دەربچـێ، هەبـوو دەیگۆت:

ئەوە رۆژووە پێغەمەریش بۆی ناگیرێ، دەیشکێنێ و نایگەیەنێتە ئێوارێ.

هەبوو دەیگۆت:

تـاقیکردنەوەیەکە، مارکسـیش لـێ یـدەکەوێ و لە خـولی دووەمـیش دەرناچێ.

مامۆستا وانەیەکی قورسی بە سـەردا جێهێشـتین و بـۆ خۆشـی چەکی هەڵگـرت و بە چیـا کەوت و زۆری پێنەچـوو، هەواڵ گەیشـت، مامۆسـتا گەشمردە بوو.

ئا، بیرمکەوتەوە، هەر لەو چەند خولەکە یەک دوو گۆتەی دی گۆ:

تا مرِ نەبن لە خوێندنەوە، بیر لە نووسین مەکەنەوە.

تا زووە فێرە زمانێکی دی بن، نووسینی کوردی بەشی ئەوە ناکات، فێرە نووسینت بکات.

وابـوو، هەینـێ کتێبـی کـوردی زۆر نەبـوو، وەرگێـڕدراو هەر زۆر کەم، ئەوجا شیعرنووس هەبوو، تەنها زمانی کوردی دەزانی، خۆشی بە پێشـەنگ دەزانێ، یەکێک لەوانە هاتوچۆی گڵکەندی دەکرد، جاوباریش دەهاتە کۆڕی ئێمە، دەڵێن چی، بیخەینە چەند رستەیەکەوە؟!

قسەتان ناشکێنم.

## شایەرانی مەهابادا!

ئەو کوڕەش جەنگی (سەدام-خومەینی)نەبا، وا زوو ناوی نەدەکەوتە سەر رووپەڕان، هەینێ وا بوو، چەند رستەیەکی کەرتت کەرتت رستکردبا، بە سووکە ئاماژەیێ، دژە ئێرانیی تێدابا، دەبووە شیعر و دەکەوتە چێوەی (ئەدەبی جەنگ)ەوە، بڕە پارەیەکی باشیشت وەردەگرت.

زۆر جار لە سەر رستە رستکراوەکان تەنها نووسیبات (بۆ مەهاباد) بڵادەبۆوە. ئەوجا چەند کەسی هەبوون، بەو مەهابادەیان گرتبوو، بۆیە لە گڵکەند بۆ ئەو مەهابادنووسانە، دەستەواژەی (شایەرانی مەهاباد!) کەوتە سەر زاران، ئەو کوڕەش یەکێ بوو لەوانە.

ئەو کوڕە جگە لەوەی لە شیعر پێشەنگ بوو! لە کوردایەتیش کەس بای نەدەبرد! باش بوو کوردایەتیەکەی زوو ئاشکرا بوو، بزانە چۆن:

رۆژێ هەر لە گڵکەندێ، ئەو پێشەنگە! روو لە کوڕێک:

+ دەڵێی تۆم دیوە!

- خۆت نەناس دەکەیت؟

+ نا، بەڵام...

- کوڕە، هەی ئیتیحاد، چەند گێچەڵت پێمکرد ببمە بەعسی؟!

کوردایەتیفرۆش زمانی تێکئالا، تا درەنگ لە گڵکەندێ نەماندیتەوە.

چ جێ هێندەی گڵکەند پڕ سەربردە نیە، بە سەریەکەوە ناهێنە ڤەگێڕان، ناوە ناوە دێمەوە ئێرە و بەسەریاندەکەمەوە.

ئێستا دەچمەوە رزگاری و پچڕ پچڕ هەندێ سەرهاتان دەگێڕمەوە.

## مامۆستا
## مارکس و بزنەگەلی

رزگاری پۆل و مامۆستای، حەوشە و بانی، دار و دیواری، دارماڵن لە یادگاری، نە بنی دیارە نە سەری، بۆ گێڕانەوە نازانی لە کوێوە بەری لێبگری، بۆیە لە هەر پنتێکەوە دەستپێبکەی، بۆ من رەنگبێ بەرایی بێ:

هەندێ گوتەی مەستانی عارەقخۆر نەخشی سەر بەردن، دەیگۆ:

کەسی وا هەیە، تا زار دەکاتەوە زۆر جوانە، دوایی حەلوای سەر پنچکانە.

ئەو زار و حەلوایە ئەو دەمە لە کنە من وەراست گەڕا و فیت دەرچوو کە لە ناو ساکەگۆڕەکە، لەو جێیەی (تەحیە عەلەم)ی لێدەکرا، لە زاری ئەو پیاوە قۆزە بالابەرزە، سپی و سۆرە، موو زەردە، چاوشینە، دەنگ گەورەیەم بیست. ئەو لە ئاقاری (جوگرافیا)وە هاتبوو، بەڵام نازانم بۆ کەوتبووە ناو (ئابووری)یەوە و قسەی لە کار و کارگە و ئەوشتانە دەکرد. کوڕێ کە لە شێوە شتێ لەو دەچوو، دیاربوو، قسەکای وی بە دڵ نەبوو، دەستی بڵندکرد و دژی وی هاتە گۆ، لە ناو قسانیش دوو سێ جاران پەیڤی (زێدەبایی) بە زاریدا هات، هێ لە هەندێش (مارکس)ێکی گۆکرد، پۆلی هەژاند، ئەو کە لە نزیکە وی راوەستابوو، سۆربۆوە بەتووڕەییەوە:

دانیشە، دانیشە کەرپیاو، کەس نەما ناوی وی دەڵێی؟!

تا زەنگی دەرێ هێندە و تەواو، هەوکە با بژنەوین، لەوێ، لە جێی (تەحیە عەلەم)ێ کە هەشت نۆدەیێ دەوریان داوە چ دەڵێ:

مارکس عەرەقخۆرە، بێ رەوشتە، بەزەلایە، داوای بەرەلایی و بزنەگەلی دەکات، راست و راست نا، بە پێچ و پەنا دەڵێت:

ئەی پیاو و ژنانی دنیا، تێکبەر بن.

ئەوانیش دەڵێن:
وایە، قسەی تۆیە مامۆستا.
پڕبووم، هاتە سەرم هاواربکەم:
سەر لەبەری درۆیە، درۆ.
باشبوو هاتمەوە سەرخۆ و هیچم نەگۆ.
ئەو دژە مارکسە زۆر دواتر، زۆر هەڵکشا، گەیشتە...

## مامۆستا

## ئاشبەتاڵ و...

برادەرێکمان هەبوو، ناوەکەی لە سەر زارمە، توخوا وەرە! ئەمن لەو رزگاریە سیخناخە، نازانم چەند پۆلیە، هەشت نۆ دە برادەرم هەبوو، ئەو کورە یەک لەوانە بوو، ناوی ویشم لەبیرچوو! دەی، لەو سەربردەیە با ناوی (A.B)بێ، ئاخر من جارێک بەو دوو دەنگە لاتینیە گازمکرد.

ئەو کورە هێند پارتی بوو، لە دوورەوە زەرددەچۆوە، کوڕێکی سەرڕاست و قسە لە روو، ئەو کورە بە وشەیێ زۆر تێکدەچوو، لە رادیۆوەش بیستبای، کەسێ بۆ خۆشیش گۆتبای، بە خۆی تێدەگەیشت و هەڵدەچوو، بەو با سەد جوێنی پێبدەی، بەڵام جارێک (ئاشبەتاڵ)ت بە زاردا نەیە، بۆیە ئەگەر کەسێ شەڕی ویستبا، دەنا لە کنە وی باسی باراشیش هاتبایە گۆڕێ، ناوی (ئاش)ی نەدەهێنا. لەگەڵ من هێندە برادەر بوو، کەچی نەدەوێرام ئاش و بەتاڵ لێکنزیکبکەمەوە، هەر کەسێ (ئاشبەتاڵ)ی تێگرتبا، وەها باگۆی دەدایەوە، لە تێگرتنەکە پەژیوانیدەکردەوە، جا خوای دەکرد ئەو کەسە مامۆستا دەبوو.

مامۆستایەک وا تێبگەم خەڵکی دەو زێی سیروان بوو، برادەرەکەمان چەند زەردی خۆشدەویست، ئەو دوو هێندە لێیان کۆڵدار بوو. ئەوجا با سەربردەکەی لە زاری پۆل بگێڕمەوە، چوونکێ من لەوێ نەبووم:

مامۆستا، لە باسێ گەیشتە ساڵە بەدیوومەکە، گۆتی:

دوای ئاشبەتاڵی ١٩٧٥...

لەو سەرەوە لێی قیتبۆوە و گۆتی:

+ مامۆستا، باشە باوکت چ جار باراشی بردۆتە ئەو ئاشە و لۆیان لێنەکردبێ؟

- باشه باوکه، باشه، نەمزانی تۆ پارتی، چما هەوی؟
+ ئەرێوەڵلا تا تۆقی سەرم هەوم.

پۆل زراویان دەچێ، ئاخر ئەو قسەیە، قەنارەی بەدواوەیە، لەو سەردەمە ئەوەی گوێشی لێراگری، بە لای کەمی تا بن پەتەکە دەچێ، تا چەند حەفتەیەکیش کەس نەیدەوێرا لە نزیک (A.B) راوەستێ، هەوکە نا دەمێکیدی، دێن قۆڵبەستی دەکەن و دەیبەن.

باش لێی دەرچوو، وا دیارە پۆل زماندراوی تێدانەبووە و قسەکە نەگەیشتووە.

ئەو مامۆستایەش، پاشتری دەستی گەیشتە شتێ.

## مامۆستا
## نیودینارەکە و...

کوڕێ لە ناو پۆلی، پۆلی پێنجەمی وێژەیی، پەڕەکی گەورە بە دەستەوە و دێ و دەچێ.

+ دیسان چ بووە؟

- بارووبووە.

+ بۆ کێ؟

- دار و دیواری قوتابخانە، بۆیاخدەکەنەوە.

+ بڕی پارە؟

- تەنها نیو دینارە.

دەگەیشتە هەر کێ، دەستی دەبرد بۆ بەڕکێ، نیو دیناری خۆی دەبەخشی و ناوی دەچووە ریزی بەخشکارانەوە. گەیشتە من:

+ ها...

- نایدەم.

+ لۆ؟

- پارە نابەخشم، بارووبوو ناکەم.

+ بە ڕاست؟

- ئی دڵیمە.

+ بە دڵی خۆت.

خەتخۆش وا تێگەیی بەڕکم بەتاڵە، دەستی بۆ بەڕکی برد و خۆی پچڕیەوە و ویستی لە باتی منیش ببەخشێ، دەستم گرت و نەمهێلا، ئیدی دامە لاملی و پارەم نەدا.

پاش تاوێ کوڕێ بە دوامدا هات:

مامۆستا ئەسغەر گازتدەکات.

قەوما، لە کەس نەقەومێ، ئەسغەرەفەندی هەینێ یاریدەدەر بوو، ئۆجا بەر لەوەی بە دڵەڕاوکێوە بەرەو هۆدەکەی وی وەڕێکەوم، با بزانین بۆچی پێم چەقاند و دەستم بۆ بەرکم نەبرد و پشکداریم لە بۆیاخکردنەوەی پۆل نەکرد.

هەینێ گەرمەی جەنگ بوو، هەموو شتێ لە پێناوی قادسیەی سەدام بوو، خرکردنەوەی پارە و پوول و زێڕ و زیو، هەر دەستگرتنێکی حوکمەت بۆ درێژەدان بە شەڕ بوو، من بە تێگەیشتنی خۆم، ئەو نیو دینارەش دەچووە باروبووی جەنگەوە.

تەق..تەق

چوومە ژووریَ، سەریهەڵبڕی:

+ تۆ کەریم کاکەی؟

- بەڵێ

+ دانیشە.

دانیشتم، ئۆجا لێرەوە با لە زاری مامۆستاوە سەربردەکە ببیستین کە دوای سی و شتێ ساڵ بووری بە سەر بەزمی نیودینارەکە، لە دیداریَ بۆی گێڕامەوە:

کاتێ تەماشای لیستی ناوەکانم کرد، لەو هەموو قوتابییە تەنها دوو کەس نیو دینارەکەیان نەدابوو، لە راست ناوێکیان نووسرابوو: نیمە

لە راستە ناوەکەیدی: نایدەم.

(نیمە) ئاساییە، لە باتی وی من دەیدەم، بەڵام (نایدەم) نائاساییە، باشە بۆ نایدات؟ لە سەر هەندێ گازمکردی و ویستم بزانم ئەو (نایدەم)ە کێیە؟

هاتی و دانیشتی و پرسیم:

تۆ نیو دینارت نیە، یاخود نایدەی؟

بێ منەتانە گوتت:

هەمە، بەڵام نایدەم.

گوتم:

ئەو بۆیاخکردنە بۆ خۆتانە، پۆلەکەتان جوان و خاوێندەبێتەوە.

گوتت:

وایە، بەڵام ئەوە لە سەر حوکمەتە بیکات، نەک لە بەرکی ئێمە.

گوتم:

خۆت دەزانی حوکمەت لە شەڕدایە و ناپرژێتە سەر...

گوتت:

حوکمەتێ توانای کڕینی ئەو هەموو فرۆکە و مووشەک و چەکوچۆلەی هەبێ، ئەو هەموو خەرجیە بکات، پارەی سێ قۆدیە بۆیاخی لە بەرکی نیە؟

کاتێ وات گوت، هەستمکرد لە بەرانبەر قوتابییەکی ئاسایی نیم، بۆیە گوتم:

برۆ هیچمان لە هیچ.

لێرە گێڕانەوەی مامۆستا تەواو، من لێی وەردەگرمەوە:

باوەڕم نەهات، وا بە سانایی بەرێمبکات، تا چەند رۆژێک دڵم لە ناو دەستم بوو، دەمگۆ بە داومەوە دەکات، هەرچەندە دەیانگۆ:

مامۆستایەکی پاکە و شتی هۆسا ناکات.

بە لام دڵی من وای نەدەگۆ، درەنگتر، پێکەوتم چەند دڵسۆز و پاکە، بە تایبەتیش لە دەمی خۆپێشاندانەکان، بۆم دەرکەوت چ کەسێکە، چ مێرخاسێکە.

مامۆستایەکی قسەخۆش و بەرێز بوو، پەیوەندیی هاوڕێیانەی دەگەڵ قوتابیان بەستبوو، لە ترسەوە نا، لە خۆشەویستیەوە، کەس لە قسەی دەرنەدەچوو، لە گفتار و رەفتاری، رێک پێچەوانەی ئەو مامۆستایە بوو، کە بووە سۆدرەی رزگاری، ئەوەی هاتبوو پیاومان بکات! تا لەبیرمنەچووەتەوە با شتێ لەویش بگێڕمەوە.

## مامۆستا
## پیاوکردن و...

رزگاری سەرکێشە و ملدەنێ و ملنادات، میری دەخەبتێ کەمۆی بکات، تێدامایە، بە چ رستێ رستی بکات، هەر جارەی پەنا بۆ رێیێ دەبات. ئەوە بەرێوەبەریشی گۆڕی، رەنگبێ وای بۆ چووبێ، بەشێ لە سەرکێشیەکە لە کەمتەرخەمی و شلی بەرێوەبەرەوە بێ، با تازەکە بناسین:

بەرێوەبەری تازە، تەژە زەلامێکە، بە سامە، قەڵەوی چوار شانەی تەنگەستوورە، باسکی دەڵێی ئەستووندەگە، پیاوێکی رەشتارەی چاو کەس نازانێ چ رەنگە، قاتی بەری لەو رەنگەیە کە هەنگینێ خەڵک لێی دەرەوینەوە، لەوانەی کەس زاخی نەدەکرد چاو لە چاویان ببڕێ. چاودەنێ، قوتەدارێ بە دەستەوە، قۆڵی کردۆتەوە، ئەفسەرانە دێ و دەچێ، لە ناو ساکەگۆڕەکە روو لە چەند قوتابیێ:

تا ئێرە و بەس، بەرەلاییتان بۆ ناچێتە سەر، پیاونەبن، پیاوتان دەکەم.

ئەو پیاوە دەڵێی زمانی بە جوێن پڕاوە، ئەو هەمووی جوێنەی لە کوێ هێناوە؟ بە رێوە جوێنی لێ بەردەبێتەوە.

بەرێوەبەر تەواو شوولی لێ هەڵکێشا، بینیبوویان ناوە ناوە قۆڵی قوتابییەکی دەگرت و دەیبرد، لە هۆدەکەی خۆی دارکاریەکی باشی دەکرد، بە پاشۆلێ جوێنی پیسەوە دەینادەوە. بەرێوەبەر پێدەچوو وای بۆچووبێ، چی بوێت بۆی بچێتە سەر، بە ئاشکرا و بێ بەردە دەیگۆ:

رزگاریی پێش من بەسەرچوو، جێی سەرسەری و بەرەلای لێ نابێتەوە، من هاتووم پیاوتان بکەم.

رستەی (پیاوتان دەکەم) رستەی سەر زاری وی بوو، هێندەی دەگوتەوە، قوتابیانیش لێیان وەرگرتەوە، لە بەر خۆیانەوە بۆ ئەویان دەگوتەوە، وای

لێهات، ناوی بووە پیاوتان دەکەم. دێ بزانین کێ کێی پیاوکرد! داخوا رزگاری بەو هەموو سەرکێشیەوە دەستەمۆی قوتەداری دەبێ؟

رزگاری پڕە، زۆر پڕە لە پیاوتان دەکەم، پەنگدەخواتەوە، هاکا سەریکرد. نەمگوت! لە هیکەوە، دەنگێکی حێڵ بە بنزاری خۆشناوان:

مدیرن ناوێ.

کوڕانی رزگاری وەکات بە یەک دەنگ لێیان وەگرتەوە:

مدیرمان ناوێ.

لە ساکەگۆڕەکەوە (نامانەوێ، نامانەوێ...)بەرزبۆوە، لە سەیداوە دەنگیدایەوە، ئیدی رزگاری (پیاوتان دەکەم)ی ناوێ، بزانین دەگاتە کوێ؟

تا هەینێ نەمدەزانی هێندە ساویلکەیە، ئەها هاتە دەرێ، قۆڵی کردۆتەوە، بە جوێنەکانی خۆیەوە بەرەو ناو گردبوونەوەکە دەچێ، دەیەوێ بە هەڕوگیڤ دەنگی (نامەوێ...) قیرەبڕبکات، رزگاری کە گوتی: نا، نایە و دەبڕێتەوە، روو لە (پیاوتان دەکەم):

لۆ دەرێ، لۆ دەرێ...

لە ناو دەنگەدەنگ و لۆ دەرێوە، دەنگێکی گەورە:

لێیدەن، بیکوتن، پیاوی بکەن...

وا دیارە پیاوتان دەکەم باوەڕ بە چاو و گوێی خۆی ناکات، ئەوەی دەیبینێ و دەیژنەوێ، لەگینە خەون بێ! باشبوو زوو تێگەیی، یەکپێ هەڵات، قوتابی بە جوێنی پیسەوە، لە شێوەی ئەو جوێنانەی رۆژانە لە زاری پیاوتان دەکەمەوە بەردەبوونەوە، کەوتنە دوای، تا هەینێ رووداوی وا رووینەدابوو، ناخر کێ دیبووی، قوتابی بەو هەموو جوێنەوە بەرێوەبەر راونێ؟! ئەوە روویدا.

ئەسغەرە فەندی گەیشتێ و هاواریکرد:

جوێن مەدەن، شەرم بکەن، جوێن مەدەن...

کەس گوێی نەدایە ئەو شەرمە، پیاوتان دەکەم خۆی گەیاندە هۆدەکەی و دەرکەی لە سەر خۆی داخست، قوتابی هێرشیان برد:

وەرە دەرێ، نۆکەر، وەرە دەرێ گەواد...

سێ چوارێ لە گژن دەرکە بشکێنن، مامۆستا ئەسغەر هات، پشتی بە دەرگاکە دا، دەستی بە شیپانەوە گرتووە و دەڵێ:

تا ئێرە و بەس، ئەگەر دەتانەوێ لەو بدەن، لە پێشدا لە من بدەن.

من کە گوێم لەو قسەیە بوو، یەکسەر کشامەوە و دوورکەوتمەوە، بەڵام هەندێ قوتابی وازیان نەدەهێنا، هەندێ مامۆستا هاتن و قوتابیانیان دوورخستەوە، لەپڕ جوێن گۆڕا بۆ:

ئەی رەقیب هەر ماوە...

رزگاری وایە، هەر زار هەڵێنێ، ئەی رەقیبێکی تێدایە. زۆری نەبرد، پەروەردە و جڕوجامشت پێوەربوون، زۆریان رێسا، بەڵام تەنها یەک رستەیان لە رزگاری بیست، رزگاری لە قسەی خۆی نەهاتە خوارێ:

نامانەوێ، ئەو بەرێوەبەرەمان ناوێ.

چابوو تێگەیشتن کە رزگاری رزگارییە، رۆیشتن و بەرێوەبەریان لەگەڵ خۆیان برد و چاوی بە رزگاری نەکەوتەوە، رزگاری ئەو جارە بردیەوە، بەرەو بردنەوەیەکی دی.

لێرە لەجێتر نیە، جێی پەڕە کاخەزەکە بکەمەوە، ئەو پەرە کاخەزەی لە چ پەڕە کاخەزان ناچێ، شێخ جەلال گۆتەنی:

پێدەچێ دەستی لەمەچێترانی لە پشت بێ!

پەڕە کاخەزێکە دەڵێی گوڵی گوڵەبەڕۆژەیە، بەڵام لەگەڵ رۆژ نا، لەگەڵ تیشکێ چاو دەسووڕێ، پەڕە کاخەزێکە کتومت دەموچاوی مامۆستایە، لە گەڵ زەنگێ دەرێ بزر دەبێ، لەگەڵ زەنگی ژۆرێ وەدەردەکەوێ.

تۆ چاودێ، چ لادیوار و سووچێکی رزگاری نیە، کەتیرەی پێوە جێنەمابێ. ئەها، دێن لێیدەکەنەوە، ونجڕونجری دەکەن، پارچەی گەورەی کەرتکە وشەیەکی لێ نامێنێتەوە، دەڕۆن، چاویان بزر دەبێ، هێندەی پێناچێ، هەمان پەرە کاخەز لە شێوەی پێش دڕانی لە شوێنێکی دی دەبریسکێتەوە و گازتدەکات:

وەرن، بمخوێننەوە.

ئەوەی پێڕانەگەیشتبوو بیخوێنێتەوە، دەپرسێ:

ئەوە چیە ئەو شتە؟

ئەز دوو سێ جار خوێندمەوە، دەستنووسە، خەتەکە نە زۆر ورد نە هێندە درشتە، لە شێوەی دەمەتەقێیە، کێش و سەرواداره، باس باسی ڕاگواستنی هەردوو مامۆستای بیرکاری و دیرۆک، باسی بەڕێوەبەری غەدارە، شرتوشۆی ئەمن و مەمنیشی شکاندووە.

پەڕە کاخەز دیارە چەندان دانەی لەبەرگیراوەتەوە، وێدەچێ لە دیواردان بە هەرەوەزی بێ، ئەگەر لەمەچیترانیش بێ! بە تاقە کەسێ ناکرێ و زوو دەگیرێ، ئەوە سەری چەند ڕۆژە، پەڕە کاخەز واز لە ڕزگاری ناهێنێ، کێشمەکێشی لێکردنەوە و لێدانەوە، درێژەی کێشا.

ئەز درەنگتر پێکەوتم، ئەو نووسینە کێش و سەرواداره، هی ئەو کوڕەیە کە ناوی یەکەم خەلیفەی موسڵمانانی لێبوو، بەڵام (هێور)ێکی نەرمی بە خۆیەوە نابوو، ئەو ئەبوو بەکر سدیقە، سەر بە ڕێبازی مەلا مستەفا بوو، ڕەمەزانێک و محەمەدێک وئەوانە بە دیواریانەوە هەڵواسیبوو.

ئەوجا بەرێ خۆ دێ، دوای تەمەنێ لە بەزمی پەڕەکاخەزی پشت بە کەتیرە، بیستمەوە، دانەیێ لەو دەمەتەقێیە سەرواداره، کەوتبووە دەستی مامۆستا ئەسغەری جێنشینی بەڕێوەبەری هەینێ و لە شێوەی یادەوەریەکی دەقونووشتکراوی جوانی ڕزگاری پاراستوویەتی.

## مامۆستا

## دیرۆک و بیرکاری

گێڕانەوەی سەربردە، سەربردەکانی رزگاری پاش و پێشیان تێدەکەوێ، ئەوەش هەندێکی بۆ لەبیرچوونەوە دەگەڕێتەوە، هەندێکیشی وا بەستەی هونەری گێڕانەوە. هەرچۆنێ بێ لەو دوو ساڵەی رزگاری، هەر سەربردەیێ خۆی بە دەستی گێرانەوە بدات، دەیگێڕمەوە. با سەربردەی گواستنەوەی دوو مامۆستاکە بکەوێتە ئێرە، ئەوەی هەرایەکی گەورەی نایەوە:

دوو مامۆستای هەڵبژاردەیان هەڵبژارد، دوو مامۆستای وا، رزگاریی تاساند، لەو دەمەی ساڵ بۆ گواستیاننەوە؟ مامۆستای دیرۆک، محەمەد ئیسماعیلە، کەس نیە نەیناسێ، لە گێڕانەوەی منیش ناوی زۆر هاتووە، هاندەری خۆپیشاندانە، کاتی خۆشی سێ چوار ساڵەکەی خۆشی، سەردەمی مەلا مستەفا دەڵێم، بەرێوەبەری پەروەردە بووە، زۆر دواتریش دوای رزگاری، بووە جێگری وەزیر، بەلام پێنەدەچوو شتێکی ئەوتۆی لە دەست بێ، ئێ، لەوە گەڕێ.

مامۆستاکەیت ری رزگاری مامۆستای بیرکاری، ناوی وی جەلال عەلی شایە، لە وانەی خۆی گەلەک شارەزا و بەتوانایە، کەسێکی شیرن و رێزدارە، تەنها زیرەکەکان نا، ئەوانەی لە بیرکاری بیرکۆریش بوون، حەزیان لە وانەی وی دەکرد، بەر لە بەسەرکردنەوەی سەربردەی گواستنەوەکە، سەربردەیەکی خۆم دەگەڵ ویم بیرکەوتەوە:

لەمێژ نەبوو هاتبوو، هێشتا نەیزانیبوو بۆ من هاوکێشەی بیرکاری لە ئاوخواردنەوە ساناترە، لە تاقیکردنەوەی مانگانە پرسیارێکی هێنابوو، من بە رێیەکی جیا لە هی ئەو لێکمدابۆوە و گەیشتبووە هەمان ئامانج، لە کاتی وەرگرتنەوە، پەڕەکاخەزی منی لای خۆی هێشتەوە و گازیکردم:

+ ئەو ڕێگایە لە کێ فێربووی؟
- لە کەس، هەر لە خۆوە لۆم هات.
+ پرسیارێکی ترت بدەمێ، دەتوانی هەمان ڕێگا بەکاربێنی؟
- لەگوینە.
پرسیارێکی دامێ و گوتی:
دەی بزانم، جغارەکەی نیوە نەکردبوو، دامەوە دەستی، خوێندیەوە و چاوی لە چاوم بڕی و گوتی:
+ پرسیارێکی تر...
- با بێ.
دووەمیانم لە یەکەمیان زووتر وەڵامدایەوە.
دەستی خستە سەر شانم و گوتی:
+ تۆ بۆ نەچوویە بەشی زانستی؟
- حەزم لە وێژەیی بوو.
دیاربوو نمرەی بۆم دانەنابوو، سەدێکی جوانی دامێ.
مامۆستای بیرکاری جغارەکێشانیشی گەلەک جوان لێدەهات، گەلەک شیرنی دەکێشا، من لە هەینێوە تا بەو ڕۆژە دەگات، نەمدی کەس وێنەی وی ناسک مژ لە جغارە بدات. ئەها، دوایوەی تەختەڕەشەکە پڕدەکاتەوە و لە سپیی هەڵدەکێشێ، خێرا پاکەت و چەرخەکەی دەردەهێنێ، پەنجەرەکە لادەدات، ڕوو لە باخچەکە، جغارەیێ پێدەکات، مژی قووڵ زۆر قووڵ، لە ماچی قووڵ دەچێ، وەک ئەوەی زاری گەیشتبێتە لێوی کۆنە یار، بیرمە چەند کەسێ بە کێشانی مامۆستا، فێرە جغارەکێشان بوون، من هێشتا فێرە جغارە نەبووبووم، جاروبار لە جوانیی لێو و جغارەی وی، دوای زەنگی دەرێ، دەچوومە ناو کۆڕی جغارەکێشان، بەردەمی ئاودەستەکان، جغارەیەکم بە با دەکرد. ئاودەستیش سەربردەی هەیە، ئەگەر بیرمکەوتەوە، دوایی دەیگێڕمەوە. ئێ، ئەوە هاوکێشە و جغارەی مامۆستای بیرکاری، وەڵامی پرسیارێکی مامۆستای مێژووش دەدەمەوە، تۆ بڵێ گرتەیەکی لا بەلایی، هەینێ دێمەوە سەر ڕاستەڕێی گێڕانەوە:

تاقیکردنەوەی نیوەی ساڵە، پرسیارەکە لە مەڕ ئۆسمانی و داگیرکاریەوە بوو، بۆچی لە هەرێمی موسڵماننشینان وا خێرا سەرکەوتن و زۆر مانەوە؟

چەندی کردم و کۆشام، وەڵامم بیرنەکەوتەوە، ناچار لە خۆوە دامە بەریێ، گوتم، هەر پڕ بێتەوە باشە، ئەوەی لەبیرمە، لە وەڵامدانەوە جەختم لە هاوئاینی و داگیرکەر و داگیرکراو و ساویلکەیی خەڵک کردبۆوە. لە دەمی کارت وەرگرتنەوە، دەبینم نمرەکەم لە سەری سەرییە، یەکەم جارمە لە وانەی وی نمرەی وا بەرز بێنم، ئاخر لە نمرە دەستقووچاو بوو! لە ناو پۆلێ گوتی:

قوتابی هەیە، وا دیارە شارەزای مێژووە و دەخوێنێتەوە، وەڵامێکی زۆر جوانم خوێندەوە، لە کتێبەکەماندا نیە و کەم مێژوونووسیش بە لایدا دەچن.

یەک دوو رستەی لە وەڵامەکەی من گوتەوە و گوتی:

کێ ئەو وەڵامەی داوەتەوە؟

پۆل چەند دەستی هەڵبڕی منیش هەر هێندە، بەلام دیتم مامۆستا تیچاوێکی لە سەر منە، هەستمکرد، هەستیکرد من بم، ئەریێ بۆ نەمگوت منم؟! وێدەچێ شەرمم کردبێ، نازانم.

ئێ، با بێمەوە سەر خەت، ئەو دوو مامۆستایە یەک لە یەکتر خۆشەویستتر بوون، رزگاری لە سەر سەری خۆی دانابوون، پەروەردەش ئەگەر شەڕی رزگاریی نەوێ، دێ بە گژ ئەوانەدا دەچێ، ئەوانە دووردەخاتەوە؟!

دەنگ بڵاوبۆوە: ئەو دوو ماۆستایەیان لە رزگاری گواستۆتەوە...

پەروەردە، چت لە خۆ کرد؟ دارت لە کونە زەنگەزۆرە وەردا! رزگاریت ورووژاند، ئەو جارەش لە سەر دەرگای هۆبەی وێژەییەوە رابوونەکە سەریهەڵدا:

**ع دەخوازی رزگاری؟**

**مێژوو لەگەڵ بیرکاری**

هێندەی بڵێی یەک و دوو، هەموو رزگاریی گرتەوە، رژانە ساکەگۆڕەکە، پڕ بە گەرووی رزگاری:

دەمانەوێ دەمانەوێ
محەمەد ئیسماعیلمان دەوێ، ئەو نەبێ کەسمان ناوێ.
دەمانەوێ، دەمانەوێ
جەلال عەلی شامان دەوێ، ئەو نەبێ کەسمان ناوێ.
دەنگێک لە هەموو دەنگان گەورەتر:
جەلال، جەلال، جەلال
جەلال نەبێ، کەسمان ناوێ
دەنگێک لەو حیلتر:
کاکە ناوی بابی بڵێ، با بە جەلال تالەبانی تێنەگەن، ئێمە ئەومان ناوێ.
زۆری نەبرد لە محەمەد و جەلالەوە گۆڕا بۆ ئەی رەقیب، رزگاری لە خوای دەوێ شتێ بقەومێ، ئەی رەقیبی سوارە و کۆڵان کۆڵان بە گەڕەکی سەیداوەدا بڵاوی دەکاتەوە، بە شاردا بڵاودەبێتەوە.
یەک دوو دەمژمێری نەویست، لە پەروەردەوە هاتن:
+ ئێوە بۆ وا دەکەن، چیتان دەوێ؟
- ئێوە بۆ وا دەکەن؟ مامۆستامان دەگوازنەوە...
+ مامۆستای باشترتان بۆ دەهێنین.
- چ مامۆستایێ ناگاتە، مامۆستا محەمەد ئیسماعیل و جەلال عەلی شا، ئێمە مامۆستای خۆمان دەوێتەوە.
+ باشە، دەگەڕێنەوە، بڕۆنەوە ناو پۆلی.
- تا هەردوو مامۆستا نەگەڕێنەوە، پێمان بە پۆل ناکەوێتەوە.
+ باشە، مەیکەنە هەرا و زەنا، ئەورۆ دەگەڕێنەوە.
بیرمە، کاتێ لە سەری کۆڵانەوە، مامۆستا محەمەد ئیسماعیل، دەرکەوت، رزگاری بە ئەی رەقیبەوە بەرەو پیری چوو.
هەینێ رزگاری، رزگاری بوو!
ماوەیێ لە رزگاری دوور دەکەومەوە، هەندێ گرتەی کۆن و نوێم بیرکەوتەوە، دوایی بە خۆپێشاندانەوە دەگەڕێمەوە.

## دوو ئاگری گەورە

لە منـــدالّیی مـــن دوو ئـــاگری گەلەک گەورە هەن، لەبیرنـــاچنەوە و ناکوژێنەوە، بۆنی دووکەڵیان دێت و بڵێسە دەدەن. یەکیان لە قرشە و دەغڵ و دانەوە، ئەوی دی لە دار و حەسـیرەوە. ئاگرێکیـان زووە، هێشـتا پیـری سوارچاکان بە گۆچانەوە لە ناومان مابوو، بەڵام لەساڵی ئاگری دووەم سێ ساڵ دەبوو، ماڵی خۆی بردبووە هەواری خامۆشی سەید مارف. دووکەڵەکە دەڵێی ئەوڕۆیە، بە هەناسەبڕکێوە:

کوڕە باپیرە، هەستە، ئاگر هات.

پیری سوارچاکان دەستی دایە گۆچان:

کوڕم کوا ئاگر، ئاگری چی؟

پێڵاوەکەیم بۆ هێنا و گوتم:

دووکەڵەکەی نابینی؟ وا گەیشتۆتە بن ئاسمانێ، دەی زوو پێڵاوەکەت لە پێ بکە با هەڵێین.

پیری سوارچاکان چاویلکەی ڕێکخستەوە و چاوی دایە راستی پەنجەی من کە بۆ راستی دووکەڵەکەم درێژ کردبوو:

نابینم، چ دووکەڵ نابینم، وێدەچێ گەلەک دوور بێ.

گوتم:

نا، باپیرە، دوور نیە، هەوکە دەگاتە ئێرە.

گوتی:

لە کوێیە؟

گوتم: لە لای مەنتکاوەوە دێ.

گوتی:

کەمێ بحەسێوە، ئەوجا جامە ئاوێکم بۆ بێنە، با بیکوژێنمەوە.

جامه ئاو! سەرم سوڕما، ئەو ئاگرە کە دنیای داگرتووە، چۆن بە جامە ئاوی دەکوژێتەوە؟ چووم بادیێ ئاوم بۆی هێنا، هێشتا دڵم توند لێدەدات و هەناسەم ئاسایی نەبۆتەوە، ئاخر ئەنگۆ نازانن من لە کوێوە بەغار هاتووم! سێ چواری، کەویاریشمان لەگەڵ بوو، بەو گەرمایە لە نزیک تاقە دار خورمای باداوە وازیمان دەکرد، لە بەری مەنتکاوە باریکە دووکەڵی بەرزبۆوە، زۆری نەبرد، ئەو ئاقارەی داگرت، پیاوێک لە بەر خۆیەوە:

پەکوو، پەکوو، زوو نەیکوژێننەوە، دەگاتە ئێرەش.

ئێمە ترساین و هەڵێ، لە پێش مەزاری سەید مارف پلکە عەیشێی مجێور، نەرم نەرم لە سینگی خۆی دەدا، گوێم لێبوو، گوتی:

بەری پێنەگرن، دەگاتە گۆڕستانیش.

بە جاری زراوم چوو، ئاخر بگاتە سەید مارف، دەگاتە ماڵی ئێمەش، نیوانمان هەشت نۆ دە دارتێلە، هەڵێ، دووکەڵ بەری ئاسمانی گرتووە، تا دێ نزیک دەبێتەوە. لە بیرمان بێ، هەینێ نێوان بەلاشاوە و مەنتکاوە چۆلەوانی بوو، هەمووی دەغڵ و دان و پووش و پەلاش بوو، کەویار لە من خۆشتر دەبەزی، ئاوڕی لێم دەدایەوە و دەیگۆ:

خێرا، با پێش ئاگرەکە بگەینەوە ماڵێ.

ئێمە دڵنیابووین، ئاگرەکە دەگاتە گەڕەکێ مە و دەبێت تا زووە خۆ دەربازبکەین، هەر یەکەمان بە هەواڵی ئاگرەوە چۆوە ماڵی خۆی.

پیری سوارچاکانی باپیرم کە لە سەر دەرگای حەوشە دانیشتبوو، جامە ئاوەکەی لێوەرگرتم و گوتی:

ها، دوو قومە ئاو بخۆوە.

گوتم:

چما....

گوتی:

کوڕم، مەترسە، ئەو ئاگرە ئەگەر وەک دووکەڵەکەێ بە ئاسمانیشدا بێت، ناگاتە ئێرە.

یەکسەر باوەڕم هات و ئاهێکم وەبەر هاتەوە، ئاخر نە من نە کەس

درۆیان له پیری سوارچاکان نەدیتبوو، دەمویست بچم هەواڵی نەگەیشتنی ئاگر بە گەڕەک و کەویار بڵێم، ئەو بە پێکەنینەوە هات و گوتی:

ئێمە لە خۆڕا ترساین.

ئیدی لە دوورەوە بە دیار دووکەڵ و ئاگرەوە دانیشتین، ئەو ئاگرە ئاقاری تەبارە و پەرێز و ڕەجۆخینی کردە خاکێکی سووتماک، ئاگرکوژێنەوە نەگەیشتبا، لەو ناوە گوڵە گەنمێ دەرنەدەچوو، بیرمە خەڵک دەیانگۆ:

دەستێکی گەورەی لە پشتە.

ئاگری دووەم، دووکەڵی نا، بڵێسەی وا لە ئاسمانە، هەر من نا هەموو وا تێگەیین، قەڵات گڕی گرتووە، تۆپەڵێ ئاگرە و شاری کردۆتە چراخان، بەر لە ئاگرەکە شەماڵێ هەڵیکردبوو شەوی سەر بانی بە کوێستان کردبوو، بەڵام دوای ئاگرەکە شەماڵ گۆڕا بۆ هوڕە، لەو دوورەوە هەستمان بە گەرمایی ئاگرەکە دەکرد، بابم دەڵێ:

سەر قەڵات نیە، ناو دارفرۆشانە.

وێدەچێ ئەوێ بێ، دارفرۆش لە کوێن؟ پشت شێخەڵا، نێوان گۆشتفرۆش و فیتەران، ئەو ناوە هەمووی کەپر و کاریتە و شەقرە و حەسیرە، ئەو شوێنە ئاگری گرتبێ، ئەوەی دیتبێتی، دەزانێ نەک بە ئاگرکوژێنەوە، بە هەوری بەهاریش ناکوژێتەوە، دەزانی چی تێدایە!

ئاگر تا دێ بڵێسەدارتر دەبێ، وا دیارە کەس لەگژ نیە بیکوژێنێتەوە، بەلاشاوەیی هەموو لە سەر بانەوە، ڕوو لە ئاگر ڕاوەستاون، دایکم دەڵێ:

تا دێ نزیک دەبێتەوە، نەگاتە ئێرە!

بابم باگۆی دەداتەوە:

ئەگەر بن زەوی و زەوی بێ، دەنا چۆن دەگاتە ئێرە!

بابم زوو وای نەگوتبا، بە قسەی دایکم ترسم لێ دەنیشت، حەزمدەکرد بگەمە لای کەویار و فازیل ڕیحانە و پێیانبڵێم:

مەترسن، دوورە...

ماڵی کەویار و ڕیحانە هەموو لە سەر بان بوون، بەڵام وەک تارمایی دیار بوون، نەدەناسرانەوە.

ئـاگرەکە زۆر درەنـگ کـوژایەوە. دواتـر بیسـتمەوە، ئەو ئـاگرە دەسـتی شارەوانیی تێدایە، نازانم راست بوو یان دەنگۆ، ئاخر دەمێ بوو هەوڵیاندەدا ئەو دارفرۆشـــانە ئەو جێــیە چــۆل بــکەن، ئەوانــیش پێیــان چەقانــدبوو هەڵنەدەقەنـان. ئەوە بـوو دوای بە خۆڵەمیشـبوونی دار و حەسـیر، دارفـرۆش بە کاریتەی نیوە سووتاوەوە هاتنە دەرێی جادەی سیمەتری، بەری سـێتاقان. دواتـر زۆر دواتر سـووتانی لەو شـێوە بووە پیشـە، سـووتانی چەنـد جـاری لەنگەی جێی پێشانی بن لەیلووکان و ئەوانە.

## پیاوه بەوەجەکەی بەستی شەرغە

بابم بۆ زۆر جێ منی دەگەڵ خۆی دەبرد، جار هەبووە جێیەکە یان کەسەکەم بە دڵیش نەبووە، بەڵام لە بەر دڵی وی چوومە، ئەوەش بڵێم دوای دوامالاوایی پیری سوارچاکانی باپیرم، من پتر متووی بابم بووم، حەزمدەکرد هەمیشە لە تەنیشتی بم و سەری پەنجە بگەیەنمە بەرکی ساقۆ درێژەکەی. ئەورۆ بابم ناوی کەسێکی گۆ، ئەگەر نەشیبردبام، وەک کووتکووتە دەکەوتمە دوای و بە زۆریش لە دوای نەدەبوومەوە، ئاخر مەگەر هەر خۆم بزانم چەند تاسەی دیداری ئەو قارەمانە دەکەم.

ئەز پێشتریێ یەک جار لە تەنیشتەوە دیتبووم، لەو دیتنە بەو شێوە لە چاوی من خۆی نەخشاند، خۆ رەنگبێ بەو شێوەش نەبووبێ، لێ چاوی من وای نەخشاندبێ:

پیاوێکی تا دەست هەڵبڕی کەڵەگەت، رەشتارەیەکی خوێن شیرن، پژدێن پانی تیلاک خوار، برنۆیەکی لە شان بوو وێنەی خۆی بەژن زراڤ، بە گۆتەی گۆتیاری:

لەوەتەی برنۆی هەڵگرتووە، هەمیشە سێ خەریتەی بەستووە.

دوو لە پشتی، یەک بە سەر شان و سینگدا زەردەچۆوە.

تەنها ئەو جارە و بەو شێوەیەم دیتبوو تەواو، بەڵام هێندەم لە بارەوە بیستبوو، ئەگەر بیگێڕمەوە بە شەش شەوی مانگی سەرماوەزێ بنی نایێ، تەنها نەبەردییەکەی هەیڤی خەرمانانی دێی ئۆمەرەسۆر کتێبێکە:

نیوەڕۆیە، لە سەر نان خواردنن، منداڵێ بەپڕتاو خۆ بە ژۆرێدا دەکات:

خۆ دەربازکەن، حوکمەت هات.

دوو برا (خدر و قادر) وێکڕا، بۆ پێکەوتن غاردەدەنە سەربانێ، هەر لەوێ

سەرو گولله دەگرنەوە و لە خوێن دەگەوزێن و گیان دەسپێرن، ئەوجا نەبادا بابیانم لەبیربچێتەوە و نەیەتە ناو گێڕانەوە، با شکاتەکەی بگێڕمەوە:

دواتر، دوای کۆستکەوتنەکە، مام پیرۆت دادی خۆی دەباتە لای پارێزگاری شار، دەڵێ:

پۆلیس لە ختوخوڕا دوو کوڕی منیان کوشتووە.

پارێزگاری هەینێ، بەدرەدین عەلییە کێیە، پوختە دەیگرێ و دەست و پێی دەبەستێ، سێ چوار ساڵ لە زیندانێ دەپەستێ.

ئێ، هێزێکی گەورە لە پۆلیس و جاشپۆلیس و چەتەی ئاغایان، دەگەنە ئاوایی، چاوساغی ئەو هێزە کێیە؟ جاشی دڕ و گەورە، حەمەی سابیراغایە.

دیارە پیاوی سێ خەریتە، جاری یەکەمی نیە لێی بقەومێ و بکەوێتە داوەوە، دەزانی چۆن خۆی دەرباز بکات، بن دیوار و بن دیوار، بە کەلێنی گولله لە ئاوایی دەردەچن و دەگەنە دۆڵەکەی پشت ئاوایی و لەوێ دەچنە سەنگەرەوە و دادەمەزرێن.

ئێستا لەو ئاقارەی ئۆمەرەسۆرێ شەڕێکی تیرە، تیری تێناچێ، سەد تفەنگ تۆ بڵێ سێ سەد، شەڕی سێ تفەنگ دەکەن، سێ تفەنگی یاخی، یاخی لە ستەمی ئاغا و داگیرکاریی حوکمەت، سێ تفەنگی بێ منەت، بێ منەت لە خوێن و مردن.

قارەمانی شەڕی ئۆمەرەسۆر بە سێ دەنگا گاسدەکات:

ئامۆزا دەست بە فیشەکەوە بگرن، گولله بە هەوادا مەدەن، نیشانە لە نێوچەوان و لاچەپی سەر سینگ بگرن، بتانبینم و نەتانناسم، رۆژ رۆژی میرانە، ئاو، ئاو، دەست بە ئاوەوە بگرن، ناوە ناوە تەنها لێوتان تەڕ بکەن.

شەڕە، گەرمە شەڕە، لە نوێژی نیوەڕۆوە، وا دەمەو ئێوارەیە، هەر ئۆمەرەسۆریان بگێڕنەوە، سێ مێرخاسی دەورردراو چ شەڕێ دەکەن، چ نیشانشکێنێکن، پشتیان بە پشتی یەکتر داوە شەڕدەکەن جاش و جێژ هەترەشیان چووە و ناوێرن هێندە نزیکببنەوە. پیاوی بەژن زراڤی رەشتارە بەو هاوینە بە دەنگێکی حێل، حێلتر لە رەشەبای زستانێ و گرمەی هەوری بەهارێ و زرم و هۆڕ دەبڕێ و کەس نیە نەیبیستێ:

جاشـینه، دڵنیـابن، سـەت تەرمتـان دەکەویتە بـن پێمـان و ئـێمە هەر بە پێوەبن.

ئەو هەشت نۆ دە وشەیە، بە قەد هەزار گوللەی برنۆ ترس دەخاتەوە دڵی جاشانەوە، زراویان دەڕژێ و ناوێرن پتر بچنە پێشێ و هەڵکوتنە سەریان.

پیاوی سێ خەرِیتە، بە دەم تەقە کردنەوە، دەڵێتە سالحی ئامۆزای:

تۆ جغارەم بۆ بپێچەوە، لە جیاتی تۆش تەقە دەکەم.

ئەحمەدیلەی ئامۆزا دەڵێ:

جغارەیەکیش بۆ من.

خەڵکی ئاوایی دەگێرنەوە:

جاشـێ کە لە شـانی راسـتی حەمەی سـابیر سـەنگەری گرتـووە، حـاجی لەشـکریی نـاوە، بە شـوفێری ئەو پیکـابەی پۆلیسـان کە دۆشـکەی لە سـەرە دەڵێ:

باژۆ، راستەو راست رووەو ئەو یاخیانە باژۆ، با دەرنەچن.

شوفێر دادەبەزێ و روو لە حاجی:

وەرە خۆت باژۆ، من ناوێرم.

حـاجی لەشـکری قسـەی خـۆی قووتـدەداتەوە و خواخـوایەتی هەر وەک خۆی لێبێتەوە.

سـێ ئـامۆزا، سـێ تفەنگچـی یـاخی، بە سـێ مەتـارە ئـاوەوە، بە دەم جغارەکێشـان و شـەڕەوە، وا دیـارە چـاوەڕێی ئـاوابوونی رۆژ دەکەن، تـا لە تاریکیدا رێیەک بکەنەوە و لە چنگی مەرگ دەرباز بن، وا بوو، تاریک دەهات، سـێ مێرخاسـەکە بە شـەڕ کەلێنێکیـان لە لەشـکر کـردەوە و باڵیـان گـرت، جاشـیش بە سـەروگوێلاک خوێنـاوی و پاشـەڵ دڕاوی گەڕانەوە، ئەو شـەڕە لەو ناوە دەنگیدابۆوە، بەلام نازانم بۆچی نەکەوتە ناو لاوک و حەیرانەوە.

قارەمانی شەڕی ئۆمەرەسۆر، ئەو شەڕە یەکەم شەڕ و دواشەڕی نەبوو، هەموو تەمەنی لە شەڕی ئاغایان بەسەربرد، بەستی شەرغە دیدڤانە بە سـەر نەبەردییەکـانیەوە، بەسـتی شـەرغە، هەردوو بەری زۆر بـوێری لـێ هەڵکەوتـووە، بەلام کەمیـان دەگەنە ئەو بـوێرە، ئەو بـوێرەی کـوڕی دایکـی

خۆی بوو، بە موو لێی لانەدابوو، دەڵێن:

زوو، کوڕە تازە دەستی داری گرتبوو، دایکە تفەنگی دابووە دەستی و پێیگۆتبوو:

کوڕم، باش گوێ لە دایکی خۆت بگرە، ئاغا ستەمکەرە، تۆم بۆ شەڕی ستەم هێناوەتە دنیا.

ئەو دایکە مەگەر تەنها حاجی وسوو دەرۆستی گێڕانەوەی بێت، لە رۆخی بەستی شەرغە نەبەردیی ئەو دایک و کوڕە بە زمانی ئاو و با بۆ منداڵە کرمانجان بگێڕێتەوە.

سەربردەی ئەو کوڕەی کە هێشتا منداڵ بوو، دەگەڵ ئاغایان دە ملەدا بوو، بە من ناهێتە ڤەگێڕان، شەڕەکانی زۆرن و ناهێنە ژماردن، بە دەم رێوە، هەندێ لە شەڕەکانی ئەوە پیاوە وەبیردەهاتنەوەوە کە هی لە بیرچوونەوە نین:

کوڕانی ئاغا و تفەنگچیانی کە هەموویان تازە بووبوونە جاش، جاشی بەگەکەی لای شەقلاوێ، بە رەوەیێ جاشەوە لە پەلکەڕەشەوە دێن، لەپڕ بە سەرماڵیان دادەن، دەبێتە شەڕێ، گوللە بە گوللە دەکەوێ. بەرەی ئاغا زۆرن و ئەوانیش بە خەزاڵەوە شەش حەفت تفەنگچین، لە ژۆرێ و سەر بانەوە، سەنگەر لە جاش پۆلیسان دەگرن، شەڕێ دەکەن، کاوێزاغاش ناتوانێ بیخاتە ناو لاوکانەوە، تا دێ بازنەی گەمارۆ وێک دێتەوە، ئاغا بە دەنگێکی جاشانە هاوار دەکات:

خۆ رادەست نەکەن، سەگ و مریشکیشتان بە ساغی دەرناچێ.

لەو ساتە چەند گوللەیێ لە دەلاقەوە دێتە ژۆرێ، دایک وا هەست دەکات کوڕەکەی لە تەقەکردن ساردبۆتەوە، بە دەنگێکی ژنانە دەڵێ:

کەریمە ڕەش، دەڵێی دەترسێی! خودا یەکە نابێ بە دوو، دەست دابێنی، بە دەستی خۆم دەتکوژم.

کوڕ بزەیەکی بۆ دەکات:

دایە، دیارە کوڕی تۆ نیم، ببینە، ئێستا چ هێرەیەکیان پێدەکەم.

لە دەلاقەوە روو لە ئاغا و چەتەکانی:

تـا ئێستا بە نیـازی کوشـتن یەک فیشـەکم نەتەقانـدووە، پیـاو بـن، وەرنە پێشتر، خۆتان دەبیننەوە.

لەو شـەڕە، خەزاڵ، خەزاڵی براژنـی حـاجی کەریـم شـەڕێ دەکـات، مەگەر بەسـتی شـەرغە بیگێڕێتەوە، ئەو شـەڕەی نەکردبـا، پێنەدەچـوو شـەڕەکە وا بکەوێتەوە، دوورنەبوو وەک چۆن ماڵیان چوو، سەریشیان چووبا.

زۆر نابا، جاشپۆلیس دەشکێن و لە تەشکی خۆیان دەدەن و دەکشێنەوە، بەلام نـامەردانە هەرچێ مەڕومـالاتی مـاڵی حـاجی کەریمە، کە حەفت سـەد سـەرێ دەبـوو، پـێش خۆیـان دەدەن و جاشـەکانی پەلـکەڕەش و بەری شـەقلاوێ بـرابەش لە نێـوان خۆیـان دابەشـی دەکەن، بەوە حـاجیە کۆمۆنیستەکە لە بن دێت و دەکەوێتە سەر ساجی عەلی.

دایـک کـوڕەکەی بە کەریـمە رەش گـازدەکرد، ئەو رەشـە لای وی واتـای جوامێری بـوێری دەبەخشـی، مـن ئێستا لەگەل بـابم وا دەچینە دیداری ئەو کەریمە رەشە، بیرمە بابم گوتی:

لە سـاڵی حەرەس قەومیـان، کـاتێ لێرە لەو سـەیداوەیە، کۆمۆنیستەکان پەلاماری ئەو بنکەی پۆلیسەیان دا، حاجی کەریم یەکێ بوو لەوان.

کەریـمە رەش، حـاجی کەریمـی حـاجی وسـووە، هەنـدێ کەس بە پیـاوە بەوەجەکەی بەسـتی شـەرغە ناویـان دەهێنـا، ئەو پیاوە کۆمۆنیستەی دەبـوو بکەوێتە ناو حەیران و لاوکـان، نەکەوتێ، ویـدەچێ لاوکبێژانـی هەینێ هێندە خۆشـییان لە کۆمۆنیسـتان نەهـاتبێ و هاموشـۆی دیوەخـانی ئاغایانیشـیان کردبێ، بۆیێ بە لایدا نەچوونە.

لە سەر دەرگا گۆتمە بابم:

حاجی کەریم هەوکەش سێ خەریتە دەبەستێ؟

گوتی:

نا، لە سەر جێ کەوتووە.

لە سـەر جـێ کەوتبـوو، نەیتـوانی هەسـتێتەوە، لە سـەر تەنیشـتەوە چـاکوچۆنی کـرد و منیشـی مـاچ کـرد، وای شـاییم بەو مـاچە هـات، بـاوەڕم نەدەهات قارەمـانێکی وا مـن مـاچ بکات، هەر بە راست ئەو حـاجی کەریمەیە

چەندان ساڵە شەڕی ئاغایان دەکات و ملیان بۆ نادات؟ ئەوە ئەو سێ خەریتەیەیە کە حەمەی سابیر و هێزێ جاشپۆلیس و پۆلیسی شکاند؟

بەو نەخۆشیەش چ شکۆیەکی هەیە، تیچاوێکم لە سەریەتی، بە من بێ بیخەمە ناو چاومەوە و لەگەڵ خۆمی بگێڕم، پێشانی هاوڕێکانمی بدەم، لە بیرمە روو لە من گوتی:

تۆ چەند لە باپیرت دەچی، باپیرت پیاوێکی بوێر بوو، هی وا نەبووە و نابێتەوە.

هێندەی نەمابوو باڵ بگرم، لەوە خۆشتر دەبێ چ بێ، قارەمانێکی وا بە باپیرمدا هەڵبڵێ؟

حاجی کەریمی ناو جێ، لە چاوی من هەر ئەو پیاوەیە کە ئەو جارە لە تەنیشتەوە دیتم، سیمای نەگۆڕاوە، بەلام ئێستا نە فیشەکدان ماوە، نە برنۆ، ئێستا لە جێ کەوتووە و نەرمە کۆخەیەکی لێیە، ئاخ بۆ رابردوو هەڵدەکێشێ:

چوو، ئەوەی هەبوو، هەمووی چوو.

بابم دەڵێ:

ماڵی دنیا هیچ نیە، تۆ بە مەردی تا ئێرەت هێنا و بۆ کەست دانەهێنا.

حاجی کەریم:

خەمی من ماڵی دنیا نیە، ئەو خەمە دەمکوژێ، ئەوان سەرکەوتن و من دۆڕام.

دیارە باری کەوتە لێژی و باری ئاغایانی نەبرد و گوندی بەجێهێشت و لە چ جێیان جێی نەبۆوە، ئەوەتا هاتۆتە شار و لەو کەلاوەیە کەوتووە.

ئێ، با هێندە درێژەی نەدەمێ، بیرا من دێ، بابم گوتی:

حاجی، گوێ مەدێ، تێدەپەڕێ، شکۆی تۆ بەو ناکەسانە ناشکێ.

حاجی هەناسەیەکی هەڵکێشا و دایەوە، کێوی لە بن دەهێنا:

کاکە، نە گوند کوشتمی، نە برسێتی، نەگوللەی ئاغا و جاشپۆلیسان، بەلام ئەو تیرۆگە دەمکوژێت، تیرۆگی نامەردی.

بابم:

وا مەڵێ، تۆ ناکەویت.

حاجی کەریم:

دڵنیام لەو کەوتنە قیت نابمەوە.

تیرۆگی نامەردی لە جێی خست و دەیکوژێت! ئەوە چ تیرۆگێکە؟ سەری سەربردەی تیرۆگەکە بکەنەوە و بزانم ئەو نەفرەتیە چیە وا ئەو قارەمانە دەکوژێت، هەستاین و تیرۆگ نەهاتەوە ناو قسە و باسان، دوا قسەی ئەو دانیشتنەم لەبیرە، قارەمانی لە جێ کەوتوو گوتی:

زۆر کەس لە سۆنگەی منەوە تووشی کێشە و ماڵوێرانی بوون، لە خۆم خۆش نابم، پیرۆت و دوو کوڕە جوانەمەرگەکەیم لە ناو گۆڕێش لە بیرناچن.

لە ڕێیێ بابم، بە کورتی سەربردەی تیرۆگی بۆم گێڕایەوە:

لەو رۆژانە حاجی کەریم بە تراکتۆرەوە ڕێی دەکەوێتە گەڕەکی پشت دارفرۆشان، نزیک ماڵی ئاغای پەلکە ڕەشێ، دیارە ئاغا لە کونێکەوە دەیبینێ و نەخشەی خۆی دادەڕێژێ:

لە پڕ کۆمەڵێ ژن و منداڵ، بە دار و خاکەناس و تیروگ، پەلاماری دەدەن، دەستی لێ ناپارێزن، ئەویش چ تێناگات کێشە چیە و بۆچی لێیدەدەن، هێ لە هەندێش پێی شەرمە دەست لە ژن ومنداڵ بەرزبکاتەوە، هەر چۆنێ بێ خۆی لە دەستیان رادەپسکێنێ و بە سەرشکاوی و لەشی بە خوێنەوە خۆی دەربازدەکات.

دوایی پێدەکەوێ، ئەوە فیتی ئاغا بووە، بۆ شکۆ شکاندنی، ئەو کۆڵانە ژن و منداڵەیان تێبەرداوە.

زۆری نەبرد، قسەی حاجی کەریمی حاجی وسوو، پیاوە بە وەجەکەی بەستی شەرغە، قارەمانەکەی ئۆمەرەسۆر و بنکەی پۆلیسی سەیداوە، نەیاری سەرسەختی ئاغا و جاش پۆلیسەکانی، ڕاست دەرچوو، تیرۆگ کوشتی.

## شێخ و نەبی

لێرەو لەوێ هەندێ گرتەی کۆن و نوێ، نوێ بۆ هەینێ، لە شێوەی تارمایی خەون دەردەکەون و بزردەبنەوە، ئەو چەندەی لە بینایيم دەمێننەوە پیشانیاندەدەمەوە:

هەینێ سەردەمی منداڵیی مە، چوونە سەر نەبی یوونس کە لە دڵێ خۆ ناوم نابوو نەبی حەلوا، من دەڵێم نیوە حەج، تۆ بڵێ حەجی تەواو بوو. ئەو پەیامبەرە دەڵێم کە لە قورئانێ سوورەتەکی بە ناوە، چەند رۆژەکیش لە ناو زگی نەهەنگێ خۆی حەشارداوە، ئەوەی کە دواتر رەوتێکی ئیسلامی کە داعشیان دەگوتی، تەقاندیەوە و کردیە تۆز وخۆڵ و بە سوورەت و نەهەنگەوە بە ئاسمانی ئێخست.

دایکم دوو سێ جار ئەو حەجەی نەبیی ماڵ لە نەینەوای بە منیش کردووە، حەجێکی شیرین، پڕ لە ئەستووکی گەرم و حەلوا و شیرینی. من تەنها لە ماڵی ئەو پەیامبەرە حەلواییە تێر حەلوا دەبووم. ژن لە هەموو دنیاوە بە حەلواوە، حەلوای نەینەوا کە حەلوای چ جێ خۆی نەدەدا لە حەلوای وێ، دەهاتنە وێرێ. چەند خۆش بوو کاتێ عەبایان لە خۆ دەکردەوە و لە ناو زەمبیلەوە حەلوای زەرد و ئەستووک دەکەوتنە گۆڕێ.

بەر لەوەی گرتە گرتە، گوتە گوتە، ماڵی پیرۆزی نەبی یوونستان پیشانبدەمەوە، واچاکە شێخەکەی سەر رێگاش بناسین. ئێمە کە لە هەولێرەوە دەچووین، پێش نەبی، شێخ دەهاتە پێشێ، ئەو شێخەی ناو گوڕێ، لەو گۆڕە لە ئێمە دەبووە شەیتانی ناو قورئانێ، دەبوو بەردباران بکرێ. لە ناو ترومبێلێ بەرد نەبوو، بەڵام تف و قسەی بەردینی زۆرە، تا لێی رەتدەبووین، شەیتان ئاسا بە نەفرەتمان دەکرد. بۆچی؟ گوایە ئەو شێخەی لۆلانێ، ناوەکەی لە سەر زارمە، لە کوردایەتی لایداوە و خەتی جاشایەتی

نیشانی کوڕ و کەسی خۆی داوە، چوونەتە شەڕی پێشمەرگەوە. لەوەوە، لە هزری ئێمەی منداڵەوە، شێوەی شەیتان دەگرێ و پێویستە بەردباران بکرێ، ئیدی لە ناو تڕومبێلەوە تفی کوردایەتیمان خڕدەکردەوە و بۆ شێخمان هەڵدەدا! هەر لە خۆڕا شێخمان لێ بووبووە شەیتان!

دەگەیشتینە یوونس پێغەمبەر، تۆ بڵێ حەج، لە دایکمم بیستووە:

حەفت جاری سەر نەبی یونس، بە جارێکی سەر گۆڕی خۆشەویست هەیە.

کاتێ حەفت جارەکەی تەواوکردبوو، گوتبووی:

من ئێستا حاجی بەسێم، بەڵام بە خۆم ناڵێم حاجی.

نەبی یوونس جێیەکی دڵڕفێن بوو، لە خڕ لاوە ژن بە عەبا و بێ عەباوە، بە منداڵ و نان و حەلواوە، دەهاتنە سەر مەزاری نەبی یوونس و دەکەوتنە نزا و پاڕانەوە. لە بن کێلی یوونس، ژنی وا بە دەنگی وا دەپاڕایەوە، بەردی دەکردە ئاو، شاتکە شێت گۆتەنی:

شەیتان گوێی لێبێ، نەرم دەبێ.

من کەمێ هەراشیش بووبووم، لەوێ لە سەر مەزاری پێغەمبەری ناوی زگی نەهەنگی، هەر قسەیەکم لە بارەی ئەوەوە دەبیست، لەوێ نازانم بۆ خۆشباوەڕ دەبووم، بووبوومە مام شاکری سابوونفرۆش.

مادام ناوی هات، شتێ لەو شاکرە پێشاندەدەمەوە.

## مام شاکری سابوونفرۆش

سەردەمی بەریَ بەر لەوەی شار خێل پێیدا برِی، پارت جوانییەکانی بەریَ، زۆری خەڵک سادە و خۆشباوەرِ و لە درۆترس بوون، بەڵام کەس نەیدەگەیشتە مام شاکری سابوونفرۆش. ئەو پیاوە چەند قلە سابوونێکی دەخستە سەر دەستان، سابوونی دەستوچاو نا، هی کۆڵیَ، لە ناو قەیسەری و دەوروبەری، کۆلان کۆلان دەگەرِا، بە دەنگێک کە شەکری لێدەباری:

سابوون، وەرنیَ، وەرنە سابوونی حەلەبیَ.

مام شاکر نە درۆی دەزانی، نە باوەرِی دەهات شار درۆی تێدا بیَ، بۆیَ هەرچیت گوتبا، وەکات باوەرِی دەهات. رۆژێک پیاویَ لە سەرە کۆلانی گەرماوی عەلمۆدە، هەر بۆ خۆشی:

+ مام شاکر، چما هەر لەگژ سابوونی؟

– ئیَ چ بکەم؟ نانەکە لە سابووندایە.

+ کورِە نانی چی! دنیا ناگاتە شەویَ، هێواریَ قیامەتە.

– ماخرا، ئەدی لۆ زوو وات نەگۆ؟

مام شاکر هەر لەویَ سابوونەکانی بە سەر ژنانی رێی گەرماویَ دەکاتە خێر و دەڵیَ:

نزای چوونە بەهەشتێم لۆ بکەن.

چێشتانیَ لە جادەی سێتاقانیَ دەبینم مام شاکر بەرۆکی پیاوێکی گرتووە و دەڵیَ:

بە راستیم پێبڵیَ، دنیا چەندی ماوە؟

پیاوە نازانیَ چۆن لە کۆڵی خۆی بکاتەوە، دەڵیَ:

وازبێنە، کاکە وازبێنە، دنیا هەزاری وەک من و تۆ لە گۆرِ دەنیَ، هەر دەمێنیَ.

مام شاکر منداڵانە دەڵێ:

ئەدی لۆ گۆتیان شەوێ خەرا دەبێ؟ ئەگەر وایە، تا سابوونەکانم بکەمە خێر.

پیاوەکە:

مەترسێ، تا سابوون مابێ، دنیا کاول نابێ.

شار تا درەنگیش بە کەسی زۆر خۆشباوەڕی دەگۆ:

دەڵێی مام شاکری سابوونفرۆشە.

سێتاقان هاتە ناو ناوان، دەڵێن چی مینا و فەقێکە بخەینە سێ چوار ڕستەوە؟

## • مینا و فەقێی هەڵگەڕاوە

مینـا، چ مینـا! مینـا مینـایە، چەرخـی روومەتـی خـۆدیکی بەر خـۆرێیە، لە دوورەوە بە هەردوو بەری سێتاقاندا تیشک دەداتەوە، فەقێ هەڵگەڕاوەکەی بەر قاپیەکەی مزگەفتی حاجی مرادی زووتر جوو، دەڵێ:

شا بەو کوڕەی دەگاتە بەرکۆژەی، لەوێ دەکەوێتە نێو رووناهیی خودا.

مینا کەس نازانێ خەڵکی کوێیە، هەیە دەڵێ:

لە تیرەی (لەیلێ)کەی سەر قەلاتییە.

هەیە وارێ:

لە رۆیینی دیارە، رواندزیە.

هەیە دبێژی:

بڕواننە چاوی، بێ سێ و دوو زاخۆییە.

ئەوی دی دەیباتەوە بەری دی:

شارەزووریە، لە حەبیبەکەی نالی دەچێ.

مینا بە کەس ناچێ، کەسیش زێدی وی پێنازانێ، کەس کەسیش گوێی لە دوو واچە و رستەی زاری وی نەبووە، تا بە زار و زمان بیناسێتەوە، مینا بە (مینا)ش ناناسرێتەوە، ئاخر خۆ ناوی مینا نیە، ئەوە فەقێ هەڵگەڕاوەکە بوو، ئەو کچە نەناسراوەی بە مینا ناودێرکرد و سێتاقان بە هەردوو بەرەوە سێ جار لە دوای وی گوتیانەوە:

مینا، مینا، مینا

ئیدی مینا مینایە، کار لە میناکەی حەسەن زیرەکیش نیە، ئەوەی بە چاو شەڕ دەکات. مینای فەقێی هەڵگەڕاوە، بە کوێی شەڕناکات؟ هەر لە دەنگی پێلاویەوە تا تف رۆکردنی، ئەو تفانەی جاروبار لە پاداشتی ماچی لە دوورەوەی کوڕێژگەیەک، هەڵیدەدا.

کاتی مینا بە ڕێی خۆیدا ڕۆیی، فەقێ لە داخا بە دیوەکەی پێشتری هەڵگەڕایەوە و هێند توند گرتی، سڵاوی نوێژنەکەرانی وەرنەدەگرتەوە. بیستمەوە خوشکێکی خۆی کوشتووە، دوایوە لە ڕێی پیرمامێ، ڕەنگە هەر پێچی کەریم حەشاشێ بووبێ، لە تامپۆنێ دەگاتە ئەو دنیا، دایکی گۆتەنی:

پیرمام تۆڵەی کچەکەمی لە کوڕەکەم کردەوە.

وا تێبگەم لەو سەروبەندە بوو، سەردانێکی پیرمام و سەریپەشم کرد، بەوە دەزانم، لە ناو ترومبێلێ باسی ئەو تامپۆنە هاتە گۆڕێ، کە فەقێ خوشککوژەکەی تیا تیاچوو، گرتەیەکی سەردانەکەی خۆم دەگێڕمەوە.

## سەریڕەش

سەریڕەش نزیک بوو، لە سەر شانمان بوو، بەڵام من نەمدیتبوو، دەبێ دوای هەنارە بووبێ، ئەو(هەنارە)یەی دەو ئاوی بەستۆرە کە بە شەڕ رژایە ناو دیرۆکەوە، ئەو شەڕەی (هەندرێن)ئاسا دەنگیدایەوە، بۆیە وا دەڵێم، لە ناو بەستۆرە لە راست ئەو رێیەی دەچێتەوە هەنارە، لە ناو ترۆمبێلێ باسی ئەو شەڕە هاتە گۆڕێ.

ئێ لەو سەروبەندە دەمەو ئێوارانێ، سێ چوار برادەر لە سەری سەریڕەشێ نیشتینەوە، نازانم بۆچی هەستمکرد رێی فڕینم بڕیوە، ئێرە لە چاو ناوشار لە کوێستانی کێلەشینێ دەچێ، لە چاوی منەوە جێ جێی دەڵێی زەنوێرە.

لە ناو زەنوێران جاش و وەلەکە بەعسی سەرودڵمیان گرت، لە بادینان و سوران، لە بەغدا و بەسراوە هاتبوون، خۆمانەت زۆر کەم دەدیتەوە، لەوێ فازیل رێحانە قسەیەکی کرد، لەبیرناچێتەوە:

کوردستان ئازاد بێت، ماڵم دەهێنمە ئێرە، ئەها ئەو بەردێهێ دەکەمە سەنگەر، هەر کۆنە جاش و بەعسیەک نزیکبێتەوە، پەلەواژی دەکەمەوە.

ئازاد گۆتی:

پەل مەبە!

ئەرێ دوای ئازادی، ئەگەر فازیل رێحانە لە ژیان مابا، داخوا چی گۆتبا؟ ئاخر ببێتە کۆتریش، ناهێلن لەوێ بنیشێتەوە!

بیرمە لە سەریڕەشێ، نازانم لە سەر چی، لەگەڵ یەک دوو تورکمانی نازانم کێندەرێ تێکگیراین، دوو سێ عارەب چوونە بەرەی تورکمانان. زۆری نەبرد گەلەکۆمەیان لێکردین، کەڵکی دەستوەکەری پێوەنەما، هەرچۆنێ بوو خۆمان لە بن دەستیان دەربازکرد، سەیرانەکەمان لێبووە سندان و هەیپەمان

لێکرد و تا شار گیرنەبووین.

ئازاد تا گەیشتینەوە گەڕەکێ، بە وەیش وەیشەوە لە چۆکی خۆی دەدا:

تۆ وەرە لە ماڵی خۆت، لە ترسی عارەب و تورکمانان هەڵێی!

بە عارەب و تورکمانی سەر سەریڕەش، تورکمانەکەی پردێم بیرکەوتەوە، ئەو سەربردەی ناونرا-هەنجەتی تڕێ.

## هەنجەتی ترێ

لە بەری کەرکووکی پردی پردێ، روو لە زێ، لەگەڵ جەباری وەستا، داری خانوویکمان دەبەستا. خاوەن خانوو پیدەچوو تورکمان بێ، بەڵام لەگەڵ ئەندازیارەکەی برادەری بە عارەبی دەئاخاوت لە ناو دەرسەکانەوە چاو و گویملییە، خاوەن ماڵی دەمانچە لە نێک، باشیش تینەدەگەیشتم، بەڵام لە قسەکانیەوە هیندەم هەڵهێنجا:

بیرمە کەرکووک پێش پارتی کۆمۆنیست، بێ کێشە بوو، تورکمان و عارەب و کورد و ئەوانیدی برابوون، موو بە نێوانیانەوە نەدەچوو، کۆمۆنیست هات و دووبەرەکی خستەوە، دەستی سەرۆک (خوا چەپارەی بدا) خۆشبێت، ئەو پارتە سەر بە گۆبەندەی لێمان دوورخستەوە، ئیدی هەموو بێ ژاوەژاو دەژین.

کاکە، چاوم چووە پشتی سەرم، ئاخر تازە هەوای کۆمۆنیستی لە کەللەی دابووم، دوو سێ جار هاتە سەرم، نیشانەی چەکوچی لێبگرم، تێیبگرم و هەڵیم، ترسام و نەوێرام، گۆتمە وەستا:

+ تێگەیشتی چ دەڵێ؟

- کەمەک، بەڵام با لۆ خۆی هەر بوەڕێ.

+ با دەستهەڵبگرین و بەجێیبێلین.

- نابێت، خاوەن دار برادەرە و تووڕەدەبێت.

+ من دەڕۆم.

زۆری هەولدا کار بەتاڵ نەکەم، بە گوێمدا نەچوو، چەکوچ و جۆڕکی بزمارم فڕێدا، وەستا تا سەر جادەش لەگەڵم هات، دوا قسەی ویم لەبیرە:

ئیشت پێناکرێ، قسەی ئەو پیاوە هەڵەوەڕەت کردە بەهانە، پێشینان لە بەلاش ناڵێن:

هەنجەتی ترێ، نانی جۆیە.

لە نـاو ترۆمبێلـێ، چ ڕێکەوتێکـی خـۆش بـوو، جـێم کەوتە تەنیشـت خـدر خەرمــان، مــن ئەو پیــاوەم زۆر خۆشدەویشــت، ئێــوەش لە چەنــد ســەرە کۆلانێکی کۆلانەکانی من بینیوتانە، پرسی:

ئیشتان لێرەیە؟ ئەدی لۆ وا زوو دەچیەوە؟

لە نووکەوە هەمووم بۆ گێرایەوە، گوتی:

شتێکت چۆتەوە سەر باپیرت.

تــا خـدر خەرمــان نــزیکە، بـا لە زاری ویەوە، هــاتنی عـارەب بـۆ قەراج ببیستین.

## قەراجی بە دوو ژن دا

لە پێش دەرگای مزگەفتێ، ئەوەی ئەو دیوەی کۆلانی مۆسکۆی سەیداوە، کۆمەڵی پیاو دانیشتوون، من کە بەسەردا چووم، مام خدر قسەی دەکرد:
+ ئەوە تۆ چ دەڵێی؟ بە سەری تۆ برایماغا عارەبی بە ئاقاری وەرکرد.
-کوو؟
خدر خەرمان ئەوها باگۆی (کوو)ەکەی کابرای دایەوە:
با ئەمن پێتبلێم، زوو، زۆر زوو، هێشتا ئینگلیز بە وڵات وەرنەبووبوو، گرانیی گەورە دانەکەوتبوو، زوو، عارەب ئەو بەرەی زێی نەدیتبوو. لەو قەراجەی خۆمان برایماغایەک هەبوو، هەموو شت بوو، عارەب بە شێخ و قورئانەوە لێی هاتنە تکایێ، تا رێیانبدا بپەڕنەوە بەری کوردان، ئاغا ملی نەدا و نەهاتە رایێ. عارەبیش کۆڵیان نەدا، پنت پنت گەڕان، کەس کەس پرسیان:
داخوا برایم بە چی دەگیرێ؟
دیتیانەوە، پنتی لاوازی ئاغایان دیتەوە، دەمارەکەیان دیتەوە.
چ بوو؟ ژن
بە جارەکی دوو ژنیان لێ مارەکرد، ژن چ ژن! غولامێکی ئاغا گۆتەنی:
هەر یەکەیان قەراجێک دێنێ.
ئیدی عارەب پێوەر بوو، برایماغا بە دوو ژن، نیوەی قەراجی لە سەر دانا.
دواتریش برا و کوڕەکانی بەشێکی قەراجیان دا عارەبان.
بەڵام پیاوێ پیدەچوو لە بەرەی ئاغایان بێ، دەیگۆ:
ئەو قسانە هەڵبەستراون.
لە عارەب و قەراج گەڕێ، بە خەمان چ پێکنایێ. سەربردەیەکی ناسکی حاجی شووشەم بیرکەوتەوە، با پێکەوە بیبیستین و خەمی قەراجمان لەبیربچێتەوە.

## حاجی شووشە

ئەو شووشەیە هەر لە گەڕەکێ نا، گەڕەک گەڕەک ناوی ڕۆیشتبوو، ئەو ژنە لە سالانی (شەعب شەعب)ەوە ناوی کەوتبووە سەر زاران، لە سەردەمی پاشایەتی بە پاشۆلێ درووشمی دژە پاشاوە دەهاتە سەر جادە، دەڵێن: لە سەر گۆڕی خۆشەویست و لە بەر دەرگای کابە ئاوا لە خودا پاراوەتەوە:

خودایە، ئاغاو زۆردار و پاشا لۆ دۆزەخ بنێرە.

حاجی شووشە لە شار لە شێخەشەلیش ناسراوتر بوو، هەر منداڵەکانی نا، کۆلان و گەڕەکیش بەو دەناسرانەوە، بەو دواییە خەڵکی گەڕەک ماڵی شووشەیان دەکردە نیشان، هەبووە لەو سەری شار بە شوفێری تەکسی دەگۆ:

بمبە کۆلانی ماڵی حاجی شوووشە.

تەکسی بێوەی کۆلانێ هەڵەبکات، لە پێش ماڵی شووشە رایگرتووە.

ماڵی فیکتۆر هۆگۆ چەند لە پاریس ناسراو بوو، ماڵی حاجی شووشەش لە هەولێرێ هێندە و پتریش.

کوڕە گەورەی حاجی شووشە لە زاری حاجی شووشە گێڕایەوە:

لە کەرکووکێ دەهاتمەوە، تاریک داهاتبوو گەیشتمەوە شار، هەستمکرد هۆشم ڕۆیشتووە، سەرم دەسوورێ و چ جێ پێنازانم، بە شێوەیێ تێکچوومە ناوی گەڕەک و خۆم و خواشم لەبیرچووە، تاکسیم راگرت، بەلام بلێم دەچمە کوێ؟ باشبوو ناوی خۆمم بیرکەوتەوە:

+کاکە بمبە ماڵی حاجی شووشە، خۆ پێدەزانی؟

- کەس هەیە، ئەوێ پێنەزانێ.

لە ڕێیێ کەم کەمە هۆشم دەهاتەوە بەر، بەلام هی ئەوە نەبوو، دەرگای خۆمان بناسمەوە، کابرا رایگرت و گوتی:

فەرموو، ئەوە ماڵی حاجی شووشە.
گوتم:
تۆ دڵنیای ئەوە ماڵی ئەوانە.
گوتی:
ئەدی کوو! ئەوە ماڵیانە.
تەماشامکرد، دەرگام نەناسیەوە، گوتم:
باشە تۆ حاجی شووشە دەناسی؟
گوتی:
کەس هەیە، نەیناسێ؟ دە وەرە خوارێ، لە کۆڵمان بەوە و پارەکەش مەدە، گەردنت ئازاد بێ.
پارەکەم دایێ و گوتم:
باشە حاجی شووشە کووە؟
گوتی:
یەکەکی وکی تووە.
ئەوجا تێنەگەیشتم، ئاخۆ ئەمنی ناسی، یان هەر لۆ فشە وای گۆ.
بەلاشاوە حاجی شووشەیەکی چەند ئازا و ناسکی هەبوو.
نەبادا درەنگ بگەڕێمەوە گەڕەکێ، با زرارێکی ئازا و جوانیش بناسین

## ئەو پیاوەی لە ئاراسی دا

چاودێ ئەو پیاوەی ئەو بەری کەندێ، ئەو خڕکەڵەیەی سەرەو سەرێ دێ، ئەوڕۆ بە ڕۆژان ناچێ، وێدەچێ نەساخ بێ، ماندوو دیارە، لاکەی لێوە دێ. ئەو پیاوە لەمێژ نیە ماڵیان هاتۆتە گەڕەکێ، زوو شتێ لە مێژووی ویم زانی. ئەو پیاوە بۆ کۆمار لە بن ئالآی قازی جەنگاوە، لە تەک مەلا لە ئاوی ئاراسی داوە، شار دەڵێ:

ئەو پیاوە تا گەشتۆتە ئێرە، شاخە و شاخ، دۆلاو دۆڵ بە ناو شەڕدا هاتووە.

هەندرێن دەڵێ:

لە من بپرسن مام زرار کێیە؟

ئەز لە ڕێی هەندرێنەوە، هۆگری ئەو پیاوە بووم، لە ڕێی شیعرێکی شێرکۆوەش هەندرێن هەمیشە لە سەر زارم بوو، ئەوەی دەڵێ:

**سەرکەوتنمان لە هەندرێن نابێتەوە.**

نازانم لە زاری کێوە بوو بیستم، ئەو مام زرارەی ڕێی هاتۆچۆی بەر ماڵی ئێمەیە، دەستی هەبووە لەو سەرکەوتنە. گەلێ جار لە دەرکەوتنەوە تا لە چاو بزردەبوو، چاوم لە سەر هەڵنەدەگرت، تامەزرۆی لە نزیکەوە ناسینی بووم، زۆر جار دەهاتە سەرم بچمە سەر ڕێی و چاکۆچۆنی لەگەڵ بکەم، بەڵام شەرم پێمی دەبەست، زارمی دەگرت.

من ئێستا لەم بەرە بەری ماڵێ لە سەر سیلەی خانوو چاوم لە سەر مام زرارە، ئەوڕۆ نەساخ دیارە، گران پێ هەڵدێنێ، بە لادا دێ. ئەها، ڕاوەستا، وێدەچێ سەری بسووڕێ، دەبێ بە هانایەوە بچم، یەکپێ گەیشتم:

+ مامۆستا، نەساخ دیاری.

- هیچ نیه، کەمێ ماندووم.
+ لادە ماڵێ مە، پشووێ بدە.
-سوپاس، دەگەمەوە ماڵێ.

بن پیلم گرت، تا ماڵێ لەگەڵی رۆیشتم، ماڵیان چەند کۆلانێ لە سەرێی ماڵێ مەیە، لە بەلاشاوە نا، لە گەڕەکی مامۆستایانە. لە سەر دەرگا زۆر هەوڵیدا، میوان بم، زۆر حەزم لێبوو، لێ شەرمکرد. ئەو رۆژە هەر نزامدەکرد، ئەو پیاوە هەر راوەستاو بێ و نەکەوێ، نزام گیرا. ئیدی لەو رۆژەوە هەر جارەی دەگەیشتە راست ماڵێ مە، سلاوی دەکرد، چەند جارێکیش تا نزیک ماڵێیان شان بە شانی دەڕۆیشتم و خەنی دەکردم بە گێڕانەوەی سەربردە و دیرۆک، دوو سێ جارێکیش چوومە ماڵیان.

دانیشتن لە گەڵ ئەو پیاوە بۆ من وەک ئەوە بوو بە دیار پاڵەوانێکی ئەفسانەییەوە بم، بە دیار دیرۆکەوە، پڕ شکۆوە، باوەڕم بە چاو و گوێی خۆم نەدەکرد، پاڵەوانێک بەرانبەرمە، کۆمار و قازیی لە نزیکەوە دیوە، ئەو هەموو شەڕ و شۆڕ و چیاو چۆلەی دیوە، لە ئاوی ئاراسی داوە، ئەو رووبارەی هەینێ لە شێوەی رووبارێکی ئەفسانەیی لە خەیاڵی مەمانان هاژەی دەهات، ئەو پیاوەی لە سۆڤیەتەوە بە ژنی ئەوێوە گەڕابۆوە و دواتر لە هەندرێنێ وێنەی هەندرێن هەڵکشا.

من هەر کاتێ ئەو پیاوەم دەدی، هەستمدەکرد هەندرێنێ لە گەورەیی و شکۆیە، ئەوەی زۆریش پێی سەرسام بووم، هەستە چینایەتی و نەتەوایەتیەکەی بوو، لە هزری وی ئەو دووە بە شێوەیەک تێکچڕژابوون، لێکدی نەدەبوونەوە.

لەو چەند جار دیتنە، چەند کتێبێکی لێ فێربووم، زرار دەرگەلەیی بۆ من مامۆستایەکی شکۆداری سەرڕێژ لە زانیاری بوو.

ناوی کتێب هات، با بچمە گژ چەند کتێبێ، لەو کتێبانەی پتر هۆگری کتێبیان کردم.

## کتێب کتێب
## لە چاوەڕوانیی گۆدۆ و...

لەو سەروبەندە شتێ عارەبی فێربووبووم، بای ئەوەی دەکرد، ئەدەبی گێڕانەوەی پێ بخوێنمەوە، بەڵام شیعر نا، پتریش خدێم بەو کتێبانە گرت کە هەینێ خرابوونە چێوەی بوونگەرایی و پووچگەرایی. نووسەری دڵنشینی من سارتەر بوو، لە مێژیش نەبوو مردبوو، هەندێ گۆتەی ویم لە ئایەت جوانتر لەبەرکردبوون، بۆ خۆمم دەگوتنەوە، هەر سێ بەرگی رۆمانی (رێیەکانی ئازادی)م خوێندەوە، هەرچەندە گەلێ وشە و دەستەواژە و رستەش هەبوون، واتایانم نەدەزانین. بەرم لە کتێبی (بوون و نەبوون)ەکەشی گرت، ئەوەیان زۆر قورس بوو، شتێکی کەمم لێی هەڵێنجا.

لە تەنیشت سارتەر، ئەلبێر کامۆشم ناسی، ئەو کامۆیەش ئاگات لە خۆت نەبێ، سەراوبنت دەکات، هەر سەراوبن نا، تەواو نامۆت دەکات، لەو تەنها نامۆم خوێندەوە، بە جارێک دووش دەستبەرداری نەبووم.

بەرۆکی کافکاشم گرت، ئەوە هەر زۆر سەخت بوو، لاپەڕە هەبوو چوار پێنج جار بۆی دەگەڕامەوە، لەو یەک دوو ساڵە بەدگۆڕان و دادگا و کۆشکم خوێندەوە، گەلێک سەرسام بوو بەو کافکایە، گەیشتە ئەوەی ناویشم لە ناوی نزیک بێ، تەنها لە بارەی (باب)ەوە نەدەگەیشتینە یەک، ئەو دانووی لەگەڵ بابی نەدەکولا، کەچی من بابمم بە شێوەیەک خۆشدەویست، کەس وێنای نەدەکرد، من کە (کافکاف)م بۆ خۆم هەڵبژارد، بۆ دوو مەبەست بوو: لە لایێ نزیک بێ لە کافکا، لە لایێ دوو پیتی ناوی بابیشم تێکەڵی ناودکە بێ.

ئەدی سامۆئیل بیکیت، ئەوە هەر زۆر کوشندە و تووشە، تۆ (لە چاوەڕێی گۆدۆ)ەکەی بخوێنەوە، هەینێ لە ژانی چاوەڕوانیی تێدەگەیت، ئەو گۆدۆیە هەر هەمووومانی لە چاوەڕوانیەکی هەمیشەیی هێشتۆتەوە، من زۆر داخم لەو

گۆدۆیە دەخوارد، زۆر جار دەمگوت، خۆزی نەمدەخوێندەوە.

ئەو بەرە نووسەرە لەوێ، لە مەکسیم گۆرکیش گەڕێ، ئەوەم بە کوردی و لە (دایک)یەوە ناسی، هەینێ کەم خوێنەر هەبوو دایک و پاڤێلی کوڕی نەناسێ، ئەو رۆمانە هەمیشە باس و خواسی سەر زاران بوو، زۆر پیاوی ناوداریش لە ڕێی ئەو دایکەوە بووبوونە مارکسی، بووبوونە کۆمۆنیست، کەسی دیاریش کوڕی خۆیان بە ناوی پاڤێلی کوڕی ئەو دایکەوە شۆڕشڤانەوە ناودێر کردبوو. دوایی بیرمبێننەوە، سەربردەم لەگەڵ ئەو دایکە دەگێڕمەوە، لەو سەروبەندە، لە دوای دایک، بە عارەبی (خوا لەکوێیە)یەکەم خوێندەوە.

یەشار کەمالیشم زووتر لە (ئەفسانەی چیای ئاگری)یەوە ناسیبوو، دواتر رۆمانەکانی دی.

بەر لە (براکوژی) من بە گژ (زۆربا)دا چووم، لێرەو لەوێ شتێکم لە مەڕ ئەو زۆربایە بیستبوو، خوێندبۆوە، هەبوو دەیگۆ:

زۆربات نەخوێندبێتەوە، وای دانێ هیچت نەخوێندۆتەوە.

قسەی خەڵکی دنەی دام، خۆمی لێدەم، بەو عارەبیە گێڕوویڕەی خۆمەوە، بەرم لێگرت، بە دوو حەفتەیێ تەقەم لێوە هێنا، دیارە ئەگەر بە کوردی با، خۆی کوشتبا، دوو شەوی نەدەبرد. بیرمە دوای خوێندنەوە لاپەڕەیەکم لە بارەیەوە نووسی، بە کەتیرە بە دیوی ناوەوەی بەرگی دووەمی زۆربامەوە نووساند، لەو لاپەڕەیە ئەو دێرەم بیر ماوە:

بە دوو حەفتە، سەد کتێبم خوێندەوە، زۆربام خوێندەوە.

لێ هەینێ، لە دیدی من کازانتزاکی، هێمان نەدەگەیشتە شانی سارتەر، دواتر بە بارێکی تردا گۆڕا، سارتەرم هێلا و کازانتزاکیم کتێب کتێب بەر لێگرت، ئەگەر بیرمکەتەوە، شتێ لە براکوژیەکەی دەگێڕمەوە.

دۆستۆڤیسکیشم، تۆ بڵێ بەلایەکە! وەکو گۆتم، لە ڕێی کتێبخوێنەوە خوێندەوە، ئەوە بوو پاشترێ و تا ئێرە، ئەو سیانە (دۆستۆڤسکی، کازانتزاکی، یەشار کەمال) هاوڕێمن و زوو زوو بە سەریان دەکەمەوە و بەوانەوە خوێندنەوە و نووسین درێژەی دەبێت. ڕەسووڵی هەمزاتۆڤیش هەر

دەبێ لە (داغستانی من)ەوە بووبێت، دوایی بۆ باخی کتێبان دەگەڕێمەوە و داغستانتان وەبیردەهێنمەوە.

لەو دوو سێ ساڵەی ئامادەیی بە کردنەوەی پەنجەرەی کتێب، بە سەر دنیادا کەوتم و بە خوێندنەوەی نووسەری هەمەرەنگ کەوتبوومە مەستبوونێکی هەمیشەییەوە، لە ڕێی ڕۆمانێکەوە، چیرۆکێکەوە، شیعرێکەوە... لەوانە:

شۆلۆخۆڤ، ئەوە لە (چارەنووسی ئادەمیزاد)ەوە شۆلۆخۆڤ، بە هۆی(جەمیلە) جوانەکەشەوە جەنگیز ئیتماتۆڤ، ئەو جەمیلەیەی بە لای ئەراگۆنەوە جوانترین چیرۆکی ئەوینداریە.

ئاراگۆنیشم لە جوانیی چاوی ئەلیزاوە ناسی، تۆرگنێفیش لە ڕێی باوکان و کوڕانەوە. گۆگۆل بە لووت و کرێوەوە. تۆلستۆی بە کورتەیەک لە شەڕ و ئاشتیەوە. ئەلیوت بە وێرانە خاکەوە. پۆشکین بە قەرەج و هەندێ شیعرەوە. هەمەنگوای بە پیرەو زەریاوە خۆی ناساند. کۆنستانتینیش لە کاتژمێر بیست و پێنجەوە. جاک لەندەن بە پاژنەی ئاسنینەوە. قەلەرەشکە ئادگار ئالان پۆی پێناساندم. لە مرواریشەوە شتاینبگ. چیخۆفیش بە سێ خوشکەوە. بۆدلێر بە گوڵی خراپەوە. رامبۆ بە دوو سێ کەرتە شیعرەوە. دەترسم بکەوێتە چێوەی خۆهەڵکێشان، وەرنا دەکەوتمە ریزکردنی ناوان!

لە ئەدەبی تورکان، هێ لە یەشار کەمالی خۆمان، شتێکم لە نازم حیکمەت و عەزیز نەسین خوێندەوە.

لە ئەدەبی فارسان کەم، لە هی تازە، ماسیە رەشە چکۆلەکەی سەمەدی بەهرەنگیم دیتبوو. فەرووغیشم بە ناو دەناسیەوە. لە کۆنەکانیش خەیام پتر، فیردەوسی و حافز و سەعدی کەمتر.

لە عارەبان لە خان خەلیلیەوە نەجیب مەحفوورزم دی. لە ڕۆژهەڵاتی ناوەراستەوە عەبدلرەحمان مونیف. جوبرانیش بە هۆی هەندێ نامەوە. بەلقیسیش نەبا، پێنەدەچوو وا زوو نەزار قەبانی بناسم. کوردستانەکەش وایکرد بە دوای مەحموود دەروێشدا بچم. جەواهێریش هەر بەو شێوە، ناسینی سەمیح قاسمیش دوور نیە، بە هۆی مەرگیەوە بووبێت. پاکانەکەی بە

دەنگی محەمەد جەزاش بەرەو مزەفەر نەواب کەمەنکێشی کردم. ناسینی نەوال سەعداویش بۆ بوێریەکەی دەگەڕێتەوە. بەدر شاکر سەیابیشم لەبەر سروودی باران. لە چاوی بەغدا و بارانیشەوە روشدی عامل. دواتر کەوتمە ناو بۆنوبەرامەی باخچەی عەلییەوە.

ئێ، لە ناوان گەڕێ، وەک گۆتیانە:

ریزکردنی ناوی نووسەر و کتێبان نیشانەی خوێندنەوە نیە.

ئەوەی لەبیرمە لەو سەردەمە، لە ناو ئەو خوێنەرانەی بە عارەبیش دەیانخوێندەوە، ناوی حەفت هەشت کتێبێ لە سەر زاران بوو، کەسێ ئەوانەی نەخوێندباوە، نەیاندەخستە چێوەی خوێنەرانەوە، لەو کتێبانە: زۆربا، تاوان و سزا، مەسیح لە خاچ دەدرێتەوە، سەد ساڵ تەنیایی، زەنگەکان بۆ کێ لێ دەدرێن، کاتژمێر بیست و پێنج...

من لەوانە هەندێکیانم خوێندبۆوە، بۆیە نەدەکەوتمە جوغزی خوێنەرانەوە.

بەڵام لە کتێبی کوردی، خۆم بە خوێنەر دەزانی و کتێبم بازنەدەدا و دەمویست پێشبڕکێی دەڕاسەی کتێبان بکەم، دواتر ئەو دەڕاسەیەم بیربخەنەوە، ئێستا پێکەوە دەچینە دنیای کتێبی کوردیەوە، کەمێکیان دەوردەکەینەوە:

لە مەم و زینی خانی گەڕێ، ئەو کتێبەی هێشتا نەمدەزانی خوێندنەوە چیە، بۆ خۆم و ماڵیم دەخوێندەوە و دواتریش بووە تاقانەیێ لە تاقانەی سەر تاقی دڵ. هێمنیش با لەوێ بێ، ئاخر من لە تاریک و روونەوە چاوی خوێندنەوەم کردەوە، ناڵەی جوداییش تا ئێرە لەگەڵمە. پەشێویش بە فرمێسک و زام و شەونامەوە جێیەکی وای گرت، لە دەلاقەی کتێبان زۆر کتێب ئێرەییان بە جێی وی دەبرد، دواتر (شەو نیە...) گەیشتە تاقی ناڵەی جودایی.

بیرمە ئەو دوو کتێبە، دەبوو زۆر زووتر نۆرەی بۆ بگری، وەرنا لە بازێڕێ دەستنەدەکەوتن، دەبوو لەو و لەمی وەربگری، وا چاکە لە سێ شاعیرەکەوە پێدا بێم، هەر چەندە بۆ هەندێ گرتە و گوتە، وا دەکات بە سەر کاتدا بازبدەم و بگەمە قۆناخی زانکۆ:

تا هەشتاوشتێ، لە شاعیران، هێمن لەوێ، پەشێو و شێرکۆ و هەڵمەت لە

خوێندنەوەی من سێ ناسکترین بوون. کاتێکیش هەڵمەت وەک کەسێکی ئاسایی، بێریە کردە سەر و پێی لە پۆستاڵ هەڵکێشا. شێرکۆ لە هەزار توندتر بە لای حیزبدا رایکێشا و بە شیعر چووە بەرەی شەڕی براکوژیەوە. پەشێویش چیا ئاسا، سپی سپی لە بەری نەتەوە راوەستا. ئەز جوایەز لە هەندێ برادەر و ناسیار، نەخزامە ناو ریزبەندیی هەڵوێستی دەرێی شیعر، لە کەسیان نەتۆرام و لە بەری شیعر مامەوە.

هەینی، هەینێی شەڕی سارد، هەینێی دنیای ئەو لایە خێر و ئەو لایێهێ شەڕ، هەینێی بەعس و شەڕ، هەینێی شەڕی براکوژی، هەینێی پسەپس و ورێنە، هەینێی وەک دواتر حیزبحیزبێنە، مانەوە لە بەری شیعر بە قسە خۆشە، چی لە مانەوە لە دەرێی گۆی زەوی کەمتر نەبوو! من لە هەستنەکردن و هێرپەوە بووبێت، یان هەر شتێ، بەو شێوەیە مامەوە.

ئەو کەژەی براکوژی کە بە قەندیلێدا هەڵگەڕا و لە پشتئاشانێ و لە دیرۆکی خۆیدا کچکوژیشی لە سەر تاشەبەردان تۆمارکرد، بانگی (پەرێز پاکی) لە ئەشکەوتان دەنگیدەدایەوە، لەو لایەوەش شێرکۆ پاکیی پەرێزپاکی نیشاندەدا و پێیدا هەڵدەگۆ، هەبوون ئەو شاعیرەیان رەشکردەوە، هەبوو میزی بە شیعرەکانیدا دەکرد، من بە چاوی خۆم میز و شیعرەکەم دیت، رێی هێلی ئاسنینی شەمەندەفەری سەرەوەی ساکەگۆڕی یاری گەواهیدەرە، ئەو کوڕەی لە سەر پشتئاشان میزی بە شیعری شێرکۆدا کرد، سێ ساڵێ دواتر سوێندی بە سەری نەوشێروان مستەفا دەخوارد.

ئەز هەینێ کە لە بەرەی دژ بە شێرکۆ و پەرێزپاکانیش بووم، لێ (کازیوە)م بە (رووبار)ەوە دەمەو ئێوارانیش لەگەڵ خۆم دەگێڕا، چاخانەی باکووری روو لە قەیسەری و شەوانی هەولێری شانی سینەما سیروانی روو لە قەڵاتێ، لەبیریانە، دەمگۆ:

شیعر هەر بە شیعری دەمێنێتەوە، ئەگەر شاعیرەکەی ببێتە میرغەزەبیش!

کاتێک لە تەیف هەڵمەت، بە ناچاری جلکی سەربازیی پۆشی، جلکی سەربازیی بە واتای مانەوە لە ئاقاری میری وەرگرە، پۆشیی و نووسی:

**کاتێ لە سەربازی دێمەوە**

**کچێ ماچم ناداتێ**

هەبوو، بەردەستیکەوتبا، تێیهەڵدەدا، هەبوو کتێبەکانی هێنایە بن دیواری قەلاتێ بە (چۆن نوێژ فێردەبی)ی دەگۆڕیەوە، پێشمەرگەیەک گوتبووی:

شیعرەکانی ئەو منیان لە حوکمەت یاخی کرد و بە چیایان ئێخستم، کەچی خۆی بووە سەرباز!

برادەرێکم کە لە (کونەفیراران) کتێبی دەخوێندەوە، گوتی:

ئەو شاعیرە ببێتە مایکۆڤسکیش نایخوێنمەوە.

کەچـی مـن( پرچـی ئەو کـچە رەشـماڵی گەرمیـان و کوێسـتانمە)م وەک کـۆچەری، چـۆن رەشــماڵ لە گەڵ خــۆ دەگێــڕن و گەرمــێن و کوێســتانی پێدەکەن، ئەوها دەگێڕا، شێخ جەلالی هاوڕێم گوتی:

سەربازیش شیعری جوان دەنووسێ.

بیرمە هەبوو سەربازیی هەڵمەتی لا جوانتر بوو لە بە چیاکەوتنی شێرکۆ، شێخەکەی هاورێم دەیگۆت:

شاعیر ببێتە سەرباز، ببێتە جاش باشترە لەوەی پێشمەرگە بێ و شیعر بە براکوژیدا هەڵبڵێ.

هەشبوو شێرکۆی پێش (جوامێر)ی نەدەناسی و لەوەوە بووبووە ئەم و سوێندی بە سەری دەخوارد، یەک لەو کوڕانە رۆژەک بەرۆکی شێخی گرت:

جارێکیدی قسە بە شێرکۆ بڵێی، هوردت دەکەم.

فەوزی شەبەکی هاوڕێشمان کە لە هەمووومان پتر شیعر و ئەدەبی دنیای خوێندبۆوە، قاقا بەو شەڕە سەیە قسەیەی ئێمەمانان پێدەکەنی، دەیگۆت:

شـیعر و شــاعیر هێنـدە تـیکەڵاومەکەن، ئەگەر ژیـانی تـایبەتی هەنـدێک نووسەری دنیا بزانن، بێزتان نایە بەرهەمیان بخوێننەوە..

ناوی هەندێ نووسەر و شاعیریشی دەگۆت، هەر ئەو کوڕە دەیگۆت:

شاعیر کە شیعرێکی جوانی نووسی، دوایوە سەد شتی قۆڕیش بنووسـێ، جوانەکە جوان دەمێنێتەوە.

هەینـێ وابـوو، کەم کەس لە ئـێمە بە قسـەکەی کـوڕە شـەبەکی دەگـۆ:

ئەشهەدوو.

ئەو سێ شاعیرە هەڵبژاردەی دڵ بوون، منیش بە قسەی ئەم و ئەو، بێ دڵیی خۆم نەدەکرد، هەمیشە دەمخوێندنەوە، بە تایبەتی پەشێو، لە فاتیحا و تەحیات رەوانتر، شیعر شیعر (شەو نیە خەونتان پێوە نەبینم)ی ویم ئەزبەر بوو، نامیلکەکەشم بە زۆری لە بەر باخەڵ یان ناو جانتا بوو، شیعری سەر کاخەز بۆنێکی تایبەتی هەیە، دەمبردە قوتابخانە، دەمبردە چاخانە، شەوانی هەولێر، زۆر جار دەمردە سەر ئیشێش، جارەکی لە رێی چوونە خۆپیشاندانێ، لە نزیک پردی سەیداوە، بە رێکەوت دەستم برد بۆ بەرکی شەروالێ، ئای کورە خۆ (شەو نیە..) یە، لەوێ لە کن پردۆکە لە دار و تەنەکەکەی سەر جۆگەی چڵکاوێ، خستمە بن کەرتە بلۆکێک، ئەو جێیەی وەختایەکی چەقۆوەشێنانی ئەوێ، بازگەیان لێ دادەنا و هەرکێ بەوێدا هاتبا، سێ شتیان دەخستە پێشی، چ چار نیە، دەبوو یەکیان هەڵبژێرێ:

برێ پارە، پارە نەبا، شەرواڵ هێنانە خوارێ، ئەگەر ملت بە یەک لەو دووە نەدابا و دەستوەکەریش نەبای، تیروپریان دەکوتای.

قوڕ بە سەر ئەو کەسە دەبوو، بە بەرکی بەتاڵ بە وێدا دەچوو.

ئێ، لە ناو کتێبان دەمێنمەوە، لە شیعرەوە بۆ چیرۆک، بیرا من دێ، هەقایەتبێژی سەیداوە، مەم و زینی خانی، سێ نیگاری کابرای نازانم کێندەری، پاشتریش ئەفسانەی چیای ئاگری، منیان بە دەسبێن بە ئەدەبی گێڕانەوە بەستەوە، گێڕانەوەم دیتبا، بە خو راپسکانیش لێی دەربازنەدەبووم، هەر گێڕانەوەیەکی هونەریانەی کوردی و بە کوردیم دەستکەوتبا، چ کۆن چ تازە، تاقیکردنەوەی کۆتاییشم هەبا، بەرم لێدەگرت، تا دوا لاپەڕە سەرم لە سەری هەڵنەدەگرت، خەتخۆش دەیگۆت:

هێندەی تۆ چیرۆک بخوێنمەوە، لە شێرزاد حەسەن جوانتر دەنووسم.

کوشتەی خوێندنەوە بووم، نووسین چیە! هەینێ لە ناو کوردان، لە دڵێ من چیرۆکی سێ چیرۆکنووس گەلەک دڵنشین بوون، چیرۆکی ئەوانم پێشتر لە ناو دەلاقەی کتێبان، دواتر لە کتێبخانۆچکەکەم لە تەنیشت ئێکدیم دانابوون، ئەوانیش: حوسێن عارف، شێرزاد حەسەن، محەمەد فەریق

حەسەن، بوون، لە کۆڕی ئێمە، کۆڕی گەرمی ئێوارانی چاخانەی شەوانی هەولێر، کاتێ چیرۆک دەبووە سەرباس، پتر چیرۆکەکانی ئەو سێ چیرۆکنووسە شەنوکەو دەکران، هەینێ خەونم بەوەوە دەدی رۆژێ دابێ، چیرۆکێکی وەک ئەوان بنووسم.

هەر لە شەوانی هەولێر، لە کۆڕی وشەی ورشەدار، من ئاشنای مەلای جزیری بووم، بیرمە عەزیز گەردی دەیگۆ:

نالی و مەحوی و ئەوانە بەس نیە، دەبێ مەلای جزیری بناسین.

لەو قسەیەوە بە دوایدا گەڕام، بەڵام زارەکەی بۆ من کێشە بوو، تێینەدەگەیشتم، پتر سەروا و کێش و ئاوازەی رایاندەکێشام، هەژار لەوەش بە هانامەوە هات، وشە وشە، دێر دێر راڤەی کردبوو، ئەو کتێبەش لەو دیوەوە هات، هەینێ لەو بازاڕەی سنوور، بازاڕی تێکەولێکە، چیا بە چیایەتی خۆی لە نێوان رۆژهەلات و باشوور دیواودیوی دەکرد، من نەمدیتبوو، بە قسەی سەرداری سەعید سۆفی بێ:

هەر چیت دەوێ، لەوێ دەستدەکەوێ.

ئەو کتێبانەی لەو دیوێ چاپدەبوون و چاپدەکرانەوە، دەهاتنە بەستەستێن و لەوێوە بە ئێمە دەگەیشتن، ئەوەشیان سەردار بۆی هێنام. دیاربوو هەژار لە پێشەکیەکەی وەک شەرەفنامەی نەکردبوو، شتی لا بەلای تێنەخستبوو، بۆیە بێوەی لاپەڕەیەکی لێبکرێتەوە گەیشتە دەستم.

ئەز پێشترێ دەمزانێ لە کێش و سەروا و مۆسیقا، نە لە کرمانجی ژوور و نە هی ژێری، نیە هاوتای مەلای جزیری، بەڵام لە رێی هەژارەوە، بە سەر جوانییەکی جزیریدا کەوتم، چەندی گەڕام نە لە شیعری مەحوی، نە هی نالی جوانیی وام نەدیتەوە.

لەو ساڵانە سێ چوار نووسەریدی هەبوون، هەر چیان دەنووسی، ئێمەمانان بە تامەزرۆوە دەمانخوێندنەوە، لە باخی گڵکەند و چاخانەی عەبۆ و باکوور و شەوانی هەولێر، دەبوونە جێی مشتومڕ، ئەوانیش: حەمەی مەلا کەریم و کەمال مەزهەر و عیزەدین مستەفا رەسووڵ بوون، هەر گۆڤار و رۆژنامەیێ نووسینی یەکێ لەوانەی تێدا با، بە عەرد نەدەکەوت و لە حەواوە

دەگیرایەوە. لای من حەمەکە لەوانی دی لە سەرتر بوو، رەنگە بە هۆی جۆری چەپبوونەکەی بووبێت، ئەو نووسەرە لای من پیرۆز بوو، بیرمە جاری یەکەم کە دیتم، وا تێبگەم لە کتێبخانەکەی مومتاز حەیدەری بوو، پەلاماری دەستیم دا ماچی بکەم، گرتمی و نەیهێشت، لە کۆڕێکیش دەمژمێرێک زووتر چوومە بەر دەم هۆڵەکە، ترسمام جێم نەمێنێ، هەینێ وا بوو، حەمەی مەلا کەریم کە کۆڕی دەگێڕا، هۆڵ چەند گەورەبا، جێی بە پێوە راوەستانیش نەدەما. سەربردەیەکی خۆشیشم لەگەڵ کتێبێکی کەمال مەزهەر هەیە، بەر لە گێڕانەوەی سەربردەکەی وی، نووسەرێکی دی هەبوو، هەینێ لە چاو ئەوانی دی کەم کەس بە لایدا دەچوو، لێ من پەڕ پەڕ دەمخوێندەوە، هەبوو دەیگۆ:

سەر لە تۆ دەرناکەم، چەپیت و سەرسامیشی بەو پیاوە کونەخوازە، دژە مارکسیە.

هەندێ هەستم لە خۆم رادەگرت، نەمدەزانی چ بڵێم، گوێم پێنەدەدا و خۆم لە خوێندنەوەی وی نەدەبوارد، بە تایبەتی ئەو وتارانەی لە بارەی زمانەوە بوون، هەر ئەوان نا، بەرم لە مرۆڤ و دەوروبەر گرت و تا دوا لاپەڕە پشتم قیتنەکردەوە! هەر چی بڵاویدەکردەوە، دەمخوێندەوە، ئەو شەوەی لە نزیک پەردەکەش بە سەر تیرۆردا چووین کتێبێکی ئەوم لە دەست بوو، با ئەو سەرهاتەش بگێڕمەوە، هەینێ دەچمەوە لای مەزهەرەکە:

قەلات، زۆر نا، هەر هێندەی ژمارەی گەڕەکەکانی شار ئەستێرەی لێ هەڵاتبوو، لە (شەوانی هەولێر) دەگەڕاینەوە، لە پردی گامێشەوانان هەڵکشاین، نەگەیشتبووینە سەرە کۆڵانی مام عەلیی عارەب، لە هێکەوە تەپەیەک و بەربوونەوەیەک، گلۆپێکی کز، کە هەر تیشکی دوو سێ چراپەشکەی هەبوو، بەربوونەوەی پیاوێکی نیشاندا، بە نیازی هەڵگرتنەوە پێم هەڵێنا، شێخ جەلالی هاوڕێم پیلمی گرت:

کوڕە، چ دەکەی؟ هەڵێ، دەنا بە مل ئێمەدا دێ.

تا پێمان تێدا بوو هەڵاتین، لە هەڵاتنێ کتێبەکەم لە دەست پەڕی و کەوتە ناو چڵکاوێ، ویستم بۆی دابێمەوە، شێخ نەیهێشت، تا گەیشتینە پێش

دەرگـای مـاڵی شـێخ رانەوەسـتاین، مـاڵی ئەوان لە کـۆڵانە بەریـنەکەی ئەو دیوەی کۆڵانی دۆمانە، شێخ گوتی:

بە دەمانچەی بێدەنگ کوشتیان.

ئەو ئێوارەیە نوێ بوو، دەنگی بێ دەنگی دەمانچەی بێدەنگ و کوژرانی لە نزیکەوە بۆ من نوێ بوو، ئەو ئێوارەیە لە دووریی حەفت شـەقاوەوە تیرۆرم دی.

ئێ، با بێینەوە سەر باسی خۆمان، وەبیرمدێ، لەشێوەی خەون نا، وێنەی ئێستا، ساڵی هەشتا، نا، هەشتاو شتێ، لە کتێبخانەیێ دیتم، کەمال مەزهەر بە خەتێکی ناسـک بە سـەر کتێبێکەوەیە، بەر لەوەی ناونیشـانەکە بخـوێنمەوە، هەڵمگرت و دەسـتم بۆ بەرکـم برد، هەینێ من وابـووم، نـاوی ئەو پیـاوە بە سەر کتێبی سەدام حوسێنیشەوە با، دەمکڕی.

دەمەو ئێـوارەیە، بە دەم هەڵـدانەوەی (ئـافرەت لە مێـژوودا) سـواری ریـم بووم، سەرم بە سەر کتێبەوە، ئەگەر شوفێر بە:

کاکە، تۆ دانابەزی؟

لە خوێندنەوەی نەکردبام، تا تەواوم نەکردبا، دانەدەبەزیم، ئەوجا منی ماڵ لە بەلاشاوە، لە کوێ دابەزیبم باشە؟

لەو سـەری مەنتکـاوە، ئەهـا، کتێـب چیـت بە سـەر دێنـێ، خەت بە هەڵە دەخوێنیەوە، بە ماڵی خۆت ناکەویەوە.

ئـێ، بـا لە کتێبـان دوورکەویـنەوە، لە بەری بـاخی شـارەوە، ئەی رەقیبـێ بڵێینەوە.

## باخی شار بە ئەی ڕەقیبەوە

جوایەز لە بەهاران ئەو بەهارە شار سەرشارە، سەرشار لە تووڕەیی، پەنگدەخواتەوە و بەری پێناگیرێ. لێرە بەربەست دەخرێتە پێشی، لەو سەرە سەردەکات. ئەوڕۆ لەو دیوەی قەیسەری، بە لای چاخانەی کرێکاران، ئەوەی بەرانبەر دەرکەی گەورەی باخی شار سەریکرد، لەگینە سەرکردنەکە تەنها لێرەوە نەبێ، لێ من هەر هی ئێرە دەبینم. گوێدەیە، چ بژی و بڕووخێیەکە، لە قەلاتـــێ دەنگــدەداتەوە، نەبـــادا کەس نەبیـــنمەوە و لەبیـــرمبچنەوە، لەو خۆپێشاندانە لە دەوروبەری خۆم سیمای ئەو هاوڕێ و ناسیارانەم لە بینایی ماوە:

هەردوو ئەحـمەدی سـێتاقان و سـەیداوە، هەردوو یووسـفی سـەیداوە و سـێتاقان، هەردوو سـەرتیپ، هەردوو نەجـات، ئەوی درێـژ و ئەوی کـورت، لوقمان، شێخ جەلال، عیسا، محەمەد، خالید، برایم، قەرەنی، جەمال، سەلاح، رزگار، عەبدولا، کامەران، بەهرام، سالار... فازیل رێحانەش لە تەنیشتمە، ئەویش وەک من کیسێ بە دەستەوە، جووتێ پێڵاوی نرت و نوێی تێدایە، هەر من و ئەو نا، وا بزانم هیتریش هەبوون پێڵاویان دەگەڵ خۆ هەڵدەگرت.

تۆ وەرە، هێندە ساڵە بکشێوە پاشێ، بکشێوە ئەو سەردەمەی لە ئاست بەعس (نا) نەبوو، هەر دەبوو (بەڵێ) بڵێی. بەعس لە سەر (لەل)ێ زمانی مرۆڤی دەبڕی، دنیایێ میرغەزەبیشی رژاندبووە شار. بگەڕێوە ئەو سەردەمە و وەرە لە جێی من راوەستە، هەینێ دەزانی خڕبوونەوە لەو شوێنە، خۆ هەڵدانە ناو کوورەی ئاگر بوو، هەنگینێ ترسناکیی ئەو درووشمانەت بۆدەردەکەوێ، من ئێستاش کە بیرمدەکەونەوە، موچڕک بە لەشمدا دێ:

**حیزبی بەعس فاشیە**

**سەدام حوسێن نازیە**

بڕووخێ، بڕووخێ
سەدام حوسێن بڕووخێ
بژی، بژی
کوردستان با بژی
بژی هێزی پێشمەرگە
سەدام لە سەرە مەرگە

ئەوجا وەرە (ئەی رەقیب)یشی بە سەردا بکە، بەعس هێندەی لەو سرووودە دەترسا، لە هیچ چەکێ نەترساوە. تۆ ببیستە، ئەی رەقیب چۆن جادە و جادە، کۆڵان کۆڵان دەنگدەداتەوە، ببینە، چ لەرزێکی خستۆتە وەلەکە بەعسەوە، ئەی رەقیب بە جادەی نێوان قەیسەری و چاخانەی عەبۆ گەیشتە قەڵات. بە جادەی نێوان قەیسەری و بازاڕی سیروان گەیشتە کۆترەکە، لەگوینە پەڕیبێتەوە بەری جوولەکان، لەو لایەوە گەیشتە بن دیواری یانەی فەرمانبەران و ساکەگۆڕی ریمانی گرتەوە، بە بن پەرژینی باخی شاردا گەیشتەوە سینەمای حەمرا و جادەی شێخەڵا. لێرەوەش لەبەر دەم چاخانەی کرێکاران دایەوە کۆڵانی هەمیشە کەڕەسیسە و ئاپۆرای دەڵاڵخانە و بە بەردم مزگەفتی حاجی لەقلەق و شێخە رەشکەدا لە قەڵاتی دایەوە و سووڕایەوە بۆ لای (تەکنیکار)ی عەبدوڵخالیق مەعرووف.

لەگەڵ یەکەم (بڕووخێ) لە نزیکە من کوڕێ چووە سەر شانی کوڕێ، بە چاوی من چاودەنێ، وێنەیەکی سەدامی لە دەستە، گەورەیە، بە قەد سەرە مەزرا دەبێ، بە دەم (بمرێ سەدام)ەوە، سەدامی ونجرونجڕ کرد، پارچەی گەورەی هێندەی تەپڵەی جغارە نەمایەوە، بە هەوای دادا، خەڵکیش بە (تف تف) گرتیانەوە، حەیف بیرمناکەوێتەوە، ئەو کوڕە بوێرە کێ بوو.

کوڕێکی دی هەیە، پارچەیێ جەرگە، لەو لاوە دێ، چاودەنێ دەڵێی پڵنگە هەڵمەت دەباتە سەر سەدام، دەستی دەگاتە هەر وێنەیەکی وی، جێی ساغی ناهێلێ، کوڕە دێ و ئاگردەکاتەوە، ملدەنێ ئاوڕناداتەوە، ئەها سەدامێکی لە جامگیراوی لە دەستە، گەورەیە بە قەد لا دیوارێ، بە بەر چاوی بەعسەوە، بە عەردی دادا، ئەها، بە پێ چووە سەری. من ئەو کوڕە دەناسمەوە، بەڵام

ناوەکەیم بیرناکەویتەوە، هەوە، بەینێکە نەمدیوە، لێ دەیناسمەوە، ئەو کوڕەش(زێوەر)یە، هەوە، لەوێ چەند ساڵێ هاوپۆل بووین، دەیناسمەوە، هاوڕێی منداڵیم دەناسمەوە.

کوڕە زۆر پەلە، خۆی بە شتێکدا دەدا، لە بەر خۆمەوە نزادەکەم:

بێ بەلا بێ، لە دەستی بەعس بە دوور بێ.

ئێ، لە خڕ لاوە، لە کۆلان و جادەوە، لە سەر تەلارەوە، هاتن، وەلەکە بەعس بە چەک دارەوە هاتن، بووە تەق و تۆقێ، مردوو دەتۆقی، کەڕولاڵ گوێی خۆی دەگرت، دەستوەکەری، خۆبەکوشتدانە، پەرتە لێکردن و خۆشاردنەوە، سەرکەوتنە.

لە کۆلانی تووتنفرۆشان، لە فازیل رێحانە دابڕام، دامەوە کۆلانی دەلاڵخانە، تەقە گەرمە، لە بن مێوانخانەی مێرگەسۆر لوقمانی بەلاشاوەم دیت، بە دەم غاردانەوە بە مەیلە و گریانەوە گوتی:

کوشتیان، بە بەر چاومەوە کوشیان.

دڵم هاتە ناو دەستم و پرسیم:

کێیان کوشت؟

گوتی:

کوڕێکیان کوشت، نەمدەناسی، لەو کولانەی لای چاخانەی عەبۆ لە خوێنیان گەوزاند.

کاتێ گوتی نەمدەناسی، کەمێ هاتمەوە سەرخۆ، ئاخر نازانم بو یەکسەر هزرم بۆ فازیل رێحانە چوو.

وا بزانم لە پشت مزگەفتی شێخە رەشکە بوو، لەویش دابڕام. یەک بەو کۆلانانە خەڵک رادەکات، هەیە خۆی دەکوتێتە ماڵان، ماڵەکانی گەڕەکی خانەقا، هەیە وەک من هەر رادەکات، زۆر ناچار نەبێ، سەر بە ماڵان داناکات. ئێستا وا لە پشت گەرماوی عەلیاغام، دیارە بە گەرماو نەماوەتەوە و بۆتە مەیخانە و ناوەکەشی گۆڕاوە، ناوێکی وەک عەباسیی ناوە، دیارە بە هەردووکیان ئاشنام، بە منداڵی خۆم تێدا شووشتووە، بە نەوجەوانیش لێم خواردۆتەوە، ویستم بچمە مەیخانەکە، نازانم بۆ پەژیوانبوومەوە، لەو ناوە،

له پەنایێ کالەکانم فڕێیدا و پێڵاوە نوێکانم لەپێکرد، من هەر جارێ بێمە خۆپێشاندان، کالەیێ زیان دەکەم، هەینێ هەندێ لە خۆپێشاندەران، کالە، پێڵاوی توندوتۆڵیان لەپێدەکرد، تا خۆش ببەزن و بەردەستی وەلەکە بەعسیان نەکەون، منیش وام دەکرد، بەڵام جووتێ پێڵاوی نرتو نوێم دەگەڵ خۆم دەهێنا، دامەوە کۆڵانی مەزاری پەنجە عەلی. دیتم لەو سەرەوە، ترومبێلێکی سەر پڕ چەکدار بەرەو پیرم دەهاتن، رێم گۆڕی، دامەوە کۆڵانی پشت تەکنیکار، لەوێوە هەرچۆنێ بوو، بە لای شەوانی هەولێرەوە خۆم گەیاندە کۆڵانی سینەما سیروان، دەمویست لە سینەما خۆم بشارمەوە، دەرگا داخرابوو.

تەماشادەکەم، ئەو سەری کۆڵانیش، لای جادەی پەروەردە دەڵێم، چەکداری لێ راوەستاوە، نەوێرام بچم، خۆ رەنگە هیچیش رووینەدابا، بەڵام دڵێ من وای نەدەگۆ. من وام هەستدەکرد، هەموو دەمناسن و وەک گای قەش دیارم و لە شێخەشەلی پێشان دیارترم! هەر بمبینن، وەکات دەمگرن، نازانم بۆ هەستێکی وام هەبوو.

پەنا بۆ کوێ ببەم؟ مەیخانە (بار)ەکەی ئەوێم بیرکەوتەوە، ئەوی سەر سووچەکە، قاتی سەرێیە و روو لە قەلاتێ. سەرکەوتم و دانیشتم و بیرەم گازکرد، بە ترسەوە پێکم هەڵدا، دڵم دەڵێ، هەوکە نا دەمێکی دی، دێن و قۆڵبەستم دەکەن. نەمگوت!

دوو ئەمن بە ژۆرێ کەوتن، چاویان بە هۆڵەکەدا گێڕا، یەکیان چاوی خستە سەر من، تەواو، قەوما. چەند گێل بووم، لەو هەموو ماڵەی خانەقا، خۆم بە دەرگایەکدا نەکرد! ئاخر جێ بڕا بوو؟ بە پێی خۆم هاتمە بن دەستیان. خۆم گرت، خۆم تێکنەدەم و نەشێوێم، بیرەی خۆم فڕدەکرد، بەڵام دڵم هەزارەی دەکرد و هەناسەم گیرابوو.

ئای، خۆ رۆیشتن، ئۆخەی! هەناسەم هاتەوەبەر، باشە کێ دەڵێ ئەو دووانە ئەمن بوون؟ خۆ دەمانچەشم بە قەدیانەوە نەدی، رەنگە لە بەر خۆمەوە گوتبێتم: نا، شوێنێکی باشم هەڵبژارد، تا لێرە بم، پارێزراوم.

بیرەیەدیم گازکرد، هێواش هێواش هەڵمدەدا، بیریشم لای خۆپێشاندەران،

لای برادەرەکانم، لای فازیل ڕێحانە بوو، داخوا کێ کوژرا بێ، کێ گیرابێ؟ ئەو کوڕەی لەوێ کوژرا دەبێ کێ بێ، بەدەم خەیاڵی تاڵەوە، بیرەی تاڵم هەڵدەدا، لەگەڵ هەندێش هەستم بە شانازیەکی زۆر دەکرد کە پشکداریم لە خۆپێشاندان کردووە، هەستمدەکرد پاڤێلی ناو ڕۆمانی (دایک)م، هەستمدەکرد، جێگرەوەی (شێخە شەل)ی شارم، لەو هەستە خۆشەوە، بیرە خۆشتر دەبوو، بیرمنیە بە خەیاڵی خۆش و ناخۆشەوە چەندم نۆشی.

درەنگ هەستام، وام دانابوو لە خوارێ یەک دوو بابۆڵەشی بە سەردا بکەم، ئەوجا چ نەبووە، با ببێ، لێ کورتی هینا، بەرکم بەشی بیرەشی نەکرد، شتێکی کەمم لێبڕا، باشبوو شاگردەکە چاوپۆشیی لێکرد، هەرێم پێدا، دوایی پێیبدەم.

رۆژ هێشتا زەردەی مابوو، گەیشتمەوە لای ماڵێ، فازیل ڕێحانە ڕوو لە ڕێ پشتی بە دارتێلی یاد دابوو، بە دیتنی من شاگەشکە بوو، ئاخر وای دانابوو، من بەر دەستکەوتووم و ئێستا لە کونەڕەشەم و لە بن قامچیی میرغەزەبان لە گیانەلادام، وەها یەکترمان لە ئامێزگرت، وەک ئەوەی ساڵێ بووبێ یەکترمان نەدیبێ.

دوای شیو خواردن و پشوودانێ، هاتینەوە کۆڵان، سێ چوارێ کەوتینە گێڕانەوەی ئەوڕۆی شار، ئەوڕۆی بەرەنگاربوونەوەی شار. هەر یەکەو سەربردەی هەڵاتن و خۆشاردنەوەی خۆمان بۆ یەکتر دەگێڕایەوە، بیرمە لوقمانی بەلاشاوە، ئەو کوڕەی نازناوی هەرمانی بۆ خۆی دانابوو، بەر لە هەر شتێ گوتی:

مەکسیم گۆرگیێ لە ناو کورد پەیدا نەبێ، خۆپێشاندان بە کەس پیشاننادرێتەوە.

هەرمان گێڕایەوە:

دوایەی لە تۆ دابڕام، لە دەرگەیەکەوە چوومە ژوورێ، سەر بان کەوتم، سەر بان و سەر بان، نیوەی گەڕەکی خانەقام کرد، لە سەرە کۆڵانێ پۆلیسێکم دیت، کەوتبووە دوای کوڕێ، لە سەر بانەوە کەرتە کەرپووچێکم ڕائاڵاندێ، هەرگیز پلارم وا ڕاست نەبووە، ڕێک بە پشتە سەری کەوت،

پۆلیس گێژ بوو، کەوت. ئەگەر سبەینێ هەواڵی مردنی پۆلیسێکتان بیست، بە کەس نەڵێن هەرمان کوشتی!

دوای تەختکردنی پۆلیسەکە، دیسان سەر بان و سەر بان، لە نزیک مەیدانی مریشکان، لە سەر بانێ پاڵکەوتم، تا دنیا هێوربۆوە، لەوێ مامەوە.

سەربردەی فازیل ڕێحانەم، وەک خۆی لە یادگەم پاراستووە، تا بە چیاش کەوت ناوە ناوە، لە سەر خواستی من، بۆی دەگێڕامەوە، دوایوەش من ناوە ناوە بۆ خۆمم گێڕاوەتەوە، بۆیە هی لەبیرچوونەوە نیە:

نازانم لە ناو تووتنفرۆشانەوە تۆ چیت بە سەر هات؟ لە هەڵاتنێ چاوێکم لە ڕێ دیتنەوە، چاوێکم لە تۆ دەگێڕا، نەمدیتیەوە، بوویە بەردی بن گۆمێ. ئەمن دامەوە پشت باخی شار، لەوێوە، خۆم بە کۆلانێکی خانەقادا کرد، هەڵێ، تەقەمان لە سەر بوو، یەک بە کۆلان خەڵک رایدەکرد، ژن و پیاو، پیر و منداڵ، عەمۆ جەلیلیش دەگەڵ هەڵاتووان هەڵدەهات، رادیۆکەشی هەر بە بن گوییەوە بوو، گوێم لێبوو کەسێ پێیگۆ:

بەدبەخت، ئەتوو لۆ...؟

گۆتی:

ئەمنیشتان تووش نەکرد!

ئێ، درێژەی نەدەمێ، کۆلان کۆلان، لە هەندێ جێ سەر بان سەر بان، وا بزانم لە پشت گەراجی بەغدا بوو، لەگەڵ کوڕێک نەمدەناسی خۆمان بە ماڵێکدا کرد، ئەو لە پێشە من چووە ژۆرێ، پێیەکم هێشتا لە دەرێ بوو، ژنێ زرووکاندی، چ زرووکاندنێ! ئەگەر خانەقا لە باری هێمنی با، دە کۆلانی دەهێنا سەرمان، هاوڕێی هەڵاتنم توند زاری گرت، منیش لە دوای خۆم دەرگام شیش دا، ژنەی راکێشایە چاوەکەی پشتەوە، دەستی هەر لە سەر زاریەتی و قسەی بۆ دەکات:

خوشکێ، مەترسێ، ئێمە دز نین، حوکمەت راوی ناوین، کەمێ لێرە دەمێنینەوە و دەڕۆین.

دوایوەی تێر قسەی بۆ کرد، دەستی شل کرد، وای بۆ چووین تێمانگەیشتبێ و خۆی کڕ بکات، وا دەرنەچوو، قیژەیەکی حیلتری لێدا، کوڕە

توندتر زاری گرت و بەرزەفتي کرد، لەو ساتە گریەی زارویێ هات. دیتم لە لای بنەبانێ، لانک بۆ خۆی دەهەژێ، چوومە سەری، زارۆ لە بن دەسرازە خۆ رادەپسکێنێ، وا دیارە شیر و ئازادیی دەوێ، ئازادم نەکرد، بەڵام شیرم داێ، مەمە و شیر لەوێ بوو، دیار بوو تازە گیرابۆوە، گەرمایی تێدا مابوو.

ئێستا من مەمەی شیر بە زاری زارۆکەوە دەکەم و هاورێکەم توند زاری دایکی گرتووە، بە ژنەکە دەڵێین:

بەرتدەدەین، بەڵام هاوار مەکە و تووشمان مەکە.

لە چاو و سیمایڕا دیارە، ئەو گۆتەی بە گوێدا ناچێ، گۆتمە هاورێکەم:

پێدەچێ ئەو ژنە کوردی نەزانێ.

گۆتی:

جلکی کوردیی لە بەرە، بەڵام قەیناکە زمان دەگۆڕین، وا دیار بوو سێ شەپۆل بوو، بۆی کردە تورکمانی و عارەبیش، بەڵام بەلاش بوو، ئەو ژنە لە چ زمانـــان تێنەگەیـــی، ناچـــار بە چەفـــیەکەی خـــۆی، زاری بەســـت و بە کەلانکوچکەکەشـــی، دەســـتی لە پشـــتەوە بەســـت، هەر بە دانیشـــتنەوە، بە پەنجەرە نەویەکەیەوە گرێیدا:

دە بخۆ دەی

منیش گوتم:

منداڵەکەت تێر شیر دەکەین و دەڕۆین.

ژنە هیچ وەرناگرێ و پێ لە زەوی دەکوتێ، هاورێکەم دەڵێ:

وام لێ مەکە، بن هەردوو پێت داخ بکەم، ژنە کە ناوی داخکردن هات، لە پێ کوتـان کەوت و هەســتمکرد کەمـێ هێوربـۆتەوە و هـاتۆتەوە ســەرەخۆ، منداڵەکەش وەک بەرخی تێر شیر خەوت.

ئەوەی بە لامـانەوە ســەیر بـوو، کەس بە هـاواری ئەو ژنەوە نەهـات، تـۆ بڵێی هاواری نەگەیشتبێتە گوێی کەس، تێنەگەیشتم .

چـوومە حەوشـە، بە کـوورە کـوور ســەرکەوتمە ســەر بـانێ، چاوێکم بە کۆڵانـدا گێـڕا، گەڕەک ئاســایی دیـار بـوو، تــاک و تەرا خەڵـک دەهــاتن و دەچوون، وا دیارە هیچ لە گۆڕێ نەماوە.

گوتمانە ژنەی بەستراوە:

دەتکەینەوە، بەڵام هاوار بکەیت، زمانت دەبڕین .

هاوڕێکەشم دەستی بۆ بەر پشتێنی برد و گوتی:

خوا دەیزانێ ورتەت لێوە بێ، بە گۆری یەک گوللەی بێدەنگت دەکەم.

هەر بۆ ترسان بوو، دەنا دەمانچۆکەی منداڵانیشی لە بەر قەدێ نەبوو، بە منی گوت:

تۆ بڕۆ دەرێ، من کەمێکی دی دێم.

ئەز لە سەرە کۆڵانێ بووم، ئاوڕمدایەوە لە سەر دەرگا بوو، بە ئاماژە گوتی:

من بەو لایەدا دەڕۆم.

نەهاتە دوای من و نەمدیتەوە، هێندە بە یەکەوە بووین، ناوی یەکتریشمان نەزانی، بەڵام لە هەر کوێ بیبینم دەیناسمەوە، لێوی خوارێی هی لای چەپی، کەمێ کەل بوو.

من لە پاش هەمووان سەربردەی خۆم زۆر بە کورتی گێڕایەوە، دوای لێبوونەوە، بیرمە فازیل رێحانە بە پێکەنینەوە گۆتی:

لەو کاتەی من شیرم بە زاری منداڵەکەوە دەکرد، تۆ بیرەت دەخواردەوە.

ئەوانی دیش روو لەو:

دایەنێکی باشت لێدەرچوو.

ئەو ئێوارەیە لە بن دارتێلی یاد ئەو دارتێلەی جێ پەنجەی من و کەویاری پێوەیە، باس هەر باسی خۆپێشاندانی ئەوڕۆی شار بوو، باسی مەرگی رژێم و زایەلەی ئەی رەقیب و بژی و برووخێ و تەقە و کوشتن و گرتن و هەڵاتن و خۆشاردنەوە، گەیشتنەوەی ماڵێ بوو، باسی ئازایی و ترسنۆکی برادەران بوو، هەندێ لەوانەی لە شێنەیی زمانیان بستێ درێژ بوو، کەچی لەو هەموو خۆپێشاندانە، لە یەکیان نزیک نەبوونەوە.

بیرمە ئەو ئێوارەیە فارس بوو یان کەسێکی دی گۆتی:

خوام لەو رادیۆ حیزەی سەرێ نەماوە، هەر زانکۆ زانکۆیەتی.

پەنجەی لە سەر هەرمان راگرت و گوتی:

ئەو کوڕە کرێکارە سینگی خۆی دەداتە بەر گوللە و بە کەرتە کەرپووچ میرغەزەب تەختی زەوی دەکات، کەچی رادیۆ دەڵێ:

زانکۆی سەلاحەدین بە رووی بەعسدا تەقیەوە.

ئێ، لەوە گەڕێ، کێ دەیکات و بە ناوی کێ دەڕوات. هەر لەو درەنگانی ئێوارەیە، نازانم لە زاری چ کەسێکەوە بوو، پێکەوتین ئەو کوڕە ئازایەی لە چەقی بازاڕێ گوللەی گرتەوە و چووە ریزی گەشمردانی رێی ئازدیەوە، کێ بوو.

هەو بوو، برادەری منداڵیم بوو، ئەو کوڕە بوو کە بە بەر چاوانەوە سەدامی خستە بن پێڵاوان، هەو بوو، ئەو کوڕە بوو کە لە ناو بازاڕێ حاڵی شۆڕش گرتبووی، باکی بە هیچ نەبوو، لە هیچ نەدەسەنگرایەوە، سەدامی بە دیوارەوە نەهێشت. هەو بوو، کوڕە زێوەریەکە بوو، ئێستا ناوەکەیم بیرکەوتەوە، ئەوەی لەوێش بەو منداڵیە مەشقی بەگژداچوونەوەی داگیرکەری دەکرد و ئەی رەقیبی دەگوتەوە.

هەوبوو، سەلاح جەوهەری هاورێی منداڵیم بوو، ئەو بەر لەوڕۆ لە ئامادەیی (هەولێر) و من لە ئامادەیی رزگاری بووم، من لە جێی خۆم مامەوە و ئەو گەیشتە گۆڕستان.

بیرمە کە بیستم ئەوە، لەوێ لە بن دار تیلی یاد تەواوێ بۆی گریام، چەندی دەمکرد و دەکۆشام، فرمێسکم رانەدەوەستا، فازیل ریحانە دەستی لە ملم کرد و گوتی:

بەسە، چکی کە، هەندێ لەو فرمێسکانە بۆ من هەلگرە.

بیرمە بەو قسەیەی وی راچڵکەیم و رۆندک وەستا.

ئەوەشم لەبیرە، وا بزانم هەر ئەو ئێوارەیە بوو، ناوی سەلاح جەوهەر لە رادیۆی سەرێش خوێندرابۆوە.

لێرە گردبوونەوەیەکی دی خۆپێشاندانێکی دیم بیرکەوتەوە، ئەوەی من لە بەری کتێبخانەی خۆماڵیەوە تەماشامکردن و نەموێرا بچمە ریزیانەوە، ئەوەشیان هەر لەوێ لە بەردەم چاخانەی کرێکاران و باخی شار، بە:

**شۆڕشەکەمان شۆڕشی گەلە**
**هی کرێکار و ڕەنجبەرە**
کۆلانی دەلاڵخانەی هەژاند، ئەوەیان ڕەنگە پێشتر بووبێ، دوو سێ ڕۆژ دوای جێژنی کرێکاران، من لە ماڵێوە بە نیازی بەشداریکردن هاتبووم، بەر لە خولەکی دەستپێک، ترسێک دایگرتم و دوورکەوتمەوە، ڕەنگە ترسەکە پتر لە ژمارە کەمیەوە بووبێت، چاوم گێڕا، سەرکوتکەر پترن لە خۆپێشاندەر. ئیدی خۆم دزیەوە و لە جادە بەرینەکە پەڕیمەوە، دوو سێ هەنگاوم مابوو، بگەمە ئەو بەر، درووشمەکان گۆترانەوە و ئەی ڕەقیبی بە دوادا هات، بووە تەق و تۆق و شەڕە مست و پێلەقە، زوو کپ بۆوە، ئەو جارەش خەڵک زۆر دەستگیرکران، عومەر مەحموودی هاوڕێم یەک بوو لەوانە، کوڕێکی دیشم دەناسی، مەولوودی ناو بوو، هەر لەو سەروبەندەش بوو، ڕۆستەم باجەلانیش کەوتە بەندیخانی، بیرمبێتەوە، دوایی ئەو مامۆستایە زیندانیە دەخەمە چەند رستەیەکی ترەوە.
ئێ، با بگەینەوە ڕزگاری، خۆپێشاندانێکی دی پیشانبدەینەوە

## رزگاری

### - ئەی رەقیب لە خوێنەوە

رزگـاری دانـاکەوێ، لە خـوای دەوێ نیشـانەی بەهـار دەرکەوێ، تـا رزگاریتی خۆی دەربخـات و خـۆی پیشـانی گەرەک و شـار بـدات، لە کەژی بەهـاری، خـۆی لە نـاو پـۆل و حەوشـە نـاگرێ و بە ئەی رەقیـب و ئەی شـەهیدانەوە دەرژێـتە جـادە و مەرگـی زۆردار دەڵێـتەوە، رزگـاری بـۆ خۆپیشـاندان هەمیشـە سـوار و لە سـەر پێـیە، بەڵام لە بەهـاردا گەرمتـرە، رشتترە.

بیـرا مـن دێ، دیسـان بە (ئەی... ئەی... ئەی...) دەسـتپێکرد، هەینـێ ئێمەمانـان، بـۆنی دەمـی دەوروبەرمـان دەکـرد، پڕ بە دەم ( ئەی، ئەی)مـان دەگۆت، ئەگەر هەستمانکردبا کەشەکە لە بار نیە و (رەقیب)ەکە دەنگناداتەوە و کەس لەگەڵمان نایلێتەوە، دەهاتین (خودا)مان دەخستە جێی(رەقیب)ەکە:

**ئەی خودا لەو ئاگربارانە، بارانە**

**یار بە بێ تۆ ماڵم ورێرانە، وێرانە**

لە رزگاری جاروبار نەبێ، خـودا جێی رەقیبی نەدەگرتەوە، ئەو جـارەش هەر وا کەوتەوە، ئەی رەقیـب قـاتی سـەرێ و خـوارێی گـرتەوە. رزگـاری بە دەنگێ مەرگی سەدامی دەگوتەوە، سەدام بیستبای، لەرزی مەرگی دەهاتێ. رزگاری لە سەر سەرکردنە، هەر دیتت لە دەرگاوە رژایە کۆڵان و گەرەکی گرتەوە.

رزگاری ئەو جارە تێکەوت، تا بە خۆکەوت، دەوری گیرا، گورگی جادە دەوریان تەنی. وەرن، لە پەنجەرەکانی قاتی سەرێوە چاودەنە کۆڵان، هەرچی جرِوجامشتی چەک لەدەستی هەولێرە، هەموو رژاونەتە ئێرە، تفەنگیان روو لە ئـێمەیە، بە هەر لایـێ چـاو دەگێـرِی لـوولەی تفەنـگە. لە کەلێنـی چەک و

چەکدارەوە، دەبینم پلکە فاتم لە سەر دەرگا لە تاوان لە سینگی خۆی دەدا، دوایی ئەو پلکەم وەبیربهێننەوە.

بڕوانە، جەنگ ئەمما جەنگ، لە رزگاریەوە پەلە بەرد و پەلە دار و رەشکەرەوەی تەختەڕەش و هەر شتێ بەردەست دەکەوێ، رایدەئاڵێننە حوکمەت. لەویشەوە دەسرێژ دەسرێژ گولله بە سەر رزگاریدا گیزەی دێ. شەڕە بەرد و گولله درێژەی هەیە و ئەی رەقیبیش نابڕێتەوە، رزگاری گەمارۆ دراوە، گەمارۆدانێ زەحمەتە بێ خوێن بشکێ. لە نزیکە من کوڕێ بیرمنەماوە خەسرۆ بوو یان یەکی دی، سەر لە پەنجەرە دەباتە دەرێ، هاواردەکات:

**رزگاری لینینگرادە**

**سەدام حوسێن گەوادە**

دەسرێژێ لە پەنجەرە دوورماندەخاتەوە، کوڕێ دەڵێ:

ئێمە هەر گەمارۆ دراوین، بە قسەم دەکەن، با پێڵاویان تێگرین.

کەس بە قسەی نەکرد، کەس پێڵاوی دانەکەند.

من لە ترسی گولله چوومە خوارێ، ئێستا وا لە ناو ساکەگۆڕەکەم، ئەو شوێنەی جاروبار ئالای عێراقی لێ هەڵدەکرا، لەوێ گرتەیەکم دی، رۆژی سەد جار پیشانیبدەمەوە و بیگێڕمەوە لیی تێر نابم:

بەهرام, هەینێش بێ زەرد هەڵینەدەکرد، تەزبێح لەوێ، لە فانیلە و کراس دەبوو یەکیانی زەرد بێ. بە بەر چاوانەوە فانیلەی داکەند و بە جێی ئالای ناو ساکەگۆڕەکەیەوە کرد. رزگاریی هەینێ هەندێ زەردپەروەری ئاگرینی تێدابوو، بەڵام لە دژایەتی ئالای سەدام و عێراق کەم کەس هەبوو خۆشییان لە فانیلە زەردەکە نەیێ، چەپڵەیان بۆ شەکانەوەی لێدەدا. بەهرام یەکێ بوو لە کوڕە پڕ زاخەکان و لە چاوی بەعس نەدەگەڕاوە، ئەو کوڕە بوێرە بە بەر چاوی یار و نەیارەوە، وای کرد، فانیلە زەردەکەی لە جێی وی هەڵکرد، ئەوەش خۆ هاویشتنە سەر چەقۆیە. فانیلە دەشەکایەوە، لە بن فانیلەوە ئەی رەقیب و بمرێ سەدام دەنگیدەدایەوە و گورگانی جادەی تووشی سەرسوڕە کردبوو.

رزگـاری هەرگیـز وا پیسـی لـێ نەقەومـاوە، وا بە گـورگی جـادە دەور نەدراوە، سەر دەهێنێ و دەبات، چاو دەگێڕێ، نابینێ، ڕێیەکی وا نابینێتەوە، تا لێیەوە گەمارۆی گورگان بشکێنێ، درِ بە تفەنگچیان بدات و رزگار بێت و بە رزگاری بمێنێتەوە.

رزگـاری لە سـەر بـان و بەر پەنـجەرانەوە، لە ڕێـی ئەی رەقیـب و ئەی شەهیدانەوە، بە سێ دەنگا گازدەکاتە گەڕەک:

کوڕەکانت دەگەڵ مەرگ دەستەویەخەن، لێ کۆڵنادەن.

گەڕەک پشتی لە کوڕەکانی خۆی نەکردووە، بەڵام تفەنگچی سـەرە کۆڵان و سەربانی ماڵانیان گرتووە، هەر ژنێ، هەر منداڵێ، هەر کێ سەر دەربهێنێ، بە گـوللەیێ لە ژۆرێـی دەکەنەوە. دواتـر بیسـتمانەوە هەر سـەیداوە نـا، لە دوورەوەش لە (کوردسـتان) و (هەولێـر) و (ئـازادی) و(زۆزان) و(گـارە)ی کچانیشـەوە، کاتێ هەواڵی گەمارۆدانی (رزگاری)یان بیستبوو، کوڕ و کچ ویستبوویان بە هاناوە بێن، بەڵام ڕێیان لێ دەگیرێ، هەندێکیان ڕێ دەگۆڕن، لـێ تـا دەگەنـێ، دۆر دەدرێ و تەقەی دەبـڕێ، بیرمـاننەچێ، گـارەی کچـان هەمیشە بە هانای رزگاریەوە دەهات.

رزگاری دەرگای لە سـەر خـۆی داخستووە، دەرگایەکی گەورەی بتەو، زۆر بـتەو دەڵێـی لە داری گـوێزە، زیـل خـۆی پێدادا ناشـکێ و لە ڕێسـمە هەڵناکێشرێ. لە دیوی دەرێوە حوکمەت وا پاڵی پێوەدەنێ، لە دیوی ژوورێ کوڕانی رزگاری بوونەتە پشتیوانە. کێشمە کێشمە، جارێ دیار نیە هێز بە لای کێدایە، دەرگـا بە سـەر رزگاریدا دەکەوێ، یـان بە رووی حوکمەتدا بە پێوە و بە داخراوی دەمێنێتەوە؟

رزگـاری دەرگـای گرتـووە و لە پەنجەرەکانیشـەوە بە درووشـم، بە ئەی رەقیب شـەڕی حوکمەت، شـەڕی فیشـەک دەکات. هـێ لە سروود، هیچی بە دەسـتەوە نەمـا، چەکوچـۆلی رزگـاری کەمـێ کـوچکە بەرد و پەلە دار بـوو، دارلاستیقکەی بەختیار بوو، ئەویش برا. رزگـاری دوا پەلاری هەڵدا، چ بکـات باشە!

لێرە وا چاکە کەوانەیەکی گچکەی گەڕانەوە و گێڕانەوە بۆ ئەو دارلاسـتیق

به دەستە بکەمەوە، نەوەک لەبیرمبچێتەوە:

ناوی وی بەختیارە، دەگەڵ من هاوپۆلە، لە گۆتە و کردەیرا دیارە، سەر بەو پارتەیە کە درووشمی نیشتیمانێکی ئازاد و گەلێکی بەختیارە. ئەو کوڕە، برۆ بەرکی بگەڕێ، دارلاستیقی تێدایە، بەڵام وێناچێ بەردێکی لە باڵداری گرتبێ، دارلاستیقی وی بۆ شەڕە، شەڕی ئەمن و چەکداران. ئەو دارلاستیق لە بەرکە بوێرە خۆپیشاندان لە کوێ بێ، لەوێیە، گرتەکەی ناوشار، ئەوەی لای قەیسەری نزیک چاخانەی عەبۆ، بوێریی بەختیار جوان پیشاندەداتەوە:

ئەها، لە ناو جادە، لە ریزی خۆپیشاندەران وەک پەلیک دەردەپەڕێ، پڕ دەداتە سەدامێکی گەورەی لە چێوە و جام گیراو، لە چاوترووکانێ دەگەڕێتەوە ریز، سەدام بە زەوی دادەدات و دەکەوێتە سەری، دەکەونە سەری، سەدام لە بن پێیان قرچ و هۆڕیەتی، دەشکێ، دەدڕێ. لەو ساتە ئەمنێکی تەژە هێرش بۆ بەختیار دەهێنێ، لە ترسا لێی تێکدەچێ، لە جیاتی بەختیار، پیلی کوڕێکی دی دەگرێ و رایدەکێشێ، بەڵام کوڕانی رزگاری، کوڕانی شار لێی دێنە دەست، چەکی دەکەن و بە وێنەی وێنەکە دەکەونە سەری و دەیکوتن. ئیدی لە خڕ لاوە دەبێتە تەقە، کوڕانی رزگاری پەرتەی لێدەکەن و هەر یەکە بە لایێ.

ئەو بەختیارە، زوو بە چیا کەوت، من بەهارێک لە بەری چیای گارە دیتمەوە، دارلاستیقەکەی بووبووە تفەنگ، بەژنی باریکی لە بن فیشەکان زەرددەچۆوە.

ئێ، بیرا من دێ، بە بیری هەندێکماندا هات، کورسی و مێزان تێکبشکێنین و درێژە بە شەڕ بدەین، لەو ساتە، دەرگا درا بەر فیشەکان، کەڵکی نەما لە پشت و ئاستی دەرگا رابوەستی، حوکمەت بە زەبری گوللە دەرگای کردەوە، کەوتە سەر پشت، لە سەر دەرگا تێهەڵقژانێ روویدا، رزگاری و حوکمەت کەوتنە شەڕە مست و پێلەقە، بەڵام تەقە نەیهێشت درێژە بکێشێ. تەقەیان کرد، رزگارییان دابێژا و رشاند، دیوار و بن ساپیتەیان رشاند، بە بەر چاوانەوە خوێن رژا.

حوکمەت هێشتا هەر لە سەر دەرگاوە تەقە دەکات و زاخی نیە بێتە

ژۆرێ، ئاخر دەزانێ خوێن ڕژاوە و ڕزگارییش خوێن بەر چاوی گرتووە، بۆیە بە پارێزەوە، بە ترس و لەرزەوە دێتە پێشێ، گیزە ویزەی گوللە ڕزگاریی کاس کردووە، بەڵام هێشتا زاری نەبەستووە و لە ئەی ڕەقیبی خۆی نەکەوتووە، دیارە ئەوەش تا سەر نابێ، ئاخر دەزانێ چ میرغەزەبێ هاتوونە بۆ گرتنی ڕزگاری، بێ چەک پێش بەو هێزە ناگیرێ.

هەوکە ڕزگاری دوو ڕێی لە پێشە، سێیەم نیە، یان خۆ بەدەستەوەدان، یان خۆشاردنەوە و هەڵاتن، هەندێ ڕێی لای ئاودەستەکانیان گرت، بەو نیازەی لەوێوە دەرگایێ، پەنجەرەیێ، کونێ، ببیننەوە و لێیەوە دەرچن. هەندێکمان لە پشتەوە، بە دیوی سەیداوەی قوڕەوە، ڕێیەکمان دیتەوە، بیرم نیە چ مامۆستایێ بوو، ڕەنگە ئەسغەر بووبێ، دەرگایەکی بۆ کردینەوە، نازانم کۆگا بوو چ بوو، هەندێکمان لەوێش ئۆقرەمان نەگرت، لە شێوەی پشیلە سەر بان کەوتین، لەوێوە بۆ سەر دیواری بڵندی حەوشە، حەوشەی ڕزگاری.

دیارە سەرکەوتنە سەر بان و لەوێوە بۆ سەر دیوار و لەوێشەوە بۆ کۆڵانە تەنگەبەرەکەی ئەو دیو، وا سانا نەبوو، بەڵام ترس بەرزی نەوی دەکات، ئیدی بەشێکی ڕزگاری لەو ڕێیەوە ئاودیوی سەیداوە بوون و لەوێشەوە بۆ ماڵان و سەر بانان.

ئێستا ئێمە چوارین، ناوی یەکیان بە برایم لە گوێمدا دەزرینگێتەوە، با برایم بێ، سووکە برینێکی پێوەیە، بیرمنیە گوللەی وێکەوتووە، یان بەر شتێ کەوتووە، لە ماڵێکین، داک و کیژێ لە ماڵێنە، داکە کیژەی ناردە سەر دەرگا و پێیگوت:

لە سەر کۆڵانێ چەکدار، شتێکت بینی، وەکات هەواڵ دەهێنی.

بە ئێمەشی گوت:

کوڕی خۆم، مەترسن، لە ناو بوخچەم شاردبنەوە، ناهێلم بەر چنگی ئەو گورگانە بکەون.

ئەز دزانم ژنانی سەیداوە هەرێ نادەن، هەرکە دایان، سەریشیان تێدابچێ، دەیبەنە سەر، بەڵام دڵی من ئاوی نەخواردەوە، ئاخر کاتێ بەعس لە

ماڵان دەکەوێتە گەڕان بە دوای مرۆڤدا، کوێ ناگەڕێ؟

تەشکەبەڕە هەڵدەداتەوە، دەرگای سەهۆڵا، دەکاتەوە، ناو کونەبا و قەدی نوێن دەگەڕێ، سەر بە سەر کوپە و تانکی ئاوێ دادەگرێ، هێ لە هەندێ هەینێ من وا هەڵکەوتبووم، لە دوای پەرتەلێکردن و هەڵاتن، نەمدەتوانی لە ناو ماڵان خۆم بەرزەفت بکەم و بمێنمەوە، حەزمدەکرد سەر بان و بان، کۆڵان کۆڵان هەڵێم، تا دەگەمە دەرەوەی جغزی مەترسی نەوەستم، بە نابەدڵێ لە نزیک پەنجەرە، روو لە دەرکەی حەوشێ دانیشتم.

ئەو کۆڵانەش وەک کۆڵانەکەی ئەو دیو تەنگەبەرە، کۆڵانی منداڵی دەڵێم، ئەوەی لە شێوەی پیت(T ) ی گەورەی لاتینیە، نزیک لە شێوەی ئەوە، لەو سەرەوە، بەری رۆژاواوە، بەری خانووە بەردینەکانەوە هاتنی هەیە و دەرچوونی نیە، ئەو ریزە ماڵە دەرگایان روو لە دیواری بڵندی رزگاریە.

ئێ، ژنە ئاوی هێنا، دوو سێ جارێ چووە دەرێ، کتری خستە سەر ئاگرێ:

مەترسن، گورگ بێرەدا نایێ، ئێستا سەر و چایە بخۆنەوە، کەنگێ گەڕەک هێوربۆوە، بەکاوەخۆ هەرکەسە و بۆ ماڵی خۆ .

کاتێ برینەکەی برایمی دی، مستێکی نەرمی لە سینگی خۆی دا. چوو، دەرمانی هێنا، بە دەستی خۆی برژاندیەوە و تیماری کرد. هێشتا چایە دێمی نەکێشابوو، لە پەنجەرەوە چ ببینم! گورگ، پۆلیسێ بە چەکەوە وا لە سەر دەرگایە، ئەوجا وەرە زراوت نەڕژێ، لە دڵێ خۆ لەوەیە یەک دوو رستەی نزیک لەوەم گوتبێ:

قوڕمان وەسەر، ئەو ژنە هەرێی ژنانەی نەبردە سەر.

یەکپێ بەرەو پێپلکانەکە چووین، پێشترێ چاومان بە حەوشە و بانەکەدا گێڕابوو، رێی هەڵاتنمان دانابوو، لەو ساتە ژنە بە ئاوازەیەکی دایکانە:

کوڕم، خۆ تێکمەدەن، ئەو گێلە هی خۆمانە.

روو لە پۆلیسەکە:

هەی هێڕە، چ دەکەی لێرە ؟

گوێمان لێیە، پۆلیس دەڵێ:

هاتم بلێم بێ خەم بن، کەس نایەتە ئێرە، ئەو جادێهی چەکداری لێیە، جارێ سەر نەهێننە دەرێ.
مەبەستی ئەو جادەیە بوو کە لە لای (رێکخراوی فارووق)ەوە بە تەنیشت خانووە بەردینەکانەوە دەگەیشتە بەر دەم یەکەم ریزە خانووی سەیداوە، تۆ بلێی نزیک ئەو کۆلانەی چوار هەلاتوو لە مالی ژنێکی میهرەبان خۆیان حەشارداوە.
کەس رێی بەو فارووقە نەکەوێ، ئەوانەی دیتبوویان دەیانگۆ:
ئەمنخانە، لە چاو فارووق مێوانخانەیە .
ژنە بە تووڕەییەوە:
مێشکە کەر، ئەو جا بە چەک و بەو جلکەوە خۆ پیشانی ئەو کوڕانە دەدەیت؟
پۆلیسەکەی رەوانەی سەرە کۆلان کردەوە، کیژەکەی سەرکۆنە کرد، دلی ئێمەشی دایەوە، بۆی روونکردینەوە کە پۆلیسەکە کەمێ تام گێلە، بەلام کوڕێکی باشە و زمانی ببڕن، زمان لەکەس نادات و کەس تووش ناکات، ئێمە باوەڕمان هات، بەلام من لەوە پتر ئۆقرەم نەگرت و گۆتمە برایم و وان:
دێن وەرن، نایێن دەڕۆم.
نەهاتن، ژنکەش زۆر هەولیدا بمێنمەوە، ملمنەدا، ئەوەشم لەبیرە گوتی:
وریابە، ئەو مالەی پشتیان بە پشتمانەوەیە جاشن.
لە سەر پێیلکێ هەستمکرد پێیەکم گران لە دوام دێ، نەرمەی رانیشم ژانێکی توندی تێکەوت، ئەوە لە کوێ هات!
بیرمکەوتەوە، خۆ من لەوێ لەو دەمەی وەلەکە بەعس وەژۆر کەوتن، قۆنداخە تفەنگێکم وێکەوت، دیارە تا ئێرە گەرماو گەرم بووە، هەوکە لێم دەرکەوت، قۆنداخەکە کاری خۆی کرد و نەرمە شەلینێکم پێوە دیارە.
ئێستا بە دەستی رۆژهەلاتا، تۆ بلێی بەرەو ناوەندی گەڕەک، بە کووڕە کووڕ و نەرمە شەلینێ بە سەر ستاراندا بازدەدەم و سەربان لە سەربانم وەردەگرێت. لە سەربانێکەوە هێندە بلند نەبوو، بە خۆشۆڕکردنەوە لە کۆلانێکی تەسک کەوتمەوە، لەو ناوە هەندێ هەلاتووی وەک خۆشم دیتەوە.

له سەرە کۆڵانی ماڵی جۆلاکە، سێ چوار منداڵ گچکەتر لە تەمەنی ئەو کچۆڵەی کە لە سەرە کۆڵانەکی دی لە شێوەی خدری زندە دەردەکەوێ، بە دەم ساپساپانێوە ئەی رەقیبیان دەگۆتەوە.

لەوێوە بە دەستی راست پێچمکردەوە، یەکپشی هاتم، لە سەر سیلەیێ منداڵەکە وەک بلێی بزانێ لە دەستی گرتن هەڵدێم، گوتی:

بگەرێوە ئەسکەر هاتن.

بە قسەم کرد و هەر پێیەکم کردە سێ پێ، لە هەڵاتنێش بە خۆم دەگۆت، دوور نیە ئەو منداڵە بەزمی پێکردبم. بەر لەوەی بدەمەوە کۆڵانێکی دی، لە سەر سیلەی خانووەکە ئاورێکمدایەوە، چوار پێنج چەکدار دەرکەوتن، سوپاس، خدری زندە گچکۆکەکە.

پشتم لە رۆژهەڵات کرد و رووم کردەوە رۆژاوا، لێرە و لەوێش، لە سەر بان و سەرە کۆڵانان، تاکوتەرا کوڕانی رزگاری دەبینم.

تووشی ناسیارێ بووم، عارەبانەی رادەکێشا، گۆتم:

کاک رەحمان، بیدە من رایدەکێشم، تۆ پاڵی دە.

کەمێ لێم راما، زوو تێگەیشت، گوتی:

باشە، بەڵام کەمێ سپیت دەکەم.

چنگە ئاردێکی سەر عارەبانەکەی بە شەرواڵەکەمدا پژاند، چوومە جێی وی، دیارە ئەویش لە بێ کەری ئەو جێیەی گرتبوو. ئیدی بە وینەی هێسترە شەلە عارەبانەم راکێشا، لە راستی کۆڵانی ماڵی پیاوە ئاسمانیەکەوە، ئەو هونەرمەندەی هەیبێ، هەندێ لە خۆپێشاندەران، هێزیان لە (هێزی گەل) و (سەدەی بیستەمە)ی ئەوەوە وەردەگرت. لەوێوە چوومەوە سەر ئەو جادەیەی تخووبی نێوان سەیداوە و خانووە بەردینەکانە، ئێرە پڕ چەکدارە، لەوێوە دەستی لای کەندەکەم گرت، رەحمان بە هێواشی دەیگۆ:

بازۆ، تا ماڵی خۆتان لە دواتم.

بەڵام هەر لە ناو سەیداوە ئەوم بەرێکرد، دەو کەند و کەند، بەرەو جادەی شێستمەتری هاتم، لەو رێیە هەندێ هەڵاتووم دیتەوە، یەک لەوانە موحسین حەمەد بوو، لە دۆخی ناو رزگاریم پرسی، ئەویش نەیدەزانی بریندار و

گیراوەکان کێن، لە کەمێ سەرتر، لە زاری کەسێکی دی هەواڵێکی تاڵم بیست:
+ وا بزانم ئومێدیان کوشت.
-کێیە ئومێد؟
لە بای غارێ شتێکی گۆ، تێنەگەیشتم.
هاتم، لەو سەرە کۆڵانەی دەچێتەوە ماڵی پیاوە سپیەکەی شار، ئەو کاکە زیادە دەڵێم کە لەو دیو دەریاکانەوە بە بەرگ و دڵێکی سپیەوە گەڕایەوە سەیداوە، لەو سەرە کۆڵانەوە:
کوڕم، ئەوە تۆی!
ئاوڕدەدەمەوە، دایک و بابمن، بەلاشاوەییان بۆ سۆراخی کوڕەکانیان، هاتبوونە سەیداوە، هاتبوونە دەوروبەری رزگاری، لەوێ لە زارێکەوە بیستم:
نیوەی رزگارییان راپێچاوە، برینداریش گەلەکە.
پرسیم:
کەس کوژراوە؟
گوتی:
نەمزانیوە.
لە ریێی، لە رۆییںی زۆرم لە خۆم دەکرد، داک و باب شەلینم نەبینن، نەرم نەرم هەنگاوم دەنا، هەستیان پێنەکرد.
رانم ئازاری زۆرە، هەڵیدەدەمەوە، لە کەرتە ئاوێنەیەکەوە دەبینم، جێی قۆنداخ شین و مۆرە، دایکم پێیزانی، چوو نیورمەی هێنا و لێینا، ئەو شەوە لە بەر ژانی ران و خەمی رزگاری، کەوتمە خەوێکی پچڕپچڕەوە، نەمزانی چۆن رۆژ بۆوە.
با بچینەوە رزگاری، بزانین و باسوخواس چیە، کێ ماوە، کێ گیراوە؟
ئەوڕۆ بەرێ خۆ دە رزگاری، تووڕەیە، خوێنی دیتووە، ئاگری لە چاو دەبارێ، دیسان ئامادەیە بۆ گەڕێکی دی، گەڕی خۆپێشاندان، بای خوێن هەڵیگرتووە، لە چاویرا دیارە، چاوەڕێی یەک دوو (ئەی، ئەی...)یە، رزگاری راناوەستێ، داوای کوڕە گیراوەکانی خۆی دەکاتەوە.
مامۆستاکان غەمبار دیارن، دەڵێی خۆڵ و دۆیان بە سەردا کراوە، رەنگە

هەندێکیان لە ئێمە دوورتر بڕوانن و بزانن کە بەعس بە (ئەی ڕەقیب)ی ڕزگاری و چەند جێیێ ناڕووخێ.

لێرە گوتەی دوو مامۆستام بیرکەوتەوە، حەزمکرد بکەوێتە ناو کۆڵان کولانەوە، مامۆستا محەمەد ئیسماعیل تی کردمەوە و گوتی:

تۆ چاوت لە سەرە، زۆر وریای خۆت بە، با لە دەستنەچی.

مامۆستا مەلاکە، ئەوەی بە جبە و مێزەرەوە، وانەی دەگوتەوە، گوتی:

من هەر خەمی تۆم بوو، خۆ باشی؟

گوتم:

باشم، تەنها قۆنداخێکم پێکەوت.

گوتی:

قۆنداخ چ نیە، وریابە گرتن و کوشتنی بە دوادا نەیە.

ئێ، پێ پێ، کاشی کاشی، بە دوای دڵۆپە خوێندا دەگەڕێین، سەر بە پۆلەکاندا دادەگرین و دەپرسین، وا دیارە گیراوەکان دوو پۆلێ دەبن، برینداریش کەم نین، لێرەوە هەندێ گرتەی دوێنێی ڕزگاری، گرتەی خوێناوی، نیشاندەدەمەوە، بە چاوی خۆم نەمدیتن، بیستمن، بیستنێ لە شێوەی دیتن:

کوڕێ هەیە، هی بەلاشاوە، حوسێنی ناوە، ئەو کوڕەش لە دەرگای لای ئاودەستەکانەوە خۆی دەگەیەنێتە سەر تەیمانە ئاسنینەکان، لەوێوە کەرتکە کەرپووچێ رادەئارێنێتە وەلەکە بەعسیێ، کوڕ نیشانشکێنە و پەلار بە خەسار نادا، وەلەک هاواری لێ هەڵدەستێ، دیارە ئەوانیش سەگڤانن، پێڕەوی یەک بە یەکیش دەکەن، تێی دەگرنەوە و دەیپێکن، جێی کەرتە کەرپووچیش گوللەیە، کەرپووچەشێن گوللەیێ دەگرێتەوە و دەکەوێ و بەردەستیان دەکەوێ، گورگ لوولی دەدەن و دەیبەن، هەشت نۆ دە ڕۆژێ لە خەستەخانە و بەندیخانە دەمێنێتەوە.

کەرپووچەشێنەکەی بەلاشاوە، ماڵیان سێ چوار کۆڵان لە سەرێی ماڵێ مە بوو.

کوڕێکیدی بەلاشاوە، محەمەدە، هەندێ بە کوڕی مەلا ناوی دێنن، خۆیشی

کرمـانجی بە خـۆیەوە نـاوە، ماڵیـان لەو بەرەی گەڕەک، بە لای مزگەفتـی دەرویـش برایمـدایە. ئەوەش کـوڕێکی سەرڕاسـت و ئـازایە و خـۆی لە خۆپێشاندان نادزێتەوە، بۆ بەدبەختی رانکوچۆغەیەکی نرت و نوێی لەبەرە و هێشـتا دەقـی نەشـکاوە، چ بزانـێ گـوللەیێ دێ و شـەرواڵی نـوێ کوناودەردەکات.

هەموو مەمنوونی گوللەی لەو شێوەن، گوللەیێ رێی نەکەوێتە ناو گۆشت و هێسکەوە، گوللەی بێ خوێن، گوللەی ئەوها با هەر بێ، شـەرواڵ بەلاگێڕە، خـۆزی بە کەڕەتـێ هەزار گـوللەی وا دێ، نەک ئەوەی کتێـبەکەی لە خـوێن وەردا.

خـوێن و کتێـب، سـەربردەی زۆرە لەو شـارە، هێنـدە زۆر ئەگەر بینووسیەوە، کتێبێکی گەورەی سوور پڕدەکاتەوە، ئەوەی رزگاری دێرێکە لەو کتێبە سوورە، خوێنی سەر ئەو کتێبە، خوێنی ئومێدە، کتێبەکە لە دەستی ماجیدە، سەربردە لە زاری کوڕەی کتێب لە دەستەوە:

گوللەیێ هـات، نە سـەری کـرد نە کـورت، رێـک بە ئومێـد کەوت، خـوێن فـیچقەی کـرد، جـۆگەلەی بەسـت، چمـا گـولله ئەو هەمـوو خـوێنە دەهێنـێ! پڕمدایێ، منیش بە کتێبەوە کەوتمە خوێنەوە... تا درەنگیش وەک یادگاریەکی خوێنین، کتێبە خوێناویەکەم بە خوێنەوە پاراستبوو.

هەر لەوێ کـامەرانێکیش بە زگ گـوللەیێ دەگـرێتەوە، خـوێن لە خـوێن دەکاتەوە، خوێنی سەرهەنگەکەش هەر لەو ناوە دەڕژێ و رزگـاری سـوورتر هەڵدەگەڕێ .

زامەکەی دیدەوان لەگینە لە زامی هەمووان بە سوێتر بووبێت، لە چاو و زاری (ئـازاد)ە وەرزشـوانەکەوە، وێـنەکە جـوانتر دەردەکەوێ، ئەو کـوڕەی ئەگەر ئەو نەبا، دەرگای لای ئاودەستێ زەحمەت بوو بشکێ:

دوایـوەی دەرگـای دەربـازبوون کەوتە سـەر پشـت، بە پارەپەسـووان گەیشـتینە حەوشـە، چ بزانین لە سـەر بانەکانەوە، لە خر لاوە دەماندەنە بەر دەسـڕێژان و خـوێن دەڕژێ، بە پرتـاو خۆمـان بە ژۆرێدا کـردەوە، هـاتینەوە ساکە گۆرەکە و ناو پۆلێ، چاوم لێیە فانیلەکەی بارام هەر وا دەشەکێتەوە.

دێدەوانم دیت، بە شەلە شەل هات، نەگەیشتەوە ناو پۆل، لە نزیک فانیلەکە کەوت، خوێن لە بەری دەڕۆیشت، ئەمنێک کەوتە سەری، بە دار وەرگەڕاوەتە سەر برینەکەی، بە زمانی دۆزەخ دەڵێ:

ئەوە بوو، ئەو سەی کوڕی سەیە بوو، وێنەکەی سەرۆکی شکاند، دڕاند.

ئەوجا تۆ بیریلێبکەوە، بە بەر چاوانەوە وا لە بریندارن بکەن، ئەدی کاتێ راپێچی کونەڕەشەیان دەکەن، داخوا بە چ دەردێکیان دەبەن، ئەو کەسەی بریندار دەبێ و بەردەستیان ناکەوێ، چەند بەختەوەرە!

سینان لەو بەختەوارانە بوو، ئەو کوڕەش گوللەیەکی گرتەوە و کەوت، بەڵام بەخت یاوەری بوو، مامۆستاکان، ئەوانەی دڵیان بۆ رزگاری لێیدەدا، زوو بە هانایەوە چوون و لە پەناو پەسیوان شاردیانەوە و نەیانهێشت بکەوێتە ناو چنگ و زاری وەلەکە بەعسیان.

رزگاری خوێنی زۆر لە بەر رۆیشتووە، جێیێ لە دار و دیواری نابینیەوە، دلۆپە خوێنی کوڕەکانی پێوە نەبێ، بریندار چەند هێندەیە، بەڵام دوای هێندە ساڵە هزرم بەربادە و هەر هێندەم لە یادە. نەخشاوترین نەخشەی خوێن، ئەو ناو لەپ و چوار پەنجەیە بوو کە بە سەر دەرگای پۆلێکەوە نەخشابوو، پەنجەی پێنجەم دەرنەچووبوو، بیرمنەماوە خاوەن خوێنەکە کێ بوو، گێڕایانەوە:

ئەو دەمەی لە خوێنیان گەوزاند، هەستایەوە و دەستی خویناویی بەرزکردەوە و پڕ بە هەوکی:

**تا بە خوێن نەخشی بکات تاجی ژیان**
**کەس نەڵێ کورد مردووە، کەس نەڵێ کورد مردووە...**

گیراویش بێ هەژمارە، هەموو تەختەرەشەکان پڕکەمەوە، ناو ناوی بە دوادا دێ و تەواو نابێ، ئەو رۆژە رزگاری بووە داستانێ، بەڵام کەس نەبوو بیچڕێ، بیڵێتەوە، بیگێڕێتەوە.

ئێ، ئەوانەی مابوونەوە، ئەوانەی پێڕانەگەیشتن، یان نەیانویست بە سەر دیواردا ئاودیو بن، هەر ئەوانە بەشی دووەمی داستانەکەی ئەو رۆژەی رزگاری بگێڕنەوە، باشبوو من زوو قووچاندم و بازمدا و نەکەوتمە دەستی

خزەیرەکـان و دوا دیمەنـی دوینێـی نـاو رزگـاریم نەدی، قـامچی و بۆیـاخم نەدی، ئەو رۆژە زۆر کەس بەزمی قامچی و بۆیاخی گێڕایەوە:

دوایوەی خزەیری میر غەزەب، چەنەی شل بوو، رێیدا بڕۆین، لە سەر دەرگا، ئەو دەرگایەی گوللە خستیە سەر پشت، کۆمەڵێ ئەمن بە قامچی و پەمپەوە، پەمپی بۆیاخ راوەستابوون، هەر کێ دەچووە دەرێ، قامچیەکە بۆ پشت یان بۆ لا رانی، پەمپیکیش بۆ لا روومەت یان نێوچەوانی، هەشبوو بە شێوەیێ دەردەپەڕی، نە قامچیی دەگەیشتێ، نە پەمپ.

ئەو رۆژە ئەمن کوڕانی رزگارییان بە بۆیاخ نیشان دەکرد، تا لە رێ، لە ئەی رەقیبێکتر بناسرێنەوە، لەگەڵ هەندیش هەندێ لەو کوڕانە لە رێی ماڵێ بە خۆ ناوەستن لە جادەی لای کۆماری و رووناکی، بە دەم ئەی رەقیبەوە کۆمەڵێ ترومبێل دەدەنە بەر خڕکە بەردان.

داسـتانەکەی ئەو رۆژەی رزگـاری، سـەربردە، سـەربردە خوێنـاوی و فرمێسکاوین، چەند گرتەیەکی لێ بترازێ، چ کەسێ خـۆزی بە وانیـدی ناخوازێ، ئەز پڕ بەدڵ حەزمدەکرد لە کونێکەوە چاوم لییان با، بمدیتبا چۆن هەندێ لە (ئیتیحادی)یەکان بە زللەی وەلەکە بەعسیان گێژیان دەخوارد و میزیان بە خۆدا دەکرد و (ئانی ئیتیحادی، ئانی ئیتیحادی) نەیدەخوارد، با لە دیدی دیدڤانانەوە بدینین و بە دارشتنەوەی من ببیستین:

کاتێ رزگاری دەشکێ، بەعس دەستی بە سەردا دەگرێ و دەسەلاتی تەواوی بە سەردا دەشکێ، هۆڤیانە بە ناو دەکەوێ و دەست ناپارێزێ، ناپرسێ: کێ یاخی بووە، کێ دەستی بە کلاوی خۆیەوە گرتووە.

چاوی، ئیتیحادیەکانی خۆشی نابینێ.

لە چاوی ئەوەوە، رزگاری وەک ئەوەی قەلات و بارەگای پێشمەرگان بێت، وایە، ئاخر هەر خۆی دەزانێ، رزگاری چ گرێیەکە لە سەر دڵی، هەر خۆی دەزانێ، لەو قەلاتەوە چەند خڕکەبەرد و پەلەداری بۆ چووە و لە چاوی راچووە، چ ئەی رەقیب و ئەی شەهیدانێ دڵی لەرزاندووە.

بەعس کاتێ چاو بە بێرایی و هۆڵ و پۆلەکاندا دەگێڕێ و ئەو هەموو سەدامە شکاو و دڕاوانە دەبینێ، هۆش لە سەری نامێنێ و بەر چاوی تاریک

دادێ، چـاوی کرێگـرتە و دەسـتچێنی خۆشـی نـابینێ، نایانناسـێتەوە، ئەهـا، چاودێ:

ئەو کوڕە نازانم کێ قاوەچیی دەڵێنێ، ئەگەر سەرۆک ئیتیحادیش نەبێ، لە بن ویە، لەو لاوە هەڵتک هەڵتک دێ و دەچێتە پێشیان و خۆی دەناسێنێ و بە زمانی ئەوان دەڵێ:

ئەزبەنی، ئەز ئیتیحادیم.

ئەمنەکە وەها شپرزە و کەللەیی بووە، لە زمانی خۆشی تێناگات، تا هێزی تێـدایە زللەیـێ دەخێـوێنێتە بنـا گـوێی، زللەیـێ زرچەکەی لە رزگـاری دەنگـدەداتەوە، کـوڕە ئیتیحـادی لە سـەر سـەر دەسـووڕێ، ئەگەر هێنـدەی سەرەدەرزیەک پەندی لەو زللەیە وەرگرتبا، هەر لەوێ لە بەعس وەردەگەڕا و دەچووە سەر ئایینی (ئەی رەقیب)ان.

کوڕێـک یـدیش لێیـان دەچێـتە پێشـێ، بەو نیـازەی داردەسـتیی و کەمەربەستیی خۆی بسەلمێنێ، کەچی تەژە ئەمنێ بە داری دەستی بەرسڤی دەداتەوە و زیرەی لێوە هەڵدەستێنێ، پیلی دەگرێ و هەڵیدەداتەوە ناو کوڕە دەستبەسەرەکانی رزگاری. کوڕێ کە درۆی سپیشی بە زاردا نایە، گێڕایەوە:

ئیتیحادیی تێهەڵدراو کەوتە تەنیشتە من، وەک کیری سەی هەڵدەلەرزی، چرقە چرقی ددانی رۆژە رێیێ دەڕۆیی، تەماشامکرد، خۆی تەڕکردبوو.

ئێ، لە داردەستانی بەعس گەڕێ، نزابکەن لەوە خراپتریان بێتە رێ.

رزگاری بەرزەفت نابێ، هەر رزگاری نا، زۆر لە قوتابخانەکانی شار، بە ئەی رەقیبەوە لە سەر پێن و هەر دیتت رژانە جادە، شار گیراوەکانی خۆی دەوێتەوە، شار بە ئەی رەقیب و ئەی شەهیدانی گرتووە و شێت و منداڵی تازە زمانگرتووش دەیڵێنەوە.

میری زیرەک بوو، هات، تاقیکردنەوەی چەند رۆژێ پێش خست، ویستی داوی لە داوی قوتابیـان بێتەوە، زوو پشـوو دابێ و بۆ خۆی دوور لە ئەی رەقیب بێنێ بدات و تاوێ بسێتەوە، هێ لە هەندێ، بەندیانێ ئازاد کرد.

کـوڕانی رزگـاری، یەک یەک بە برینـدار و سـاغەوە- جـگە لە عـومەر مەحموود- هاتنەوە، ئومێدیش هاتەوە، دۆخەکە کەمێ هێور بۆوە، بەڵام لێرە

و لەویٚ، لە بـن لێـوانەوە، زایەلەی ئەی رەقیـب دێ، رزگـاری بە دیـار پەلە خوێنی کورەکانی دەیلێتەوە، ئەو خوێنەی با و ئاو و زەوی گەرم داهاتن، گیا بـووە پـووش، دنیـا زەردهەڵـگەڕا، خـوێنی رزگـاری هەر تەڕە و رەنگیشـی نەگۆڕا، ئاخر مامۆستا محەمەد ئیسماعیل گۆتەنی:

خوێنی شەڕەفە، مەیشۆن.

رزگاری لە بیریەتی، کاتێ چەند بەردەستێ لە گژن خوێنی رژاو بشۆن، ئەو مامۆسـتایە بە دەنگێکی حێل و لە بەر چـاوان، ئەو رسـتە سـوورەی بە زاردا هات، رستەیەک قەستی سەرە و خوێنی بە دوادا دێ.

ئێ، چ ما! ئا، باشبوو پلکە فاتمم لە بیرنەچوو، ئاخر رزگاری بێ ئەو ژنە بـۆ رزگـاری بە خەمە، شـتێکی کەمە، دەزانـی چەنـد کـوڕی لە زاری گـورگی جادە رزگار کردووە؟

## پلکە فاتم
## گوڵەبەڕۆژە و کچەکەی!

تۆ بێژە پلکە فاتم، ئەز دبێژم پلکە فاتێ، ژنێکی رەشتارەی نازدارە، لە شیرینی هەنگوینی ناو دارانی کوێستانی کێلەشینیشی ناگاتێ، ماڵیان لە کوێیە؟ رێک بەرانبەرمانە، بەرانبەری قوتابخانە، کام قوتابخانە؟ رزگاری، ئەوەی لە دەمی لێقەومان و تەنگەزاری، ئەو پلکە فاتێیە بە گیان دەهاتە هاری.

پلکە فاتێ لە ناو ماڵێ فرۆشگایەکی گچکەی هەیە، گچکە هەر هێندەی بەرانپیلێ، لەو جێیە وردەواڵە وکێک و گوڵەبەڕۆژە و ئەو شتانە دەفرۆشی. ئەو ژنە رووی چەند خۆشە، دوو هێندە هەرزانفرۆشە، گرانجان نیە، لە بەر هەندێ هەموو رزگاری رووی تێدەکەن، ئەوی لە بەرکیانە لە مستی وی دەکەن. ئۆجا تۆ لە کێک و رووخۆشی گەڕێ، سەرباس خۆپێشاندان و خۆشاردنەوە و رۆڵێ شێرە ژنەکەی سەیداوە، پلکە فاتێی خۆمانە، ئەو ژنەی بۆ دەربازبوونی کوڕانی رزگاری بە گیانی خۆی دەهاتە بەرێ.

کەسێ لە جۆش و خرۆشی رزگاری جۆشی نەدابێ، کەسێ لە بڕووخی و بژیی رزگاری نەژیابێ، کەسی گەمارۆدان و لە قاودانی رزگاریی نەدیتبێ، کەسێ هاڕژن و تەق و تۆقی سەر رزگاریی نەبیستبێ، کەسێ وەلەکە بەعس راوینەنابێ و پلکە فاتێ پەنای نەدابێ، یاخۆ لەو ناوە تیچاوێکی نەخستبێتە سەر ئەو راوڕاوە، چ لە گیانگۆری و بوێریی ئەو ژنە شەکەراتفرۆشەی دەرگا بە دەرگای رزگاریەوە تێدەگات کە پلکە فاتێی ناوە؟

دەرگای ماڵی پلکە فاتێ بۆ کوڕانی رزگاری، کوڕانی یاخی لە ستەمکاری، هەمیشە لە سەر پشتە، بۆ چاوترووکانێکیش ناهێتە داخستنێ، بۆیێ ئەو دەرگایە ناوی بۆتە دەرگای رزگاری. هەر کوڕێ پەنای بۆ وێرێ بردبێ،

سەربان و سەر بان بازیداوە و رزگاری بووە و بەر چنگی گورگی جادە نەکەوتووە.

ئێ، هێ لە پلکە فاتێ کچەکەشی سەرباسە، لێ بەر لە ناسینی کچە با یەک دوو ئیستیکان گوڵە بەڕۆژە یان بریشکەی گەرمی دەستی پلکە فاتێ لە بەرکێ بکەین و بە دەم قرتانەوە شتێ لە گوڵەبەڕۆژەی برژاو بگێڕینەوە:

ئەرێ لە گەڕەکێ هەر گەڕەک تا هەموو شار بڵێ، داخوا گوڵەبەڕۆژە هەبووبێ، وێنەی گوڵەبەڕۆژەی پلە فاتم بە تام و شام؟ لە دوورەوە بۆنەکەی رایدەکێشای، چ تامێ! دەتگوت بە چەلاوی بارۆکە خوێاوکی دەکات و لە ناو گۆلی ڕێحانە هەڵیدەخات، سوێندتان لە سەرم نیە! تام و بۆی بریشکەی سەر سێری پلکە فاتێ کۆڵان کۆڵان رۆیشتبوو، کەسێ گۆلمێکی لێ نەقرتاندبێ، ئەو پێداگۆتنەی من بە بۆ جوانکردنی گێڕانەوە تێدەگات، دەزانن کچەکەی دەیگۆ:

ئەو گوڵەبەڕۆژەیە هی ئەوەیە بە ربە بیکڕی، نەک بە پیاڵە.

کچەکە دەیگێڕایەوە:

ئەو دانە رۆژەی بوومە کچی پلە فاتم، سێرێکی لە پێش رووکردم، قووچەکێ پەلکم هەڵدایەوە.

ئا، ئەو کچە یەک دانە رۆژ بووە کچی وی، هێ لەوەش بۆ یەک دانە رۆژ بووە کچ، وەرنا کوڕ بوو. کوڕێژگەیەکی سپیکەلەی جوانکیلەی باریکەلەی بەژن مام ناوەنجی، ئۆجا با سەربوردەی بوون بە کچتان بۆ بگێڕمەوە:

ئەو کوڕە کە ناوەکەی وا لە سەر زارمە، لە لێقەومانێ لەگەڵ یەک دووانێ پەنا بۆ دەرگای رزگاری دەبەن، دەرگای ماڵی پلکە فاتێ.

لە حەوشە پێی بە چتێ دەکەوێ، دەواودەو دەکەوێ، بۆ پێی لە جێ ناچێ! لە جێچوونی بە ئەحمەد تەبیبیش ناهێتەوە جێ، دەستبەجێ پێ دەئاوسێ، دەبێتە هیزە، دەیهەوێ هەڵگەڕێ، پێی لە دوای ناچێ، ئیدی تینی بە پەیژە هەڵگەڕان و بانە و بان کردنی نامێنێ، دەڵێتە پلکە فاتم:

پلکێ، لە دوای خودێ تەنیا، تەنێ تۆ...

پلە فاتم دەڵێ:

کورِم، بێ خەم بە و دڵ لە دڵ مەدە، هەوکە دەتکەمە کچی خۆ.

کورِ بەو گۆتەیە هەژەند دەمێنێ و دەپرسێ:

کچی خۆت؟!

پلە فاتێ دەڵێ:

ئا ئا، کچی خۆ، دەی زوو، چم گۆ، نەڵێی لۆ.

هێندەی بڵێی یەک و دوو دەیکاتە کچێ، دەڵێی داکە و داک هەر کچ بووە، تازە کچ دەیگۆ:

کەوتمە ناو کراسێکەوە، باخەڵ و دامەنی یەک بوو، فۆتەیەکی جوانیشم لە سەر کرد، چووومە بەر ئاوێنە، خۆم نەناسیەوە، هەستمکرد مەمکیشم کردووە، کەمێ سپیاوم لە رووومەتم دابا، حەزم لە خۆم دەکرد، ئیدی لە بەر هەیوانێ کچانە دانیشتم و کەوتمە گوڵەبەڕۆژە قرتانێ.

هەینێ وا بوو، ترسی بەعس کورِی دەکردە کچ، ماڵی پلکە فاتێ دارماڵە لە سەر بردەی کوڕانی رزگاری، لێ دوای تەمەنێ، هزرم بەربادە و هەوکە هەر هێندەم لە یادە.

هەوکە کەمێ لە رزگاری دووردەکەومەوە، هەندێ لەو کوڕانە بە سەردەکەمەوە کە لە زیندانێ هاتوونەتەوە، سەردانیش بە سەردان گرێدەدەمەوە، هەردوو ساڵی هەشتاو دوو و سێ بە سەر یەکەوە، جارێ لای ئێوەم خۆش.

## سەردانی کوڕانی زیندانی

بۆ بە سەرکردنەوە لە ماڵی خۆمانەوە پێدادێم، برای ساڵێ کەمتر لە خۆ گچکەتر ئەوەی لە کوردەواری شیر بەشیری دەڵێنێ، لە زیندانێ هاتەوە، خۆی لە سەر پێ ڕانەدەگرت. هێندە بە داران لە پێیان دابوو، پێ بووبووە هیزە و بە پێڵاوی دێویشەوە نەدەچوو، هەموو لەشی جێی قامچی بوو، جگە لە سەر و دەم و چاوی چ جێ نەمابوو، برین نەبێ، شین و مۆر هەڵنەگەڕابێ. دایکم بە دەم برژاندنەوە و شێلان و چەورکردنەوە گوێملێیە دەڵێ:

کوڕم عەلی، چەندی گۆتم هەندێ هۆش لە کەریمی برات وەرگرە، خۆت لەو بگرە و بەردە و بژی و بڕووخێیە دووربگرە، نەچوو بە گوێتدا.

من لە ماڵێ وا خۆم پیشاننەدەدا کە دەچمە ناو خۆپیشاندانی، دایکم چ بزانێ منیش ڕۆژانە لە ناو بڕووخێ و بژیمە.

هێ لە برا هەندێ برادەریش لەو خۆپیشاندانە هاتنەگرتن و زیندانیکردنێ، ئەوەی لە بەری ڕووناکیەوە رووە و کۆشکی باکوور بە بڕووخێ و بژی و ئەی ڕەقیبەوە یەک بە جادە ڕێدەکەن، لە بنکەی پۆلیسی ئیسکانەوە دەدرێنە بەر دەستڕێژان، خوێن هاتە ڕژانێ، ئەگەر پەرتەیان نەکردبا، زێی خوێن هەڵدەستا.

ئێک لەو برادەرانە کە بە برینداری کەوتە چنگی گورگانی جادە، کوڕێ بوو، شەوان بە پەمپی بۆیاخ و دەمانچەیەک و حەفت فیشەکەوە، بە بەلاشاوە دەکەوت و چ سەرە جادەیێ نەدەما، بە بڕووخێ، یان بە بژی نەینەخشێنێ، ئەو کوڕە سەر بەو پارتە بوو کە ناوەکەی بە کێش و سەرواوە کەوتبووە سەر زاری منداڵ و هەراشانی شار:

**نە چەلۆمە، نە مەلۆمە**

**سۆشیالیست سەربەخۆمە**

ئەو کورە حەفت فیشەکە چەند جارێ گوولەی گرتۆتەوە و لە لێواری مەرگ گەڕاوەتەوە، ناوێ وی فارسە، لێ بە چاوشین دەناسرێتەوە. سالی پێشتر لە (ئازادی) هاوپۆل بووین، ئەو رۆژەی خۆپێشاندانی خۆی بە مالێکدا کرد، وێدەچێ گورگی جادە بە رێچکەی خوێندا گەیشتبنە سەری، بە خوێنەوە لوولی دەدەن و دەیبەن، لە رادیۆی سەرێ ناوی بە شەهید خوێندرایەوە، بەلاشاوە بۆ ئەو کورە بوێرەی خۆی تاسا، زۆر کەس کەوتنە پاڕانەوە و نزا:

خودایە، ئەو هەوالەش وەک زۆری دی راست دەرنەچێ.

نزای گەڕەک گیرا، دوای چەند رۆژێ هاتەوە و گەڕەک گەشایەوە.

فارس چۆنیەتی گرتنەکەی وا بۆم گیڕایەوە، منیش بە داڕشتنەوەی خۆم دامڕشتەوە:

*ئێمە حەفت کەس خۆمان بە دەرگایەکی لە سەر پشتدا کرد، ژنی مالەکە لە ژوورێکی کردین و هێندەی بلێی یەک و دوو چاکەت و بێجامە و جلکی مالیی بۆمان هێنا، من و بلە و سەرتیپ ئۆقرەمان نەگرت و قسەی ژنەمان شکاند و سەر بان کەوتین، چەندی هاواریکرد:*

*کورم، لێرە پارێزراون، مەڕۆن.*

*گوێمان نەدایێ، ئاودیو بووین، لە مالەکەی پشتیان کەوتینە دەست ئەمن، وەهایان دارکاریکردم خوێن لە دەم و لووتمەوە فیچقەی کرد و ئەو ناوەم لە خوێن وەردا، کەوتم، هەموو وا تێگەیشتن مردم.*

لە بیرمان بێ، هەندێ لەو کوڕانە لەو خۆپێشاندانانە دوو جار و سێ جار گیران.

فارس چاوشین داناکەوێ، زام و زیندان نایترسێنێ، لە شەوگەڕانی خۆی ناکەوێ، بە پەمپ و دەمانچەوە دەچێتەوە کۆلانێ، لە شەوێکی زستانی لە سێلەی قوتابخانەی مەلافەندی دەسوورێتەوە، لە دێوی تاریکی وا دیوار دەنەخشێنێ، (برووخێ...)ی نووسی، لە گڤ (بڤ...)یە، لە هێکەوە لەو بەرەوە دەستڕێژێ گردار ئەو ناوە گڕدەدات، فارس خۆی دەداتە پەنایێ و وەلامی

گولله به گولله دەداتەوە، پاشەکشێ دەکات، ئێستا لە سێ تفەنگەوە گوللەی بۆ دەچێ، زۆری گوللەکانیش گڕدارن، دەمانچەیێ بە حەفت فیشەکەوە، هی ئەوە نیە بچێتە شەڕی سێ کلاشینکۆفەوە، هێ لە هەندێش گوللەیێ بە لاچەنەگە و یەک بە شان دەگرێتەوە، خوێنی گەرم بە بەژنیدا دێتە خوارێ، تا پێی هەڵهاتنی پێوەیە، دەبێ هەڵێ، باشبوو ئەو جارە شوێنپێی خوێنیان هەڵنەگرت و نەیاندیتەوە. ئەو شەوە ئاسمانیش بە هەور و نمە بارانەوە بە هانایەوە چوو، کۆڵان کۆڵان بە دوایەوە بوو، ڕێچکەی خوێنی دەشووشتەوە، هێ لە هەندێ باران چێژیشی پێدەبەخشی، با چەند گرتەیێ لە سەربردەکە لە فیلمی (خوێن و بۆیاخ) ببینین و ببیستین:

به هەڵە دەداتەوە کۆلانی ماڵە دوژمندارەکە، لە سەر بانەوە رووی تفەنگی تێدەکەن، دەنگی دەدەن:

بوەستە زەلام.

دەنگدانەکە لە گوێی وی هی کوشتن بوو، نەک ئاگادارکردنەوە، ئەویش ئەو تاقە فیشەکەی پێیماوە، دەینێ بە پیاوی سەربانەوەد و دەردەچێ، لەو کۆلانە دەسووڕێتەوە، خۆ بە ماڵی ناسیارێکدا دەکات، محەمەد شوعیی ناوە، لەوێ برینەکەی شانی دەپێچن و شتێکیش بۆ برینەکەی چەنەگە، محەمەد دەڵێ:

چوونە خەستەخانە، واتە بەرە و بەندیخانە و لەوێوە هەردووکمان بۆ بن قەنارە.

فارس تا ئێستا برینەکەی گەرماو گەرمە، بە هەندی وەرنەگرتووە، وەک ئەوەیە بەردی دارلاستیقی وێکەوتبێ، بە نیازی ماڵێ، ماڵە کۆمۆنیستەکە بە جێدێلی. بە بن نمەی بارانیدا کۆڵان کۆڵان دەڕوا، بە قسەی خۆی چێژی لە نمەی بارانێ وەردەگرت کە دەیاندا لە برینێ و دەگەڵ خوێن تێکەڵ دەبوون.

لە سەرە کۆڵانێکی دی هەستدەکات خوێنی زۆر لەبەر ڕۆییوە و بە لادا دێ، دەترسێ لەو ڕێیە تووش ببێتەوە و بە دەمانچەوە بگیرێ، بۆیە لە دەرگایێ دەدات، نایناسن، بەلام رایدەگرن، دەڵێ:

من دەڕۆم بەلام دەمانچەکەم بشارنەوە، هەر کاتێ کەسێ هات و گوتی:

من سۆلینم، بیدەنێ.

بە دوو برینەوە و بێ دەمانچە رێ دەبڕێ، بیردەکاتەوە وا بڕوا چۆڕە خوێنێکی لە لەش نامێنێ و ناگاتە جێ، خولیای خەستەخانە لە سەری دەگەڕێ، چۆن بچێ؟

ماڵی شێخەکەی ئەوێی بەبیردا دێ، دەرگای لێدەکەنەوە، ناگاتە ژۆری دەکەوێ، شێخ دەیبات و لەوێ دەڵێ:

نایناسم، لە سەر جادە کەوتبوو، بە خێرا خۆم هەڵمگرتەوە و هێنامە خەستەخانە.

شوان باجەلانی برای رۆستەم باجەلانی شاعیر، لە شێوەی خدری زیندە لێی پەیدا دەبێ، ئەو نەبا خەستەخانە بێ ئاگاداریی پۆلیس و ئەمن وەرینەدەگرت، سەربردەی ئەو حەفت هەشت رۆژەی خەستەخانە بە خۆی نەبێ بە کەس ناگێڕدرێتەوە، لێی گەرێ.

منیش ئەو شەوە گوێم لەو تەقانە بوو، بەڵام چ بزانم ئەو کوڕە چاوشینەیە، لە سەر (بڕووخێ)یەک برینێکی تێکەوتووە، بۆی بۆتە نیشانەیێ دیرۆکی خوێن و بۆیاخی شەوانی شارێ نیشاندەداتەوە.

کوڕێکی دیی (ئازادی) سەرداری ناوە، بۆ هەلاوێرد لە سەرداران، ساڵەیی بە خۆیەوە ناوە، ماڵیان لە موفتی نزیک گۆڕستانی سەید مارفە، ئەو سەردارە لە چەند گرتەیەکی فیلمی (خوێن وبۆیاخ) دەردەکەوێ، ئەو فیلمەی چاوشینەکە پاڵەوانی بوو، ئاخر شەوی فیلمەکە لە ماڵی وان نەخشەی نەخشاندنی دیوار و بڵاوکردنەوەی پەڕە کاخەزی بقە دەکێشرێ.

لە کاتی تەقەکردن، ئەو و یەک دوانێکی دی (داود و عەباس) لەو ناوە دەبن، بەڵام نەیانزانیبوو پاڵەوان پێکراوە و خوێن رژاوە.

دوایەوەی هەواڵ دێ پاڵەوانەکە بزرە و نەگەیشتۆتەوە و ماڵێ، بەو درەنگانی شەوە بە خۆو خوشکەوە، بە بن نمەی بارانێ، کۆڵان کۆڵان بە دوای پاڵەواندا دەگەڕێن و نایبیننەوە.

رۆژی دوایی کە لە خەستەخانە دەیبینێتەوە، بە زمانی ئاماژە لە شوێنی دەمانچە خوێناویەکە دەدوێن، دەگەڕێ، پێدەکەوێتەوە و لە رێی وشەیەکی

نهێنی، هەر دەبێ (سۆلین) بووبێ، وەریدەگرێتەوە.

ئێ، لە فیلمی خوێن و بۆیاخ گەڕێ، بە شەو و دوو تەواو نابێ، با خۆپێشاندان و گرتنەکە پیشانبدەینەوە:

.هەر ئەو ڕۆژە و لەو خۆپێشاندانە دوایوەی پەرتەی لێدەکەن دیارە شوێنپێی هەڵدەگرن و لە ماڵێکی بەری موفتی لەگەڵ دوو سێ خۆپێشاندەری دی دەگیرێ و ڕاپێچی زیندانێی دەکەن، حەفتەیی پتر لە ناو گورگانی دەو بە خوێن دەمێنێتەوە، هەر ئەو سەردارە بەرەبەیانانی ئەو چەند شەوەی بەندیخانە بگێڕێتەوە، بەرەبەیانی ئەشکەنجەدان، بەرەبەیانی هەڵواسین و قامچی وەشان و کارەبا لێدان و جوێن و هاوار و گریان.

سەرداریش لەوانە بوو کە ئەو ساڵەی خوێندنیان لە دەستچوو، بەڵام خۆشەویستیی ناسیار و گەڕەکی بەدەستهێنا .

هەر لە ئازادی کوڕێک هەیە، ناوی شاسواری لە خۆی نابوو، بەڵام لای ئێمە هەر بلە بوو، ئەو کوڕە نیو دارتێلێ بەژنی هەبوو، بۆیە ئەگەر کەسێ زۆر درێژ با، ناسیار و بلەناسان دەیانگۆ:

دەڵێی بلەیە.

ئەویش بە زۆر خۆپێشانداندا هات، لەوەیان گیرا کە لە بەری ڕووناکیەوە بەرەو باکوور دەهات لەگەڵ فارس، بلە ماڵیان لە سەیداوە سەر شەستی بەرانبەر گەڕەکی میرپێداوان بوو، کاتێ لێمان دەپرسی:

ئەرێ لە زیندانێ چیان لێکردی؟

دەستێکی بۆ گون و یەکێکی بۆ پشتەوەی دەبرد و دەیگۆ:

نە ئێرەیان بڕی، نە لێرەیان بڕی، کەواتە وەک ئەوە بوو چووبمە میوانداری میری.

زۆری نەبرد بووە بەردی بن گۆمێ، نەمزانیبوو بە چیا کەوتووە، دوای ئەنفال لە (ناوزەنگ)ێ دیتمەوە.

قوتابیەکی دیکەی ئازادیی ماڵ لەئازادیی تینووی ئازادی، جەمالی ناوە، هاوڕێی کووران و ئازادیمە، ئەو کوڕەش لۆ خۆپێشاندان سەری دەخورێ، جادە جادە دەگەڕێ، لە هەر جێ خڕبوونەوەیەک ببینێ، ئەی ڕەقیبێ،

بڕووخێنێ ببیستێ، بە خۆی ناوەستێ و وەکات دەگاتێ.

ئەو ڕۆژەی ڕزگاری لە شێوەی چەمی بەهاری ڕژایە جادە، ئەو و ئاورەحمانی هاوڕێی لە ئازادییەوە بە پرتاو، بە پێی با دێن و دەڕژێنە ڕژانی ڕزگارییەوە، ئەو خۆپێشاندانەی بەر لەوەی ئەمنی عارەب بگەن و تەقە بکەن، لە جاشخانەکەی عومەر حەسەنەوە، کەوتە بەر دەسڕێژی جاشە کوردەوە، جەمال و ئاورەحمانیش لەوێ گیران.

لە کاتی پەرتەلێکردن و هەلات هەلاتێ، خۆی لە مالێکی دەرگا لە سەر پشت دەپەستێ، ئەو مالە گەورەیە مالی مامۆستایەکە، وا تێبگەم هاشمی ناوە.

ئێستا، مالی مامۆستا بیست هەلاتووی لە ئامێز گرتووە، وەلەکە بەعس بۆن دەکەن، گزوگوم بە سەردا دەدەن و بیست و یەک کەس قۆلبەست دەکەن و دەبەن.

بیستەکە بووە بیست و یەک، ئاخر عەدنانی کوڕی مامۆستاش، بە ئاگری ئەوانەوە دەسووتێ.

دوو سێ شەوێ لە بەندیخانە دەمێننەوە، دیارە بەندی عارەبا مینا بەندی ڕۆمیا گرانە، دوایوەی کوتکوتیان دەکەن دەیاننێرنەوە.

هەر لە بەری ئازادی سەرێ لە دوو براکە دەدەم، ئەو دوو برایەی لە وەرزی یەکەمی خۆپێشاندانی بۆ خۆپێشاندانێ سەریان پێوە نەبوو، لە کوێ بزرت کردبان، لە ناو خۆپێشاندانێ دەتبینینەوە. لەگەل ئەو دوو برایە زووتر لە (کووران)ێ هاوپۆل بووین، مالیشیان نزیکە وێ بوو.

ئەو ڕۆژەی لە بەری ئازادییەوە خۆپێشاندانێ بە ناو مالەکانی زانیاریدا کشا و نەگەیشتە شەستی، ئەمن دەوری گرت و بە ناو کەوت و هەر یەکەی بە لایەکدا هەلبڕی، ئەوانە لەوێ بەردەستناکەون، بەلام لە نیوەی شەوێ لە شیرنەی خەوێ بە سەریان دادەن و لە ناو نوێنێ لوولیان دەدەن و یەکسەر بۆ کونە ڕەشەی بەعسیان.

دوای ئازادکردنێ، سەرداریان خولیای سەرێی لە سەر گەڕا، سال وەرسووڕاوە و نەسووڕاوە، بە چیا کەوت، سەرتیپیان لە ناو کتێب و

خوێندنەوە مایەوە، یەک دوو جاری دیش ڕێی بە زیندانێ کەوتەوە، چاری نەما، ئەویش شاری جێهێشت و گەیشتە شاخ و خۆی لە تەک تفەنگ و فیشەکدان دیتەوە.

سەردار هەر ئەو سەردارەیە کە بە زمانی تفەنگ (هێی)یەکی وای لە برایم زەنگەنەی پارێزگاری هەینێی شار کرد، چ پارێزگارێ هێی وای لێنەکرابوو.

سەرتیپیش، ئەو کوڕەی کتێب سەرگەردانی کرد.

نەریمانی بەلاشاوەشم بە سەرکردەوە، ئەو کوڕەی بۆ ئازادی گیانی خۆی لا بەلاش بوو.

لە گەڕەکـــی ئـــازادی دەمێـــنمەوە و لە پشـــت کارەبـــا، دڵشـــادێ بەســـەردەکەمەوە، نەبەردیـــی ئەو دڵەیە هەر دەبـــێ (ڕزگـــاری) بیگێـــڕێتەوە، خـــوترمەکەی دەســـتی وی هێنـــدەی فـــانیلەکەی بـــارام دەنگیـــدایەوە و خۆپێشاندانێکی پێدەناسرایەوە.

ئەو کـوڕە لە گەرمەی خۆپێشـــاندان نـــا، لە پەرتەوازە بـــوون و گەڕانەوە تـووش دەبـێ، لەگەل (کرێکـار)ێ لە بەری قەلاتە گچکە (قالینجاغـا)وە بەرەو مالێ دەبنەوە، گزوگوم دەوریـان دەدەن، قۆڵبەسـتیان دەکەن و هەڵیاندەدەنە ناو ترۆمبێل و بە حەیرانەوە باژۆ لۆ زیندانێ.

ئەو دڵشـــادە لە ڕێوبـــانێ تـــاو ناتـــاوێ لە شـــێوەی بـــارانی بەهـــارێ، تێیهەڵدەکردە حەیرانێ، بێ حەیران هەڵینەدەکرد، ئەو چەند ڕۆژەی زیندانێ داخوا بێ حەیران چۆن بە سەربردبێ.

دەگەڕێمەوە ڕزگاری، دیداری کوڕێکی سـەربەگۆبەندی مـاڵ لە سێتاقانی خـــوارێ، ئەو یووســـفە سۆسیالیســـتە لە چ یووســـفان نەدەچـــوو، پشـت بە دووکەڵ و سـەر بە گێچەڵ بوو، هەبوو دادوبێدادی بوو لە دەستی، کەم کەس دەیوێرا لە لای ڕاوەستێ، ئاخر بەرک و بەرپشتێنی پڕ بوون لە پەڕە کـاخەز، کـاخەزی قاچاخ، ئەو پەڕانەی سـەرپەڕانیان بە دواوە بـوو، ئەز لە سـەر زۆر لادیـواری ڕزگـاری پەنـجەی ئەوم بە سـەر (برووخـێ و بـژی)یەوە دەدی، دەستخەتەکەیم دەناسیەوە.

ئەو ڕۆژەی (ڕزگـاری) خـوێنی بـۆ ڕزگـاری ڕشـت، ئەو لەوێ بەردەسـت

نەکەوت، بەڵام شەوێ ئەمن بە چاوساخیی جاشێ لە ناو جێ دەریدەهێنن، پەلبەستی دەکەن و دەیبەن و چینە لێدانێکی باشی بۆ دەکەن، شەوێک دەیهێڵنەوە و بە لەش نەرمکراوی دەینێرنەوە و بە زمانی دۆزەخ پێیدەڵێن:

بڵێ، بە کوڕانی رزگاری لەوەو دوا لە ئاست میری و سەرۆک، زمانیان بە خراپ بگەرێ، قەنارە بە چاوی خۆیان دەبینن.

بەڵام رزگاری لە هەڕوگیڤان ناپرینگێتەوە، لە ئەی رەقیب ناکەوێت و بڕووخێ و بژیی خۆی دەڵێتەوە.

سەر بەگۆبەندەکەش، پاشترێ رێی چیای گرتە بەرێ.

لە رزگاری دەمێنمەوە، بۆ دیدەنی ئەو کوڕەی هاوینێکی لە زیندانی هەولێر و کەرکووک کردەوە، لە بەهاردا بە رەنگی بەهاری بزربوو، دەمەو پایز زەرد زەرد بە نیوە مردوویی هاتەوە، گەنجێکی گەڕناس و مێرخاسە، بەڵام خۆ دەرناخات، کەس لە زاری نەبیستووە ئازایەتیەکی خۆی گێڕابێتەوە، تا بڵێی کەم دووە، تا نەیدوێنی نادوێ.

ئەو کوڕە کەمدووە خاکپەروەرە ناوی عومەرە، لە خۆپێشاندانەکەی لای باخی شار و چاخانەی کرێکاران گیرا، نزیک ئەو جێیەی سەلاح جەوهەری تیا لە خوێن گەوزا و خۆپێشاندانێکی بە ناوکرا، لەوێ گیرا. هەموو پەیدابوونەوە، ئەو بێ سەروشوێن ما، لێبووردنەکە دەرنەچووبا، چاوی بە رزگاری نەدەکەوتەوە، باشبوو بە خولی دووەم راگەیشت و لە ئێمە دانەبڕا، دواتر لە زانکۆش بە هاوپۆلی ماینەوە.

عومەر چ ئەشکەنجەی ئەمن و خاسە نەمابوو، نەیبینێ، لێ پنتێ ترسی لێ نەنیشتبوو، لە پێشتر پتر لە سەر خاکپەروەریی خۆی رشتتر بوو.

بیرمە چەند گرتەیەکی کورتی ناو زیندانی نیشانی من دایەوە، ئێک لەوانە مامۆستا رۆستەم باجەلان و پشیلەکە بوو.

ئێستا سەرێ لەو مامۆستایە شاعیرە زیندانیە دەدەم و بەمیاوە میاوی ناسکی پشیلەکەوە دێمەوە، رزگاری تەنها قوتابی نا، مامۆستاشی دەهاتنە دەرکردن و گرتن و بەندکردنێ، باجەلان مامۆستای کوردی بوو لە کوردایەتیش خۆی بە جێنشینی خانی و حاجی دادەنا، لە بەرەی میللەت

رادەوەستا.

رۆستەم باجەلان لێرە و لەوێ پلاری توندی لە میری دەدا و بە زمانی خۆی نەدەوەستا، زماندراوێ زمانی لێدەدات، ئیدی مامۆستای قوتابخانە لەتەک هەندێ لە قوتابیانی دەکەوێتە بەندیخانە، لەوێ پشیلەیەک لە شێوەی پشیلەکەی بورهان جاهید دەبێتە مێوانی، ئەویش جاهیدانە چەند کۆپلەیەکی بۆ دەڵێ.

کاتێ چوومە سەردانی، پشیلەکەی بۆ خوێندمەوە.

ئەز ئەگەر بە گیراوان پێدابچم و یەک یەک بە سەریان بکەمەوە، وەرزێکی پێدەچێ، ئەگەر سەربردەی هەر یەکەیان بخەمە یەک رستەوە، هەزار و یەک شەوەیێ دەردەچێ.

بۆ دوورکەوتنەوە لە کەشی گرتن و راونان، وا چاکە بگەڕێمەوە منداڵی، هەندێ گرتەی هەیێ پێشانبدەمەوە کە هەوکە بیرمکەوتنەوە.

## خۆشەویست
## سەر دەرگەی مزگەفتی شەش پەنجە

زوو، هێژ یادکردنەوە بەو دەردەی دواتری نەچووبوو، بیرا من دێ، ساڵ ڕۆژێکی هەبوو، لە چ ڕۆژێکی نەدەچوو، شیرن شیرن، هەنگینێ لە زاری من لە هەنگینی ناو کۆلکەداران شیرنتر بوو. شار دار و دیواری خۆی لە شیرینی دەگرت، شار خۆی لە دەف و زایەڵەی ئەی (خۆشەویست)ێ دەگرت، بێ دینیش چ کێشەی دەگەڵی نەبوو. ئاخر ئەو خۆشەویستەی لە دەف و زاری دەفزەنانەوە، لە مزگەفتی گەورەی ناو قەیسەری و مزگەفتی حاجی لەقلەق و شێخە ڕەشکە و شێخی چۆلی و قیبلە خوار و حاجی مرادی جوو و دەروێش برایمەوە، دەگەیشتنە ئاسمان و لەوێوە لەگەڵ هەورا بە سەر شارا لە شێوەی یەکەم بارانی پایزی تەڕیان دەکردین، ئەو خۆشەویستە ئەو پەیامبەرە نەبوو تیر و شیر بسوێ، ئەوە نەبوو کە لە ڕۆژانی هەینی لە زاری هەندێ مەلاوە لە شێوەی دەرگاوانی دۆزەخ خۆی نیشاندەدا، پەیامبەری ئەو ڕۆژە شیرنە ئەو پەیامبەرە نەبوو کەلە هەندێ کتێبەوە جەنگاوەرێکی شیر بەدەست بوو، دەستی نەدەپاراست و ملی پەلدەدا.

پەیامبەری ناو زار و دەفی دەفزەنانی شار لە گوێی من، لە دید و ئەندیشەی من، لەرینەوەی دەف بوو، ڕووناهیی چرا و لۆکسێ بوو، لوقم و پاقلاوە و خۆشاوی مێوژی سووسێ بوو، ناردنە دۆزەخ و بەهەشت چەند لە دەستی کەویار بوو، هەر هێندەش لە دەستی وی.

خۆشەویستەکەی سەر زار و نێوان زریزەی دەفی دەستی دەفزەنانی ئەو ڕۆژەی ساڵ، هێند نزیک بوو لە شار کەس باوەڕی نەدەهات خەڵکی بیابان بێ، لەو ڕۆژە زمانی حەمە شێتی دەزانی، جلکی بەخۆکەی لەبەر دەکرد.

دەفزەنانی هەینێی شار، مەولوودخوێنانی هەینێی شار چەند شیرن

پەیامبەریان کردبووە هاوشاری.

بیرمە، لە پێش مزگەفتی شەش پەنجەی ناو قەیسەری، ئێمە پێنج شەشێ بۆ گەیشتنە شیرینیی مەولوودێ، پاقلاوە و لوقم و خۆشاو، ریزمان بەستبوو. لە هیکرا لە سەر دەرگەی مزگەفتێ بووە هەرا، دوو پیاو پیس تێکگیران، دوو سێ کەس کەوتنە ناوبژی، ئەوەی لەوی دی پیرتر ناوەستێ، گۆپاڵ هەڵدەشەقێنێ و بە کۆخە کۆخ دەڵێ:

لە سەرت ناچێ، ئەو خۆشەویستە نازدارە، دەکەیتە عارەبی پێخواسی خوانەناس.

ئەوی دی سەربادەدات و دەڵێ:

وای لەو کەرە پیاوە، حەفتا ساڵە بە عارەبی نوێژ دەکات، نەیزانیوە خۆشەویستی گەورەمان عارەبە! باشە خۆ من گووم نەخوارد گۆتم:

یا مووحەمەدی عارەبی، هاوارە...

پیرەی لەو پیرتر، بە زاری پڕ تفەوە:

سەگباب دیسان گووەکەت خواردەوە، کردتەوە عارەب! ئەدی من کەنگێ بە عارەبی نوێژم کردووە؟!

باشبوو لێکیان دوورخستنەوە، ترسی من لەوە بوو شەڕ درێژە بکیشێ و بە بن خەڵک بکەوین و شیرینیی رۆژی هاتنە دنیای ئەو خۆشەویستە بەر نەکەوێ کە ئەوەتە لە سەری بۆتە شەڕە گۆچان.

راستیتان دەوێ منیش هەینێ باوەڕم نەدەهات عارەب بێ. حەزیشم نەدەکرد کەس بە عارەب ناوی بهێنێ، لەو پیرە گۆچان بەدەستەش پتر بە دەستەواژەی (موحەمەدی عارەبی) تووڕە دەبووم، بەلام لە سەری نەدەهاتمە وەلام و شەڕم بۆی نەدکرد.

بیرماننەچێ هەر گۆچان بەدەستەکەی سەر دەرگای مزگەفتی شەش پەنجە نا، ژن و پیاوی دیش هەبوون، نەیاندەزانی نوێژیان بە زمانی عارەبییە، بیرمدێ گوڵی کۆسارانی نەنکم کاتێ لە عارەب تووڕە دەبوو، دەیگۆ:

زمانەکشیان زمانی بنیادەم نیە، هی شەیتان و جندۆکەیە.

جارێ کەسێ پێیگوتبوو:
نەنێ، وا مەڵێ، گوناهت دەگاتێ، قورئانیش بە عارەبییە، نوێژی تۆش بە عارەبییە...
گوڵی کۆساران چەند سۆر بوو، سێ هێندە سۆرتر هەڵگەڕابوو:
درۆیان مەکە، قسان هەڵمەبەستە، نوێژی من یەک قسەی عارەبیی تێدا نیە.
+ ئەدی کوردییە؟ دەبزانم ئەنەعەمتە چیە؟
- واز لەو قسانە بێنە، ئەوە زمانی خودایە، کەس تێیناگات.
+ ئاخر ئەوە بە زمانی موحەمەدە، ئەویش عارەبە و خەڵکی عارەبستانە، ئەو جێیە ئەتۆ سەرت لێدا و ماچت کرد و...
-کوڕم، واز لەو قسە بێ کەڵکانە بهێنە، سەرم ئێشا، موحەمەد عارەب نیە و تەواو، خۆشەویستی هەمووانە.
خۆشەویستەکەی ناو هزر و خەیاڵی گوڵی کۆساران، هەمان خۆشەویستی منداڵیی من بوو، شیرن بوو، بۆیێ حەزمدەکرد ساڵێ جارێک نا هەموو سەرە مانگێک یادی هاتنە دنیای ئەو با، شیرینیم خواردبا و گوێم لە دەنگی دەف و مەولوودنامە با.
ئەو شیرینی و دەف و زاری شیرینی گوڵی کوساران و گۆچانی پیرەکە و ئەوانە لە منداڵیمەوە لەگەڵم هاتن و لێم نەبوونەوە، بۆیێ دوور نیە لەبەر هەندێ بێ هەوکەش حەزم لەو یادەیە، یاد بە شێوەی پێشانی.

## کۆنترین ترومبێل

هەولێر نیو سەدە و شتێ پێش تەڕواری پیری سوارچاکان ترومبێلی گەیشتێ، بەڵام پیری سوارچاکان بەر لە هەردووکان ترومبێلی دیتبوو، بە گۆتەی گۆتیاری:

ساڵی جەنگ، گەرمەی جەنگی گەرمی گێتی هەندێ سەربازی ئەلەمانی نازانم لە چ رێوە ترومبێلیان هێنا و بە سەر قەلاتیان ئێخست، شار چاوی زەقبۆوە، ئاخر پێشتری دەعبای وای نەدیتبوو.

پیری سوارچاکان دەڵێ:

من پێشتر ئەو دەعبابەم لە لای مووسڵێ دیتبوو.

هەرچی کوڕەکەی پیری سوارچاکانە، دەڵێ:

کۆنترین ترومبێل بە ساڵەکەوە لە خەیاڵم مابێ، ئەوەی عەلی گاورە، ئەو ساڵەی شار بن ئاو کەوت، دەوری گیرا، دوو رۆژ رێی بە ریبوار نەدا، ترومبێلەکەی عەلی گاوریش لە کەسنەزانێ مایەوە.

کوڕەکەی پیری سوارچاکانیش یەکێک بووە لە سەرنشینانی عەلی گاور، نێوان ترومبێلی ئەلەمانی و عەلی گاور پێدەچێت بیست ساڵێک بێت.

ئەدی نەوەکەی پیری سوارچاکان لە کوێ و کەنگێ ترومبێلی دی؟

رەنگە لەو بەری گۆمی مراویان، ساڵەکەش هەمان ئەو ساڵە بووبێت کە بابی بووە مراوی.

بیرمە کە بە گرەگڕ لە سەرە کۆلانێ پەیدابوو، لە هاڕژنم دا و هەلاتم، ئاخر دەعبای لەو شێوەیە لە ناو هەقایەتانیش نەبوو.

بیرمە لە دەفتەری یادەوەریم دیرۆکی دیتنی ترومبێلم وا تۆمارکردبوو:

باپیرم بەر لە شار ترومبێلی دی.

منیش بەر لە دێ. بابیشم لەو نێوانە و لە ناو لافاوێ.

## ژنی لاق رووت

هێند منداڵ بووم، هیچم لە رووتی نەدەزانی، بەڵام نازانم لۆ حەزم لە رووتیی لەشولار دەکرد، سەیرم بە داپۆشین دەهات، کاتی دایکم دەیگۆ:

کوڕم گەڵ و گونت داپۆشە، شەرمە.

دامدەپۆشی، بەڵام چەندی سەرم دێناو دەبرد، لەنگیەکم لە رووتیی خۆم نەدەیتەوە. خۆ لە گەرماوی ژنان ئەو هەموو ژنەم بە رووتی و لە گەرماوی پیاوان ئەو هەموو پیاوەم بە رووتی دەدی، چ لەنگیم نەدەدی، باشە بۆچی رووتی لە گەرماو ئاساییە و لە دەرێی گەرماو شەرمە، تێنەگەیشتم، ئێستاش باش تێنەگەیشتم.

دێتەوەبیرم بۆ یەکەم جار لە دەرەوەی گەرماو و لە حەوشەی خۆمان ژنێکی لاق تا سەرەوەی چۆک و بن ران رووتم بینی، پێڵاوێکی بن بڵندی لە پێ بوو، دایکم تەنەکەیەکی بۆ هێنا و نیمدەرێکی گچکەی لە سەر دانا و ژنە لە سەری دانیشت. من لەبەر تەماشاکردنی شتە باریکەکەی بن پێڵاوی، رێک بن پاژنەی ئاگام لە هیچ نەما، حەزمدەکرد وەک پشیلە، بە پێدزە بچمە کن تەنەکەکە و ئەو شتە باریکە بگرم کە بەلامەوە عەنتیکە بوو، ئەو ژنە بەخۆوەیە چۆن لە سەر ئەو دوو باریکە رادەوەستێ کە هەر هێندەی پەنجەیەک ئەستوور دەبوون، تەماشای سپێتیی لاق و لوولاق و رانەکانیشم دەکرد، دیارە سپێتیی وای کردبوو چاویان لە سەر هەڵنەگرم، سپی سپی، لە سینەی کەویاریش سپیتر، نا...

ئەو ژنە لاق رووتە سستەری ناو بوو، وام زانی سستەری ناوە، نەمزانی سستەرە، دواتر کە گوێم لە گۆرانیی (دە وەرە وەرە سستەرێ...) دەبوو، هەر وام دەزانی لە سەر سستەرەکەی سەر تەنەکەی حەوشەی ماڵی ئێمەیەتی.

## ئەسپە سەرینە

لە دیوەخانی سەر تەپرەکی پیری سوارچاکان، دوای پایدۆسی دوا مێوان و چۆلبوون، زۆر جاران دوور لە چاوان سواری ئەسپە سەرینە دەبووین و دەمانکردە مەیدانی خۆمان، بە سەر لبادی لێرەوە تا ئەو سەر درێژ، سوارسوارانێمان دەکرد، بالیفی هەینێ خۆشڕۆبوون، بە هەچەیێ بالیان لێ دەڕسکا، لە پێشبڕکێی ناو دیوەخانێ هەر یەک لە ئێمە لە سەر ئەسپی خۆیەوە، بە دەنگێک کە خۆشمان نەماندەناسیەوە:

من باپیرەم، لە خرتان باشتر دەبەزم، دەبەمەوە.

لە سەر پشتی ئەسپی سەر لبادێ، هەموو دەبووینە پیری سوارچاکان و کەس نەدەبەزی، بیرمە ئەسپەکەی من سوورباو بوو، پنتی شینی تێدابوو، شەوانیش سەرم نەکردبا سەر وی، خەوم لێنەدەکەوت، ئەسپی من لە تەنکێشەوە پەڕ پەڕ پەڕەمووچی هەڵدەدا و ئەو ناودی پڕدەکرد و دەتگوت ڕێوی بە ناو کوڵێتی مریشکان وەربووە.

بەر لەوەی سێبەری گوڵی کۆساران، لە پەنجەرەکەی پشتەوە دەرکەوێ، بە پڕتاو پەڕ پەڕ پەڕەمووچەم خڕدەکردەوە و لە زگی ئەسپم دەپەستەوە و دەمکردەوە بالیفی پێش غارغارانێ، جاریک خڕاپم بەسەرهات، بێ ناردنی سێبەر، لە هێکەوە گوڵی کۆساران بە سەرداهات، بە دەنگێک قیژاندی من لەرزم گرت، پەلاماری دام، گیانم هاتە سەر کونە کەپووم، بە دەنگێک بە هی وی نەدەچوو، گوتی:

هەر ئێستا هەرچی پەڕە مووچەی بە گۆڕێت وەرکردووە، بە زمان هەڵیدەگریتەوە.

خەنی بووم، ئاخر من دامنابوو بمکوژێت.

زمانم بۆ پەرەمووچەیێ دەرهێنا، توند دەستمی گرت، زۆر ترسام، خوایە چم لێدەکات؟

ئای! توند لە باوەشمی گرت و ماچ ماچ، بیست ماچی گەرمی لێکردم، گوتی:

کورِم، بە قەستیم بوو، چۆن دڵم دێ بە زمان پێت هەڵگرمەوە.

گوڵی کۆسارانی نەنکم هەر ئەوەی لێ دەوەشایەوە، ئەنگۆ نازانن ژنێکی چەند میهرەبان بوو.

ئەو رۆژەی هەواڵی مەرگی هات، گریانێ گرتمی، پیری سوارچاکان لە ناو گۆڕەوە هاتە قسە، ئەو نەبا پێندەچوو کرِببمەوە.

وای، دیسان باس باسی مەرگە!

لە هەواڵە جەرگبڕەوە گەیشتەمەوە کوندەلان و گونی کوندە.

بەلام با جارێ سەیرێکی شەڕی ران و باڵ بکەین.

## شەڕی باڵ و ران

ماڵێ لە سەر بەستێ، سێ کۆڵان لە سەرێی ماڵێ مە، بەڵام وەک ئەوەی لە سەر بانێ مە بن وابوو، ئاخر لە کاتی شەڕی حەفتانەیان شەڕە مست و تەپەی پێیان هەراسانیان دەکردین، شەڕ دەکەوتە کۆڵان و پێش ماڵان. ئەو ماڵە حەفتانە شەڕیان هەبوو، شەڕی سەر جەمی ئێوارە، شەڕەکەش هەمیشە لە سەر باڵ و ران بوو، کەس نەیبیست سینگ شەڕ بنێتەوە، لە سەر هەندێ گەڕەک ناویان لەو ماڵە نابوو: ماڵی باڵ و ران.

ماڵی باڵ و ران درەنگ هاتنە گەڕەکێ، زوو، ساڵ وەرنەسووڕاوە باریانکرد. ئەو رۆژەی بارگەیان تێکنا، گەڕەکی بەلاشاوە کۆڵان کۆڵان هەناسەی ئۆخەی هەڵکێشا، هەبوو لە خۆشیی بارکردنی ئەو ماڵە مریشکی کوشتەوە، ماڵی ئەو کچەی خالید چاوبەخاڵ لە سەر چاوی وی چینە لێدانی باشی خوارد، سەنگۆیەکیان کوشتەوە و لەگەن لەگەن گۆشتیان بە سەر ماڵاندا بەشیەوە، شاتکە شێت گۆتبووی:

ئەگەر گەڕەک حەفتەی دوو ران و دوو باڵێ ناردبا بۆ ماڵی باڵ و ران، کەس شەڕی وانی نەدەدی.

حەمەد مەستان گوتبووی:

منداڵ بابی ئەوهایان هەبێ، کەلەشی گاشیان لە پێش بێ، پێکنایەن و لە سەری بە شەڕ دێن، رۆژی دوو فڕ بادەی خواردبا، دەبووە باب، هەینیەک بە زۆر دوو سێ پێکم بە قوڕگیەوە کرد، ئەو رۆژە بەشی خۆی دابووە منداڵەکانی و شەڕ بەرپا نەبوو.

پیاوەکەی ماڵی باڵ و ران کە پێدەچوو تۆزێ تامگێل بێ، گەلەک پڕکێش و چاوبرسی و نەوسن و بێ بەزەیی بوو، ژنەکەشی دەتگۆ مەڕی خودایە،

مێشی لە زاری خۆی نەدەکردەوە، حەفتەی جارێ مریشکێکیان دەکوشتەوە، سینگەکەش دەبوو لەپێش باب بێ، ران و باڵ و ئەوانەش بۆ دایک و چوار منداڵە جمکەکە. ئەو ژنە بە دوو زگ و لە ماوەی دوو ساڵ چوار منداڵی هاوشێوەی یەکتری خستبووەوە، کەس لە یەکتری جیانەدەکردنەوە، هەر لە بەژن و رەنگ نا، لە دەنگیش لە یەک دەچوون، دەتگۆ لە یەک هەوکەوە قسە دەکەن. کاتێ لە کۆڵانێ دەکەوتنە دوای یەکتر، سێ چوار جوێنیان هەبوو، بە یەک شێوە و بەرز و نزم دەیانگوتەوە، دوای ئەو هەموو ساڵەی جوێنێکیانم وەک خۆی لەبیرماوە:

رانەکەم، کورە رانەکەم، بیخۆی بابت دەگێم.

ئەوەی رانەکەی فڕاندبوو، بە دەم غار و گاز لە ران دانەوە:

سەگباب لێم گەڕێ، با لە گەرووم نەپەڕێ.

لە کۆلانێ مە، لە گەرەکێ مە، هێ لەو ماڵە چ ماڵێ نەبوو، لە سەر گۆشت دەنگیان لێوەهاتبێ و قرەقرپیان کردبێ. ماڵی مەش هەینێ هەر حەفتەی جارێ گۆشتمان هەبوو، ئەگەر نۆرەی مریشک با، هی ئێمەش یەک مریشک بوو، دایکم لە مارکس یەکسانتر دابەشی دەکرد، دەهات گۆشتی لە هێسک دەکردەوە، سینگ و ران و هەمووی پشک پشک دەکرد، بە جەرگیشەوە، هێسکەکانیش کە بایی کەلێنی ددانیش گۆشتیان پێوەنەمابوو، ئەوانیشی کەرت کەرت دەکرد و دابەشی دەکردن، بابیشم هەرگیز بەشە گۆشتی خۆی تەواو نەدەکرد و هەندێکی دابەشدەکرد، ئێمەی منداڵیش جاروبار پشکە گۆشتمان لە نێوان خۆمان دەگۆڕیەوە.

دایکم جارێک بە ژنی ماڵی باڵ و رانی گوتبوو:

تۆش وەک من گۆشتەکە دابەشبکە.

ژنە گوتبووی:

پیاوەکەم سینگی نەبێ، ماڵ کاول دەکات، ئەوەی تۆش بە من ناکرێ.

من درەنگتر زانیمەوە، لە زۆر ماڵی تریش سینگ تایبەت بووە بە باب.

## گونی کونده مەرگپەڕێنە

*نەنە هەمینتان تایەکێ هاتێ، پەنجەی دەسووتاند، نانی دەبرژاند، لە نێوان دوو کیلە بووز درێژیان کرد، پتر گەرم داهات، ئیزرائیل گەیشتێ، بە بەر چاوانەوە گیانی سپارد.*

بەو هەواڵە وەک گووژارک تاڵە گونی کوندەم بیرکەوتەوە.

منداڵ بووم، هێند منداڵ، زارکی کوندەم دەکردەوە، لێ نەمدەزانی گرێیدەمەوە، رۆژەکی نەخۆش کەوتم، گۆتمە نەنە گوڵی کۆساران:

نەنە، تام لێیە.

هات پشتی پەنجەی شادە و زێڕنەقووتەی لە سەر ئەنیم دانا و گۆتی:

کوڕم، بەڵات نیە، لە گونی کوندەی فێنکتری.

گونی کوندە چیە؟

دواتر پێکەوتم کوندەی ئاوێ کوندەی بن کەپرۆکەی بەر هەتاوێ، ئەگەر لە پێستی نێری بێ، دوو گونی رەشی گەورەی جوانی هەس، لە قرچەی گەرمایێ دەست بگەیەنە ئەو جۆتە گونە، سارد سارده، سارداوە، لە کانیی گەری سۆر ساردتر، دەڵێی هەر ئێستا لە چاڵە بەفری سەفینت دەرهێناوە.

بیرمدێتەوە، گوڵی کۆساران دەیگۆ:

تای مەرگیشت بێتێ، سەر بنێ بە گونی کوندەوە، ساردایەتی چابوونەوەت دێتێ.

منیش کاتێ بیستم، گوڵی کۆساران بە هۆی تا لێهاتنەوە مردووە، لە بەر خۆمەوە دەمپرسی:

گونی کوندە قات بووە؟!

ئەو رۆژەی هەواڵە تاڵەکەم چەشت، خۆم نەگرت، وەکات رێی گۆرستان، رێی پیری سوارچاکانم گرت، چوومە سەر گۆڕەکەی و هەواڵی مەرگی

گوڵەکەی خۆی، گوڵی کۆسارانم داین.

سەرم بە کێلی پیری سوارچاکان کرد و بۆ گوڵی کۆساران گریام، بگری بگری، فرمێسکم سێ ریز سێ ریز دەهاتنە خواری، گۆڕم تەرکرد، بە دەنگی بەرز دەگریام، هێند بەرز پیری سوارچاکان بیستی!

لە هیکڕا دەنگێک ناسیمەوە دەنگی پیری سوارچاکانە:

بەسە مەگری، دەمری...

هێندە لە خۆم هەڵدا، بەرزەپێ هەستام، رۆژ لە سەر ئاوابوونە، موچڕکی لە بنی پێمەوە سەرکەوت لە تەوقی سەرمەوە دەرچوو، وەک ئەوەی بە شمشێر لە باری درێژی دوو لەتت بکەن وابوو، ترسام، بە هەڵاتن گۆڕستانم بەجێهێشت.

لە ڕێ چەند جاشێکم دی، ئەوانەی لە ترسان نەدەوێران شەوان لە ماڵی خۆیان بخەون.

یەکیان پێدەچوو منیش بە جاش تێگەیشتبێ، پرسی:

دەڵێی چەکت پێنیە؟

باشبوو چاوەڕێی بەرسڤی منی نەکرد.

## باداوای ئازاد

باداوا لێرەوە هەر تفەنگهاویژێ دوورە، ئەگەر کەوتبێتە بن تەنکە تەمتومانیشەوە، لە سەر بانێ ماڵێ مەوە دارخورماکەی جوان دیارە، باداوە لە پەڕگەی شارە، هێ لە ماڵە کۆنەکانی، ئەوانی دی هەمووی قوڕ و تەنەکەنە، کۆڵانی وای تێدایە، زەلامی تەنگە ستوور تیواوتی پێوەی ناچێ، نەخشەی باداوە شەیتانیش سەرەدەری لێ دەرناکات، موختاریش تێیدا بزر دەبێ، لە پێکهاتەی باداوە گەڕێ، نە بە من نە بە کەس شەنوکەو ناکرێ.

باداوا تا بەرە بەری ئێوارە لە دەست حوکمەتە، دوایوە پێشمەرگە تێیدا دەسەلاتدارە، چاودێ، هێمان خۆر هێندە لار نەبۆتەوە بگاتە سەر منارە، منارەی چۆلیم مەبەستە، ئەوەتا شاتکە شێت گۆتەنی:

جاشی جانگحیز لوولەی تفەنگیان لە شێوەی کلک بە لا رانیاندا شۆڕکردۆتەوە.

لۆژە لۆژە بە هەر دوو دیوی گۆڕستانی سەید مارفدا بەرە و شار شۆڕدەبنەوە، هێژ نەگەیشتوونەتە راستی ماڵێ مە، پێشمەرگە پێوەر دەبن، باداوە مینا تاقە دارخورماکەی، بەری سەرکێشی دەگرێ.

باداوا لە تاریکیەوە بۆ تاریکی ئازادە و بە ئاشکرا بانگێ ئازادی رادەدێرێ، شار هەموو شار خۆزی بەوە گەڕەکە قوڕاوی و خۆلاویە دەخوازێ، ئەو گەڕەکەی زۆری هەرە زۆری کۆڵانەکانی ئەگەر دەستکورتی و بێ جێیی نەبێ، کێ شەوێک و یەک دانە رۆژی لێ دەژی؟ ئەوە ئازادیە وا دەکات تەلارنشین خۆزگە بە کوڵێتێکی شەوانەی ئەوێ بخوازێ، ئاخر لە وان رۆژان مەگەر هەر شارنشینانی هەینی بزانن بەعس چتۆیی دەستی لە هەوکی شار نابوو، هەناسەبڕکێی پێکەوتبوو، لەو رۆژانە باداوە جێی هەناسەدان بوو.

بیرمه لەو سەروبەندە سەروبەندی ئازادیی باداوا، پیری هەبوو، کەمێ شێتۆکەش دیار بوو، ماڵیان لە بەری موفتی، هێندە دوور نا لە گومبەتی مەلافەندی. لە دوای ئەو ساڵەی مەلا مستەفا جاڕی مەرگی شۆڕشی دا، ئەو پیرە باوەڕی بە هەستانەوەی شۆڕش نەمابوو، زۆر جار دەیگۆ:

باپیرم لە گۆڕێ راستبێتەوە، شۆڕش سەرهەڵناداتەوە.

چەندی دەیانگۆ:

ئەوەتا شۆڕش، پێشمەرگە وا گەیشتە باداوا.

دەیگۆ:

وای لەو شینە درۆیە، باداوا ئەسحابەی تێدا بێ، پێشمەرگەی تێدا نیە.

دەیانگۆ:

ئەگەر باوەڕناکەیت، شەوێک لە باداوە رۆژ بکەوە، بە چاوی خۆت شۆڕش و پێشمەرگە ببینە.

هەر بە زار نا، بە ئاماژەی دەست و چاو و برۆ، دەیگۆ:

درۆیە، درۆ...

بە خۆی ناوەستێ، شەوێک بۆ دیتنی پێشمەرگە دەپەڕێتەوە بەری باداوە، دەیانبینێ، بەڵام باوەڕناهێنێ، پێیاندەڵێ:

ئێوە هێندەی لە جاش دەچن، لە پێشمەرگە ناچن.

لە سەر ئەوە قسەیە پێشمەرگەیێ پاڵێکی پێوەدەنێ، دەستی لە دوو جێ دەشکێ. بیستمەوە گوتبووی:

نەمگوت نە شۆڕش هەیە، نە پێشمەرگە، نە تەڕەماش.

جاشە کەرگێیەکەش پێیگوتبوو:

نەمگوت ئێمە لەوان باشترین!

پیرەی دەستشکاو گۆتبووی:

تۆ لە هەموو شتان هەڵمەدێ، برۆ کەری خۆ بگێ و بکوژە.

وا باشە ئەو جاشە لە بن لادیوارەکەی باداواوە بخەینە دوو سێ رستانەوە.

## جاشی بن لادیواریّ

لەو ئاقارە تاکە لادیوارە بە پێوە مابێتەوە، ئەویش پێدەچێ خودا بۆ کەری هێشتبێتەوە، ئەوەتا هەر کەریّ جێیەکی بخوریّ و جێی گەوزین نەبینێتەوە، دیّ لامل و پشتی لەو دیوارە دەخشێنیّ و خورشتی نامێنیّ.

لا دیوار لە کۆشک و تەلارەکەی مەلا فەندی ماوەتەوە، وێنەی تاقە دارخورماکەی بەرگەی سەختیی رۆژگاری گرتووە، دیوار ئەو هەموو باوبۆران و تەڕ و تووشیەی دیتووە، کەچی هەر بە پێوەیە و نەکەوتووە.

دیوار لە ئاقارە، چوار دەوری چۆل و حۆلە، هێند چۆلە وەک دەڵێن:

بڕۆ کەری تێدا بگێ.

هەر واش کەوتەوە، ئەو جێیە لە بەر کەر و کەرگێیان بە بەر نەدەکەوت، ئەوانەی هەر کاتێ حەزی کەریان هەستابا، بە کەرێک و مستە جۆیێ یان بەڕکێ پەلکە نانەوە لەویّ بوون، حەمەد مەستان دەیگۆ:

باشە کەر لە کوڕ ئاوس نابیّ، دەنا گەڕەک پڕ دەبوو لە جاشکەبنیادەم.

ئێ، ئەوجا با بگەینەوە جاشەکەی لە مەڕ خۆمان، جاشەکە تازە بووبووە جاش، دیتبوویان لە بن لادیواری ئاقاریّ، تفەنگ بە ملەوە وا لە گژ جاشماکەرێکە. دیارە چەمووشە و راناوەستیّ، لووشکەیێ رادەوەشێنیّ، جاش توورە دەبیّ، خوێن بەر چاوی دەگریّ، نایکاتە نامەردیّ! تفەنگی لیّ رادەکێشیّ، سێ چار فیشەکانی پێوەدەنیّ، لەوەوە جاشی کەرگێی بە دوا دەکەویّ، دەڵێن گوتبووی:

نیوەی گەڕەک کەرگێنە، هەر ناوی من بەدە.

من گۆڕی ئەو جاشماکەرەم دیتبوو کە بە دەستی جاشەکە کوژرابوو، دوایوەی سەی بەرەڵا بەشی خۆیان لیّ پچڕاندبوو، چەند شەقاویّ دوور لە دیوارەکە خرابووە قۆرتێکەوە، خۆڵ و بەردیان پێدا دابوو، شێوەی گۆڕی

وەرگرتبوو. رەنگبی کوری کتێبخانە بووبێ لە سەر پارچە مەقەبایین بە خەتێکی درشت نووسیبووی:

جاشماکەرێ بە دەستی جاشێک شەهید بوو.

ئەو کورەش سەروکاری لەگەڵ کەر هەبوو، دەمەو ئێوارەیێ یەک دووانی بە سەردا دەچن، بە چاوی خۆیان کورە نابینن، دیارە زوو گوێی لە دەنگی پێ دەبێ و بۆی دەردەچێ، بەلام نیشانەیێ لە دوای بەجێدەمێنێ، لە وێنەی خۆی روونتر، چ حاشا هەڵناگرێ، ئەویش کتێبێکە مۆری کتێبخانەی گشتیی پێوە، هەینێش لە گەرەکێ جگە لەو کورە، چ کورێ کتێبی لە کتێبخانە نەدەهێناوە ماڵێ.

بیرمە منیش لە رێی ئەو کورەوە فێری چوونە گژ کەر نا، چوونە کتێبخانەی گشتی بووم، ئەو کورەی ئەگەر ناوی هەڵدەم گەرەک دەیناسێتەوە، بۆیە هەر بە کوری کتێبخانە ناوم هێنا.

دەڵێن چی وێنەیەکی کتێبخانەی گشتی پیشانبدەمەوە کە بە (باخی کتێبان)یش ناوی دەهات.

## باخی کتێبان

دواتر لە بەر خۆمەوە دەمگوت:

لەو دەرگایە بڕۆ ژوورێ، دەکەویە ناو باخێ، چ باخێ! گوڵ نیە، نەیبێ، هەر گوڵە و بۆنێ، هەر بۆنە و مەستبوونێ، لە هەر مەستبوونێکیش خەیاڵێ، لە هەر خەیاڵێ...

بیرمە کوڕی کتێبخانە دەرگای باخی نیشاندام، ئەوەشم بیرە جاری یەکەم لە ناو ئەو هەموو گولە، دەستم بۆ گوڵە کتێبی (سرووشت و دەروون) برد، خەتخۆشیش هەر گوڵێ لە گوڵەکانی گۆرانی بۆنکرد.

ئەو رۆژە کەم لە باخ ماینەوە، باخ کەوتۆتە سەر جادەی سی مەتری، لای تەیراوە و ناوی وی (کتێبخانەی گشتی)یە، ئێمە تا درەنگیش هەر باخی کتێبمان دەگۆتێ و کەم بە کتێبخانە ناومان دەهێنا، ئەو باخی کتێبە پاشترێ هاتە نزیک قەلاتێ، ئیدی من بە باخی کتێبانم گرت، بزر بام، لەوێیان دەدۆزیمەوە.

بیرمە لەوێ لە باخی کتێبان، سەرم بە سەر ئینجیلەوە بوو، سەرچیخ نەچووبم، ئینجیلەکەی کەریم زەند بوو. لە هیکەوە لوقمانی کوڕی ئەکرەم بڕنۆ، ئەو بڕنۆیەی تۆی خوێنەر لە زۆر سەرە کۆلانی کۆلان کۆلانی من دیوتە و بە دەنگ و رەنگ دەیناسیەوە، بە دیتنی کوڕی بڕنۆ لێرەوە پسام، ئاخر ئەو دوژمنی بابەکوشتەی کتێب بوو، هەموو کتێبێکی لە کتێبی ماتماتیکی قوتابخانە دەدیتەوە، چەند جارێ بە بابی دەلێ کە لە قوتابخانە دەریبهێنێ، باب گوێی پێنادات و سەی تێبەردەدات! دەمەو پایزانێ دەلێتە بڕنۆی بابی:

بابە، منت دەوێ یان ماتماتیک؟

باب:

هەردووک.
کوڕ:
نابێ، هەردووک پێکەوە نابێ.
باب:
کوڕی سەی، ئەوە چ دەڵێی! دەتەوێ وەک من ببیە گووڕێژ؟
کوڕ هەڵدەچێ:
گوو بە ماتماتیک، گووڕێژێ سەد مامۆستای ماتماتیک دەهێنێ.
بڕنۆی باب هێور دەبێتەوە، دەڵێتە کوڕێ خۆ:
کوڕم، تۆ چۆن دەڵێی با وابێ، بیهاوە بەر دڵێ خۆ.
ئیدی کوڕی بڕنۆ کەس لە قوتابخانە نایبینێتەوە.
وای! ماتماتیک منی چەند لە باخی کتێبان دوور خستەوە، کوڕی ئەکرەم بڕنۆ، کە کەمێ زمانیشی دەگرت و لە دەمی تەنگەتاوی زمانگرتنەکەی دەگەیشتە رادەی نیوە لاڵی، تا تێیگەیاندم کێشە چیە، نیو لاپەڕەیێ لە ئینجیلم دەخوێندەوە:
داکت گۆتی بێتەوە.
پرسیم:
لۆ؟ چ بووە؟
گۆتی:
خاڵت شڕە، دەچنە کۆیێ.
ئەو خاڵەم لە دایکەوە عیسایی بوو، ئەو نەنکەم لە قسان دوای هاتنە سەر ئایینی محەمەدیش، لە سەر بەرماڵێ ئینجیلی دەخوێندەوە، ئەرێ ئەوە چ ڕێکەوتێ بوو من لەو دەمە لەگژ خوێندنەوەی ئینجیل بووم!
ئێ، لە خاڵ و کۆیێ گەڕێ، باشبوو تا ئێمە گەیشتین، ئەو دەردی پەراندبوو، ئیزرائیلی دەستبەتاڵ ناردبۆوە، لەوەش مەپرسە، کوڕی بڕنۆ چۆن زانی من لە باخی کتێبانم. وەبیرمدێ، ڕۆژێ لە پێش دەرگای باخی کتێبان تووشی یەکتر بووین، پرسی:
+ چا کەی لێرە؟

- دەچمە ناو باخی کتێبان
+ کتێب باخی هەیە یان گوو؟
-کیوی، کتێبی ئێرە وەک ماتماتیک و هی قوتابخانە نیە.
+ کەرە، کتێب هەر کتێبە.
بە پێکەنینەوە گوتی: ـ
ئەگەر رۆژێ دیتت لێرە دووکەڵ بەری ئاسمانی گرتووە، بزانە من ئاگرم تێبەرداوە.
گوتم:
نەکەی، قورئانیشی تێدایە.
گوتی:
نەتهێشت، گووت تێکرد.
{دوای ئەو تەمەنە، لەو رۆژانە، رۆژانی نووسینەوەی کۆلان کۆلان، کوڕی بڕنۆم دیتەوە، من ئەو سەرهاتەم وا ورد لە یادگە نەمابوو، ئەو وەک خۆی پاراستبووی و بە دڵ و داو بۆی گێڕامەوە، ئەو کوڕە هێشتا دەگەڵ کتێب ئاشت نەبۆتەوە}
ئێ، لە کوڕی بڕنۆی لە کتێب تووڕە گەڕێ، دوای خوێندنەوەی ئینجیل حەزم چووە خوێندنەوەی قورئان، بەڵام کوا قورئان! ئەز زمانی قورئان نازانم، عارەبیەکەم بەشی ئەو چەند ئایەتەش ناکات کە لە قوتابخانە ئەزبەری دەکەم، بایی تێگەیشتنی بانگدانەکەی دەروێش برایمیش ناکات، بە کوردییش نیە، زۆر کەس دەڵێن:
گوناحە قورئان وەربگێڕدرێ.
هەیە دەڵێ:
گوناح نیە، بەڵام گرانە، کاری نەکردەیە، کەس دەرۆستی زمانی قورئان نایێ.
هەشبوو دەیگۆ:
نە گوناحە، نە گرانە، ئەوە ناهێنێ کاتی خۆتی پێوە بکوژی.
هەرچی بێ، من لە بەر خۆمەوە دەمگوت:

بە تاسەوەم کە قورئان بە کوردی بخوێنمەوە.

ئەو تاسەیە درەنگ دوای چەند ساڵێ شکا، هەژار شکاندی، هەینی تێگەیشتم نە گوناح بوو، نە کاری نەکردە بوو، نە ئەوەش بوو هێندە نەهێنێ.

هەر لەو سەروبەندە لە باخی کتێبان کتێبێکم لە بارەی ئێزیدی و ئایینی ئێزیدیان خوێندەوە، لێیەوە پێکەوتم کە نوێژ و پاڕانەوە و سرووتیان بە کوردییە، پێیان سەرسام بووم، دڵم خۆش بوو کاتێ زانیم ئایینێکی کوردیش هەیە. هەر لەوەوە دەستم دایە کتێبێکی عارەبیش، ئەوە یەکەم کتێبی عارەبی بوو کە لە باخی کتێبی بخوازم، کتێبەکە باسی لە دین و دیرۆکی ئێزیدیان دەکرد، کەم تا کورتێکیش لە زمانەکە دەگەیشتم، بەڵام هەمووم خوێندەوە، وا تێبگەم کتێبەکەی عەبدلرەزاق حەسنی بوو.

ئێ، لە باخی کتێب دەمێنمەوە، لە دیوانی شاعیرە کۆنەکانەوە پێداهاتم، بەرم لێگرتن، لە نالیەوە پێداهاتم تاگەیشتمە کانی و ئەوانە. بیرمە لە ئاست دوو دیوان تێدامام و دنیایێ خەمم لێیان خوارد، چۆن دەبێ تێیاننەگەم. ئەوانیش مەولەوی و مەلای جزیری، باشبوو لە مەولەوی ماڵی حەمەی مەلا کەریم بە هانامەوە هاتن. مەلای جزیری ما، ئەویش هەژار نەبێ کێ دەرۆستی دێ!

ئەرێ ئەگەر هەژار نەبا، من چیم کردبا! نە مەم و زینم دەبوو، نە مەلای جزیری، نە قورئان! دواتر جزیریم بیربهێننەوە، ئێستا لە باخی کتێبەوە (دایە) دەخەمە بن لچکی ساقۆکەم و تا ماڵێ گیرنابم، ئەو دایەی سەردەمانێ زراوم لێی چووبوو، شتێ لە زراوچوونەکش دەگێڕمەوە.

## دایه و ترسی کۆمۆنیست

دەورو بەری هەشــتا، هێشــتا پــێم نەنــابووە هەژدە، خولیــای (دایە) لە شێوەی شەوگەڕان لە سەرم دەگەڕا، زاخیشم نەدەکرد خۆی لێدەم، لە بەر ئەستووری و پەڕ زۆری نا، نا لە ترسی لە خۆم وەرگەڕان، ئاخر بە گۆتەی گۆتیاری:

شێخ و مەلا و ئاغاش وەردەگێڕێ.

لە زۆرانم بیستبوو: هەر گەنجێ (دایە) بخوێنێتەوە، ئەگەر کوڕی ئیمامی عەلیش بێ، بەر لەوەی بگاتە دوا لاپەڕەی، چۆتە سەر دینی پاڤێلی کوڕی، بــۆتە کۆمۆنیســت، ئەو دایــکە چەنــدان ســەرکردە و بنکــردەی کــردۆتە کۆمۆنیست.

تەنها من نا، هیدیش هەبوون لەو ترسە ترسی کۆمۆنیست، لەو دایکە شۆڕشڤانە دەرەوینەوە، ئەز هەینێ وا بووم، نەمدەویست ببمە کۆمۆنیست.

ئێ، حەزی خویندنەوە حەزی ناسینی دایە سویسی ترسی کۆمۆنیستی رەواندەوە، دایەم هێنا و ناوی خودام لێهێنا، گوتم:

خـودایە، چەپارەم دە، دایە دەخـوێنمەوە، بەهەشـتیش لە بـن پێـی دایـکە، دەیخوێنمەوە و لە کۆمۆنیزمیشم بە دوور بگرە.

بەرم لێگرت، وەک هەوکە لەبیرمە زستان بوو، لە ناو رۆمـان و دەرێی رۆمان زستان بوو، زستانێکی تووش، سووی سارد سارد بوو. لە مـاڵێ مە هەر کەڕەتێ دەرگا دەکرایەوە، بـایێ لە شێوەی ئەو بـایەی لە نـاو رۆمـان هەڵیکردبـوو، هـوڕوژمی دەهێنـا ژووری و جـادووی سـۆبە عەلادینـە ئـاگر کەسکەکەی بەتاڵدەکردەوە و چاوەکەی بۆ تـاوێ دەتگوت رووی ناتاشـایە هوردە خوساری گرتووە...

هێــژ هەر لە بەرایــیم، رەنـــگە هەشـــتیەکی لاپەرە گەرمەکــانی دایەم

هەڵدابێتەوە، ئا ئەز هەستم بە گەرمیی کتێبەکە دەکرد، لەو بەرایییەدا خۆزیم بە پاڤێل خواست، دەمویست کەویاریش ببێتە ناتاشا، هێشتا ساشێنکام نەناسیبوو! حەزمدەکرد داکیشم پێلاگێیای دایکی پاڤێل بێ، بەلام بابی! بابم نا، با بابم هەر وەک خۆی بمێنێتەوە و نە بە بابی پاڤێل نە بە هی کەس نەچێ، تا ئێرە ئەو تارماییەی لێی دەترسام نەهاتۆتە پێشێ.

بانگی سپێدەی دەروێش برایمی دەنگ داودی، منی لە ماڵی دایە پێلاگێیا هێنایەوە ماڵێ خۆمان، ئەو شەوە لە چاوەکەی من گلۆپی خەو (سفر) هەڵنەبوو، چاوم بایی خەونێکیش بە لای خەودا نەچوو.

بە تاقە شەوێکی ئێرە، زستانێکی ئەوێم پەڕ پەڕ، بەفر بەفر هەڵدایەوە، گەیشتمە ئەو لاپەڕەیەی کە بەفری تێدا دەتوایەوە، ئەها، خاک لەگژە بە گژوگیا بەگژ سەرماوسۆڵەدا دەچێتەوە و ژیانی دایەش کەسکدەبێتەوە.

ئەوەی لەوێ زستانێ بیرمبێتەوە: پاڤێل دەکەوێتە زیندانێ و دێتەوە، دایە پێیتە لە بیرچووەکانی بیردەکەوێتەوە و فێردەبێت و دەخوێنێتەوە، پەڕە کاخەزی قاچاخیش لە ناو کارخانە بڵاودەکاتەوە، وا دیارە لە نێوان پاڤێل و ساشێنکا کەین و بەینێ هەیە، نازانم بۆ حەزمدەکرد ناتاشا لە جێی ساشێنکا بایە!

لەو شەوە، لەو چەند بەشەی (دایە)ی گۆرگیەوە، سۆزی چینایەتیم پتر بزووت، ئەو رۆژە تا لە قوتابخانەش هاتمەوە، ناوە ناوە هەستم لە خۆم رادەگرت، لە خۆم دەپرسی:

داخوا نەبوومەتە کۆمۆنیست؟!

هەر خۆم بەرسڤم دەدایەوە:

نا، نابمێ، چما کۆتریشم ببێتە کۆمۆنیست، بە لیسەوە بە نیوە نرخ نایفرۆشم!

ئێ، بە دوو سێ رۆژێ گەیشتمە دوا لاپەڕەی دایە و هەندێ لەو وشانەشم ئەزبەر کرد کە لە فەرهەنگۆکەیدا هاتبوو، هێندەی رێژنە بارانێکیش نزای باشم بۆ کەریمی حیسامیی وەگێڕ خوێند و درووود لە سەر درووودیشم بۆ مەکسیم گۆرکیی نووسەر دەنارد. دایەم بۆ باخی کتێب گەڕاندەوە، بەلام

نەدەبوو لە ماڵێ نەمبێت. ئەوە بوو گەڕام، پارەی کۆترێکی باشم پێدا، تا بە چیاش کەوتم گوڵێکی گەش بوو لە ناو باخچە گچکەکەی کتێبانی هۆدەکەم. حەزمدەکرد ببمە پاڤێلەکەی ناو لاپەرەکانی، ئەوە بوو لە دەمی خۆپێشاندانەکانیش بۆی گەڕامەوە و وردتر خوێندمەوە.

دوای خوێندنەوەی دایەی گۆرگی هەر بڕادەرێکم دەدی، ئەوانەی سەروکاریان دەگەڵ خوێندنەوە هەبوو دەمگۆ:

بڕۆ دایک بخوێنەوە، تا نەیخوێنیەوە، نازانی رۆمان چیە.

هەبوو دەیپرسی:

ئەدی نابیە کۆمۆنیست؟

دەمگۆ:

نا، کوا من بوومەتە کۆمۆنیست!

وا تێبگەم لە وان ساڵان چ خوێنەرێک نەبوو، دایەی گۆرگی نەخوێندبێتەوە.

دەچم سۆراخێکی پاڤێلیکیدی دەکەم، ئەوەی پۆلای ئاودایەوە.

## چتۆیی پۆڵامان ئاودایەوە

ڕۆمـانێ هەبـوو کەم کەس چـاوی پێکەوتبـوو، بەڵام هەرکـێ شـتێکی لە بـارەوە بیسـتبوو، مینـا چیرۆکخـوانێ پێیـدا هەڵـدەگۆ و دەیگەیانـدە تەشـقی ئاسمانێ. بە شێوەیێ کەوتبووە سەر زاری خوێنەران، شەرم بوو شتێکی لـێ نەزانی، هەبوو نە بە کتێب نە بە فیلم نەیدیتبوو، کەچی دەیگۆ:

ڕۆمـــانە نەک گەمە، کـــار لە دایـــک نـــیە، ئەوەی نەیخوێنـــدۆتەوە، نەڵـــێ ڕۆمانخوێنم.

منیش کەڵکەڵەی خوێندنەوەم کەوتە سەر، وام لێهات بە ناوهێنانی ئاوم لە زار دەهات.

بیستبووم نووسـەرەکە ئەو ئـاودانەوەی لە ژیـانی خـۆیەوە هەڵگۆزیـوە و بەرگی ڕۆمانی لە بەر کردووە، ئەوە وایکرد پتر تینووی پۆڵاکە بم.

لە زۆرانـم پرسـی، زۆر جـێ گەڕام، کەس نەیزانـی، لە چ جـێ نەمـدی، چ وێناچێ بە عارەبی بەو ناوە کتێبێ هەبێ! هەر وا بە دوایدا وێلم.

گۆتەی نووسـەرێکی ڕووسـیزان کەمـێ سـاردیکردمەوە لە پرس و گەڕان، گوتبووی:

چتـۆیی پۆڵامـان ئـاودایەوە چ نـیە، لە بەرایـی تـا کۆتـایی پیاهەڵـدانە بە بەلشەفیک و سوپای سوور.

هەر ئەو ڕووسیزانە:

ئەو کتێبەی ئۆسترۆڤسکی چ هونەرێکی ڕۆمانی تێدا نیە، تەنها هەژانێکە، بە وێنەی دە ڕۆژەکەی جۆن ڕێدی ئەمریکی.

تۆ بڵێێ وابێ، ئەو دکتۆرە نووسـەرە ڕووسیزانە سەرچیخ نەچووبێ؟

هەبـوو گـۆتەی ڕووسـیزانەکەی پشتڕاسـتدەکردەوە، نـازانم لە کـوێ و لە کێی بیستبوو، گوایە:

له سـەردەمی جەنگـی دووەمـی جیهـانی، لە گەرمەی شـەڕێ، سـەربازی سـوپای سـوور، سـەد و دوو سـەد و هەزار نـا، زۆر ئەو کتێبەیـان لە نـاو کۆڵەپشـتێ بـووە، دەگەڵ خۆیـان دەیـانگێڕا، دەیـانبردە بەرەی شـەڕ و نـاو سـەنگەرێ، کتێبـێ ئەگەر بە دڵـی سـتالین نەبـێ، ئەگەر بـۆ هانـدان و خـۆ بە کوشتدان نەبێ، وا دەستاو دەست دەگەڕێ!

هەشبوو دەیگۆ:

تۆ بڵێی سـەربازی رووسـی، سـەربازی رووسـیزان هـزر و خەیاڵیـان بەو شـێوەیە لە چێوە گیرابـێ، لە خوێندنەوەش هەڵبژاردنیـان نەبـووبێ، سـتالین شیعر و رۆمانیشی بۆ دیاریکردبێ، بە فەرمـانی سـەربازی (چتۆیی پۆلامـان ئاودایەوە)ی دەرخوارد دابن!

رێی تێناچێ، هەبێ نەبێ جوانییەک لەو کتێبەدا هەیە، جوانییەک لە سەرێی شەڕ و کوشتن و پارت و ستالین.

منـیش وای بـۆ دەچـم، ئـێ، ئۆجـا تـۆ بەرێ خـۆ دێ، کتێبـێ هێشـتا نەمانخوێندۆتەوە، ئەو هەموو مشتومڕەی ناوەتەوە.

هەر دەبێ وەدەستی بهێنم، دا بزانم رازی ئەو پۆلا و ئاودانەوەیە چیە!

ساڵێ دوو دواتر لەو ساڵەی وا من دوای ئەو هەمـوو سـاڵە دەیگێڕمەوە، کوڕێ هەبوو گۆگجەلی، هی لای مووسڵێ، قسە هاتە قسە، گوتی:

خوێندوومەتەوە و دەتوانم پەیدای بکەم.

دوای حەفتەیـێ کەمتـر هێنـای، کتێـب گەورە و کـۆنە، هەنـدێ پەڕێ گەچراوە، بەرگەکەی رەنگی چووەتەوە وکەس نازانێ چ رەنگە، دەڵێی لە ناو خۆڵەمێشـی خـانەی حـیکمەی بەغـدایێ هەڵگیـراوەتەوە، ئەوەی بە گـۆتەی گۆتیاری: هۆلاکۆ ئاگری بەردایێ.

هەر لە بەرایی پەڕی یەکەم بووم یان دوو، رستەیەکی منداڵەکە رایکێشـام کە لە وەڵامی پرسیارێکدا گوتی:

من بەرکم نیە.

نەیبـوو، جلکـی ئەو منـداڵە وەک هـی منـداڵەکانی دی نەبـوو، بەرکـی پێوە نەبوو، منداڵەکەش ناوی پاڤێل بوو، لەو دیمەنەوە دیار بوو دەبێتە شاکەسی

ناو رۆمانەکە، ئەرێ خۆ کوڕەکەی دایکی گۆرکیش ناوی پاڤێل بوو، ئەوە بۆ؟

لەوێ لەو دوو سێ لاپەڕەیە ئەو پرسیارە لام سەریهەڵدا.

چوومە دووی، لە بەرئەوەی زمانەکەم باش نەبوو، بیست ڕۆژی ویست تا گەیشتمە ئەوەی پاڤێل کەڵکی جەنگاوەری پێوەنەما، لە ماڵ کەوت و بووە نووسەر.

من پێشتر شتێکم لە ژیانی نووسەرەکە بیستبوو، دەمزانی نیکۆلای ئۆستروڤسکی جەنگاوەر بووە و دوایی پێ و دەست و چاوی لەدەستداوە، لە جێ کەوتووە...

دەبینم پاڵەوانی ناو رۆمانەکەش پاڤل کورچاگین دەگاتە هەمان چارەنووس، لە زۆر شوێن ئەو دوو ژیانە، ژیانی ناو رۆمان و دەرێی رۆمان هاوشێوەن، لە زۆر گرتە کتومت یەکن، بۆیێ لێم تێکەڵ بووبوو، ئەوەی دەیخوێنمەوە رۆمانە یان ژیاننامە؟

لە خۆم دەپرسی:

داخوا ژیاننامەش بە هەندێ خەیاڵ و هونەرکارییەوە ببێتە رۆمان؟

وەلامم نەبوو.

رستەیەکی دی کە منیش هەینێ هێندەی پاڤێل باوەڕم پێیبوو:

بۆئەوەی رۆژێ دابێ مرۆڤ دەستی نەچێتە مرۆڤ، ناچارین بکوژین.

رستەیەکی دی پاڤێل کە بیرمناچێتەوە و زۆر داخم بۆی خوارد، کاتێ لە شەڕێ چاوی راستی لەدەستدەدات، دەڵێ:

خۆزی چاوی چەپم دەبوو، تا توانیبام نیشان بگرم.

ئەمن هەر لە منداڵییەوە لەو ساتەی گۆتی:

بەڕکم نیە.

پاڤێلم خۆشویست، تا ئەو رۆژەی لە جێ کەوت، بیرمەدێ رقم لە رۆماننووسەکە هەستا و دەمگوت:

نەدەبوو بەو دەردەی بردبا، با پاڤێل خۆشت بێت، هەر نەدەبوو وای لێ بکەیت.

بەڵام لە هەندێ هەڵوێست لەگەڵ پاڤیل نەبووم، پارتایەتیەکەی لەوێ، ئەوەی لەگەڵ تۆنیا کردی، ئەو کچەی زوو کەوتە بەر دڵی من و خۆشەویستی پاڤیل بوو، کەچی لە سەر هەڵوێستی سیاسی دەستبەرداری بوو.

ئێ، دوای خوێندنەوە هەر جارێ چتۆیی پۆلامان ئاودایەوە، دەهاتە ناو باس و خواسەوە، ئەمن دەمگۆ:

قسەی دکتۆرە رووسیزانەکە هێندەی راستە کە لە بەرژەوەندی سۆڤیەت و پارتی کۆمۆنیستە، بەڵام رۆمانە نەک گەمە، پڕپڕ لە جوانی و هونەرکاری.

لە باخی کتێب دەمێنمەوە، داغستانی من دەخوێنمەوە.

## داغستان

## زنەی بیابان

ئەو رۆژە یەکەم کەس کە لە باخی کتێب کتێبی خواست من بووم، دوا کەسیش کە لە دەرکەی باخی گۆدە گۆد هاتە دەری، من بووم. ئاخر دەزانی بە سەر چیدا کەوتم! لەو ریبوارە بیابانیە دەچووم کە شەو و رۆژێ زاری تەڕ نەکردبێ، تەریفەیی هەڵیگرتبێ، لە هیکڕا بە سەر کانیی کوێستانی کەوتبێ. کانیەک کە لە بن بەردێکی بەر سێبەری گولان هەڵقولابێ، داغستانی من کانیەکە بوو، ریبوارەکەش من.

داغستان پەڕ پەڕ پەند و جوانی، رستەی ناسک و هۆزانی، داغستان لاپەڕەکانی هێندەی ژمارەی رۆژەکانی ساڵە، لاپەرە لاپەرە گوڵن، هەر لاپەرەیەکی بۆنی گوڵێ دەدات، هەر لاپەڕەیێ بە بادەی گوڵاوێ مەستت دەکات. ئەو رەسووڵە ئەو هەموو وێنە و وەسپە ناوازەی، ئەو هەموو راز و نیازەی چۆن لە رستەدا جێ کردۆتەوە؟!

لە بەر خۆمەوە دەمگۆ:

ئەوە چ کتێبێکە، دەبێ لە خودای نەدزیبێ و کەس پێینەزانیبێ!

لە خوێندنەوەی داغستان بە دیار هەندێ وێنەوە، وێنەی بە وشە، رادەچڵەکیم، راچڵەکینێ وەک ئەوەی لە خەونێکەوە بەربیتەوە سەر جێ. دوای ئەو تەمەنە هێشتا دوو سێ وێنەم وێنەی هەینێ لە یادە، رسووڵ گۆت:

پیاو تەنها لە دوو باردا دەبێ بچێتە سەر چۆک:

بۆ خواردنەوەی ئاوی کانی و بۆ قرتانی گوڵ.

بە شێوەیەک راچڵەکیم، عەزیزی مەلای رەش کە لە نزیکە من سەری بە سەر کتێبەوە بوو، دیاربوو هەستی پێکردبوو، گۆتی:

کورە ئەوە چیتە، دەڵێی دەرزی لە رانت راچووە!

خۆزی دەرزی با! لەوێ لە رەسووڵ هەمزاتۆفم پرسی:
هێ لە کانی و گوڵ ئەدی خودا؟ بۆ وی نەچینە سەرچۆک؟
بیرت بێ، هەینێ نێوان من و خودا، خودای ناو کتێبان، کتێبی ئایینی، هێندە دوور نەبوو، هەر لاسکی گوڵێ تۆ بڵێی جۆگەلەیەکی پێوە دەچوو، نوێژم نەدەکرد، رۆژووم نەدەگرت، لێ لێی دەترسام، هەستمدەکرد هەمیشە لە تەنیشتمە، لە سەر سەرمە...
هێمان نیوەی داغستانم نەبڕیبوو، هەستمکرد رەسووڵی داغستانێ نەک هەر بەگژ ئاییندا ناچێ، بەڵکوو دەگەڵیشی نەرمە، لەوەوە لە خەیاڵێکی ئۆلداریەوە گوڵ و کانیەکەم گەیاندەوە بەهەشتێ، گوتم:
وێدەچێ رەسووڵ مەبەستی گوڵ و کانیی بەهەشت بێ، بۆیە لە واتایەکی دووردا چۆکدادانەکە هەر بۆ خودای تاک و تەنیایە.
ئێ، جارێ لە کانی و گوڵی بەهەشت گەڕێ، لە دەمی خوێندنەوەی لەو رستەیەی هەمزاتۆفەوە کانی و گوڵم پتر خۆشویست، چ خۆشویستنێ! هاتە سەرم دوای دوا لاپەڕەی داغستان، بەو دوا دواییەی جوزەردانی، یەکسەر رێی دڵۆپە بگرم، ئەو کانیەی وا لە بن بانیەکانی رۆژهەڵاتی شارە، وەک چۆن بابم لە سەر دووگرد کڕنووشی بۆ خودا دەبرد، وا چۆک بۆ کانیی دڵۆپە دابدەم و تا زگاو دەبم لێی بخۆمەوە، بۆ قرتانی هەر گوڵێکیش وەک چۆن دایکم لە ساتی گەسکدان دەنووشتێتەوە وا بنووشتێمەوە.
ئێ، داغستانی من هێند جوان وڵاتی داغستان نیشاندەداتەوە، کەژ کەژ بە کەژ و دۆڵەوە، بە رووبار و پێدەشتەوە، بە ئاوایی و مرۆڤ و ئاژەڵەوە، بە سوار و ئەسپ و خەنجەرەوە، بە زمانی ئاڤاری و بە گۆرانی و شمشاڵەوە، بە راستی و خەیاڵەوە، هی ئەوەیە هەرچیت هەیە لە دارەتێ دنێ، بیخەیتە گرەوی گەشتێکی ئەوێ.
وا تێبگەم لە خوێندنەوەی دووەمین جاری داغستانی من بوو، ئا، جاری دووەم کتێبەکەم کڕیبوو، لە ماڵی لە تەنیشت تاریک و روونی هێمنی خۆمانم دانابوو، هەستمکرد داغستان زۆر لە کوردستان دەچێ، لێ کەسێ هەڵنەکەوتووە، بە شێوەی رەسووڵی داغستان، تۆ بڵێی پەیامبەری داغستان

پێیدا هەڵبلێ. نەبێتە درۆ ئەو کتێبە ئەو داغستانە زمان و ولاتی خۆمی لا شیرینتر کردم.

رستەیەکی تری ناو داغستان کە لە یادگەم دەقاودەق وەک خۆی ماوەتەوە، دوو باڵی باڵندەکەیە، ئەها دەڵێ:

کرملین و گوندی من، بیری کۆمۆنیزم و هەستی نیشتیمانپەروەری، وەکوو دوو باڵی باڵندەن، وەک...

بۆ من ئەو بیرۆکە نوێ بوو، تۆزێ سامی کۆمۆنیزمی رەواندەوە، بەرە بەرە، دوای خوێندنەوەی هەندێ کتێبی دی، هەستمکرد دڵم بۆ کۆمۆنیزمەکەی رەسووڵی داغستان لێدەدا، پاشتر دەمگۆتە فازیل رێحانەی هاوڕێم:

دایەی گۆرگی هێندەی داغستانی هەمزاتۆف منی لە کۆمۆنیستان نزیکنەکردەوە.

دەیگۆ:

هێندەی نەمابوو منیش بگۆڕێ...

ئەوجا دەڵێن ئەوە یەکەم کتێبی پەخشانیی هەمزاتۆفە، بەر لەوە تەنها هۆزانی نووسیوە، تۆ وەرە بە کتێبی یەکەم وا بگەیتە ئاسمان، راستی هەینێ من ئەو داغستانەم بە کتێبێکی ئاسمانی دانابوو، پێموابوو هەبێ نەبێ، ئاسمان دەستێکی لە نووسینی ئەو کتێبەدا هەیە، لە دڵێ خۆ دەمگۆ:

ناکا ئاسمان چاکەیەکی واش لە گەڵ من بکات و لە نووسینی کتێبێکی وا یاریمبدات!

باشە، ئەوە کتێبی یەکەم بوو، چاوە چاوین کتێبی دووەم بێ، چاومان لە دەست عەزیز گەردییە، چاپی بکات و بە داغستانمان هەڵگەڕێنێتەوە، تینوویێتیمان بە وشە داغستانییەکان بشکێنێتەوە، لە هەر دیدارێ، دیداری چاخانەی شەوانی هەولێر، دەپرسین:

مامۆستا عەزیز، سۆراخی داغستان؟

مامۆستا بە کەمێ بێزارییەوە:

شەش حەفت ساڵە، لە بەحرکە کەوتووە، بەغدا رێی لێگرتووە.

قسـه له داغسـتان، بێ نـاوی عەزیـز گەردی نـاتەواوە، وەک ئەوە وایە لە قورئـانە کـوردییەکە بـدوێیت و نـاوی هەژار نەهێنـی، چ زمـانێکی هەیە ئەو عەزیزە، ئەز پێشتر پێش خوێندنەوەی داغستان دەمگۆ:

دوای هەژار و هێمن له زمان، ئەوەی نووسەری کوردە بۆ ماڵێ.

چ شیرنە، چ ناسکە، چ پاراوە، زمـانی داغسـتانی عەزیـز گەردی، وەبیرتـان دەهێنمەوە پێشتریش گوتوومە و دەیڵێمەوە:

ئەو داغستانەی بەو زمانەی من خوێندمەوە، ئەگەر رەسـووڵ هەمزاتۆف خوێندبایەوە، بە دووری مەبینە وای گۆتبا:

من له عەزیز گەردیم شیرینتر نەگۆتیە.

بیرمە داغستانەکە لە سـەر زاری برادەران رەسـووڵ هەمزاتۆفی بە دوادا نەدەهات، هەموو بە داغستانی منی عەزیز گەردی ناویان دێنا.

تـا دیـداری کتێبـی دووەمـی داغسـتان، لای رەسـووڵی ئەوێ و عەزیـزی ئێرەم خۆش، ئێستا بـازێ دەدەمەوە و دەگەمەوە سـاڵێ لە سـالانی براکوژی و لەوێوە لە چەند شەوێ بە دیار نیکۆس کازانتزاکیەوە دەکەمەوە، بەڵام بەر لەوە مگێـزم لێیە کەرەتێکـی دیش ئەفسـانەی چیـای ئـاگری وەخـوێنم، بیـرم ناکەوێتەوە ئەوە جاری چەندەمە بۆی دەگەڕێمەوە، هەر ئەو ساڵەی کڕیم، وا تێبگەم سێ جار خوێندمەوە، ئیدی نازانم بۆچی من لەو رۆمانە تێر نابم.

## ئەفسانەی چیای ئاگری

هێندەم دەور کردبۆوە، نێوی کەسەکانم وێنەی نێوی خۆم و کەویار ئەزبەر بوو:

گوڵبەهار، گوڵستان، گوڵڕێز، ئەحمەد، مەمۆ، سۆفی، سلێمانی فەلە، حوسۆی ئاسنگەر، پیری کاروان... مەحموود خانیش لەوێ.

بەر لە هەمووان گوڵڕێزم خۆشویست، چوونکێ سەرلەبەری مەم و زینی خانیی ئەزبەر بوو، حوسۆی ئاسنگەریش لە بەرئەوەی منەتی کەسی نەدەزانی، مەمۆی نێردەوان لەبەرئەوەی لە بری دوو سێ داوە کەزیی گوڵبەهار، بە مەرگی خۆی هاتە پێش، وەستا فەلەکە لە سۆنگەی دەلاقەکەوە... ئێ لە قارەمان و کەسان گەڕێ.

چیای ئاگری ئەوەی شۆڕشێکی بە ناوەوەیە، لەو ڕۆمانەدا هێند ئەفسانەیی، هێند پیرۆز پیشانی دەدات هی ئەوەیە لە ڕێی گەیشتن بە دامێنی، سەرتی لە سەر دانێی، ئەدی گۆلەکەی سەری سەرێ! خۆزگەم بەو کەسەی لە خەونێش دەیگاتێ.

ئەفسانەی چیای ئاگری بە شێوەیێ هەندێ شتی پیرۆزکردووە، لە دەستی ئایین و پەیامبەرانیش نایێ، لەوانە:

چیای ئاگری، ئاگری چیا، گۆڕی ئەحمەدی خانی، ئەسپ، کوورەی ئاسنگەرەکە، پیری کاروان، شمشاڵ، ئەو شمشاڵەی توورەیی چیای ئاگری دەژەنێ و گوڵبەهاری سەوداسەری ئەحمەد کرد، ئەوەی گوتی:

ئەسپ ئەسپی خۆمە.

ئەو ڕستەیەی ئەفسانەی چیای ئاگری لێکەوتەوە و...

ئەدی جوانیی شاری بایەزید و ئاقاری بایەزید، نەخاسمە ئەگەر لە دەلاقەی زیندانێوە لێت ڕوانیبا، ئەو زیندانەی بە سەر هەڵدێرێکەوە هەڵنرابوو،

ئەو دەلاقەیەی وەستا سلێمانی فەلە لە زیندانی کردەوە، گۆتەیەکی واشی بڵاوکردەوە، کەس نەبوو باوەڕ نەهێنێ، هیچ پاشا و بەگ و میری نەوێرا بیریش لە گرتنی دەلاقەی زیندانێ بکاتەوە.

لە دەلاقەی زیندانی بایەزیدەوە، دنیا دنیایەکی دی بوو، جوانییەکی وات دەدی، لە دەرێی زیندآن نەدەبینرا.

من کە دەمخوێندەوە خۆزگەم بە زیندانیانی ناو زیندانەکەی بایەزید دەخواست.

ئەفسانەی چیای ئاگری، جێ جێ، کەس کەس، گرتە گرتە ئەفسانەیە، ئەفسانەی جوانی، ئەفسانەیێ هەر لە یەشار کەمال دێ.

دوا گرتەش کە گوڵبەهار و ئەحمەد پێکدەگەن و بە سواری ئەسپێ دەگەنە سەر چیای ئاگری، کاتێ لە تەنیشت یەک رادەکشێن، ئەحمەد شمشێرەکەی لە نێوان خۆیان درێژ دەکات، لەو کاتە دێتە سەرت سەری ئەو ئەحمەدە هەڵبکێشی و بە یەشار بڵێی بۆ؟

بەڵام دوای تۆزێ بیرکردنەوە، پەژیواندەبیەوە، ئاخر ئەگەر شمشێرەکەی لەوێ دانەنابا، دوورنەبوو ئەفسانەی چیای ئاگری بەتاڵبێتەوە.

کتێبت سەد کتێبی لێبکەوێتەوە، شوکر مستەفا، تۆ بە زمانی ئەفسووناوی منت خستە ناو ئەفسانەی یەشار کەمالەوە.

هەوکە بەرەو براکوژی.

## براکوژی

لە دەرێ لەناو سەرماوسۆڵێ، برا تەق تەق برا دەکوژێ، بە فیشەکان کوژراو دەژمێرێ، بە خوێن براکوژی دەخاتە ناو مێژوو، منیش لە ژۆرێ بە دیار سۆبە و بە دەم بریشکە قرتاندنەوە پەڕ پەڕ (براکوژی) هەڵدەدەمەوە، چ ڕێکەوتێکە، لە براکوژیدا براکوژی بخوێنیتەوە!

ئەو نووسەرە گریکیە چیە، خوایە؟ ئەو هەموو رستە ئاسمانیەی لە کویوە بو هاتووە؟ ئەوە کار لە رەسوولێ داغستان و ئەوانە نیە، براکوژی هەر بە راستی وای بۆ چووم لە ئاسمانێوە هاتبێ، لە دیدی هەینێی منەوە ئەو رستانە رستەی بنیادەم نەبوون، لە توانای وی بە دەربوون، هەر دەبێ خودا بۆی دارشتبێ.

ئەز بەر لە براکوژی زۆربام خوێندبۆوە، بەڵام هێند گیرۆدەی نەکردبووم، رەنگە بە هۆی زمانەوە بووبێت، ئاخر من بە شرە عارەبیەکەوە بە عارەبی خوێندبوومەوە، زمان بەربەست و کۆسپی پێش چێژ بوو، هەر واش بوو، دوای سالانێ بۆ زۆربا گەڕامەوە، تێگەیشتم زۆربا، زۆربایە!

براکوژی بە زمانی خۆمان بوو، زمانێکی تەڕ و پاراو، وەک عەبدولکەریم شێخانی روون و زەلال، ئەو شێخانیەش دەڵێی نان و دۆی دەگەڵ هەژار و هێمن و شوکر مستەفا و عەزیز گەردی خواردووە، چەند شیرینی کورداندووە.

براکوژیشم بە دوو سێ شەویک لە بن هێنا، بیرمدێ لەو براکوژیەدا، براکوژیی ناو کتێبێ، وەکوو هەستم لە دڵی خۆم رادەگرت، دەمبیست بۆ باوە یانارۆس لێدەدا، ئەو قەشەیەی لە نێوان زەوی و ئاسمان، لە نێوان لینین و مەسیح تێدا مابوو. باوە یارانۆس پێدەچوو نیکۆس خۆی بێ، پاشترێ کە شتێکم لە ژیانی خوێندەوە، گومانم نەما کە خۆی لەو قەشەیەدا

نیشانداوەتەوە.

براکوژی بۆ من دەروازەی چوونە دنیای نیکۆس بوو، دواتر کتێب کتێب بە دوایدا چووم تا وای لێهات بووە دڵنشینترین نووسەری من، تا ئێستا بە دڵنشینی ماوەتەوە و چ نووسەرێ جێی وی نەگرتۆتەوە.

براکوژی لە سەردەمی براکوژی دەنگیدابۆوە، کەم خوێنەر هەبوو نەیخوێندبێتەوە، زۆر جار کە ناوی دەهات، لێمان تێکدەچوو مەبەست لە کامیانە، براکوژیی گریکی ناو کتێبێ، یان ئەوەی ئەو دەشت و چیایەی کوردستانێ، ئەو شەڕەی بە شێوەیێ خوێن بەر چاوی زۆریانی گرتبوو، وەها بەر چاویانی تاریک کردبوو، ئەگەر گوتبات:

ئەرێ لە براکوژی تێرنەبوون؟

لێت دادەڕسان، چەکیان لێت رادەکێشا، وەها باگوێیان دەدایەوە:

براکوژیی چی! ئەوە شەڕی پێشمەرگە و جاشە، شەڕی...

هەبوو رقی لەو کتێبەش دەبۆوە کە براکوژی ناونیشانی بێ، بیرمدێتەوە کوڕێ، ناوێکی وەک (...) هەبوو، لە گەرمەی براکوژی، کاتێ براکوژیەکەی نیکۆسی بە دەستی برادەرێکەوە دیتبوو، وا تێگەیشتبوو لە بارەی شەڕی خۆمانەوەیە، گوتبووی:

ئەو کتێبە لە بەر چاوم هەڵگرد، هەرکەسێ ئەو شەڕە بە براکوژی ناو ببات، ناپاکە.

برادەرەکە گوتبووی:

کەرە، ئەو کتێبە پێوەندی بە کوردەوە نیە، کۆنە، سەرۆکەکەت هێشتا لە پشتی بابی بووە، ئەوە نووسراوە.

گوتبووی:

هەرچی بێ، شتێ نیە ناوی براکوژی بێ.

ئەو کوڕە سەر بە بەرەی مام جەلال بوو، برایەکیشی لە چیا لە ریزی کۆمۆنیستان بوو.

کوڕێکیش دوور بە دووری دەمناسی، ناوی مەهداوی بوو، گوتبووی:

هەر کەسێ براکوژیی خوێندبێتەوە و باوەڕی بە براکوژی هەبێ،

گەمژەیە.

چ ما لە کتێبی براکوژی؟ ئا، وەرگێڕانەکە پێشکێشکرابوو بە (ن . م)ێ، کەس نەیدەزانی ئەو ناوە کێیە، من درەنگ پێکەوتم یەکێکە لە سەرانی براکوژی، نەوشێروان مستەفای ناوە، زۆرم لە دڵ گران بوو، براکوژیی کازانتزاکی پێشکێش بەو کراوە.

باشە، با وابێ، لە براکوژیی نیکۆس گەڕێ، خستمە تەنیشت دایەی گۆرگی با لەوێ بێ.

لە سەروبەندی براکوژی، دوو هاوڕێی زۆر نزیکم بە چیا کەوتن و هەر یەکەیان چووە بەرەیەکی شەڕەوە، فازیل ڕێحانە و کیفاح، ڕەنگە ئێستا سێرەیان لە یەکتر گرتبێ، دڵم لە ناو دەستمە.

وا باشە لە باخی گڵکەندەوە، لە بەهاری هەشتا و سێوە، شتێ لە باس و خواسی براکوژی پیشانبدەمەوە، بەڵام بەر لەوێ حەزدەکەم چەند گرتەیەکی هەمەڕەنگ، کۆن و تازەی فازیل ڕێحانەی هاوڕێم پیشانبدەمەوە، ئەو هاوڕێ گیانیەی کەس لە دڵێ من جێی وی نەگرتەوە.

## جندەخانەی مووسڵێ

بەر لە چیا کەوتن دڵی نەرم کردم لەگەڵی بچم، بۆ چیا نا، بۆ مووسڵێ، راستی من لەو پتر حەزم لەو جێیە بوو، بەڵام شەرمم دەکرد، وا خۆم پیشاندەدا کە ناچمە جێی وا و شتی وا ناکەم. رێحانە پێشتر بینیبووی، کاتێ شتێکی لێ دەگێڕایەوە، زارم ئاوی دەکرد، لێ هەوڵمدەدا بە سەر خۆم نەهێنم و بە هەندی وەرنەگرم، رێحانەش هەستی بەو شەرمەی من کردبوو، بۆیە بۆ شەرمشکاندنەکە چ رێ نەما نەیگرێ، ئیدی بە رێ کەوتین.

لە بەری رۆژهەڵات لە نزیک نەبی یوونس دابەزیین، بە پێکەنینەوە گوتی:

دوایەوەی لەوێ هاتینەوە، سەرێ لە مەزاری نەبی یوونس دەدەین و لە گوناهەکە پاکدەبینەوە.

بە منداڵی ئەو نەبیە لای من زۆر پیرۆز بوو، هەر جارێ لەگەڵ دایکم دەهاتم هەستمدەکرد چوومەتە حەجێ، ئەو مەزارە، ئەو پەیامبەرەی ناو زگی نەهەنگێ، هەر لای موسڵمانان نا، لای هەمووان پیرۆز بوو، مەسیحی، یارسانی، ئێزیدی...

شتێکمان خوارد و برۆ، من شوێنەکە پێنازانم، وا دیارە نزیکبووینەتەوە، رێحانە قسان دەکات، وێدەچێ رێوشوێنی جێ و سەرجێیم فێر بکات، بەڵام من لە ترسان هیچی تێناگەم، چۆکم دەلەرزێ، هەستیپێکرد، پیلمی گرت و گوتی:

بە من بڵێ، ئێمە دەچین لۆ سەر ژن، یان لۆ بن قەنارە؟!

بیرمە گوتم:

تۆ برۆ، من دەگەڕێمەوە.

زۆری هەوڵدا، ملم نەدا، گوتی:

دە تا من دەگەڕێمەوە، برۆ لە سەر نەبی یوونس بۆم بپاڕێوە کە خودا لە

گوناهم خۆش بێ.

ئەری بۆچی ترس پێی بەستم و نەیهێشت تامی ژن بکەم کە تا هەینی نەمکردبوو، لە ناو خەونیش بە نیوەچڵی بوو، هەوکەشپیوە لەو ترسە نەگەیشتم.

ئیدی جندەخانەی مووسڵم لە دەست خۆم دا، وا نەبا، ئێستا ئەویش دەکەوتە ناو کۆڵانەوە.

ڕێحانە درەنگ هاتەوە، کز دیار بوو، چەندی پرسیم:

چ بووە؟ چ ڕوویدا؟

هیچی نەگۆ، لە نزیک ماڵێ هاتە گۆ:

ئەو بەڵایە مەمکی گەلەک جوان بوو، دەتگوت هەنارە، بە خۆم نەوەستام، گەزەیەکی ناسکم لە گۆیەکەی دا، هەر هێندەم زانی دوو شەقاو لەولا کەوتم، توومەز تەڕدەستانە بن پێی لە سینگم گیرکردووە و هەڵیداوم، چما ژن ئەوها بە تێنن! چما مەمک ئەوها ناسکە!

بە مەمک راوە کەرویشکم بیرکەوتەوە.

## راوە کەروێشک!

ئەگەر وەبیرتان بێتەوە، جاری راوە کەروێشکم هێنا گۆڕێ، بەڵام نەچووینە راوێ، هەر هێندەم گۆت:

راوێکە نە داوی دەوێ، نە تاژی، نە پشکە خوێنێکیشی لێ دەڕژێ.

راو نیە لەو راوە ناسکتر، راوێکە چێژێکی وات دەداتێ، لەبیرت ناچێتەوە، راوی پڕ موچڕکە و ئۆخژن، کەرەستەی راویش تەنها تیچاوە و چیدی نا، فێربوونیشی گران نیە و هاسانە، رووتەنک مەبە و تەواو، جێی راویش کۆلانە، سەر دەرگا و حەوشەی ماڵانە.

ئەز زۆر حەزم لە راوە کەروێشکێ دەکرد، بەڵام چوونکێ زۆر شەرمن بووم، کەم دەچووم، یەکەم راوی خۆم وەک خۆی ماوەتەوە و وەبیرناچێتەوە، دەڵێی ماچی یەکەمە، تامەکەی بە هیچ ناچێتەوە، ئەو جووتە کەروێشکەی کەوتنە ناو سێرەوە سپی سپی بوون، لە گوڵی مەمکەکیژە سپیتر، ئەو کەروێشکانەی هەینێ ئێمە راومان دەکردن هەمە رەنگ بوون:

سپی سپی، سپی، تۆزێ سپی، گەنمی، رەشتارە، رەشی هەنجیری، خورمایی... لەشێوە و قەبارەش جیا جیا: هێلکەیی، هەرمێیی، هەناری، گندۆرەیی... بەڵام لە شلی و توندی هیچم لێنەدەزانی، ئاخر دەستم لێنەدابوون، ئەرێ کێبوو ناوی نابوون کەروێشک و راوە کەروێشک؟ هەر کێ بێ، ماڵی ئاوابێ، ناوەکە ناسکە.

ئێ، راوی یەکەم لەبیرناچێتەوە، لە کۆلانێکی تەنگەبەری گەڕەکی تەیراوە، لە کۆنە خانووێ لەگژ کاری داربەستی بووم، لە ناو دەرسەکانەوە چ ببینم، کچێکی تازە هەڵچوو، دەتگۆ گلۆپە، بە سۆندە و گەسکەوە، لە سەر کۆسپی دەرگای بەرانبەرم دەرکەوت، نزامکرد دانەوێتەوە و دەست بە یەخەوە نەگرێ، نزام بە زیادەوە گیرا.

ئێستا نێوانمان هەر سێ چوار گەز دەبێ، من وا لە پەنا و تاریکی سەریش هەڵبڕێ نامبینێ، ئەویش لە بەر رووناکی، ئەو خوی رووناکیە، ئەگەر لە تاریکیشەوە دەرکەوێ هەر رووناکە. بە چاوی من چاودێ، بەر کۆڕەی تەواو کردۆتەوە، جۆتە مەمکی سپی سپی، گچکۆکە، برێ لە هێلکەی بارۆکە گەورەتر، بە گۆوە دەرکەوتن، دوو گۆ لە کەرتکە گێلاس دەچوون ئەوجا لە سەر سپێتی، کچە لەگژ شووشتن و گەسکدانە، منیش لەگەل وەرسووڕان و روو وەرگێرانی ئەو، بە پێدزە جێی خۆم دەگۆڕم و لەگژ راوی ئەو دوو کەروێشکەم کە تا ئێستاش لە چاومدا سپی دەچنەوە.

ئەو راوەم بە شەرمەوە بۆ فازیل ریحانە گێڕایەوە، گوتی:

تۆ چیت دیتووە، من راوی لەو ناسکتر و سپیترم کردووە.

وابوو، ئەو زۆری دیتبوو، ئەو زۆر لە نزیکتریشەوە دیتبووی، دەستیشی لێدابوون، هەر هی هەولێر نا، هی مووسڵیشی تام کردبوو، وەکوو دەڵێن شتێ لە دنیای دیتبوو، بەڵام من نا، تەنها هێندە بوو، جاروبار بۆ راوێ دەکەوتمە کۆڵانان، جارناجارێ بە چاوی پڕ مەمکەوە دەهاتمەوە و شەوان بە خەیاڵی وان دەکەوتمە خەوەوە.

هەندێ کۆڵانی چەند گەڕەکێکمان دەستنیشان کردبوو، دەمانزانی کەروێشکی ناسکی لێیە و ئاسان دەکەونە ناو سێرەوە، سێتاقان گەڕەکێ بوو لە جێراوگەی ئێمە، هەر لەوێش فازیل ریحانە وانەیەکی فێرکردم، لەبیرنەچێتەوە، بزانە چۆن:

بە کۆڵانێکدا هاتین، دوو سێ ژن لە سەر کۆسپەی دەرگا دانیشتبوون، یەکیان منداڵکار هەر لە تەمەنی کەویار دەبوو، ساوایێ بە سینەیەوە، شیری دەدایێ، مەمکێکی تەواو دەرهێناوە و ئەوی دی نیوەی دیارە، بە دیتنی ئێمە خۆی لە گوورە نەبرد، داینەپۆشی، دەستی نەخستە سەری، منیش تیچاوم وا لە سەری. وای خودایە، چەند جوانە مەمکی ناو زاری ئەو ساوایە، لەو چەند چرکەیە هەزار جار خۆزگەم بەو ساوایە خواست، خۆزگەم بەو پیاوە خواست کە باخەوانی ئەو سێوانەیە، چەند شێوەی سێویان دەدا، ئەو مەمکە رەشتارانە.

وەهایان کەمەندکێش کردبووم، برژانگم بە سینەی ژنەکەوە بەسترابوو، دیاربوو تێپەڕیبووین، بەڵام ئاورمدابۆوە، چاوم هەر بەوێوە هەڵواسرابوو، لە نقورچێکی توندی فازیل هاتمەوە سەر رێ و گوتی:

تۆ هەڵەیەکت کرد.

گوتم:

وایە، نەدەبوو ئاوڕبدەمەوە.

گوتی:

ئا، هەڵەکە چ نیە دەڕوا، بەڵام چ لە گوناهەکە دەکەیت؟

بە پێکەنینەوە گوتم:

ئەدی نالێن (نەزەر) بە چەند نوێژێ رەشدەبێتەوە!

گوتی:

ئەو گوناهەی تۆ کردت لەو شێوەیە نیە.

گوتم:

ئەدی؟

فازیل بە وردی گوناهەکەی بۆ وردکردمەوە، پێدەچوو ئەویش لە کەسی گەورە بیستبێتی:

ژن کاتێ بە نیازی شیردان مەمکی دەردەهێنێ، ئەوجا هەر ژنێک بێت و هەر مەمکێک بێت، نابێت تەماشای بکەیت، ئاخر وەک ئەوە وایە تەماشای مەمکی دایکت یان خوشکی خۆت بکەیت.

نازانم بۆ یەکسەر باوەڕم بە قسەکەی هات، ئیدی مەمکی ناو زاری منداڵ بهاتایەتە ناو چاویشم، نەمدەدیت و رووی خۆم وەردەگێڕا.

هەر لە سەر هەندێش لە دیتنی ئەو مەمکە خۆم بێبەری کرد، کە چەند ساڵ بوو، تامەزرۆی دیتنی بووم، دیتنەکە کەوتە کاتێکی خراپ، کاتی گوناهەکە، ئەویش لە سەر دەرگا، خستبوویە زاری ساواکەی، بەڵام من هێند خێرا چاوم لە سەری هەڵگرت، بە دیتن ناهێتە هەژماردنێ، وەک تارماییش نایەتەوە ناو چاوم، ئەگەر ناوی ئەو کچە بهێنم، هەمووتان دەیناسن، ناڵێم ناوی.

## شار و ناسینەوەی ساڵ

پێشان لەو شارە ساڵ هێ لە ژمارە ناوی دی هەبوو، ساڵ هەیە دوو ناوی هەیە، بەڵام وێناچێ ساڵی بێ ناو هەبێ، ئەوە ساڵی گرانیی گەورە، ئەو ساڵەیە کە جەندرمەی ئۆسمانی دەنکە گەنمیان لە مێروولەش دەڕفاند، پووشانەیان لە دەرۆزەکەریش دەستاند، برسێتی بە شێوەیێ تاوی ستاند، خەڵک گۆشتی کەر و سەگ و پشیلەی دەبرژاند.

ساڵی ئینگلیس:

ساڵی قووچاندنی ئۆسمانی و پێوەربوونی ئینگلیسە.

ساڵی مێرێ و حەسۆ:

ئەو ساڵەیە، لەو دەشتە، حەسەن و مریەم کە جوانترین ژن و مێرد بوون لەو دەمە، دەکەونە جەنگی جەندرمان، حەسۆ بە بریندارى دوو جەندرمان دەنێرێتە ئەو دنیا، جەندرمە دەست لە مێریش ناپارێزن، هەردووکیان لە خوێن دەگەوزێنن، دەڵێن:

لە ناو گۆڕیش هەوریی سەری حەسۆ وا بە برینی سینەی مێرێوە.

تا درەنگیش ژنی هەولێرێ، بۆ نزا دەچوونە سەر مەزاری حەسۆ و مێرێ.

ساڵی لافاوەکە:

ئەو لافاوەی خەڵکی سەر قەڵاتێش ترسیان لێ نیشتبوو، ئاخر وەک دەگێڕنەوە: لافاوێ بوو، لە پانەوپانی و هاشە هاش و شەپۆلان زۆر لەوەی نووح دەچوو.

ساڵی بەفری ئەستوور:

ساڵێ بەفرێکی ئەستوور دەکەوێ، کەس ماڵەوماڵ ناکات، چڵ رۆژ دەمێنێتەوە، لە هەندێ جێ ئالیک نامێنێ، بزن قشپلی خۆی دەخوات، مامز لە برسان دەستبەرداری کێو و دەشتنشینی دەبێت و رەوە رەوە دێنە ناو ماڵان.

ساڵی نەوار:

ئەو ساڵەی لە دیرۆکی شار بە ساڵی نەوار تۆمار کراوە، ئەو ساڵەیە کە پۆلیس وەک چاویەشتە کون کون لە چاخانە و مالان، بە دوای نەوارێکدا دەگەڕان، نەوارەکەی کاوێزاغا، ئەوەی سەر و دڵی پادشای بەغدای گرتبوو، ئەوەی پێشتر لە چ جێ رووینداوبوو.

ساڵی مەرگی شەهابە:

شەهابە ئەو خۆشخوان و بانگخوێنەی قەڵاتێ کە دەنگ نەبوو بە داودیشەوە بیگاتێ، دوای وی کەس جێی وی پڕنەکردەوە، ئەو ساڵە شار بۆی گریا و لە بانگیدا.

ساڵی ئاگر:

ئەو ساڵەی ئاگری ناوە، ئەو ساڵەیە شێخ محێدینێ فەتوای حەرامکردنی کردنەوەی ئاگری نەورۆزی داوە.

ساڵی کەریم و ستی:

ساڵی کوژرانی ئەو کوڕ و کچەیە، ساڵی لە خوێن گەوزینی ئەوینە، ئەو دوو ئەویندارە بەرگی خوێن و شاریش رەشی پۆشی.

ساڵی بازاڕی فەلەک:

تاقە ساڵە ناوی شیعری هەڵگرتبێ، ئەو ساڵەیە کە بورهان جاهید شیعرێکی بە ناونیشانی (بازاڕی فەلەک) لە دیواری سەرا هەڵواسی، دەنگیدایەوە و لە سەریشی کەوتە زیندانێ.

ساڵی کۆچی جوو:

ئەو ساڵە بوو، هەرچی کوردی جوو هەبوو، ماڵی خۆیان هەراج کرد و بەرەو ئیسرائیل کۆچیان کرد و نەگەڕانەوە.

ساڵی چەپڵە:

ئەو ساڵەیە کە شێخە شەل لایەکی شار بە دوای خۆی دەدا، بە چەپڵە و

دەستی رووتەوە درووشمی مەرگی زۆردار و بژی هێزی گەل دەڵێتەوە.

ساڵی سوێند:

ئەو ساڵەیە کە جووتیار و رەنجدەران سوێندیان بە تەڵاق و قورئان خوارد، مل بۆ ستەم و زۆری ئاغا نەدەن.

لەو شارە ساڵ نیە بێ ناو، ئەوە ساڵی حەرەس قەومی:

ئەو ساڵەی وەلەکە عارەبی بیابان پێوەربوون و بە:

ئیحنا بەدوو وینە عەدوو

کەوتنە کوشتوکوشتارێ، شار بە مردنیش لە بیری ناچێتەوە.

ساڵی حەمەی سابیرت هەیە، ئەو جاشەی جادە دەگەڕا، رانکوچۆغە لە بەری دیتبا، دوو فیشەکی پێوەدەنا.

لە ناو ساڵان ساڵێ هەیە ناوەکەی تریشی هەر ژمارەیە، ژمارەکەی خۆی، ئەویش شێست و شەشە:

ئەو ساڵەیە جەلالی لە داخی مەلایی لە بەغدایان کردەوە و پێش دەبابە کەوتن.

ساڵی یازدەی ئادار:

ئەو ساڵەیە کە میللەت دەستی گەیشتە شتێ و هەناسەیەکی دا.

ساڵی ئاشبەتاڵ:

ساڵێکی زۆر شووم بوو، دوای ماچەکەی شا و سەدام، بە فیکەیەکی مەلا مستەفا وڵاتێ پێشمەرگە چۆکی شکا و دەستی لەرزی، چەکی دانا، شۆڕشێ بە ئاودا چوو.

ساڵێ کەرگیران:

ئەو ساڵەیە، میری فەرمانی گرتنی کەری دا، لە تەنیشت گەراجێ، دنیایێ کەری لە ناو تەلبەند کرد، ئەوجا خاوەن کەر هەبوو، دەچوو جۆرکە جۆی لۆ کەری خۆی دەبرد، پۆلیس لێی وەرنەدەگرت، دەیگۆ:

بە فەرمانی بەرێوەبەر، کەر نابێت ئالیکی بۆ بێت.

خاوەن کەرێ گۆتبووی:

دە بڕۆ بەرێوەبەری کەرانم لۆ بانگکە، بزانم...

دەڵێن شێتێ گوتبووی:

حوکمەت زۆر کەرە، لە باتی کەری دوو پێ، کەری چوار پێ دەگرێ.

ساڵی کەمانچەی کوژراو:

کەمانچەژەنێ هەبوو، ناوێکی وەک رەوەندی هەبوو، لە ختوخۆڕا شەقاوەیێ، سەرچیخ نەچووبم عومەری ناو بوو، رێی لێدەگرێ، بە سێ چوار چەقۆ لە خوێنی دەگەوزێنێ و تەلی هەناسەی دەپسێنێ، لە کاتی ناشتنی نیوەی شار دەرژێتە گۆڕستانی سەید مارف، تا درەنگ وێنەی کەمانچەکەی بە سەرکێلەکەیەوە...

ساڵەکان ناهێنە ژماردنێ، ساڵی سە هەیە، ئەو ساڵەیە پۆلیس کەوتنە راوە سەگ و قڕانیان تێخستن. ساڵی رۆژگیرانی گەورە هەیە، ساڵی کلۆ، ساڵی بەفری سۆر، گەنمی سۆر، ساڵی شار بە چیا کەوتن، ساڵی گریانی حەمە شێت، ساڵی راوە کۆمۆنیستان...ساڵ ساڵ وەرە، وەڕە، ئێستا گەیشتینە ساڵی راوە شێت.

## دەفتەری شێتان و راوە شێت

ویناچێ شار هەبێ هێندەی شاری مە شێتی هەبێ، هەر شێت نا دەرۆزەکەر و مزگەفتیش، دەگێڕنەوە فازیل رێحانەش ناوە ناوە بۆ کەنین و خۆشی لە شێوەی شانۆگەری پیشانیدەدایەوە:

*حەمەد مەستان سەر لە ئێوارەیێ لە ساتی مەستی رێ لە دەروێش برایم دەگرێ:*

*پرسیارێکم لێت هەیە دەروێش.*

*دەروێش لووتی خۆی دەگرێ و دەڵێ:*

*حەمەد بڵێ، بەڵام هێندە لێم مەیە پێشێ.*

*مەستان زیاتر دەچێتە پێش:*

*خودا لە سەر دنیا چەند ماڵی وەک ئەوەی تۆی هەیە؟*

*دەروێش کەمێ دەکشێتەوە:*

*نازانم، لە ژمار نایە، بێ کۆتایە.*

*مەستان:*

*ئەدی لە هەولێرێ چەند ماڵی هەیە؟*

*دەروێش کەمێ دادەمێنێ، ژمارەیەک دەڵێ.*

*مەستان:*

*ئەدی لۆ دەڵێی نازانم؟*

*دەروێش:*

*کوڕە هەی سەرخۆش، من گۆتم هی دنیایێ نازانم.*

*مەستان:*

*ئێ، دە تێبگە، خودا لە دنیایێ چەند ماڵی هەیە، نیوەیان لێرەن، لەو*

*هەولێرەن، دە بڵێ وا نیە!*

*دەروێش گوتبووی:*

*حەمەد، لە دوای بانگدانێ نزات لۆ دەکەم بگەڕێیەوە، لۆوەی لە ماڵی خودا لە لای خۆم ئەو باس و خواسانە بکەینەوە، حەمەد، بە خودای ئەمن زۆر خەمی تۆمە.*

*مەستان دەڵێ:*

*بەلاشە، لەو نزا و خەمە گەڕێ، دەروێش بە پێی خۆی، سەرخۆش بە پێی خۆی.*

*دەروێش بەرەو مزگەفت دەبێتەوە، مەستان گاسیدەکات:*

*دەروێش، دەروێش...*

*دەروێش ئاوڕدەداتەوە:*

*چیە، خودا هیدایەتی دای؟*

*مەستان:*

*لە پەنای دەرگەی مزگەفتێ، جێیەکم لۆ بکەوە، وا لە سەر شێتبوونم، هەر دیتت شار حەمە شێتێک یدی خستە ناو جادە و بەر دەرگای ماڵی خودا.*

*دەروێش سەر بادەدات و لە بەر خووە:*

*وای لەو حەمەدە شێت و نەزان و کەرە، وا دەزانی ماڵی خودا تەنها جێی شێت و دەرۆزدکەرە!*

ماڵی خودا زۆر لە باسی راوەشێتی دوورخستمەوە، لە ماڵی خودا گەڕێ.

شار سەرشارە لە شێت و دەرۆزکەر، لە هەر لایەکەوە کەسێ شێت دەبێ، کەسێ دەکەوێتە سەر ساجی عەلی و پەنا دەباتە بەر دەستەسڕ راخستنێ، ڕوودەکاتە ئەو شارە هەمە ڕەنگ و هەمە دەنگە، ئەو شارە رووتەنکە، ئەو شارەی هەمیشە دەرگای لە سەر پشتە، هەر شێتێ، هەر دەرۆزەکەرێ راونرێ، تێهەڵدرێ، لە بێ جێیی، لە برسان سەرهەڵگرێ، دێ لێرە بارگە دەخات و ناڕواتەوە. تۆ برۆ شێت و دەرۆزەکەرانی شار بدوێنە، لە قسەیانڕا دیارە، هی چ ئاقارێکن، هی چ شارێکن. ئەها چاودێ، لەو سەری سەرێ، لە دەڤەری بالەکایەتی و پژدەرێ، لە هەموو جێوە لە بەری بارزان و

کەڵەک و قەراج و پردێوە، بپەڕێوە، لە زێی گچکە لە زێی گەورە بپەڕەوە ئەو بەری، بەری بادینان و گەرمیان و بابان، دەبینیەوە، شێت و دەرۆزەکەری هەموو جێیان لەو شارە دەبینیەوە.

باشە، ئەو شارە بۆ بۆتە جێی دەرۆزەکەر و شێتان؟

فازیل ریحانەش پیاوبوو بە هۆی زۆری ماڵی خودا و نانبدەیی خەڵکەوەیە. دەیگۆ:

سێ رۆژ دەرگای مزگەوتان داخە، با سێ رۆژ کەس کەس دانەکات و نانێک نەبەخشێ، بزانە ئەو شارە حەفت شێت و سێ دەرۆزەکەری تێدا دەمێنێ!

واز لەوە بێنە بەر لەوەی بببێتە راوەراو، راوی شێتان، لەگەل فازیل ریحانە دەچینە سەرژمێریی شێتان، گوتی:

وەرە، با هەر شێتە و بە دوو سێ خەت بناسێنین، رۆژێک دێ بە کەلکمان دێ.

من هێندە مەیلم لێ نەبوو، دڵیم نەشکاند و چەند جارێ بەگەڵی کەوتم. دەفتەرێکی گچکەی خستە باخەڵی و لە ناوشار و گەڕەکان کەوتینە گەڕان، هەر شێتێکمان دەدی دەمانخستە چەند رستەیەکەوە، بەو شێوەیە دەماندناساند:

ناوی فلانە، جلک و بەرگی ئەوهایە، بەژنی هێندەیە، داری بە دەستەوەیە یان نا، پێڵاوی لە پێیە یان پێخواسە، دەستوەشێنە، یان بەستەزمانە، بە چ قسەیەک یان شتێک دەناسرێتەوە...

سەد و شتێ شێتمان خستە رستەوە، ئەوانەی ناومان نەدەزانین، بۆ خۆمان ناوێکمان بۆیان دادەنا کە لە شێوە و سیمای بوەشێتەوە، یان لە قسەیەکی خۆیەوە، وا تێبگەم لەو شێتەوە پێدا هاتین کە لە نزیک مزگەفتی دەروێش برایم لە ناو گۆماوێ دەلینگی هەڵکردبوو، لە ناوی خۆی دەگەڕا، بیرمدێ فازیل لێی پرسی:

ئەوە چیت بزرکردووە؟

بێوەی سەرهەڵبڕێ:

خۆم خۆم، ناو ناو...

ناوی ئەو شێتەمان نەزانی، بۆیە ناومان نا:

خۆم خۆم.

ژمارە یەکیشمان بۆی دانا.

لە دەفتەری شێتان ناوی لە شێتێک نابوو:

شێتی کەلاوە.

ئەو شێتە لە گەڕەکی کۆماری بوو، دوو سێ کۆڵان هێروەی ئەو کۆڵانەی کە دواتر کۆچەرێکی کۆمۆنیست بە دەمانچەیەک و چەند فیشەکێ حوکمەتێکی شێت کرد! داستانێکی وای تۆمارکرد، شار هەمووی، هەندێ شێتیش دەیانگوتەوە. لەوێ لە لایەکی حەوشەیەکەوە دەرگەیەکی گچکە کرابۆوە، هۆدەیەکی پیس، ئەو شێتە کە ئێوارە دادەهات، دەهاتەوە ئەو کەلاوەیە.

دەفتەرەکەی فازیل شێتی بێ ناوی زۆر تێدا بوو، ناوی لە شێتێک نابوو:

شێتی پێ بە زنجیر

دەیگۆ:

لە خانووێک کارم دەکرد، لە ماڵەکەی تەنیشتیان لە پەنجەرەوە دیتم پیاوێکی تەژەیان لە ژۆرێ بە مەربەند بە ستبۆەوە، دیار بوو شێت بوو، پێکەوتم کە شارستان مەگەر چۆن دەنا شێتی خۆیان بەرەڵای جادە ناکەن.

لە دەفتەری شێتان، شێتێک هەیە ناوی شێتی تف لە حەوایە، کەس نیە ئەو شێتە نەناسێ، کەسیش ناوی نازانێ، دیار نیە جێ و بنەچەی کوێیە، بە زۆریش لە ناوەندی جادە دەڕوا، ترومبێل خۆی لێ لادەدا، ناوە ناوە قیت رادەوەستێ، تەواو خۆی پشتەوشکێن دەکاتەوە و ئاسمان بە بەر تف دەدات، رێحانە بە پێکەنینەوە دەیگۆ:

هەبێ نەبێ، ئەوە لە سەر بەرماڵ شێت بووە.

فازیل ئەو دەفتەرەی لای خۆی پاراستبوو، هەر شێتێکی تازەش لە شار پەیدادەبوو، دەیخستە ناویەوە، ناوە ناوە لێم دەپرسی:

دەفتەری شێتان پڕنەبۆوە؟

دەیگۆ:

فشەت پێبێ، ڕۆژێ دێ، دەبینی چەند بە کەڵک دێ.

حەیفم دێ، دەفتەری شێتان لەگەڵ چوونی فازیل ڕێحانە چوو، ئەز دوای ئەو تەمەنە، لە کەڵکی ئەو دەفتەرە تێگەیشتم، ئێستا ئەگەر لە بەر دەست با، لە زاری ڕێحانەوە کۆلانی گێڕانەوەم پڕ دەکرد لە شێتی شار و ڕستەی سادەی ئاودار.

باشە، با بچینە دیار ڕاوێ، ڕاوی شێتان، ئەو ڕاوەی خوێنیشی لێوە ڕژا، ئەو ڕاوەی لە پۆلیس وابێ ڕاوە سە دەکەن، ڕاوە سەیەکەی بەرێ دەڵێم، ئەوەی زەوی و ئاسمانیان پڕ کرد لە قوورە قووڕی پارانەوە و کەس بە هاواریانەوە نەچوو.

شار تا دەهات شێتی دەخستەوە، شێتی دەهاتێ، شێتی هەمە جۆر، شێتی لە شێوەی بەرخۆکە، نەرم نەرم، نەرم لە ڕەفتارو و گفتار، بەر بەردیشت دابا، نەیدەگۆ ئەی هاوار. شێت هەبوو بە شێوەیێ بە ڕێی خۆیدا دەڕۆیی ڕێت لێ نەگرتبا، نەدەهاتە ڕێت. شێتیش هەبوو چاوی لە هەیاس کردبوو، پێت بە خواری دانابا، دەیکوتی. جۆرە شێتێکی دی پەیدابوو، دەتگۆ لە سالح ستالینیان گرتۆتەوە، لەویشیان تێپەڕاندبوو، ئەوانە سیاسی بوون، بە حوکمەتیان گرتبوو، جوێنیان دەدا، تفیان هەڵدەدا، وەک ئەو شێتە نا کە تفی بۆ ئاسمان دەنارد، نا، ڕاستەوخۆ تفی لە ناو چاوی سەرۆک دەکرد.

ڕێحانە بە چاوی خۆی دیتبووی، گێڕایەوە:

*لە بەری قەیسەری، نزیک چاخانەی سەید سەلیم، ئەها سەدامێک وا بە دیوارەوە، چاوم لێیە شێتی تەواوێ بە بە دیاریەوە ڕاوستا، دەستی لە شێوەی دووربین لە ڕووی ڕاگرتبوو، وەک بڵێی لە خۆی دوور و نزیک بخاتەوە، پاش تاوێ بە تفان وەرگەڕا سەری و سواخیدا، خەڵک ترسان و پەرتەیان لێکرد.*

بیرمنەماوە چ ناوێکی لەو شێتە تفهاوێژە نابوو.

شێتی تووڕە و دەستوەشێن ڕۆژ دوای ڕۆژ پتر و پتر دەبوون، هەبوون بە گژ بێریە سۆر و قات زەیتوونیشدا دەچوون، یەک دووانێکیش دەرکەوتن

گێچەڵیان بە کچان دەکرد...ئیدی میری بڕیاریدا شار شێتی تێدا نەمێنێ، هەموو راپێچرێن بەرەو شێتخانەی گەورەی بەغدایێ.

پۆلیس پێوەربوون، بگرە و سوارکە و بازۆ، هەندێ شێت نازانم چۆن دەیانزانی فەرمانی دەسگیرکردنیان دەرچووە، لە دوورەوە پۆلیسان دیتبا، هەڵدەهاتن، هاواریان دەکرد، کەس تێنەدەگەیشت هاواری خودا دەکەن یان کەسێکی تر. سابە شێتێ هەبوو،ماڵیان لە کوورانێ بوو، کاتێ بیستبووی راوەشێتە، بە غاردان بەرەو ماڵێ بووبۆوە، لە رێ منداڵ لێیان پرسیبوو:

ها، سابە لۆ وا زوو هاتیەوە؟

سابە دەڵێ:

پۆلیس هی وەکی من دەگرن.

شێت هەڵدەهاتن و لە پەناو پەسیوان، لە ئاودەستی مزگەفتان خۆیان دەشاردەوە، شێت هەبوو لە کاتی بەردەستکەوتن، دەستی نەدەدا و شێتانە دەستی دەکردەوە، دوو سێ پۆلیسی تەخت دەکرد. هەیاس بە دە دوازدە پۆلیس ئەوجا بەرزەفت بووبوو. هەندێ شێت بە ئاقار کەوتن، پۆلیس لە دوایان نەبوونەوە، بووە یەک راوە راو، دەتگوت راوە سە دەکەن، دەیاندانە بەر فیشەکان، شێت هاواریان دەگەیشتە ئاسمانێ، کەس بە هاواریانەوە نەدەچوو، یەک دووانێکیان بە برینداری گرتن و بردنیان، شێت نەما. مەمەدیش ماوەیێ لە ماڵێ نەوێرا بێتە دەرێ، ترسا بە شێتی دانێن و بیبەنە شێتخانێ.

شار چەند رۆژێ شێتی تێدا نەما، خەڵک وەک بڵێی شتێکیان بزر کردبێ، شار بیری شێتەکانی دەکات. ئەها یەک دوو شێتی تازە پەیدابوونەوە، زۆر بوون، زۆری نەبرد شێتە کۆنەکانیش، شێتی شێتخانە هاتنەوە، وەک خۆی لێهاتەوە، بەڵام پێدەچوو، دەرزیان لە شێتە دەستوەشێنەکان دابێ، کز و مەلوول دیار بوون. هەیاس هێزی هەستانەوەشی نەمابوو، شار دڵنیابوو حوکمەت شتێکی لە هەیاس کردووە، دەنا ئەو شێتە شێرە وا کز ناکەوێ.

ئەو راوە شێتە و بردنیان بۆ شێتخانەی بەغدایێ بە چەند دێرێ کەوتبووە دەفتەری شێتخانەی فازیل رێحانەوە.

## کچەی ئامێدی

فازیل ڕێحانە ماوەیێ بەر لەوەی ناوی سەربازیی بێ، دەیویست زۆرترین جێ بگەڕێ، فیلمی باش ببینێ، کتێبی باش بخوێنێتەوە، ئاخر بڕیاری دابوو، نابێ سەری بێریە، پێی پۆستاڵ ببینێ، هەرێی چوونە چیای بە خۆی دابوو، دەیویست بە پڕی، پڕ لە شار و فیلم و کتێب، چەک بکاتە شانی.

منیش دەتگۆ دڵم تریواندوویەتی، ئەگەر بە چیا بکەوێ نایبینمەوە، هەرچی دەگۆ، دەمگۆ ئێ. وەکوو بڵێی (نا)م نەمابێ! لە سەر خواستی وی، هێشتا ڕۆژ لە چ جێ هەڵنەهاتووە، سوار بووین، بۆ کوێ؟

ئامێدی

هەر من و ئەو و شوفێرین، ترۆمبێلەکی تایبەتی گرتبوو، بمانبات و بمانهێنێتەوە، پارەیەکی باشیشی دایێ، نە من نە ئەو ئامێدیمان نەدیتووە، نیوەڕۆ نەبووە، وا لە بن ئامێدی، تۆ بڵێی ڕێ سەرکەوتنی هەبێ! تا گەیشتینێ، وەک ئەوەی ڕێی ئاسمانمان گرتبێ، شار چۆن گەیشتۆتە سەر ئەو شاخە، ئەو شاخە چۆن وا پان کەوتووە و شاری لە خۆی بار کردووە؟! شاری لەو شێوەم لە خەونیش نەدیتبوو، ئەوەی لە تەلەفزیۆن پێشانی دابووین کوا ئەوها بوو، ئەوە ئامێدیەی لە کتێب خوێندبوومەوە، کوا ئەوەیە کە بە چاوی خۆ دەیبینم.

ڕێحانە دەڵێ:

بە من بڵێ، ئێمە لە زەوین یان لە ئاسمانێ؟ داخوا جێ هەیە لێرە بڵندتر!

شوفێر دەست بۆ چیایەکی پشتەوە درێژ دەکات و دەڵێ:

تەماشای مەتین بکە، هەیێ تێدەگەی.

وایە، لە بەرزیی مەتینەوە تێدەگەین کە ئێمە هێشتا لە سەر زەوین.

میری بادینان لە خۆڕا ئێرەی نەکردۆتە پێتەختی میرنشینەکەی، ئێرە

قەلاتێکە لە ئاسمانی، ئەگەر چەکوچۆلت لە مشە بێ، ناپاکت تێدا نەبێ، ناگیرێ، لەشکری چوار دەوڵەت دەوری بدات، ناگیرێ.

تیکە نانێکمان خوارد و بگەڕێ، ئامێدی جێیەکی دیاری شوێنەواری نیە، ئاخر ئەو شارە لە چ شارێ ناچێ، سەر لەبەری شوێنەوارە، بە هەر لایکدا دەڕوانی شوێنەوارە، هی ئەوەیە بە دیاریەوە دانیشیت و سەربردە و دیرۆکی لێ بخوێنیتەوە. لە نزیک منارەی گەورە وێنەیەکمان گرت، بەڵام ئەوەش بە دەردی وێنەکەی ئەوێ ساڵێی تەک کۆتەڵەکەی حاجی قادری کۆیێ چوو، چوو.

ئامێدی پێدەچێ، شاری هەموو ئایینان بێ، بە دوای هەر ئایینێکدا بگەڕێ شوێنەواری دەبینیەوە. دوو دەمژمێرێ تێدا گەڕایـن، لە دەروازەی زەردەشتەوە پێدا هاتین، سەر گۆڕی میرەکانمان کرد، لە دەرگای کۆنەوە گەیشتینەوە ئەو کلێسەیەی تەماشاکردنی حەیرانت دەکات، گۆتمە فازیل ڕێحانە:

بەوەندە لێی تێر نابین، دەبێ بێینەوە و شەو لیی بمێنینەوە.

گوتی:

من پێناچی جارێکی دی بیبینمەوە.

بەو وەڵامە دڵمی گرت، هیچم بۆ نەگوترا. ئێ، چیدی... ئا، بیرمکەوتەوە، شوفێرەکە بە پێکەنینەوە گوتی:

من چاوم لە دار و دیوار بە فیرۆنادەم، ئەوان بۆ ئێوە و کچەکان بۆ من.

بە راست کچە ئامێدی بۆ وا جوان بوون، وا تەڕ و ناسک دەتگوت ئاسماننشینن و بای زەویان بەر نەکەوتووە، لە دەمی سواربوون و گەڕانەوە شوفێر گۆتی:

ئەگەر حەزدەکەن سەد ساڵ بە جحێڵی بمێننەوە، کچە ئامێدی بخوازن.

فازیل ڕێحانە:

دیارە ئەو پیرانەی ئێرە تەمەنیان دوو سەد ساڵە!

لەو قسانە بووین، لە سووڕانەوەیەک ئەگەر شوفێر تەڕدەست نەبا، کچێکمان پانکردبۆوە. کچە تاسا و لە جێی خۆی وشک بوو، دانیشت، زمانی

شکا، هەناسەی گیرا، رەنگی سپی هەڵگەڕا، خەڵک خڕبوونەوە، ئاویان پێدا کرد، بە زاریانەوە کرد. جغارەخۆرێکی پێچوو تا هاتەوەسەرخۆ، رەنگی بە بەردا گەڕایەوە، روومەتی دەتگوت سێوی بەرواریە، بزەیەکی هاتێ، لە ناو شارێ کچ بەو بزەیە دەناسرێتەوە، کچە بە زاری ناسک و پڕ لە ئاوازەی ئامێدیانە، گوتی:

هەڵەی من بوو، بڕۆن.

نیوەی رێمان بە گێڕانەوەی سەربردە و بزەی کچە ئامێدی بڕی، ئەوجا بزانە چۆن هات، دەڵێن: کێو بە کێو ناگات، بەڵام بنیادەم بە بنیادەم دەگات.

ساڵی دوایی لە کۆلێژ کچەم دیتەوە، ئەگەر لە (کۆلان کۆلان...) گەیشتمە قۆناخێ زانکۆ، بە دڵوداو ناسینەوەی کچە ئامێدی دەگێڕمەوە، ئێستا لای فازیل دەمێنمەوە، زۆری نەماوە بە چیا بکەوێ.

بیرمنەچێ، پاشترێ بۆ لە یادنەچوونەوە، ئامێدیم لە چێوەی چەند رستەیێکی لەو شێوەیە گرت و لە یادگەی خۆمم هەڵواسی:

شارێ لە شێوەی بنجە گیا لە سەر بەردێ شین بوو، بەردێ ویدەچێ لە گارەوە پەڕیبێ، یانژی لە مەتینەوە غلۆر بووبێتەوە، دەروازەی بە سەر هەڵدێرەوە، بە زمانی دیرۆک دبێژی:

سەردەمانێ ئێزیدی و زەردەشتینشین بوو، پاشان بووە شاری موسڵمان و فەلە و جوو، پاشترێ رەنگی بەهاریانەی هەڵبزڕکا، کەمی ما، زۆری چوو.

ئێ، لە وێنەی ناو ئەو چێوەیە گەڕێ، با هەر لەوێ بێ.

## نامەی ماڵاوایی

وەرزێ پترە فازیل ریحانە ئەو گەرموگوڕیەی جاران بۆ سیاسەت هەیبوو، نەیماوە. رۆژ دوای رۆژ پتر لێی ساردەبێتەوە، ئەو کوڕە نەماوە، شەوان بزرت کردبا، بە قۆدیێ بۆیاغەوە لە سەرە کۆلانێ دەتدیتەوە. هێ لە هەندێ جاروبار سەرکۆنەی پارتەکەی خۆی دەکرد، سەرکۆنەکە بە شێوەیەکە، وا هزردەکەم ئەگەر بە چیاش بکەوێ، بەگەڵ ئەوان نەکەوێ، دوور نیە بچێتە ریزی پارتێکی دی، من وای دەخوێنمەوە، مەرج نیە وابێ.

فازیل ریحانە ناوی سەربازیی هات، ئەز بەر لەو ناوم هاتبوو، دوایی ئەگەر بیرمکەوتەوە بەزمی هاتوچۆی راپێچخانە دەگێرمەوە. هەوکە ئەو دوو رێی لە پێشە: راپێچخانە، لەوێشەوە داخوا بۆ کام بەرەی شەڕ، شەڕی قادسیە، یان رووە و چیا و پێشمەرگایەتی، دیارە بێ چەند و چوون و سێودوو، رێی دووەم دەگرێ.

ئەو چەند رۆژە پێیەکی هەر لە لای منە، ناوە ناوە دەست دەخاتە سەر شانم و ماچێکم لێ دەکات و دەڵێ:

کەمێ شمشاڵم بۆ لێدە.

بە دڵی وی یەک دوو ئاوازی بۆ دەژەنم. ئەو کوڕە من دەترسێنی، وا دەکات رێنەدەم بە تەنیا بڕوات، دڵم دەڵێ لەگەڵی بڕۆ، ناوە ناوە دەڵێ:

وەک من لە خۆت مەکە، واز لە خوێندن نەهێنی، ئەوساڵ دەبێ نمرەیەکی باش بهێنی، تا لە زانکۆ وەربگیرێیت و تووشی سەربازی نەبیت، تا هەینێش شەڕ رادەوەستێ و...

لە سەر رۆیشتنە، سبەی دووەی بەرەو چیا، چەند جارێ هاتە سەرم لێی بپرسم:

ئەرێ هەر پارتەکەی خۆت، یان....

دەمگێڕایەوە، هەستمدەکرد ئەو پرسیارە زۆر بێجێیە.

چاوەڕێم بێت و ماڵاوایی بکات، نەهات، ئێوارەیە برا گچکەکەی نامەیەکی هێنا:

*....من ئێستا لە دەرێی شارم*

*نەمتوانی بەرگەی ماڵاواییت بگرم، لە ئێستاوە بیرت دەکەم....*

بە نامەیەکی هەشت نۆ دە خەتی منی کوشت، ئەو شەوە هێندەی پەلە هەورێکی تەڕ رۆندکم بۆی رشت، تا چەند رۆژێ لە سەر سەر دەسووڕام، بە سەر دنیاوە نەبووم، کەویاریش رۆیی هەر شتێ لەو پتر خەفەتم بۆی خوارد.

ئیدی لە دوو برادەری شیرنی منداڵیم بووم، گەڕەک چۆل دیارە، گەڕەک بێ رێحانە و کەویارە، هەر دەبێ بە شمشاڵ دڵی خۆم بدەمەوە.

هێندەم لەدەستدێ، نزابکەم:

هاوڕێکەم، فازیل رێحانەی هاوڕێم، دوورە بەڵا بێ.

ئێستا دەچمەوە گڵکەند، بزانین باسوخواسی براکوژی چیە.

## شەڕ لە پشتئاشان
## تۆز لە گڵکەندێ

بە دەست خۆم نیە، هەر جارێ رێی گێڕانەوە دەگاتەوە گڵکەند، حەزدەکەم گرتە گرتە پیشانی خۆمی بدەمەوە، ئاخر گڵکەند جوانترین باخی شارە، لە باخی شاریش جوانتر، ئەو باخە هەموو وەرزێکی مەیلەو بەهارە، باخێکە سەراپا گوڵ و موورتک و داروبارە. ئەو ساڵ سەری سێ ساڵانە گڵکەند جێی دەورکردنەوە و خوێندنەوەی منە، جێی راوێچکە و دانیشتنی منیش دیارە، ئەگەر لەو کۆڵانەی موورتکان نەمبینیەوە کە دەچێتەوە لای یانەی دختۆران، ئەوا لە بن دارتووە گەورەکەی بەری رۆژاوام، ئەو توووەی لە نوێژی نیوڕۆی هاوینێ، سەد کەس لە بنی دانیشێ، کەس تاوی وێناکەوێ. ئەگەر لەوێش لە سەر پشت رانەکشابووم، وەرە لێرە لە بن ئەو ریزە درەختەی بەری باشووری چاڵی گوڵان، لە بن جریوەی چۆلەکە، لە سەر رێچکە چەمەنتۆ باریکەکە لە سەر مقەبایێ دانیشتووم، پێم شۆڕکردۆتەوە و سەرم بە سەر کتێبەوە، ئەو درەختەی ئێرە دواتر بە ناوی منەوە ناو نرا.

لە گڵکەندێ کەمێ کاتم بۆ کتێبی قوتابخانە، ئەوی دی هەمووی بۆ کتێب و گۆڤار و رۆژنامە، بەڵام ئەم بەهارە پتری بۆ دەورکردنەوەیە، پۆلی شەشەمین و رەوانەی ماڵێ کراوینەوە، دەبێ بایی هێندە بخوێنم، لە جێیەک وەرگیرێم و تووشی بەڵایەک نەبم، بە دەردی رێحانە نەچم، ئاخر یەک دوو ساڵە ئەوەی نمرەی باش وەدەستنەهێنێ، سێ رێی لەپێشە:

راپێچخانە، لەوێوە بۆ جەنگ.

جاشخانە، لەوێوە بۆ جەنگ.

چیا، لەوێشەوە بۆ جەنگ و جەنگی براکان.

ئاخر خۆدزینەوە و خۆشاردنەوە تا سەر نیە، هەر دەبێت خۆت بە لایەکدا بدەیت.

جەنگی براکان گەرمە، جەنگی جەلالی و مەلایی، ئەو جەنگەی تەمەنیکە ئاگری ناو گوفەکە و ناوە ناوە لێرە و لەوێ دادەگیرسێتەوە و نابڕێتەوە. ئەو جەنگەی هەر ئەو دووانە نا، کۆمۆنیست و هی دیشی گرتەوە.

من سەرم بە سەر کتێبەوە، بەڵام خەیاڵم لە چیاکانە، لای شەڕی برا شەرانگێزەکانە، جار هەبووە لە قووڵایی خەیاڵەوە گوێم لە دەنگی فیشەکی براکان بووە و راچەنیوم، چەندی دەمویست لە بیرکردنەوەدا خۆم دوور بگرم، بەلاش بوو، تەقەو خوێن دەگەیشتنە نێو لاپەڕەی کتێبان، ئەو برا بە خوێنی سەری یەکتر تینووانە، وەختە بڵێم لەوەتەی هەن، لە شەڕی دەستەو یەخەن، چەتۆ سەرناس ناهەقی نەبوو، دەیگۆ:

قابیل و هابیل هەر دەبێ لە رەشماڵێکی کوردان کۆتکە دۆیەکیان خواردبێتەوە، دەنا دەستیان نەدەچووە خوێنی یەکدی.

ئێ،.وا چاکە تۆزێ خۆ بناسێنم، ئەوجا تۆزی شەڕی پشتئاشانێ لە ناو باخی گڵکەندێ پیشانبدەمەوە. ئەز هەینێ چەپڕۆ بووم، مەیلی پارتەکەی فەهدیشم هەبوو، بەڵام لەگەڵ نەبووم و لە سەری شەڕی کەسم نەدەکرد، من پێچەوانەی هەندێ لە برادەرانم، لە رێی کتێبەوە لەو پارتە نزیک بوومەوە. ئەوان فرچکیان پێگرتبوو، لە دایک و باوکەوە بۆیان هاتبوو، لە سەردەمی مەلاکانەوە، مەلا شەریف و هەمزە، شێخە شەل و حاجی کەریمی بەستی شەرغە و حوسێن مەیاسی ئەو دەشتە و جەمال حەیدەری و عەزیز محەمەد و کەریم ئەحمەد و ئەوانەوە، ئەوانە پارتی فەهدیان بە هی خۆیان دەزانی و لە پێناوی سەریان دادەنا.

تۆزی گڵکەند لە زۆر قسەوە هەڵیکرد، قسەی کورێکیانم بیرناچێتەوە:

لە بارەگای پشتئاشان دەست بە سەر یەک فەردە گۆڤاری رووتدا گیراوە.

بەر لەوەی لە بن دارتووەکەوە، تۆزی قسەکە هەستێ و هەموو گڵکەند بتەنێتەوە، با بچینەوە ماڵێ و بە دزیەوە گوێدەینە رادیۆی سەرێ، ئەوەی لە هەمووان پتر دەنگ و نەڕەی دێ، ئەرێ ئەو چەند رۆژە بۆچی وا زەلالە؟

وێنەی هی بەغدا زەلال، نە هانی هانیی سالانی زوو، نە غژەغژی سالانی دوایی، هیچی نایەتە سەرێ. رادیۆی سەرێ کەس وای نەبیستووە، وا دیارە

هەردەمێ پێشمەرگە تێکبەربن، جوێننامە بڵێنەوە، بەغدا حەزدەکات هەموو کورد هاییدار بێ و ببیستێ. تۆ گوێرادێرە، ئەو بێژەرە زار ئاگرە، یەک نەزانێ دەڵێ کورد بە ئازادی گەیشتووە، هەر کەرکووک نا، دەستی بە سەر بەغداشدا گرتووە.

لێرەوە کەمێ لە سەرباس دوور دەکەومەوە، سێ بێژەر دەخەمە سێ چوار رستەوە و یەکسەر دەچمەوە باخی گڵکەند:

من لە سێ بێژەرەوە لەگەڵ بێژەران تێکمدا، ئاشتنەبوومەوە و تا درەنگیش وام دەزانی لەگەڵ تووتی خزمی لە پشتن. یەکیان سەر گەورەکەی ناو تەلەڤزیۆنی کەرکووک، ئەوەی لە گەرمەی شەڕی قادسیە زاری بە (سەرۆکی فەرماندە، خودا بیپارێزی...) هەڵدێنا و پڕ بە بەغدا دەیشیراند، ناوەکەی خیلێکی پێوە بوو.

ئەوی دی دەنگگرەکەی ناو رادیۆی سەرێ، ناوەکەی وا تێبگەم گوندێکی پێوە بوو، ئەوەی لە گەرمەی شەڕی براکان لە ئەشکەفتەوە بە سێ دەنگا دەینەڕاند:

دەست مەپارێزن، پەرێزتان پاک بێت...

بێژەری سێیەم، لە مۆسکۆوە، ئەوەی بە عارەبی و پڕ بە گۆی زەوی دەشریقاند:

ئێرە مۆسکویە....

رقی من لەو مۆسکۆییە لەوەوە بوو، دەمدیت کورد و خاکی کوردیان لە توورەگە دەکرد، کەچی ئەو دەنگسزە! جارێک کوردێکی بە سەر زاردا نەهات.

دەمێ بوو، گڵکەند بووبووە ساکەگۆڕی براکوژی، شەڕی چەک نا، دەمەقرە، بەڵام پشتئاشان گەرمتری کرد، گەیاندیە جوێندان و لە یەکتر هەستانەوە، ناوبژیوان نەبا، دەگەیشتە شەڕە مست و چەقۆ.

ئەو کوڕەی فەردە داخسۆرەکەی گۆڤاری رووتی بە شانەوە بوو، لوقمانێ بوو، ئا، بە شێوەیێ باسی ئەو فەردە گۆڤارەی دەکرد، وەک ئەوەی لە گرتنی پشتئاشان لەگەڵ بووبێت و بە دەستی خۆی کۆڵەپشت کۆڵەپشتی

پێشمەرگەی کۆمۆنیستان گەرابێت و قل قل گۆڤاری رووتی دەرهێنابێت و لە فەردەی کردبن، ئەوەتا لە باخی گڵکەندێ بە ئاماژە پەڕ پەڕ بۆ ئیمەی هەڵدەداتەوە.

دڵشادێ، ئا، وا تێبگەم ناوێکی وا بوو، لێی هاتە دەنگ:

+ ئەوەت لە کێ بیست؟

- لە کێم بیست! رادیۆی سەرێ وای گۆ.

+ درۆیە.

- من درۆ دەکەم، یان رادیۆ؟

+ تۆ

- بەگۆڕی شەهیدان رادیۆ وای گۆ.

+ بە خۆت و بە رادیۆ و بە سەرۆکتەوە درۆدەکەن.

لێک بڵند بوون، دەستمان نەگرتبان، خوێن دەڕژا.

هەر لە بارەی گۆڤاری رووتی ناو بارەگای کۆمۆنیستان، شێخ جەلالی سۆسیالیست دەڵێ:

منیش دەڵێم لەوێ ئەو جۆرە وێنە رووتانە هەبووە.

من دەڵێم:

شێخ، تۆ لە کوێ دەزانیت؟

شێخ:

کوڕە هەر خۆیان لە کاتی پەلاماردنێ، ئەو وێنە رووتانەیان لەوێ بڵاوکردۆتەوە، تا وا لە خەڵک بگەیەنن، کۆمۆنیستەکان هەر لەگژ دەسپەڕ و گانگانۆکێن.

نازانم کێ بوو، گوتی:

رێی تێدەچێ.

عیسایێ هەڵیدایێ:

باشە ئەگەر شۆڕشگێڕێ وێنەیەی کچێکی رووت لە بەرکێ بێت، لێی کەم دەبێتەوە؟! دەنا من ببمە پێشمەرگەش وێنەی رووت لەگەڵ خۆم دەگێڕم لە کاتی پێویست بەکاری دەهێنم.

کەم بوون ئەوانی دەگەڵ بۆچوونی عیسا بوون، من تێدا مابووم.
کەسێ دەیگۆ:
ئەوانە کۆمۆنیست نین، لادەرن، حەیای مارکسیان بردووە، نابێ بمێنن.
کەسێ وا باگۆی دەدایەوە:
ئێوە چ لە مارکس تێدەگەن، چ پەیوەندیتان بە مارکسەوە هەیە، تا بزانن کێ لادەرە و کێ لادەر نیە.
کەسێ دەڵێ:
ئەو کۆمۆنیستە لادەرانە، قەندیلیان پڕ لە عارەب کردووە، عارەب و چیا!
کەسێ لە دەوی دەداتەوە:
ئەو عارەبانەی چیا پێشمەرگەن، شەڕی بەعس دەکەن، ئێوە خۆتان پیاوی بەعسن، ئێوە دەبێ تۆوتان ببڕێتەوە.
ئێ، لە باخی گڵکەندێ، پشتئاشان سەرباسی باسانە، پێشتریێ کێ ئەو ناوەی بیستبوو، کێ دەیزانی کەوتۆتە کوێ، ئێستا لە مۆسکۆ پتر ناوی دێ. ئەوانەی لە بەرەی کۆمۆنیستان بوون، دەتگوت مۆسکۆیان بە سەردا رووخاوە. ئەوانەی لە بەرەی یەکێتی بوون وەک ئەوەی بەغدا و تارانیان گرتبێ. هەندێکیش بە هەندیان هەڵنەگرتبوو، پێیانوابوو رووداوێکە و دێت و دەڕوات، هەر دیتت لەبیرچوو، پێویست ناکات سەری خۆتی پێوە بێشێنی.
ئەوەی لە دڵێ من دەرنەدەچوو، هەواڵی دیل کوشتن و ژن کوشتن بوو، پەرێزپاکیی زاری پیاوە دەنگگرەکەی ناو رادیۆ بوو، بۆ تێگەیشتن لە پەرێزپاکی سەرێ لە ماڵێ دەدەمەوە و زوو دێمەوە:
چەتۆ سەرناس و بابم کە زاوا و خەزوور بوون، لێ وەکوو دوو برادەری گیانی بوون، بێ یەکتر نەدەحەوانەوە، لە بارەی براکوژیشەوە بۆچوونیان لێکدی نزیک بوو، هەردووکیان نەفرەتیان بۆی دەنارد، لە مەڕ پەرێزپاکیەوە بابم دەیگۆ:
پەرێزپاکی لە دروێنە هونەرێکە لە دەست هەموو سەپانێ نایێ، کەڵە گەنمێ، جۆیێ لە دوای خۆی بەجێناهێلێ، کێ هەیە خۆزی بەو سەپانە پەرێزپاکە نەخوازێ؟ بەڵام لە شەڕ بەرەواژە....

چەتۆ سەرناس باوەگۆی دەدایەوە:

بەڵام لە شەڕ هونەری ناکەسانە، ئەو شەڕکەرەی تۆزێ میراتی تێدا بێت، نابێت پەنای بۆ ببات، دەبێت خۆی لە پەرێزپاکی دوور بگرێت...

بابم لێی وەدەگرێتەوە:

پەرێزپاکی لە شەڕ، واتە دەست لە هیچ مەپارێزە، هەرچی سەر بە بەرەی نەیار بوو، ملی پەلدە، قرچ و بڕی بکە، دیل بکوژە، ژن بکوژە...

چەتۆ سەرناس لە بارەی دەنگگرەکەی ناو رادیۆ دەیگۆ:

کەسێ کەمێ هۆشیار نەبێ، ئەو پیاوە کەری دەکات، بە چیا دەکەوێت و چەکی براکوژی لە شان دەکات و بە ناو دەکەوێت.

بابم دەیگۆ:

بە راستی رێکی رێکدەخات و جوانی دەڵێتەوە، دەبی قسەی خۆی بن، یان بۆی بنووسن؟

چەتۆ سەرناس بە بێزاریەوە:

شەیتان بۆی دەنووسێت.

ئەوەشم لە یادە چەتۆ سەرناس روو لە من:

تۆ ئەو مارکسە دەناسی؟ ئەوەی ئەم دەنگگرە، دەمشرە دەڵێ:

مارکس، گۆڕ هەلتەکێنە.

گۆتم:

کۆمۆنیستەکان بە رێبەری خۆیانی دادەنێن، سەد ساڵێکە مردووە.

بیرمە وێنەکەشم پیشاندا، لێیوردبۆوە:

کوڕە، ئەوە لە شێخ و پیاوچاک دەچێ!

دەگەڕێمەوە گلکەند، لەو رۆژانە ناوی پیاوێ زۆر لە سەر زارانە، من پێشترێ چەند جارێ لە سەر لاپەڕان ئەو ناوەم دیتبوو، سەرتیپی هاوڕێشم جاروبار پێیدا هەڵدەگۆ. ئێستا لە پشتئاشان پتر ناوی دێ، ئەو پیاوە لە شەڕ و دەمەقرەی هەنگینێ، دوو کەس بوو، دوو کەسی هێند جیا لە یەکتر تەنها لە ناوەکەی دەبوونەوە یەک، لە چەند رستەیێ لە زار و دیدی بەرەی یار و نەیاریەوە، ئەو پیاوەتان بە پوختەکراوی پێدەناسێنم:

بەرەی یار:

ئەو پیاوە لینینە، رۆژگار بۆ کوردی ناردووە، سەرکردەی کۆمەڵەیە، گەل لە سایەی وی دەگاتە ئاوات، رێنجبەر و چەوساوەی کورد لە سایەی وی دەحەسێنەوە.

پیاوێکە دەستێکی تفەنگ، دەستێکی کتێبە، لە ناو سەنگەریش دەخوێنێتەوە، کاتێ دەدوێ مارکسە، کاتێ دەجەنگێ گیڤارایە.

ئەو بیرمەند و قارەمانە، تا بڵێی کەسێکی بەرێزە، خاکی و بێ فیزە، بە دەستی خۆی جلکی خۆی دەشوات، شیو لێدەنێت، پێڵاوە لاستیقەکەی پینە دەکات، دار دەشکێنێت و سۆبە پێدەکات، خراپترین تووتن دەکێشێت و لەگەڵ گەوران گەورە و لەگەڵ گچکان گچکە، لە هەموو شتێ دەزانێت، کەس باری وی نابات، هەرکێ باوەڕی نایێ با جارێ بچێتە دیداری، با بە چاوی خۆی ببینێ، کورد چی هەیە، لە جێی شەهید ئارام چ سەرکردەیێ دانیشتووە.

چ دەکەی ! مەلایـی بەگ و کریگـرتە، کۆمۆنیسـتی لادەر، سۆسیالیسـتی جووجەڵە و ئەوانە، بەربەستن، رێگرن، پێویستە سەریان پانبکرێتەوە، دەبێ ناویـان بسـڕێتەوە، هەنگینـێ رێ تەخـت دەبـێ بـۆ گەیشـتن بە ئـازادی و بەختیاری.

بەرەی نەیار:

ئەو پیاوە خـوێنرێژێکی نەوێرۆکە و هیچـی دی، لە خـۆی ترسـنۆکتر نیە، ئەو کاتەی گیرا، وەک سەربازێکی ترسنۆک دەپاڕایەوە. رووبەڕوو شـەڕێکی نەدیوە، فیشەکێکی بە بەعسـەوە نەنـاوە، ئازای چی! دیل بە دەستبەسـتراوی دەهێننە بەر دەمی، ئەویش دەمانچەکەی هەڵدەکێشێ و زرم، فیشـەکێکی پێوە دەنێ، ئەوەیە گیڤاراکەی ئێوە!

دەخـوێنێتەوە! بـا بخـوێنێتەوە، میـرغەزەبیش دەخـوێنێتەوە، دەنووسـێت! موسلیح جەلالیش دەنووسـێت، بـا هەر بنووسـێت و بخـوێنێتەوە، ئەو پیـاوە پیـاوکوژە تەواو، بـا ببـڕێتەوە، ئەوەتـا لە پشتئاشـان دیـل دەکوژێـت، ژن دەکوژێت، دڵدار بە بەر چاوی دڵبەرەکەیەوە گوللەباران دەکات، ئەنگوستیلە بە پەنجەوە لە دەستی دەستگیران دەکاتەوە...

ئەو پیاوە دەبەیتە ریزی مارکس و لینین! وەی شیرڕ! ئەوە هزر و بیری لە کوێ بوو! چی پێیە! گرێکوێرەی خۆی دەنووسیتەوە و تەواو...

پیاوێکی خاکیە! با خاکی بێت، مەلا ماتۆڕیش خاکی بوو! ئەو پیاوە تەنها بۆوەی ناو دەربکات، لە سەد بەرگ و کاژ خۆی دەردەخات...

ئێ، هەر شتێکیان لە بارەی ئەوە پیاوەوە دەگوت، من هیچم نەدەگوت، هەرچەندە دڵم بۆ کۆمۆنیستەکانیش لێیدەدا، ئەو پیاوەی هەندێ کەس بە پاڵەوانی شەڕی پشتئاشانیان دادەنا، هەندیکیش بە میرغەزەب و تەور بە دەستی پشتئاشان.

ئەو پیاوە کێ بوو؟ من درەنگتر پێکەوتم هەمان ئەو (ن . م)ەی سەر لاپەرەی یەکەمی (براکوژی)یە کە وەرگێڕەکە وەرگێرانەکەی پێشکێش کردبوو.

وا باشە، تۆزێ لە باسی براکوژی دوورکەومەوە و بچمەوە گژ دەورکردنەوەی وانەکانم، لە سەرمە بایی هێندە بخوێنم، نمرەی بەشی کوردیی زانکۆ بهێنم.

## درەختێ بۆ خوێندنەوە

بەری دوو ساڵان کە هاتمە بەشی وێژەیی، نیازم گەیشتنە بەشی یاسا بوو، خولیای بوونە پاریزەریم لە سەر دەگەڕا، خەونم بە دادوەریەوە دەدی، بەڵام هەر زوو ئەو خەونەم لە خەیاڵێ خۆ وەدرنا، بزانە بۆ.

هەندێ شتم لە مەڕ دادەوەران خوێندەوە و بیست، هەند دوور بوون لە حەز و ویست، گوتم ببمە بەردەست، نابمە دادوەر، دەیانگۆ:

دادەوەر هەمیشە دەبێ پۆشتەو پەرداخ بێ، نابێ بچێتە هەموو جێ، نە چاخانە، نە مەیخانە، نە ناو پاس و ئەو جێیانە.

گۆتمە خەتخۆش:

کۆلیژی یاسام بە عانەیێ ناوێ.

گۆتی:

ئەدی دەچیە کوی؟

گۆتم:

بەشی زمان و ئەدەبی کوردی.

گۆتی:

منیش حەزم لەوێیە.

ئیدی ئەوە دوو ساڵە نیازی ئەوێم لە سەرە، بەڵام وا بڕوات نایگەمێ، ئاخر چەند رۆژێکی ماوە بۆ تاقیکردنەوە، دوو کتێبم دەورنەکردۆتەوە، ناچار ئینگلیزیم بۆ خولی دووەم هێشتەوە.

هەرێم بە خۆم دا بگەمە زانکۆ و بەشی کوردی، ئەوجا خەونی من سەرتر چوو، ئەها، دوای تەواوکردنی ئەوێ، واز لە خوێندن ناهێنم، بەری نادەم، دەچمە دوای، ماستەر و دکتۆرا دەهێنمەوە، ئەگەر لێرەش بۆم مەیسەر نەبوو، دەچمە هەندەرانێ.

ئیدی ئەو چەند رۆژە کەمەی لە پێشم ماوە، هێندە بخوێنم پێی بگەمە زانکۆ. سپێدان زوو هێشتا خۆر لەو دیوی بانیەکانی پشت کەسنەزان بوو، من گەیشتبوومە سەر دەرگای رۆژهەڵاتی گڵکەندێ.

ئەز لە گڵکەندێ درەختی خۆم هەبوو، پیتی یەکەمی ناوی خۆم و بابم لە قەدی هەڵکۆڵیبوو، تا دەرنگیش (ک . ک) بە درەختەوە مابوو، چوار پێنج دۆست و ناسیاریش بە داری کافکاف ناویان دەهێنا، ئا، ئەو ماوەیە و دواتریش زۆر لە بنی دادەنیشتم. خووم پێوە گرتبوو.

وەبیرمدێ دواتر لە نامەیەکدا بۆ کچێ بەو شێوەیە ناونیشانی درەختەکەمم هەڵدابوو، دیارە نامەکە هەر لای خۆم مایەوە و ئەو نەیدی، ئەوە نامەکە بە داڕشنەوەی تازەوە:

*دیتنەوەی درەختەکەی گڵکەندنیم ئاسانە، هەرکە لە دەرکەی رۆژهەڵاتەوە وە ژوور کەوتی، بە دەستی چەپ، کۆڵانی گەورەی موورتکان بگرە، ئەو کۆڵانەی ئەگەر هەر بڕۆیت و پێچنەکەیتەوە، دەتهێنێتەوە جێی خۆت، ئاخر بازنەیی و خڕە. ئێ، بە کۆڵانی موورتکاندا بڕۆ، رێک شەش درەخت بمێنێ بۆ رێی شۆڕبوونەوە، بوەستە، ئەوە رێیە دەڵێم کە لە کۆڵانی بازنەیی موورتکان دەبێتەوە و دەگاتەوە چاڵایی گوڵان، ئەو چاڵاییەی سەبەتەیەکی گەورەی پڕ گوڵی بۆ رێبواران راگرتووە، واتە تۆ ئەگەر پێش شۆڕبوونەوە بە رێی سەبەتەی گوڵان بە رێی خۆت بە کۆڵانی موورتکاندا بگەڕێیتەوە، شەش درەخت بژمێرە، من وا لە بن حەفتەم چاوەڕێی تۆ دەکەم.*

وا تێبگەم ناساندنی ئەو درەختە پێویست نەبوو، وا نیە!

لە بن درەختی خۆم ئەو درەختەی بە سەر چاڵ و سەبەتەی گوڵاندا دەڕوانێ، بۆ تاوێکیش باڵداری لێ نابڕێ، درەختێکە لە کمەگم و جریوە و ککوو...من لەگەڵ ئەو دەنگانە بە شێوەیەک راهاتووم، ئەگەر تاوێ لە خوێندن بکەون، منیش لێدەکەوم و کتێبم بۆ ناخوێندرێتەوە. وا لێرە لەگژ دەورکردنەوەی عارەبی و ئابووری و دیرۆک و جوگرافیام، باشە، بیرکاریم لە کۆڵبۆتەوە، ئاخر لەو وانەیە، وێنەی سالانی پێشووم، بێ دەورکردنەوە سەدی خۆم مسۆگەرە، ئەوەی زۆریش لێی دەترسم عارەبیە، عەشتەبای

خودا له رێزمانەکەی نازانم، خەتخۆش هەندێ (لا ، لن ، ما)م بۆ راڤە دەکات، بەڵام هەر ئەودەمە، لەبیرمـــدەچێ، منـــیش رۆژانە شـــتێ، هاوکێشـــەیێ لە بیرکاری بۆ وی و هەندێ برادەری دی شیدەکەمەوە.

کەم نیوەڕۆیـان دەچـمەوە مـاڵێ، دەچـم لە کۆڵانەکەی پشـتەوە، کۆڵانی گەڕەکی پێشانی جووان،-لە نانەواخانەکەی نزیک حەساری پلکە زەمیلە، دوو سێ نـانی گەرمـی تەواو بـرژاو هەڵـدەگرم و هەڵدەکشـێم سـەرەو خـولگەی کـۆترەکە. لە هێـروەی وی چاخـانەی قامیشـان هەیە، لەوێ بە دوو چـایەی گەرمەوە لوولیاندەدەم، سەرێ لە کتێبخانەی خۆماڵی دەدەم، ئەگەر گۆڤارێ، رۆژنـامەیێ گەیشـتبێ، دەیکـڕم، دێـم لە مزگەفتـی گەورەی نـاو قەیسـەری پشووێ دەدەم، شتێ دەخوێنمەوە.

تـــا لەبیرمنەچـــۆتەوە، گرتەیەکـــی گچـــکەی نـــاو مزگەفتـــی گەورە پیشاندەدەمەوە، ئەوجا یەکپێ بەرەو گڵکەند، بەرەو درەختەکەی خۆم، ئا، مـن لەو سـاتە ناسـکەی خوێنـدنیش، پشـت لە خوێنـدنەوەی دەرەکـی نـاکەم، کەم شتێ دەخوێنمەوە.

وا تێبگەم پاش نـوێژە، مزگەفت مەیلەو چۆڵە، مـن لە بێراییە درێژەکە لە سەر پشت راکشاوم، پشت سەرم بە دیوارەوە، رۆژنـامە دەخـوێنمەوە، گوێم لە دەمەقرێیە، خوێندنەوەی خۆم دەکەم و گوێی پێنادەم، لەپڕ بـووە شـەڕە مست و پێلەقە، جەمەدانی کەوتە ئەو گۆڕە، دوو سێ کەس کەوتـنە نێوانیـان، لێکیان کـردنەوە، جەمەدانیەکانیـان هەڵگـرتەوە، نـاوبژیوانێ بە دەنگێکـی نـزم دەڵێ:

شەڕی جەلالی و مەلاییتان هێنایە ناو مـاڵی خـوا! ئێوە بەو تەمەنەوە هـی ئەوەن لە سەر ئەوان پەلاماری یەکتر بدەن؟

چما شەڕی چیا گەیشتە ناو مزگەفتی قەیسەریش، لە دڵێ خۆ گۆتم.

وا دیارە لە بارەی براکوژیەوە پیر لە گەنج شەڕانیترن.

ئەوە دەمگۆت لە شـەڕ دووردەکەومەوە و خەریکـی دەورکـردنەوە دەبـم، ئێ، ئەو چەنـد رۆژەم لە بـن درەخـتەکەی خـۆم بە دەورکـردنەوەی وانـان و خوێنـدنەوەی کەمـێ بـابەتی رۆژنـامە و گۆڤـار و قسـە و باسـی هەمە جـۆر

بردەسەر.

تا رۆژی تاقیکردنەوە دێ، ساڵێ، ساڵ و شتێ دەگەڕێمەوە پاشێ، هەندێ سەربردەی تاڵ و شیرین هەن، حەزناکەم لە دەستبچن، هەموویان نا، هەندێکیان دەگێڕمەوە، با لە چوونە راپێچخانەوە پێدا بێم.

## سەردانی راپێچخانە

لە هەشتاودوو قادسیەی شەڕ باش داگیرسابوو، دەستە دەستە جەستەی نێرینەی دەسووتاند و جەرگ و دڵی مێینەی هەڵدەقرچاند، کۆڵان کۆڵان شین و خمی دەبەخشیەوە. من لەو وەرزە داخبووەی ساڵ پۆلی پێنجەمم بڕیبوو، دەپەڕیمەوە بۆ شەش، ناوی سەربازیم هات، بەڵام خوێندن خۆش بێ، باکم پێنیە. بریا فازیل ڕێحانەی هاوڕێشم وەک من دەبوو، بەڵام داری بریا بۆ کێ بەری گرتووە!

دەگەڵ خەتخۆش ئەو کوڕەی یازدە ساڵە هاوپۆل و هاوڕێین، کەوتینە دوای تێکەولێکەی دەرهێنانی پەڕاوی ڕاژەی سەربازی. چووینە راپێچخانە، ئەوەی لە وەتەی هەیە، کورد زراوی لێچووە، نەخاسمە لە سەردەمی شەڕەکان. ئەوجا لە سەردەمی شەڕی قادسیە، راپێچخانە ڕێک یەکسان بوو بە مردن، ئاخر ئەوانەی دەچوون کەمیان وەک خۆیان دەهاتنەوە، یان لە ناو دارەبازە، یان بێ دەست و پێ بە دارشەق، شەلە شەل دەگەڕانەوە. لەوەتەی سەربازیی داهاتووە، کورد دژ بووە، ئەها ژن چۆن تووک لە شا و حوکمەت دەکات:

**یاخوا ڕەزا شا تەختت وەرگەڕێ**
**دوو کوڕم بەخێوکرد بە شیری مەڕێ**
**حوکمەت گرتنی بردنی لۆ شەڕێ**
**یاخوا ڕەزا شا بەردت لێ باری**
**دوو کوڕم بەخێوکرد بە قەندی شاری**
**حوکمەت بردنی لەبۆ ئیجباری**

ئەوجـا لە هەولێـری، ئەمـن دەمبیسـت، ژن بە دزیەوە دەیـانگوتەوە، سەدامیشیان خستبووە جێی رەزایەکە.

هەر ئەو ترسـانەیە، ترسـان لە سـەربازیی کـاتی شـەڕ، شـەڕی تیـر تێنەچووی قادسیەی سـەدام، شـەڕی نێوان عـارەب و عەجەم، ئەو هەمـوو کوردەی کردۆتە جاش. پێشتریێ لەو شارە یەک جاشخانە هەبوو، ئەویش لە پەنایێ، کەچی ئێستا گەڕەک نیە بێ جاشخانە، جاشخانە جاشخانە سەر بە هەر گەڕەکێکدا دەگری جاشخانەیێ دێتە ڕێ، وێنەیەکی گەورەی سەدام وا بە دیواری حەوشەوە. دواتر پتر ئەو وێنەیەی دەهـاتە نـاو چـاوتەوە کە بە جلک و بەرگی کوردیی بەری بادینانەوە گرتبووی، بە سەر دەرگا و دیواری جاشخانەکانەوە دەبینرا.

هەوکە سـەرەک جـاش چەند هێندەی موختـارن، تۆ لە خۆوە هەر نـاوێ هەڵدەی، سەرۆک جاشێ هەیە بەو ناوە. پێشتریێ بە زۆری هەر ئاغا و شێخ سەرۆک جاش بوون، هەوکە سەیدۆکە و شـوانەوێرە و نۆکەر و خـوبزەش. پێشتریێ جاشەکان لە چەند تەویلەیێ جێیان دەبۆوە، هەوکە کۆڵان نیە مـاڵە جاشێکی تێدا نەبێ.

دەی لە جـاش و مـاش گەڕێ، بـا بچینە راپێچخـانە، ئەوەی دەمـێکە لێـی دەترسـێم، کـاتێ ڕێشـم بەو ڕێـیە دەکەوت، بەری ئەو بەرم دەگـرت و لێـی نزیک نەدەکەوتمەوە. ئێستا ناچار وا بە پێی خۆم بۆی دەچم، نزام بۆ بکەن بێ کێشە لێی دەربچم، باشە بۆچی لێی دەترسـم، خۆ رامناپێچن و نـامخەنە پاشکۆی زیل و بۆ بەرەی جەنگم نانێرن. ئەوپەڕی چەند پرس و بەرسـڤێکە، پەڕاوم بۆ پردەکەنەوە و بەڕێمدەکەن، نازانم بۆچی لە ڕێی راپێچخـانە هێندە دەترسام؟!

خەتخۆشی هاوڕێم هەستی بە ترسانەکەم کردبوو:

چیە دەڵێی پۆستاڵەکە بە پێت تەنگە؟ ئاگات لە بێریەکەت بێ، با نەیبات!

لە گاڵتەپێکردنەکەی تووڕە بووم:

خۆت لە من پێ ئازاترە؟

بە پێکەنینەوە:

با چەکی سەربازی لە شان بکەین و بچینە شەڕی ئێرانی، هەنگینی دەردەکەوێ...

ئێ، بە ترس و لەرزەوە بڕۆ بۆ راپێچخانە، راپێچخانەی شار کەوتۆتە گەڕەکی تەیراوە، لە سەر جادەی خڕی سی مەتری، تەواوێ دوور لە باخچەی کورد و عارەب. تەلارێکی گچکەی دوو نهۆمە، کەوتۆتە سەر سووچێ، هەر هێندەت خۆشە تا پێ دەخەیتە سەر کۆسپی دەرگا، ترسەکەم لە خۆوە نەبوو.

کوردی نامێنێ، کەڕولاڵیش دەبێ بە عارەبی بێتە گۆ، ئۆجا عارەبیەکی چتۆ، هەموو گەف و جوێن، رستەی خۆش کە دەیبیستی:

رێک ریز بە، کوڕۆ.

بزانە لێرە کێم دی؟ مێردەکەی کەویار، ئەگەر لێرە دەرچووم و بیرمکەوتەوە، دەیخەمە هەشت نۆدە رستەوە، جارێ لێی گەڕێ.

وەلەکە عارەب و کوردە بۆرەی بە عارەب بوو، دانە رۆژێکیان بە پێوە و لە نۆرەگرتنێ راگرتین، تا گەیشتمە هۆدە گچکەکەی سەدام، هۆدەیەک جێی مێزێک و چوار پێنج زەلام، لە ساتی وەژۆرکەوتن من تەنها سەدام و جغارە ئەستوورەکەی کەلێنی پەنجە شەڕانیەکانیم دی، درەنگتر هەستمکرد لە سەر مێزەکەی بەردەمم تەپلەیێ هەیە و کاری منیش لای ئەوە، سەرتان سوڕنەمێنێ سەدام لەوێ بوو.

هەر بە راستی من کە چوومە هۆدەکە و ئەو وێنە گەورەی سەدامم دی کە لادیوارێکی گرتبوو، زەق زەق تەماشای دەکردم، وام هەستکرد، لە وێنەکەوە هەناسە دەدات و دەجوولێ و مژ لە جگارە دەدات، ئەو بێریە لە سەرەی پشت مێزکەش تەپلەی پڕ لە سۆتەکە. دوای تاوێ واقوڕماوی بەریدام و ئاسایی بوومەوە، تەپلەکە گۆڕا بۆ ئەو وەلەکە عارەبەی وا بە رووگرژی و پرتەپرتەوە کاری من رایی دەکات.

لە بەخت رەشی خۆم ناوی بابم بوو یان باپیرم گرفتێکی تێکەوت، لە سەر ئەوە تووشی بڕۆ و وەرە و بێنە و بەردەیەکی زۆر بوومەوە، تا چارە کرا و وەرمگرتەوە، هەزار نەفرەت و جوێنم بۆ بێریەی سۆر لە سەران و

ئەستێرەداران نارد. ئەو رۆژەی پەراوی راژەم وەگرتەوە خەنی بووم، ئۆخەیش خۆ دەستمان لە بەرۆکی یەکدی بەربوو.

ئیدی چیدی لە بێریە سۆران ناترسێم، خۆ لێیان لانادەم و دەچمە ناو چاویان، ئاخر لەو یەک دوو وەرزەی بەر لەوەی ناوی سەربازیم بێ، زوو زوو رایاندەگرتم و ناسنامەیان لێ وەردەگرتم، دوو سێ جاریش گێچەڵیان پێمکرد و باوڕیان نەدەکرد تەسکەرەکەم هی خۆم بێ، پێدەچوو خۆم لە ساڵێ لە دایکبوونم گەورەتر دیاربم. جارێ گیراشم، با ئەو گرتنە بە سێ چوار رستە بگێڕمەوە:

لە سینەما سیروان هاتمە دەرێ، برسیمە، لە بابۆڵەفرۆشەکەی بنی بابۆڵەیەکم کڕی، هێدی هێدی دەمخوارد و هەندێ گرتەی فیلمەکەش لە خەیاڵم خۆی لێدەدایەوە، بەو خەیاڵەوە خۆشاوێکیشم بە سەردا کرد، هێشتا پەرداخەکەم هەر بە سەر لێوەوە بوو، دەستێکی گران کەوتە سەر شانم، بە دەستی دۆست نەدەچوو، ئاوڕمداوە بێریەسۆر بوو:

هەویتەک (ناسنامەکەت)

ئەو بێریەسۆرەم زۆر دیتبوو، کورد بوو، بەلام ئەو کەمە پێی کەم بوو بە کوردی بدوێ، تەسکەرەم دایێ، لە دڵێ خۆ گۆتم:

مار لەوانە مرۆترە.

ئەوە نیە دەڵێن: مار کاتێ دەبینێت کەسێ ئاو دەخواتەوە، ئەگەر نیازی پێوەدانیشی هەبێ، پێوەی نادات تا لە خواردنەوە نەبێتەوە.

کەچی ئەو وەلەکە بەعسیە نەیهێشت خۆشاوەکەم تەواوبکەم پێوەی دام، ئاخر هەینێ داوکردنی ناسنامە لە مار پێوەدان کوشندەتر بوو.

بێریەسۆر تەسکەرەکەی یەک دوو جار ئەودیو و دیو کرد، بە عارەبی گۆت:

ئەو تەسکەرەیە هی خۆت نیە.

بە کوردی گۆتم:

بە خودای تەسکەرەی خۆمە و وێنەی خۆمە.

خۆی توورە کرد و دەنگی هەڵبڕی:

دەڵێم هی خۆت نیە، ساختەیە...
کەڵکی وەڵامدانەوەی نەبوو، قرِوقەپم لێکرد، ورتەم لێوە هاتبا، لە ناو چاوی دەدام. پیلی گرتم و راپێچام، وای قەوما، خۆ زیلیشیان راگرتووە، پێشتر نەمدیتبوو، ئێستا وا لە پاشکۆی زیلی کز و مەلوول دانیشتووم، بە تەنێم، وا دیارە دەیانەوێ چەند کەسێکی دیش بگرن، ئەوجا باژۆن.
کورِە گیراوەکەم دەهاتەوە بەرچاو، ئەوەی پێش کەمێ، سێ چوار سەرباز گرتیان و رایانپێچا و هەڵیاندایە پشتی قوتە جێبێ، کورِە خۆی رادەستی چارەنووس نەکرد، چاوی بە دەور و پشتی خۆیدا دەگێرِا، لە بن چاوەوە لە چەکدارەکان وردەبۆوە، پاش تاوێ کەلێنی دەربازبوونی دیتەوە، بازیدا و هەڵات، دوو سێ تفەنگ تەقەیان لێدەکرد، بەرنەکەوت، دەرچوو.
منیش دەمویست چاو لە کورِەکەی ناو فیلمەکە بکەم، بەڵام ئەو لە کوێ من لە کوێ، ئەوە لە توانای من بەدەرە، بیرمدەکردەوە باشە بۆ وا بکەم؟ خۆ من هیچم لە سەر نیە نە هەڵاتووی سەربازیم، نە شتێکم کردووە، نە پەرِە کاخەزێکم لە بەرِکێ گیراوە، دەمبەن، دوای پێکەوتن بەرمدەدەن، نا، هەڵنایەم لە خۆرِا خۆم تووشی بەڵایەک ناکەم.
دەمژمێرێ پترە لە ناو زیلم، بووینە سێ چوارێ، زیلیان بە گرِ ئێخست، دڵم توند لێیدا، زۆر ترسام، دەبێ بەرەو کوێم ببەن؟ باشە چۆن بۆیان ئیسپات بکەم تەسکەرەکەم ساختە نیە؟ ئەوە ئیسپاتیش بوو، لەوەیە وازم لێنەهێنن، دێن تەمەنم گەورە دەکەن و رامدەپێچن، وا بۆ لە سێدارەدان تەمەنی منداڵ دەگەیەننە هەژدە، بۆ سەربازی ئەوە ناکەن؟ تۆ بڵێی...
من ئەو پرسیارانەم لە خۆم دەکرد، بێریەسۆرێ کە دەیویست سوار بێت، دیتم تەسکەرەکەمی بۆ راگرتم و بە ئاماژەی دەست:
دابەزە.
دابەزیم و ئەو خۆی هەڵدایە سەری و زیل جووڵا، ئۆخەیش بەربووم! لە چاوی گیراوەکانەوە (خۆزگەم بە خۆت)م خوێندەوە. واز لەو گرتنە بێنە، بووە رابردوو، ئێستا پەرِاوی راژەم لە بەرِکێیە، منەتی بێریەسۆران نازانم.
بەبیرم هاتەوە، با بگەرِێمەوە لای مێردی کەویار، ئەو کەویارەی دوای

دوو مێردیش لە خەیاڵی من هەر کچۆڵەکەی جاری جارانە و نابێتە ژنی کەس. کەویارە و لە شێوەی خۆی دمێنێتەوە، کەویارە و چەندی دەکەم لەبیرناچێتەوە، دیارە ئەو پیاوە دووبارە سەربازی گرتوویەتیەوە، ئاخر ئەو هێشتا کەویاری نەخواستبوو، سەربازیی تەواو کردبوو.

## کەویاری سەمەرقەندێ

ئەو رۆژەی کاری راپێچخانەم تەواکرد و وەرمگرتەوە و ترسی بێریە سۆرانم نەما و زانیشم میردەکەی کەویار بەرگی سەربازیی پۆشیوە و رەنگە گەیشتبێتە بەرەی شەڕیش، حەزی سەمەرقەندم هەستا. زۆر هەوڵم لەگەڵ خەتخۆش دا بێت و تامی بادە بکات، نەهات، فازیل رێحانەشم چنگ نەکەوت، دواتر دەمگوت:

باش بوو نەهات، هاتبا هەمووشتم بە گۆڕێ وەردەکرد، ئەوینی ئەو کەویارەی لە خۆشم دەشاردەوە، ئاشکرام دەکرد.

ئاخر ئەو رۆژە هەر کێ لە سەمەرقەندێ هاومێزم با، دوور نەبوو وردوباریک سەربردەی کەویارم بۆ باس کردبا، هێندە سالەرازەی ناخمم بۆی هەلڕشتبا.

ئەز هەنگینێ هێندەم نە دەخواردەوە، بیرەیێ دوو لەوە پتر نەبوو، ئەویش مانگی جارێک دوو، کەم مانگ هەبوو بگاتە سێ، بەلام ئەو رۆژە زۆر تێپەڕی، هەر بۆیە هۆش چوو، خەیاڵ لە شێوەی کۆتر فڕی.

لە سەمەرقەندێ روو لە دەرێ، روو لە جامخانە و مینا، دانیشتووم، لەسەرەخۆ پێکان هەڵدەدەم، فڕ فڕ لەگەڵ هەر فڕێ، خەیاڵ فڕ فڕ بەرەو کەویار هەڵدەفڕێ، کەویار داستانی تەمەنی منە، ئەوەتا لە سەمەرقەندێ خۆی دەگێڕێتەوە، لە منداڵیەوە ئەو دەمەی لە سەر کۆسپەی دەرگا بە سەری پەنجە لە گوپی یەکترمان دەدا، تا دوێنێی راوەستانی سەر دەرگا کە سەری هەڵنەبڕی بمبینێ، خۆی دەگێڕێتەوە، من لەو گێڕانەوەیە لە جێ جێ دەردەکەوم، لێ هەستدەکەم بزرم، زۆر بزرم.

لەو چەند هەیڤەی دوایی جاروبار ئەو هەیڤەم دوور بە دووری دەدی، مالیان هاتبووە ئەو پەڕی گەڕەکێ، نزیک لە گەڕەکی میرپێداوان، دوا دیتن

دوێنێ سەر لە ئێوارێ بوو، ڕێم بردەوە کۆلانی وان، لە سەر سیلە دیتم لە سەر دەرگا لە نیوان دوو ژن دەتگۆت هەیڤە دابەزیوەتە کۆلانێ، ویستم چاکوچۆنی دەگەڵ بکەم، زمانم بەسترا، ئەویش سەری هەڵنەبڕی، نەیبینیم.

ئێ، لە سەمەرقەندێ شووشە شووشە شەهرزاد گازدەکەم و خەیاڵ خەیاڵ لەگەڵ کەویار ڕێدەکەم، نازانم لە چەندەمین شەهرزاد بووم، هاتە سەرم نامەیێ بۆ کەویار بنووسم، پێنووس و کاخەزم پێبوو، ئەز هەنگینێ لە خەوێش پەرە کاخەزی سپیم لە بەرکێ بوو، ئاخر جاروبار لە پڕ سەرۆی هۆزانێ لە سەرم سەریدەکرد، منیش وەکات دەمخستە کۆپلەیەکەوە، ئەوجا دوای نووسینەوەشی دەمدڕاند.

نووسیم، بە دەم هەڵدانی شەهرزادەوە نووسیم، نامەیەکی درێژم بۆی نووسی، لەو نامەیە دڵی خۆمم بۆی کردبۆوە، هەرچی ئەو هەموو ساڵەی لە دڵم پەنگی خواردبۆوە، ڕستە ڕستە ڕژاندبوومە ئەو نامەیە، چەند جارێ پێیداچوومەوە، لە شێوەی نووشتە دەقونووشتم کرد، بڕیارمدا هەر ئێستا بچم و بە دەستی خۆم بیدەمێ، هەستام.

ئێرە کوێیە، بە کوێدا گەیشتمە ئێرە؟ سۆندەم لە دەست ژنێک وەرگرت، سەرم لە بن سۆندە ڕاگرت، گوێم لێیە، ژنە دەڵێ:

وەی کۆرە بم، ئەو کوڕە چی بە سەر هاتووە!

لە خۆم پرسی:

دەبێ چیم بە سەر هاتبێ؟!

هەندێ هاتمەوە سەرخۆ، سوپاسی ژنەکەم کرد، چاوم بە دەوروبەردا گێڕا، شوێنم ناسیەوە، باشە، باش هاتووم، وا لە نزیک کۆلانی منداڵی، ئەوەی پشت ئامادەیی ڕزگاریم. نامەکەم بیرکەوتەوە، دەستم لە بەرکم گێڕا، مابوو. هێشتا مابووی ڕۆژ ئاوا بێ، گەیشتمە سەر جادەی شەستمەتری، لە سەر پەڕینەوە بووم، ئەو کوڕەی لە ڕێی کتێبەوە دەفڕی، گازیکردم، چووم، هەر لە سەر دەرگاوە چاکوچۆنیم دەگەڵ کرد، بیرمە پرسی:

+ شێواو دیاری، چ بووە؟

– چ نیە، کەمێ ماندووم.

+ خوابکەم وابێ، هەر شتێ بە من بکرێ، بە چاوان.

با بچم نامەکە بدەمە کەویار، دوایی دێمەوە دیداری کوڕی لە کتێبەوە فڕیو، فڕینەکەی پێشانی خۆم دەدەمەوە.

ڕۆژ ئاوا بوو، زەردەی مابوو، ئەز لە سەرە کۆلانی ماڵی کەویار ڕاوەستابووم، دەگەڵ خۆم کەوتبوومە مشتومڕ:

دەچم، لە دەرگا دەدەم، بەبێدەنگی نامەکەی لە دەست دەنێم و یەکپێ لە چاوی بزر دەبم.

ناچم، جوان نیە، خۆ ئەو هیچی لەگەڵ من نەبووە، ئەوە چ شێتایەتیەکە دەیکەم!

دەچم، نامەکەی نادەمێ، بەڵام بە دوو سێ ڕستە، تێیدەگەیەنم کە من لە منداڵیەوە سەرگەردانی تۆم.

نا، ناچم، هەرچی بڵێم جێی سۆتەکە جگارەیێ ناگرێ، ئەو خاوەن ماڵ و مێردی خۆیەتی.

هەر دەبێ بچم و دوو قسانی دەگەڵ بکەم، هیچ نەبێ تۆزێ دڵم دادەکەوێ.

لە بیرنەکەم، من جغارەکێش نەبووم، ئەوە ئێوارەیە چەند جغارەیەکم هەڵگرتبوو، ناوە ناوە بە بام دەکرد، ئیدی بڕیاری لە دەرگادانم دا، وا گەیشتم:

تەق...تەق

ئەرێ چ بکەم! نامەکەی بدەمێ یاخود دوو سێ قسانی بڵێمێ، تا دەرگا نەکاتەوە، دڵنیا نیم، کامیان دەبێ. بەوەی باشە هەست بە شەرم ناکەم، بادە شەرمی بەزاندووە و سەرمەستی ئازایەتیم، خۆزی زوو بەر لەوەی شووی دەکرد، بەو شێوە پەنام بۆ بادە دەبرد، بێ شەرم سەودایی خۆمم بۆی دەنووسیەوە، دەیخوێندەوە، خۆزگە سەمەرقەند سەردەمی زوو وا سەرمەستت دەکردم، بزانە کەویار لە تۆوە چەند ئاسان و بەردەستە، دەتوانم بە دڵی خۆم، دڵی خۆمی بۆ بکەمەوە.

ئەگەر پێشتر وام کردبا....

تەق... تەق

لە دەرگاکەی تەنیشتەوە منداڵێ سەری دەرهێنا:

کەسیان لە ماڵێ نینە.

حەیف، لە دەستمچوو، دەرفەتێکی باش بوو.

وێدەچێ ئەو شەوە هەر لە ئێوارەوە خەوتبم، لەگەڵ بانگی سپێدە، دەنگی زولالـی دەروێـش بـرایم بەئاگـا هـاتم، نەداهـاتەوە بیـرم بە چ کـۆڵانێکەوە گەیشتبوومەوە ماڵێ و چۆن بە سەر بان کەوتوومە، خۆم تەنیا نەکردبوو، بە جلکی دەرێوە خەوتبووم.

نامەکەم بیرکەوتەوە، دەستم گێڕا، بەرکم گەڕا نەمدیتەوە، زۆرم خەفەت لێ خوارد، لە بەر خۆمەوە:

دەبێ لە کوێ لێم کەوتبێ، دەستی ناسیارێ نەکەوتبێ!

بەر لە تاو کەوتن، هەستام، لە دوای بگەڕێم، سەرم تێدا مابوو، چ ڕێیێ، چ کـۆلانێ بگـرم بـۆ گەیشـتن بە مـاڵی کەویـار، مێشـکی خـۆم دەگوشـی ڕێـی هاتنەوی خۆم بیربکەوێتەوە، بەلاش بوو، بیرمنەدەکەوتەوە، لە بیرکەوتنەوەی بە ڕێکەوتنەوەدا بـووم، دەبینم وا لـە هـۆدەکەی خـۆم، لە سـەر کتێبێکی لەو گۆڕە کەوتوو، کەوتووە، بە دیتنەوەی شاگەشکە بووم، خوێندمەوە، بیرمە بە هەردوو دەست لە سەری خۆم دەدا:

باشبوو لە ماڵێ نەبوو...

نامەم پارچە پارچە کرد، پارچەی گەورەی نیو وشـە مـایەوە، هێشـتا دڵـم ئاوی نەدەخواردەوە، هاتم ئاگرم بەردایێ، لە ساتی سووتانێ تەماشام دەکرد نەوەک وشەیێ دەرپەڕێ و دەرباز بێ.

ئای لەو نامەیە پەشیمان بووم، دەمگۆ:

چـۆن دەبـێ ئەو هەمـوو خەم و حەسـرەتەم بـۆ ئەوە کـچە بنێـرم و لە سۆنگەی منەوە خەم دایگرێ.

دواتریش، زۆر دواتر چەند لە نووسینی پەژیوان بووبوومەوە، دە هێندە لە سووتانی، دەمگۆ:

دەبوو ئەو ڕستە ڕۆندکیانە بۆ هەتایە لای خۆم بپارێزم.

واز لە نامە بێنە، ئێستا کەوتمە نزا، نزای گەڕانەوەی کەویار بۆ ماڵە باوان، ئەوجا تۆ بەرێ خۆ دێ، من نەمدەویست بە نامەیەک، بە چەند رستەیەکی ئەوینداری، دڵی کەویار توند بکەم، کەچی لە دڵەوە نزامدەکرد، مێردەکەی لە قادسیە نەگەڕێتەوە.

ئا، دوایوەی ئەو پیاوە چووە سەربازی، حەزمدەکرد شەڕ بۆ خۆی بباتەوە و نەگەڕێتەوە، دیسان کەویار بێوەژن بکەوێتەوە، بەڵکوو ئەوجارە بۆ هەمیشە بۆ من بێ، بۆیە تووکی پیسم لە مێردەکەی دەکرد.

بەڵام ئەو تووک لێکردنە هەر یەک دوو وەرز بوو، زوو هاتمەوە سەرەخۆ و خۆم سەرکۆنە کرد، بەڵام ئەوینی کەویار لە دڵ وەک خۆی ما.

لە ئەوین و کەویار گەڕێ، زۆرم باس کرد، لە تامێم بردە دەرێ، هەوکە دەچمە دیداری ئەو کوڕەی لە کتێبەوە دەفڕی، نا، چیرۆکێکم بیرکەوتەوە، چیرۆکی جەمیلە، با ئەو چیرۆکە بە کەویارەوە، دوا باس بێت سەبارەت بەو، زوو دەگەمەوە لای کوڕە فڕیوەکە.

*{دەڵێن، ئەگەر کەسێکی لە دەستچوو باست بکات، یان تۆ زۆر بیری لێبکەیتەوە، دێتە خەونت، بەڵام کوا! من لەو رۆژانە زۆر جار لە بەر خۆمەوە دەمگوت:*

*ئەوە بووە حەفت هەشت ساڵ، وا لە گڕ گێڕانەوەی کوڵان کوڵانم، لە سەر سەرە کۆڵانی کەویار سەرێ دەردێنی، هێندەم هێناوەتە ناو باسان، خوێنەر ئەگەر دەنگی بمگاتێ، دەڵێ:*

*ئەرێ، چ بوو، نەبڕایەوە!*

*کەچی ئەو کچە فڕیوە، شەوێ نەهاتە ناو خەونمەوە.*

*وا دیارە گازاندەکەم گەیشتە جێی خۆی! شەوی رابرد، هات، بە هەمان بەژن و باڵا و کەزیەوە، بەڵام سەرتاپا رەش، رەشی پۆشیبوو، چاوی، ئەو چاوەی هەر من دەزانم چ چاو بوو، بە قووڵدا چووبوو، رەنگ بە روویەوە نەمابوو، زەرد زەرد، کز کز، دەتگوت پایز لێیداوە...*

*بە یەکەوە راوەستابووین، هەندێ قسەی کرد، حەیف، هەر لە ناو خەونەکە لەبیرمچوو، ئەوەی لەبیرم ماوە و لە کاتی وەئاگا هاتنەوە وەکات*

نووسیمەوە، تا لەبیرمنەچێتەوە، هێندە بوو، پرسیم:

-تۆ بە جارێک خۆت بزر کرد.

+ چووزانم، کێشە و خەمی دنیا.

- گەلەک بیرم دەکردی.

+ بەراست!

- ئەگەر باوەڕ ناکەیت، بڕۆ کتێبی....

وەئاگا هاتم، دەمویست بڵێم، بڕۆ کتێبی کۆڵان کۆڵان گێڕانەوە بخوێنەوە، لەو خەونە زۆر ئازا دیار بووم، بە ناوی خۆیەوە گازمکرد و دەمویست خۆم لێی ئاشکرا بکەم و حەز و ئەوینی خۆمی بۆ بگێڕمەوە، وەئاگاهاتنەوە نەیهێشت، لە دەستمچوو، لە کوێ خەونێکی وا دەبینمەوە!}

## جەمیلە

## جوانی لە وێنەی وشەوە

دوای دیتنی جەمیلە، جەمیلەی نێو چیرۆک، ئەو چیرۆکەی ئاراگۆنی کوشتەی چاوی ئەلیزا، ناوی لێنا:

جوانترین چیرۆکی ئەوینداری دنیا.

ئەز وەها بۆی حەیران بووم، پێشتری چ چیرۆکێ بەو دەردەی نەبردبووم، بە دەردچوونێ، لە دەست دەرچووبووم، سەرگەردان سەرگەردان لە نێوان چیرۆکی خۆم و هی وی، هی ناو کتێبان دەسووڕامەوە، لە هیچ لایێ نەدەگیرسامەوە.

لە خۆم دەپرسی:

کامیان ئەوینترە، هی دەرێ یان هی ناو چیرۆکان؟

دەمگۆ:

جەمیلە ئەگەر لەو کتێبە و لە ناو هەموو ئەو وشانەی جەنگیز ئیتماتۆڤ بێتە دەرێ و لەو گۆڕە بسووڕێتەوە، داخوا لە وێنەی خۆی دەمێنێتەوە؟!

دەمگۆ:

سەربردەی من ئەگەر بکەوێتە کتێبێکی لەو شێوەوە، دەشێوێ، یان...

جەمیلەی ناو کتێبێ، جەمیلەیێ بوو لە ناسکی و جوانی، لە چ جەمیلان، لە چ کچان نەدەچوو، نەهی دەرێ، نە هی ناو گۆرانی، نا، نەرم و نۆڵ و نازەنین و پەنجە بە ئەنگوستیلە و بەرۆک بە دەرزیلەی حەسەن زیرەک نەبوو، بەڵام لە ڕەفتارێ نەختێ نزیک بوو لە گورێی کچی پلکەبەندبێژی گەڕەکێ، ئەوەی کاتێ کوڕێ گێچەڵی پێکردبا، (کوڕی هەرە)ی لێدەکرد، لە شێوەی کەرێ. خۆ ئەگەر ئەو کوڕە لە (کوڕی) تێنەگەیشتا، ئەوا کچی پلکە بەندبێژی خۆمان، لە جەمیلەی قیرغستانیی تێدەپەراند، بە زمانی چەقۆ

جوانتری تێدەگەیاند.

گوڕێی گەرەکی لە ساتی ناسکبوونەوەش، تۆزێ وردە نازی جەمیلەی ئەوێی تێدایە، بەڵام جیایە، لە دیدی منەوە جەمیلەی ناو کتێبێ لە کەس ناچێ و کەس لەو ناچێ، کەسی نەبێ! کەویار، ئەویش هێندەی ئەو وێنەیەی جاروبار وێنام دەکرد و لە هەندێ گرتە هێند لێکدی نزیک دەبوونەوە، لە جێی خۆم رادەچڵەکیم و دەمگۆ:

نا، وا نابێ...

لە بیرتان بێ، رێکەوتێکی سەیر بوو، من لە کاتێکی زۆر ناسک جەمیلەی ناو کتێبم ناسی، لە حەفتەیەک سێ جارم خوێندەوە، لێی تێر نەدەبووم، ئەوجا لە جاری چوارەم، نەگەیشتبوومە لاپەرەی چوارەم، تا دەستم تێدابوو جەمیلەم تێهەڵدا، بە ساپیتەی خانوو کەوت و لە سەر سینگم کەوتەوە، وازم لێنەهێنا، هەستام پەڕ پەڕم کرد، هەر پەڕێکم کردە دوو کەرتک، هێشتا دڵم ئاوی نەخواردۆتەوە، لە سەر دەرگا ئاگرم بەردایێ، بە بەر چاومەوە جەمیلە قرچ قرچ دەسووتا، هێشتا دووکەڵی مابوو، هەستمکرد بۆکرووز دێ، بۆکرووزی کەزی، پەژیوان بوومەوە، وەک بڵێی کەزی کەویارم سووتاندبێ.

ناپرسن، جەمیلە بۆچی منی بەو دەردە برد و منیش ئاگرم بەردایێ؟

تۆ بەرێ خۆ دێ، مێردی جەمیلە لە شەڕە، مێردی کەویار لە شەڕە، نێوان ئەو دوو شەڕە بە جێ نا، بە کات چل ساڵێ دەبێ، ئەو لە بەرەی ستالینە دژی نازی، ئەم لە بەرەی سەدامە دژی خومەینی، ئۆجا تۆ لە شەڕی رەوا و نارەوا گەڕێ، سەرباسمان شەڕ نیە، کێشەی دڵە.

چ جەمیلە چ کەویار وێناچێ ئەوینی مێردەکەیان لە دڵ بێ، جەمیلە بە ئاشکرا ئەوەی سەلماند، لێ کەویار نا، کەویار وەک من بیناسم، لە سەریشی بدەی ئەوە نالێ و رازی دڵ بۆ کەس ناکاتەوە، دووریش نیە سەرچیخ چووبم، لەوەش گەڕێ.

لەو تەنیشتە منداڵکارێ هەیە لە تەمەن لە جەمیلە گچکەتر، بۆیێ جەمیلە هەر بە گچکەڵ گازیدەکات، ئەو گچکەڵە بە شێوەیێ هۆگری جەمیلەیە، بە رادەیێ خۆشیدەوێ، لێی تێکچووە چیە، تۆ بڵێی ئەوین نەبێ! ئەو گچکەڵە

چەند لە منی پێشان دەچی، ئەو دەمەی تەمەنم نەگەیشتبووە تەمەنی ئەویش کە لەو پتر هۆگری کەویار بووبووم، بێ وی هەڵمنەدەکرد، هەستمدەکرد دڵم بۆ وی لێدەدا نەشمدەزانی بۆ، چ بزانم لێدانی ئەوینە، کەویاریش کە تەمەنی منیشی نەبوو، بەڵام بە شێوەیێ تەماشایدەکردم، گازیدەکردم، بەوەی جەمیلە دەچوو. کاتێ جەمیلەم خوێندەوە، خۆم لە بەرگ و شێوەی گچکەڵ دیتەوە، بەڵام خۆزگەم پێ نەخواست، بە کوڕەکەی لەو لاوە هاتوو خواست.

کوڕێ لەو لاوە بە شەلەشەل دێ دێ، دێتە دێی ماڵی جەمیلەی ناو کتێبێ، هێند دوورەپەرێز و کەم دووە، بە شیرینیی زار و جوولەی ناسکی جەمیلەش زار ناکاتەوە. ئەو کوڕە لە دڵی کەس جێی خۆی ناکاتەوە، وای لیدێ کەس رووی ناداتێ، کەس لێێ نزیک نابێتەوە، لەوە چەند بە من دەچوو، بەڵام حەیف ئەگەر چاریەکی وی هۆشم لە سەر با، هەشتیەکی وی دەنگم خۆش با، دوور نەبوو کەویاریش ببێتە جەمیلە.

جەمیلەی خەیاڵی جەنگیز، دیار بوو لە دڵی تریوەیێ دەیتریواند، وازی لە کوڕەی شەلەی کەمدوو نەهێنا، بە گۆرانی کوڕەی هێنایە گۆ. جەمیلە کە دەنگی کەمێ لە دەنگی کەویار دەچوو، لە بەر خۆیەوە سترانی دەچڕی، کوڕەی کەمدووی ناچار کرد، دەنگ هەڵبڕێ، رێوبان و شەوی نزیک ئاوایی لە گۆرانی بگرێ، بە هەندێ وشەی وا دەنگ هەڵبێنێ، لە دڵی جەمیلەی تینووی ئەوین، ئەوین بچێنێ.

کوڕە شەلەی کەمدوو بە گۆرانی جەمیلەی مەست و حەیران کرد، بە گۆرانی دڵی جەمیلەی برد، بە گۆرانی بووە شۆڕەسوار، شۆڕەسواری ناو خەونی چەند ساڵەی جەمیلەی سەرکێش، جەمیلەی ناسک و نازدار، جەمیلەی لەو دەمەو ئێوارەیەی فڕی، من بوومە کوڕە گچکەڵ، ئەویش کەویار.

ئەوەتا بە بەر چاومەوە، لە درەنگانی ئێوارەیێ، دەستی یەکیان گرتووە، پشت لە ئاوایی روو لە چۆلەوانی، دوور لە چاوان رێیان گرتووە، بێ ئاوڕدانەوە خۆش خۆش رێ دەبڕن، هەزار خۆزگەم بە تۆ، کوڕە شەلەی کەمدوو، ئەو کوڕەی بە گۆرانی دەستەگوڵی خۆت وەشاند، ئەوینت لە دڵی

جەمیلە چاند، چنیتەوە بەری رەنجی خۆ، وەک من، وەک کورە گچکەڵ نەبوویە شوانەی رەنجەڕۆ، نەبوویە مازیچنی کون لە پاشۆلێ.

جەمیلە و دانیار، ئا، ناوێکی وای هەبوو، رۆیشتن و کەس نەیدیتن، لە ئاوابووندا، گچکەڵ چاوی کەوتە سەریان، پڕ بە هەوکی هاوریکرد:

جەمیلە، جەمیلە، جەمیلە...

دەنگی نەگەیشتێ، چاوەڕێ بوو، ئاوڕێ بدەنەوە، جەمیلە چوو، ئاوڕی نەدایەوە، نە لە کورە گچکەڵ نە لە ئاوایی. لەو ساتە من لەو دەچووم، کتومت کورە گچکەڵ بووم، جیاوازی من لەو ئەوە بوو: ئەو لەو ساتە، لە ساتی ئاوابووندا هەستیکرد ئەوینی جەمیلە لە دڵی نیشتووە، بەڵام هی من کۆن بوو، دەمێ بوو ئەوینی کەویار لە دڵێ من سەریکردبوو.

لێکدانی کۆچ و دابڕانی ناو کتێب و دەرێی کتێب بوو، هی جەمیلە و کەویار بوو، هی من و گچکەڵی وێنەکێش بوو، چەرخی دا دەستم و کتێبم سووتاند، ئەو کتێبەی نە هەینێ و نە دواتر لە ژیانی تایبەتی من هیچ کتێبێ لەو نەدەچوو، لەو ناچێ، سووتاندم و وەکاتیش پەژیوانبوومەوە، گچکەڵی وێنەکێش پەژیوانیکردمەوە.

بەڵام کورە وێنەکێشەکە پێشتر جەمیلە و کورە کەمدووی لە تابلۆیەکی سادەی دڵداری گرتبوو، تابلۆیەکی هێند روونی ناو وشە، وەک ئەوەی بە چاوی خۆم دیتبێتم وا بوو، دواتر زۆر دوایوەی ئەو دوو ئەویندارە لە ئێوارەیەکی ئەوینی سەری خۆیان هەڵگرت و ئەوین بردنی، وێنەی ئەو دوو ئەویندارەی هەر لە هزر و خەیاڵ مابوو، خۆی لێ دەر هاویشتبوو، دەیویست لە جاران روونتر ئەوینی جەمیلە و دانیار بکێشێتەوە.

بەڵام من نەمدی، ئەوینی کەویارم بۆ کەس نەدی، دەنا دوور نەبوو منیش ئەو و ئەویندارەکەی تابلۆ نا، بیخەمە چیرۆکێکەوە، چیرۆکێ لە شێوەی جەمیلە.

بمبوورە جەمیلە، نەدەبوو بتسووتێنم، بمبوورە کەویار، وا لێت توورە بووم، ئاخر تۆش چ بزانی من من وا سەوداسەری تۆم، نە نامەیەکم دایتێ، نە ماچێکم تێگرتی، نە گۆرانیم بۆ گوتی، بە چی بزانی؟ بە راست نەتدەزانی!

لە زمانی شمشاڵت نەزانی!

وەبیرمدێ لەو سەروبەندە جاروبار کەویارم لە سەرە کۆڵانێ دەدەی، لە هەر دیتنێ گرتەیەکی منداڵیم بیردەکەوتەوە و لەو گرتانە سەرۆی هۆزانێکم بۆ دەهات، هەندێکیانم دەنووسی، ئێستاش بابەتی هەندێ لەوانەم لەبیرە:

سەر و هەنارمان دەهێنا، دەی، بیشکێنن، بزانین کێ دەیخوات و کەمترین دەنک بەردەداتەوە، هەموو جارێ کەویار دەیبردەوە. ئەو دەنکە هەنارانەم خستبووە ناو هەڵبەستەوە، کردمە چیرۆکیش. بابەتێکی دی دارخورماکە بوو، ئەو هەڵبەستەم چەند ساڵ لە بەر خۆم دەگوتەوە، ئێستاش لە بیرم نەچۆتەوە.

کۆپلەیەکی بە کەمێ دەسکاری و داڕشتنی دواترەوەم، وام بۆ کچەی فڕیو، بۆ کەویار نووسی:

**کیژێ،**

**وە بیرت دێ**

**دارخورمایێ لێرە هەبوو؟**

**لە هەموو کەژێکی شیرینی،**

**دەنکێ خورمای رەشی دەگرت**

**لە رەنگ لە من و**

**لە تام لە لێوی تۆ دەچوو**

ئیدی واز لەو کچە مێرددارە دەهێنم! با هەڵفڕمە لای ئەو کوڕەی لە کتێبەوە دەفڕێ.

## کوڕێ لە ڕێی کتێبەوە دەفڕێ

لە سەرە کۆڵانی ماڵی هەقایەتبێژەکەی سەیداوە، ئەوەی کە دەیگۆ:
هەبوو نەبوو...
تا دەگەیشتە:
کلاشم دڕا، هیچم پێنەبڕا.
بە رستی وشە و رستەی جادوویی دەیبەستیەوە و نەتدەتوانی هەستی و گوێی لێ نەگری.
لەوێ لە سووچەکە لەسەر جادەی خڕی شەستمەتری، فرۆشگایەکی گچکە روو لە ڕۆژهەڵاتە، زۆر گچکە جێی خۆی و هەندێ وردە واڵە و شەکەراتە، هەمیشەش گۆڤارێ، کتێبێکی لە دەستە. ئەو کوڕە مینا هەقاتبێژەکەی گۆرین زارشەکرە، کاتێ دەدوێ، بە تۆ بێ زاریشت ببێتە گوێ. ئەو کورە کە لەوەتەی هەیە دانیشتووە و کەس بە پێوەی نەدیتووە، بەڵام لە ڕێی کتێبەوە سەرتاسەری دنیای تەی کردووە، بە ئاسمان و سەر دەریادا فڕیوە. ئەو کوڕەی لە ڕێی کتێبەوە دەفڕێ، مەسعوودی ناوە و نازناوێکیشی لە خۆی ناوە.
کوڕە تازە ماڵیان هاتۆتە ئێرە، سەر ڕێی من، ڕێی دوو ساڵی بەلاشاوە بۆ رزگاری. هەر زوو کەوتە بەر دڵم، ئێکدی ناسینمان لە ڕێی شەکرلەمە و کتێبەوە بوو. وەک هەوکە وەبیرمدێ، شەکرلەمەم هەڵگرت، پارەم بۆ ڕاگرت، دەستی نەهێنا و وەرینەگرت، گوتی:
+ با لە بەرکی من بێ.
- شتی وا نابێت.
بە زەردەخەنەوە:
لە باتی شەکرلەمەکە ئەو کتێبەی دەستت بدە برای خۆت، سبەی ئەو

دەمە، وەزە وەریگرەوە.

بیرمناکەویتەوە کتێبەکەی دەستم چ بوو، لێ بیرمە گوتم:

ئەگەر پارەی شەکرلەمە وەرگری، کتێبەکە بەجێدەهێلم.

راستیت دەوێ سەرەتا پێموانەبوو ئەو کوڕە بزانێ دوو پیتان لێک بدات و سەرەدەری لە کتێبان دەربکات. دوو سێ گۆڤار و رۆژنامەم لە بەر دەمی بینی، لێ وای بۆ چووبووم بۆ کیسەی گولەبەڕۆژە و ئەوشتانە بەکاریان بهێنێ. منی لە کنە خۆی شتزان، چ بزانم ئەو کوڕەی وا خۆی بە زەویەوە نووساندووە، لە خوێندنەوە و خوێندەواری لەو سەرەوە هاتوتەوە، من لە چاو وی کۆلکە خوێندەوارم، باری نابەم، دە هێندەی منی خوێندۆتەوە، لە هەندێ بابەت وشیشی لە دوو ناکەم. چ بزانم لە ناو کتێبەوە باڵی گرتووە، لە شوێنی وا و لای نووسەری وا نیشتۆتەوە و چینەی زانیاریی کردووە، من تا هەنگینێ ناوم نەبیستبوون.

بەرلەوەی لە وی فێرە هەندێ شێوەی فڕین ببم، با پێبکەوم چۆن فێری پیت لێکدان و فڕین بووە.

هەنگینێ پرسیبووم، بەڵام زۆر پاشتری لە زاری خۆیەوە بیستمەوە و پرس و بەرسڤەکەم بیرکەوتەوە:

- ئەرێ برا، پرسیارێ...

+ بپرسە

- تۆ دەرچووی چی؟ تا پۆلی چەندت خوێندووە؟

+ دەرچووی ماڵێم، لە تەمەنم بۆ چرکەیەکیش ناو پۆلم نەدیتووە.

- وا مەڵێ، ئەدی لە کن مەلا...

بە گاڵتەوە:

ئا، دەرچووی زانکۆی ئەزهەرم!

پرسیارەکەم گۆڕی:

تۆ لەمێژە کتێبان دەخوێنیتەوە؟

گۆتی:

لەوەتەی فێرە خوێندەواری بوومە.

پرسیم:

چەند ساڵە خوێندنەوە و نووسین دەزانی:

گۆتی:

لە منداڵییەوە.

گۆتم:

دە بە من بڵێ، لە سەر دەستی کێ؟

گۆتی:

ئێ، دە ئەوها بڵێ، دانیشە با بۆت...

دانیشتم، ئەوجا لێت تێکنەچێ، لە زاری خۆیەوە نا، لە زاری دیدڤانێکەوە، دیدڤان بە سەر گەڕەک و کۆڵانەوە، بە سەر ئەو کوڕەی لە کتێبەوە دەفڕی، دیدڤانەکە بە کورتی بە چەند رستەیەکی کورت و سادە لە ماوەیەکی کورت هەر هێندەی تا سی چلێ بژمێریت، سەربردەی فێربوونی کوڕەی گێڕایەوە. من دوای ئەو هەموو ساڵە رستەکان لێکدی رادەکێشمەوە و ورد و باریک سەرهاتی فێربوونەکە، فێربوونی خوێندەواریی کوڕەتان بۆ دەگێڕمەوە، ئەو کوڕەی فێرە فڕینی ناو کتێبانی کردم:

*هەراش بوو، دەمێ بوو کاتی چوونە قوتابخانەی هاتبوو، دەمدی منداڵانی ئاوزەی ئەو جانتایان دەکردە شان و بڕۆ. دەمدی لە سەر کۆسپەی دەرگەی حەوشەوە، چاوی بە کۆلانێدا دەگێرا، دەیدی ئاوزەی خۆی و لە خۆی گچکەتر و هەراشتر، لە هاتنەوەدا جانتایان لە سەر سەری خۆیان بادەدا و بە غارغارانێ و گەمەکردن وشاپ راوەشاندنەوە، بەرەو ماڵێ دەبوونەوە. لە چاویم دەخوێندەوە ئیرەیی پێدەبردن، خۆزیی پێدەخواستن! خۆزگەیێ ناهێتە باسکردنێ.*

*منداڵ دەهاتن لە نزیکە وی دادەنیشتن، کتێبیان دەکردەوە، دارا و زارایان دەخوێندەوە، دەفتەریان دەکردەوە، نەیدەزانی چی دەنووسنەوە.*

*وا تێبگەم لێرەوە خولیای چوونە قوتابخانە، لە سەری گەڕا، چ حەزێ، چۆن گەرانێ! ئارامی لێ هەڵگرتبوو، بەڵام چۆن بگاتێ، بەو دانیشتنەوە کە وا دیارە بۆ هەمیشە بەشی ئەوە، چۆن بگاتێ، مەگەر پۆل بۆی بێتە ماڵێ.*

*- پۆل هاتە ماڵێ؟*

*+ ئا، هات، بزانە چۆن.*

*خزمێکی، دیار بوو لە چاویەوە تاسەی ئەوی خوێندبووەوە، تاسەی فێربوون، گوتی:*

*مەسعوود، حەزت لێیە، خوێندنەوە و نووسین بزانی؟*

*گوتی:*

*ئەوە قسەیە! ئەدی کوو، بەڵام کێ دەمباتە فێرگە؟*

*گوتی:*

*فێرگەت بۆ دەهێنمە ئێرە.*

*گوتی:*

*بەراستتە؟!*

*گوتی:*

*ئا، من بۆت دەبمە فێرگە.*

*هەستیکرد گاڵتەی پێدەکات، ئەویش هەستی بەو هەستەی ئەو کرد، بە بێ دەنگی چوو، کتێب و دەفتەر و پێنووسی هێنا.*

*بە سەری هەردووکمان یەک مانگی نەبرد، خەر پیتی کوردی بە خوێندنەوە و نووسینەوە ئەزبەر کرد و فێربوو لێکیان بدات و هەر وشەیەکیان نیشان دەدا، وەک خۆی دەیخوێندەوە. هەر وشەیەکیان دەگۆت، بێ کەم و زیاد دەینووسی. وەرزێک تێنەپەری، ئەو منداڵی کۆڵانێی فێری لێکدانی پیتان دەکرد.*

ئەوە سەربردەی فێربوونی ئەو، ئەو کوڕەی بە دانیشتنەوە باڵی دەگرت و دنیا دەگەڕا و بە پاشۆلی دیدی تازە و زانینەوە لە فێرگەکەی خۆی دەنیشتەوە، بەڵێ فرۆشگا گچکەکەی وی بۆ ئێمەمانان فێرگە بوو، فێرگەی کتێبی کراوە و خەیاڵاوی، نەک ئەو کتێبانەی هزریان سندم و باڵی خەیاڵیان دەبەستەوە و لە چەند پێناسەیەکی لە چێوەگیراو تەلبەندیان دەکردین. ئەوە لەوێ، هەوکە با بێینەوە فێرگەی ئەو و لێیەوە فێرە فڕین بین.

سەرتیپ ناوی لەو فرۆشگایە نابوو، فێرگەی بێبەش، بەڵام هەر کێ ڕێی

بەو بێبەشە کەوتبا، بێ بەش نەدەبوو، بە دەستی بەتاڵ نەدەگەڕایەوە. وەک چۆن منداڵ بە چەند عانەیەکەوە بە غاردان دەهاتن و بە چنگێ شەکرۆکە و نانۆکەوە پێیان پێوەدەنا. ئێمەمانانیش بە دەستی بەتاڵەوە خۆمان بە ژوریدا دەکرد، بەڵام بە چەپکێ زانین، خەیاڵی جوان، تۆ بڵێ باڵێ بۆ فڕین دەهاتینەوە. کەس نەبوو سەر بە فێرگەی بێبەشدا بگرێ و شتێ هەڵنەگرێ، شتێ وەرنەگرێ. لەو فێرگەیە هەمیشە کۆڕ گەرم بوو، کۆڕی وێژە و هزر و رامیاری، کۆڕی فڕین لە کتێبەوە و نیشتنەوە لە کتێبەوە.

رۆژێ لە پرسیارێکی ئەوەوە، گفتوگۆیەکی ناسک کەوتەوە، لەو پرسیار لە دووان سیانێکیش وەڵام. حەزدەکەم تۆزی تام و خوێی گێڕانەوەی پێوە بکەم و بە زمانی هەنگینێ نا، هی ساڵی هەشتاو دوو و سێ نا، هی ئێستا دایبڕێژمەوە و بۆتان بگێڕمەوە:

+ تۆ هەرگیز فڕیوی؟

- هێشتا نەبوومەتە باڵدار!

- وا بزانم مەبەستی فڕینی ناو کتێبە.

+ دەم خۆش، بنیادەم لە دوو شوێنەوە دەتوانێ لە شێوەی باڵدار باڵ بگرێ، لە کتێبەوە یان لە ناو خەونێ.

- ئەدی لە ناو فڕۆکەوە؟

+ سوار نەبوومە، بەڵام ناو فڕۆکە کەی فڕینە، رەنگبێ هەر وەک ئەو دانیشتنەی من بێ، من مەبەستم فڕینێکە باڵت لێ بڕسکێ، لە شێوەی قاز و قورینگ، لە شێوەی حاجی لەقلەق، ئەو سەر و سەری دنیا بکەیت و بێیتەوە و لە جێی خۆ بنیشیتەوە.

- باشە، بزانین، چتۆیی فێرە فڕینمان دەکەیت؟

+ راستی لام سەیرە کەسێ کتێب بخوێنێتەوە و نەفڕیبێ، چما ئێوە نەفڕیون؟

کەس وەڵامی نەدایەوە.

دوای ئەو تەمەنە پەیڤ و رستان بە شێوە و ئاوازەی خۆیان لە یادگە نامێننەوە، خۆ ئەگەر نزیک لە خۆشیان مابنەوە، نابێت تام و خوێی

جوانكاریی گێڕانەوە لەبیربكەین! فێركارەكەی فێرگەی فڕین، ئا، من پاشتریَ فێرگەی بێبەشم گۆڕی بۆ فێرگەی فڕین، بەو شێوە هاتە سەر باسی هونەری فڕین:

تۆ ماركست كردۆتەوە، سەرت بە سەر لاپەڕەیەكی داگرتووە، كێشەیێ دەخوێنیتەوە، تۆ پێشتر هەستت پێنەكردووە، شوێنی ئەو كێشەیە دوورە لە تۆ، نەتبیستووە و نەتدیتووە، لەو ساتەی خوێندنەوە ئەگەر بتەوێ سەرە داوێكی بگریت و بە دوایدا بچیت، دەچیت، بەڵام چۆن دەچیت؟ هەر لە ڕێی كتێبەكەوە، یان ئەو نا، كتێبێكی تر، لە كتێبەكەوە تۆ دەگەیتە شوێنی كێشەكە، جا ئەو جێیە ئەلمانیایە، ئینگلتەرایە، هەر جێیە، تۆ ئەگەر ورد لە كێشەكە وردببیەوە، لە جێی خۆت چاوت داخە، هەست بە فڕینەكە دەكەیت، لە شەقەی باڵ دەدەیت، دەگەیتە شوێنی كێشەكە، لە كاتی گەڕانەوە و نیشتنەوە، دوور نیە كێشەیەكی لە شێوەی ئەوەی ئەوێ، كێشەی چینایەتی لە نزیك ماڵی خۆت ببینیەوە.

- تۆ ناو لەوە دەنێیت فڕین؟

+ ئەوە فڕین نەبێت، فڕین نیە.

- من زۆر دەخوێنمەوە، بەڵام هەستم بەو فڕینە نەكردووە.

- من هەستم پێكردووە.

- من.....

+ من پێموایە، هەر كەسێ بە قووڵی بخوێنێتەوە، نەك سەرپێیی ئەو فڕینە دەبینێ.

شێخ جەلال كە وا بزانم جاری یەكەمە بێتە فێرگەی فڕین، قۆڵی لە شێوەی باڵی كەڵەباب لێككردەوە و گوتی:

من هەر لە ساتی خوێندنەوە نا، كاتێ باسی خوێندنەوەش دێتە گۆڕێ، نەمگرن، باڵ دەگرم.

فێركاری فێرگەی فڕین لە سەری ڕۆیی:

من كە داروین دەخوێنمەوە، دەفڕم و دەگەمە ئەو شوێنەی كە بۆ یەكەم جار ململانێ لە پێناو مانەوەدا سەریهەڵدا.

- شوێنەکە کەوتبووە کوێ؟
بە پێکەنینەوە:
+ چووزانم تا گەیشتمە ئەوێ، چەندان کیشوەر و زەریام بڕی، هێندە دەزانم دەو ئاو بوو.
- ئەگەر ئەوە فڕین بێت، منیش لە دەمی خوێندنەوە هەستی پێدەکەم.
فێرکاری فێرگەی فڕین:
فڕینە، فڕین ئەوهایە، تۆ کە دایکی گۆرکی دەخوێنیتەوە، هەست ناکەیت وا لە رووسیا لە ناو کارگەیەک نیشتوویتیەوە؟ وەرە دۆستۆفسکی بخوێنەوە، بزانە سیبریا بە چاوی خۆت دەبینی یان نا. وەرە پەڕ پەڕ داغستانی من بکەوە، بزانە چۆن دەبیە قاز و قورینگی ئاسمانێ و لە سەر ماڵی هەمزەتۆڤ دەقریوێنی، ما ئەدی فڕین کووە!
ئەز زۆر چێژم لەو باسی فڕینە وەردەگرت، لە فڕینی ئەو کوڕەوە کاتێ کتێبم دەخوێندەوە، فڕینەکەی ئەوم بیردەکەوتەوە و هەوڵی فڕینم دەدا و هەستمدەکرد هەر بە راستی نەک لە خەیاڵ هەندێ رستەی ناو کتێبان بۆم دەبنە باڵ، بە ئاسمانیم دێخن، لە جێی دوور دەنیشمەوە، لەگەڵ خۆم هەندێ وێنە و گرتە دەهێنمەوە و تا چەند رۆژێ بە بەر چاومەوە بازبازێنێ دەکەن و نارەوێنەوە.
فێرکاری فێرگەی فڕین بە تەمەن هەر دوو سێ ساڵێ لە من مەزنتر، لێ بە خەیاڵ و هزر زۆر لە من سەرتر، سەرم نەدەگەیشتە شانی، ئازاد خەتخۆش روو لە من دەیگۆ:
+ دەزانی بۆچی هێندە لە پێشە مەیە؟
- لە ئێمە پتر دەخوێنێتەوە.
+ هەر ئەوە نیە.
- ئەدی؟
+ ئەو کوڕە لە تەمەنی سەری بە سەر کتێبێکی قوتابخانە دانەگرتووە، لەوەتەی دەزانێ پێتان لێک بدات، کتێبی دەرەکی دەخوێنێتەوە.
-ئەها، تێگەیشتم، پێدەچێ...

خەتخۆش مەبەستی ئەوە بوو کتێبی قوتابخانە هیَ لەوەی شتێکی ئەوتۆت فێرناکەن، هزر و خەیاڵیشت لە چێوە دەگرن، دەتخەنە رکەوە و رێنادەن هەڵفڕی، سەرەڕای هەندێش تەمەنی ناسکیشت درووێنە دەکەن و دەیبەن.

ئەو کوڕە چ کاتیَ کاتی خۆی نەکوشتبوو بە:

دیرۆکی درۆ، جوگرافیای شێواو، کۆمەڵایەتیی بەرەواژ، ئاییینی داخراو، فەتحە و کەسرە و زەمە و شەدەی عارەبی...

کاتی خۆی بە ئاوێدا نەدابوو بە:

سین و ساد و $H_2O$ و کێش و مێش و ئەوشتانە.

بۆیە وا سەرشارە لە زانین و هەمیشە باڵی لە باری هەڵفڕینە.

چ لە ئێوە شاراوە بیَ! ئێمە هەینیَ وەک بڵێی پێمان کەمی بیَ، بیَ پێنج و پەنا پێلێنیین کە فێرکاری فێرگەی فڕین، لە زانین و خەیال لە ئێمە سەرترە، بۆیە بیانگەمان بۆ کەم زانینی خۆمان دەهێنایەوە.

فێرکاری فێرگەی فڕین پتر ئەو کتێبانەی دەخوێندەوە کە دژە باو بوون، دژی دابونەریتی کرێتی کات بە سەرچوو بوون، ئەو کوڕە دەگەڵ گۆڕانی لە رەگەوە بوو، نەک پینەوپەڕۆ.

ئەو کوڕەی لە کتێبەوە دەفڕی خوێندنەوەی بۆ خوێندنەوە نا، بۆ فڕین بوو، فڕینیش تەنها بۆ مەبەستی فڕین نا، بۆ گۆڕین، گۆڕینی تاک و گشت، گۆڕینی خۆی و دەورووپشت، دەیگۆ:

من کاتیَ گۆتەییَ دەخوێنمەوە و روانینم دەگۆڕیَ، لە سەرمە ئەو گۆتەیە بگۆڕم لۆ کردە، کردەییَ لە خۆمەوە دەستپێبکەم، هەنگینیَ لە تۆ بخوازم بێیتە سەر ئەو خەتە.

بەڵام هەبوو، مەبەستی لە خوێندنەوە تەنها چێژ وەگرتنەکە بوو.

فێرگەی فڕین بووبووە جێگەی پەڕە کاخەزی بڤە، پەڕی وا لە سەر دوو سیَ پەیڤی دەگەیشتیە بن سێدارەی نەینەوا. زۆر لەو پەڕە کاخەزانە لەو فێرگەوە دەستاودەستیان دەکرد و بە گەڕەک و شاردا بڵاودەبوونەوە، کام بڵاوکراوەی چیا کە زۆر بڤە بوو، ئەگەر ویستبات، ئاسان و پاسان لە فێرگەی فڕین دەستدەکەوت، هەندیَ لە کوڕە سەرکێشەکان لەو فێرگەیە

پەڕی پڕ لە پەیڤی بڤەیان دەگۆڕیەوە.

ئەو فێرکارە پتر لە کۆمەڵەی ئارام نزیک بوو، لێ دەرگای فێرگەی بۆ هەمووان لە سەر پشت بوو، جیاکاری لە نیوان من و تۆ و ئەو نەدەکرد، بۆ فێربوون دەستی هەمووانی دەگرت، باروبووی دەستکورتیش لەوێ بوەستێ، بیرمە لە دڵەوە دەیگۆ:

بەرکی من بەرکی ئێوەیە، رووتەنک نەبن، داوا بکەن.

زۆر چاو تێر بوو، وەک کەسێ دەدوا کە نیوەی قەیسەری و ئەو ریزە خانووەی سەر جادەی شەستمەتری هەموو هی وی بن، دەیگۆ:

لە سایەی گوڵبەڕۆژە و شەکرۆکەوە، من بژێویم زۆر باشە، لە ئەحمەد چەڵەبیش باشتر، پێویستیتان بوو دێنە ئێرە، ناچنە چ جێ.

چ ما، چ ما! ئا، گۆتە باوەکە، ئەوەی هەینێ لە سەر زاری مارکسخوازان بوو، وەبیرمدێ لە گەرمەی خۆپێشاندانێ هی سالانی هەشتا و دوو و سێی سەدەی بیستێ، ئەو کوڕەی لە کتێبەوە دەفڕی، زۆر لە خەمی ئێمە بوو، زوو زوو دەیگۆ:

وریای خۆتان بن، پەل مەبن، با لە دەست نەچن.

لە ناو قسانیش گۆتەکەی مارکسی دەگۆتەوە:

مرۆ بە بەهاترین سەرمایەیە.

جارێ لای فێرکاری فێرگەی فڕینم خۆش، لای ئەو کوڕەی لە کتێبەوە دەفڕی و منیش لەوەوە هەستم بە فڕینەکە کرد و لە هەر کتێبێ کە دەمخوێندەوە، باڵ لێکدان و فڕینم بیردەکەوتەوە، لای ئەو کوڕەم خۆش کە تا ئێستاش، ئێستای گێڕانەوەی هەینێ، گێڕانەوەی کۆلان کۆلان هەر دانیشتووە، دانیشتنێکی پڕ فڕین، لای مەسعوودی بێبەشەکەی جاران، ئێستاش ڕێمان.

دواتر دوور نیە ڕێم بە فێرگەی فڕینی ڕێمان بکەوێتەوە، ئێستا کاتی تاقیکردنەوەی سەری ساڵە ئەوەی بەکالۆریای دەڵێنێ، ئەوەی دوازدە ساڵی خوێندنت لە سەر ئەو راوەستاوە، دوارۆژی خوێندن لێرەوە دەردەکەوێ، داخوا دەبیە چی و چیت بەردەکەوێ!

ئەها، هەندێ سەربردەیدی سەردیقانێم دەگەڵ دەکەن، ئەگەر زوو نەیانخەمە ناو گێڕانەوە، دەترسم بزر بن و لە دەستمبچن و نەیانبینمەوە بۆیە وا باشە بەر لە چوونە هۆلی تاقیکردنەوە بیانخەمە کۆلان کۆلانەوە.

لە هێمن و هەژارەوە پێدا دێم، ئەو دوو هاوڕێیەی خۆزیم دەخواست یەکیان من بام، هەر من-نا، زۆر کەسی دی ئەو خۆزگەی منیان دەخواست، یەک لەوانە خەتخۆشی هاوڕێم بوو، وەبیرمدێ زۆر جار بۆ خۆشی منی دەکردە هەژار و خۆی دەبووە هێمن.

## هێمن و هەژار

بستێ منداڵ بووم ئەو دوو هاوڕێیەم دەناسی، هێشتا نەمدەزانی کتێب کەڵکی چیە، هەردووکیانم خوێندبووەوە. لە کتێبی خوێندن گەڕێ، لە هی خویندنەوە یەکەم کتێب هەژار و دووەم هی هێمن بوو، ئەوە نەبوو، مەم و زینەکەی خانیم بە زاری هەژار خوێندەوە، لە دوای ویش تاریک و ڕوونەکەی هێمن.

هێ لەو دوو هێیە چ هۆزانڤانی دی وا ناویان پێکەوە نەدەهات، لە سەردەمی ئێمە لە کۆڕی گەرمی گڵکەند و باکوور و عەبۆ و شەوانی هەولێر و ئەو جێیانە، ناوی یەکیان هاتبا، ئەوی دی لە دووی بوو. لە سەردەمی ئێمە مینا سەردەمی بەرێ، سەردەمی کۆمار، سەردەمی لە کوێوە بۆ کوێ، ناوی هێمن و هەژار لە ناو زۆری توێژی خوێندەوار، وێکڕا دەهاتنە سەر زار، ئەو دوو شاعیرەی چەندان منداڵ بە ناوی ئەوانەوە ناودێرکراون، بەڵام...

هەیە، خوێندەوار هەیە لە ڕوانگەی پارتەوە، لە ڕوانگەی تەنگەوە، لە ڕوانگەی هەندێ، دەڕوانێتە هەژار و دەیخوێنێتەوە، هەندێ گۆتە و هۆزانی ئەوی کردۆتە بنێشتە خۆشەی سەر زار و بەو هێندە زیوانەوە ئاگر لەو خەرمانە وشەیە بەردەدات کە داهاتێکی ئەوتۆی وێژە و زمانە، نەبووە و نابێتەوە.

هەندێ لەوانەی دوژمنی بابەکوشتەی مەلا مستەفا بوون، ناوی هەژاریان دەگەڵ ناوی وی دەهێنا، بە هۆزانڤانی دەرباری ئەویان دادەنا، نەفرەتیان بۆی دەنارد. وەبیرمدێ سەر لە ئێوارانێ لە گازینۆی شەوان، لەگەڵ یەک دووانێ، یەکیان نازناوی هەرمان بوو، لە سەر هەژار کەوتینە مشتومڕ:

-تۆ هەڵەی ئەو هەژارە لە بەهرە سەرشارە، لە دوو سێ هەڵبەستەوە ببینی، لە (جاشی بەکرە جۆ و بلەی ئەحە ڕەش و پێشمان کەوە

بارزانی)یەوە هەڵیسەنگێنی، ئەدی مەم و زین و....

- کەسێ کە دەربار بوو، ئەگەر (ژانی گەل)یش بنووسێت، نیو درهەم ناهێنێ.

- هەژار شتێکی وای بەرنەهێناوە جێی ڕێز بێ

- تۆ چەند کتێبێ ئەوت خوێندۆتەوە؟ کتێبی....

- خوێندوومەتەوە، نایخوێنمەوە، هی خوێندنەوە نیە، من کاتی خۆم بەو دەربار و کۆنەپەرستانە دەکوژم؟ بە هەژار و کوڕی مەلای گەورە و...

من گوێم بە دەرباری و کۆنەپەرستی نەدەدا، ئەوەی دڵ ویستبای دەمخوێندەوە، مەسعوود محەمەدیشم بازنەدەدا، جارێ لە وی گەڕێ، سەرباسمان هەژار و هێمنە. ئەز زۆر لەوە دڵگران دەبووم کە قسەی سووک بە هەژار بدرێ، ئەو نووسەرە لە کن من گەلەک مەزن بوو، ئاخر من لەڕێی ئەوەوە شاکاری مەم و زینم خوێندەوە، لە ڕێی ئەوەوە خەیامم ناسی، زمانی ڕەوانی ئەو نەبا، من لەو تەمەنە شەرەفنامەی شەرەفخانم دەخوێندەوە؟ بە سەر باخی هەزار میوەی مەلای جزیریدا دەکەوتم، هەژار نەبا، لە تەمەنی زوو من زۆر شتم لە دەستدەچوو، ئەدی قورئانەکەی! ئەوەی دواتر، خۆ ئەگەر خودا بۆ کورد، یان بە کوردیی ناردبا، هەر بەو زمانەی دەنارد کە هەژار پێی کردە کوردی{ئەو گۆتەی دوایی هی خۆم نیە، دزیم}

ئەدی چێشتی مجێورەکەی پاشانی، ئەو هەژارە چیە، چ زمانیکی هەیە، دەبێ هەبێ شان بدا لە شانی؟

هەژارم لە زووەوە دەناسی، لە مەم و زینەوە، لە بە کوردی و دەژیم و بە کوردی دەمرم و ئەوانەوە، لە شەوە دنیا خامۆشەوە، ئەوەی لە چریکەی مامڵێوە هەوکەشپێوە دەمرژێنێتە هەیوەشەو و لە جریوەی ئەستێرانم دەگرێ، بەیان دەدا و نادا دەگەڵ گەزۆدا دەبارێم، ئاونگی سەر کوڵمی کەویارم بیردێنێتەوە.

ئیدی من بێ هەژار هەڵناکەم و هەرچی هەیە دەیخوێنمەوە بە (دایە باوە کێ خراوە)شەوە، بۆیە دڵگران دەبووم کە دەمبیست کەسێ بە بیانووی دەرباری و شتی واوە، دەیەوێ لێی کەم بکاتەوە.

ئەوە هەژارەکە، بــا هێمـــنەکەش لە یەک دوو کــورتە گــرتە بە ســـەر بکەیـنەوە، ئەو هێمـنەی لە کـاروانی شـاعیراندا خـۆی سـەرقەتارە، گەوهەر باریەتی و شـەکرە وشـە لە زاری دەبـارێ. ئەو هێمـنەی لە نـاڵەی جوداییدا دەگاتە ئەو جێیەی کەس نەبوو دەستی بگاتێ.

لە کـۆڕی گەرمـی ئـێمە هـێمن جیـا بـوو لە هەژار، کەس نەبـوو لە گـوڵ رەقتـری تێگـرێ، کەس نەبـوو چەنـد شـیعری وی ئەزبەر نەبـێ و لە دڵەوە نەیڵێتەوە، هێمن لای هەمووان خۆشەویست و لە بەر دڵان بـوو، کەس نەبـوو بـۆ گـاڵتەش تـوانجێکی تێگـرێ. هـێمن نمـوونەی بـاڵای جـوانی و شـیعر و بەرخۆدان بوو، هێمن پیرۆز بوو، هەر خوێدەوارێ قسەیەکی ناڕێکی پێگۆتبا، زمانی خوێندنەوەی خـوار دەبـوو، هەر کـێ هەڵەیەکـی وای کردبـا، بە دەردی هونەرمەندکەی گۆرین دەچـوو، ئەهـا ئەوەی نـازانم کـێ قەدری بـوو، لە پتـی دەرچووبوو، لە رادیۆوە گوتبووی:

حەسەن زیرەک نازانێ گۆرانی بڵێ...

وا بزانم واشی نەگوتبوو، خەڵک وا تێگەیشتبوون، لە سەر ئەوە دنیای لـێ هەستا، ئەوەی خراپە پێیانکرد، چ جوێنی مزرە بۆیـان نـارد، ئەو قوڕبەسەرە خواخـوای بـوو وەک خـۆی لێبێتەوە، نەیـدەزانی چـۆن چـۆنی قسـەی خـۆی راست بکاتەوە.

ئەو ئێســتگەیەی لە پیرۆزیـی هێمنیشــی دا، وەهــا خـۆی ناشـیرن نەکـرد کەس بزانێ.

وەکـی گـۆتم، دووەم کتێب کە خوێنـدمەوە تاریـک و روونـی هـێمن بـوو، لەوەوە و نەخاسـمە لە خوێنـدنەوەی جـاری دووەمەوە ناسـکی و جـوانیی شـیعرم دیـتەوە، خـۆ هەر جـارێ دەگەڕامەوە سـەر پێشـەکی ئەو تاریـک و روونە (لە کوێوە بۆ کوێ)، هەزار خـۆزگەم دەخواسـت، رۆژێ دابـێ منیش بتوانم لاپەرەیەکی وەک وی بنووسم.

ئەدی ناڵەی جودایی! کێ هەبوو بە نـاڵینەوە دەگەڵ پیاوە ئاسمانیەکە، تۆ بڵێ خارە تایەر و مـحەمەد جەزا و رەزازی نەیڵێتەوە، ئەز نـاڵەی جودایی بە تەنێ نا بەشی هەرە زۆری شیعرەکانی ناو ناڵەی جوداییم ئەزبەر بـوو، نـاوە

ناوه لە بەر خۆمەوە دەمگوتنەوە:

**بۆیە ناڵەم تێکەڵی نەی کردووە**

**شیوەنێکم پێیە نەی نەیکردووە**

.......

**خدر نیم بۆ تەمەنِ شێت بم، بە کانی ژینێ دانووسێم**

**ئەوەندەم شین دەوێ، تا دەم دەنێمە نێو دەمێکی تر**

**من گوڵی سەر گۆڕی ئاواتی لەمێژینەم، بەڵام**

**ڕێژنێکم لێ بدا، پێم وایە بۆ ڕوان ببمەوە...**

سەرەدێری هەر شیعرێکی ناو ناڵەی جودایی هێمنت گوتبا، من تا دوایی بێ پسانەوە دەمگوتەوە، هەر ناڵەی جودایی نا، زۆری تاریک و روونیش.

خۆ کاتێ لە دەمی ڕێپێوان وخۆپێشاندانان، لە بەر خۆمەوە ڕقی پیرۆزم دەخوێندەوە:

**دەمگرێ ئەمما لە گرتووخانە ڕق ئەستوورترم**

**لێم دەدا ئەمما لە سەر داوا ڕەواکەم سوورترم**

**دەمکوژێ..........**

دەهاتە سەرم بە پێی خۆم بچمە زیندانێ و بە گژ میرغەزەبەکەمدا بچمەوە.

هێمن لای منیش هێما بوو، هێمای جوانی و بەرەنگاری، هێمای ئازادی ئەوینداری، هێمن پیرۆز بوو، ئەوجا تۆ بەری خۆ دێ، لەو کەشە پیرۆزیەدا ئێستگەیێ لەولاوە هەستێ، لەو پیرۆزیەت بدات! چۆن سەر و دڵت تێکناچێ، چۆن بە خۆت دەوەستی و هەڵناچی و دۆ و دۆشاو تێکەڵ ناکەیت!

ئێستگەی رادیۆی دیموکراتی ئەو دیو، ئەوەی قاسملو، یەک بە دەنگی خۆی دەیگوڕاند:

هێمن بۆتە جاش، جاشی میللی.

بە ڕاست هێمن جاشە؟ ئەو شاعیرەی تا دوێنێ شاعیری گەل بوو، تەمەنێ لە زێدی خۆی هەڵبڕا و لە دوورە وڵات ئاهی دووریی بۆ کەس و

زێد هەڵکێشا، ئەو شاعیرە ئاگرینە ئەوەی دەنگی هەڵدەبڕی:

**لەت لەتم کەن بمکوژن هێشتا دەڵێم کوردم ئەمن.**

ئەو شاعیرەی دەیگۆ:

**...خاکی بەر پێی تێکۆشەرێکی کوردم**

ئێستا چاشە؟

ئەو شاعیرە ناسکە، ئەوەی دەیگۆ:

**لە سەر بەفرێ بە کار نایە وەکوو بیستوومە داوی رەش**

**لە سەر کوڵمت ئەدی بۆ دڵگرە ئەو بسکە تاتایە...**

ئەو شاعیرەی هاواری دەکرد:

**کە دەستی رۆژگار بای دا سەری من**

**سەری شووشەی شەراب وا چاکە بادەم**

ئەو شاعیرەی دەیگۆ:

**ئاخرین تیشکی خۆری پاییزم...**

چۆن رێی تێدەچێ لەو پایزەی تەمەن ببێتە جاش!

ئەمن بیستبووم و خوێندبوومەوە و دەمزانی هەیە بە واتای وشە هونەروەرە، کەچی لە بەرەی شەڕە، لە بەرەی زۆردار و داگیرکەرە. هەیە تا بڵێی جوانناس و ناسکخوێنە، کەچی لە خۆفرۆشی تاکی نیە، بەڵام بۆ هێمن چەندی دەمکرد، سەرم دەهێنا و دەبرد، باوەڕم نەدەهات ئەو هێمنە لەو تەرزە بێ جاشایەتی لێ بوەشێتەوە. هەرچەندە بیستبووشم، زوو، زۆر زوو بە دوو سێ دێرێ بە بەچکە شایدا هەڵگۆتبوو.

هەواڵی جاشایەتی هێمنم لە کێ دەپرسی، کەس نەیدەزانی، سەرچاوە هەر ئەو رادیۆیە بوو، ئەوەی بە شێوەیەک هەوڵی رەشکردنی هێمنی دەدا، ئەگەر باوەڕت کردبا، بایی نیودێرە شیعر جوانیی تێدا نەدەما.

باشبوو زوو پێکەوتم، دڵم ئاوی خواردەوە، من جاش بم ئەو جاش نیە، نە تفەنگی بۆ خومەینی هەڵگرتووە و نە دێرە شیعرێکی بە مێزەر و ریشیدا هەڵگوتووە، هەیە و نیە ئەوەیە دانووی دەگەڵیان نەکوڵیوە و جیا بۆتەوە، دواتریش بۆ خۆی دانیشتووە و (سروە)یێ دەردەکات و دڵی خوێنەری کورد

فێنکدەکاتەوە.

لە سەر ئەو هێمن شکاندنە، ئەز لە رادیۆکە تۆرام، لە بەر خاتری شمشاڵەکەی قاڵە مەڕە نەبا، بە لایدا نەدەچووم.

لەجێیە لێرە سەربردەی فڕینی ناڵەی جوداییش جێبکەمەوە، نەوەک لەبیرمبچێتەوە و بۆی نەگەڕێمەوە:

ناڵەی جوودایی لە یادەوەریی من یەکەم کتێب بوو کە فڕی، وەک تریاک فڕی و لە چ جێ دەستنەدەکەوت، چەند کەسێ لەو کەسانەش بە بەریاننەکەوت کە چەند مانگ پێشتر پارەیان بۆی خەواندبوو، بە پارچە کاخەزێکەوە نۆرەیان بۆ گرتبوو.

ناڵەی جودایی بەر لەوەی بکەوێتە بازێڕێ، نۆرەی بۆ گیرا، من کاتێ لە کتێبخانەی خۆماڵیی روو لە باخی شاری بن دیواری یانەی فەرمانبەران، ئاگاداریەکەم خوێندەوە:

بۆ بەدەستهێنانی ناڵەی جودایی هێمن، ناوی خۆت بنووسە و...

بیرمدێ گیرفانم گەڕام، چەند دەرهەمێکی کەم بوو، ترسام تا دەگەمەوە ماڵێ و دەگەڕێمەوە، ناونووسین نەمێنێ!

ئاخر چەند کەسێ بۆ ناونووسین ریزیان بەستبوو، چوومە چاخانەکەی بەری قەیسەری، هی کوڕی هەقایەتبێژەکەی سەیداوە، ئەوەی بە منداڵی چەند مانگێک شاگردی بووم و چایەم بۆ پیاوە ئاسمانیەکە دانابوو، ئەو پیاوەی نەکەوتە چێوەی وێنەیەکی گیراوەوە، لەوێ شەرم دایگرتم و زارم هەڵنەهات، کوڕی هەقایەتبێژ کە بە تەماشاکردنێ دەیزانی خەڵک چی لە دڵدایە، گوتی:

بڵێ، چیت....

تێمگەیاند و وەرمگرت و ناوم بۆ ناڵەی جودایی نووسی، ئەوە یەکەم جارم بوو، بەر لەوەی کتێب بگات، پارە بدەم.

ئاخر من لە تاریک و روونەوە سەوداسەری هێمن بووبووم، هێ لە هەندێش، ئەو ناڵەی جوودایییەی ئەو کتێبەی بە ناوەوە کراوە، من لە پیاوە ئاسمانیەکەوە بیستبووم و ئەزبەرم کردبوو.

ئیدی وا لە سەر ئاو و ئاگرم، ناڵەی جودایی کەی دێ، پەرە کاخەزی وەرگرتنەوەم هەمیشە لە بەرکێیە.

ئەو ڕۆژەی ناڵەی جودایی گەیشت، وەک ئەوەی هێمن خۆی هاتبێت و لە کۆشکە گچکۆکەکەی خۆماڵی دانیشتبێت وابوو، بڕوانە لەو ناوە چ ئاپۆرایەکە، باوەڕناکەم لە سەر هیچ شتێک کە لە ئۆرزدیباگ دابەشدەکرا، خەڵک وا کەڕەسیسەی کردبێت. منیش بە پارەپەسووان خۆم گەیاندێ و وەرمگرت، ناڵەی جودایی نەبا، من و پارەپەسووانێی وا! نە پێشترێ و نە پاشترێ نەمدی بۆ چ کتێبێ بەو شێوە ریز بگیرێ و هەرا بکرێ.

زۆری نەبرد ناڵەی جودایی لە چ جێ نەما، بە گوللە دەستنەدەکەوت، نرخەکەی چەند قات بۆوە، فڕی، پێشەکییەکەی حەمەی مەلا کەریمیش پتر فراندی، ئاخر ئەویش لە ناو خوێنەرانی هەینێ گەلەک خۆشەویست بوو. ناڵەی جودایی دەستاودەستی دەکرد و بە عەرد نەدەکەوت، زۆر کەس هەبوو لەو کتێبەوە بووە خوێنەر و شیعری خۆشویست، جەبارێک هەبوو، خوێندەوارییەکی وای نەبوو، لە تەمەنی سەری بە سەر کتێبدا دانەگرتبوو، ناڵەی جودایی بە شەش دینار کڕی کە نرخی سەر بەرگەکەی نیو دینار کەمتر بوو، هەمیشە لە بەر باخەڵی بوو هەمووی ئەزبەر کردبوو، هەبوو لەو پارەش پتری پێدابوو، فازیل ڕێحانە دەیگۆ:

وا نەبوو زوو سەت دانەیێ بکڕم، هەوکە دەبوومە خاوەن لادەیەکی وەک ئەوەی محەمەد جەزا.

ئەرێ ئەو محەمەد جەزایەش هێمنی گەلەک شیرن دەگۆتەوە و شیرنتری دەکرد. نەخاسمە، ناڵەی جودایی و عەشق و ئازادی و ئەوانە، کاتێ دەیچریکاند:

**بەهار و گوڵ، کچ و مانگەشەو، شیعری تەڕ و بادە...**

تەختی دەکردی و هێندە هێزەت تێدا دەما، لەگەڵ وی بپرسی:

**لەوەی زیاتر جەنابی شێخ، گەرەکتە عالەمێکی تر.**

ئەوجا وەرە، هێمنێکی وا بکەیتە جاشی میللی! لەوەش کەسەردار و سوێدارتر، شەش حەفت ساڵێ پاشتر، ئەوکاتەی هەواڵی مەرگی هێمن شاری

تاساند، تاسانێ مەگەر کاتی خۆی مەرگی حەسەن زیرەک وای تاساندبێ- ئەگەر نەمردم و لە گێڕانەوە گەیشتمە ساڵی مردنی، شیوەنی شار بۆ هێمن دەخەمە کۆلان کۆلانەوە - ئێ، بیستمانەوە، کاتێ تەرمەکەی دەگاتەوە مەهاباد، هێمن گۆتەنی: **کانگای بیری ئازاد.**

هەوادارانی حیزبِ ڕێی لێ دەگرن و لە ناو دارەبازەی دەردێنن و هاواردەکەن:

هێمن جاشە، نابێت لێرە بنێژرێ، خاکی مەهاباد پیس دەکات!

بزانە حیزب هزری خەڵک بە چ پەندێک دەبات! با بگەمە ساڵی مردن، هەینێ شیوەنی شارم بەبیربهێنەوە، جارێ لەوە گەڕێ، هەوکە با شتێ لە کوڕی مەلای گەورەش بگێڕمەوە.

## کوڕی مەلای گەورە

کەس نەبوو ناوی مەلای گەورەی نەبیستبێت، کەم هەبوو نەیناسێت، ئەگەر کوو، دەنا کەسیش نەبوو خۆشی نەوێت، لەو پەڕی چەپەوە پێدا وەرە، بە ناوەندا تێپەڕە، تا دەگەیتە ئەوسەری راست، بەڵام کوڕەکەی وا نەبوو، هەبوو خستبوویە جغزی میر و میری و نەیارەوە، بەوەی لە سەردەمی پاشایەتی و کۆماری هەر نوێنەر و وەزیر بووە، لە قسان لە رژێمی ئێستاش نزیکە، لە سەر هەندێ بەلای نووسنەکانیەوە نەدەچوو.

کوڕی مەلای گەورە ناوی مەلای لە بایشی کردبووە! مەسعوود محەمەدێکی رووتی بۆ خۆی هێشتبۆوە، بەڵام لە دیدی هەندێ کەسەوە لە هەندێ نووسینی بە شێوەیێ دەردەکەوێ، دنیابینیی کۆلکە مەلایەکی وراتی کۆیێ، زۆر لە هی وی سەردەمیتر و لە سەرترە.

ئەوەی لە وان سەردەمان لە کۆڕی مە کۆڕی گەرمی ناو قوتابخانە و چاخانان، هی گڵکەند و باخی شار، هی خولگەی گۆزەکە و کۆترەکە و سەر دەرگای یانەی فەرمانبەران، جێی مشتومڕ و قسان بوو، دوو سێ کتێبی کوڕی مەلای گەورە بوو، یەکیان ئەوەی لە مەڕ حاجی قادر، ئەوی دی لە مەڕ مرۆڤ، ناوی مرۆڤ و دەوروبەر بوو.

هەبوو دەیگۆ:

لەو مرۆڤ و دەوروبەرە دوو دێری بە کەڵک نابینیەوە، هەمووی دژی چەپ و مارکس و داروینە.

هەبوو دەیگۆ:

نووسەر هەیە سەر بە بنەماڵەی بەگ و خانەدانانە، بەڵام نووسینی بۆ چینی بندەستانە، بۆ هەموانە، بەڵام کوڕی مەلای گەورە بە نووسینەوە سەر بە بەرەی چینی سەرێ و دەسەڵاتە.

زۆری هاوڕێ و ناسیارەکانی من ئەوانەی سەروکاریان لەگەڵ خویندنەوە هەبوو، لە بەرانبەر مەسعوود محەمەد هەڵویستان وەگرتبوو، نەیاندەخوێندەوە، بەلام تێیاندا هەبوو پێی سەرسام بوو، وتاری وی دەرباز نەدەکرد، منیش یەکێ بووم لەوانە.

بیرمدێ سەر لە ئێوارەیێ لە گازینۆی شەوانی هەولێر سەرم بە سەر وتارێکی ناو بەرگێکی گەورەی گۆڤاری کۆڕی زانیاریەوەیە، وتار هی مەسعوود محەمەدە، گۆڤارەکە هی سالانی کۆنە، خوێندنەوە لە برادەرانی دابڕیوم، دڵشاد ناوێ لە تەنیشتم دانیشتووە، بێ پرس لە دەستی وەرگرتم:

+ تۆ ئەو پیاوە دەخوێنیتەوە؟

- ئا، نووسینێکی زۆر باشە.

+ زۆر باشە؟ تەرەماشە، نووسینیکی نیە چایەک بهێنێ.

- تۆ ئەو وتارەت خوێندۆتەوە؟

+ کوڕە من شتی وی کوو دەخوێنمەوە!

- ئەدی......

مەسعوود محەمەد نەیاری لەو تەرزەشی هەبوو، بەلام هەشبوو لە خوێندنەوە و تێگەیشتنەوە نەیاری بوو.

ئیدی من خوێنەری ئەویش بووم، وەک چۆن هەینێ تامەزرۆی نووسینی حەمەی مەلا کەریم و کەمال مەزهەر و عزەدین مستەفا رەسووڵ و ئەوانە بووم، ئەوهاش تامەزرۆی نووسینی مەسعوود محەمەد، دیارە لە زۆر شتیش بیرکردنەوەم لەو جیا بوو، بەلام نووسینەکانی رایاندەکێشام، بە تایبەتی زمانەکەی و ئەو وتارانەی لە بارەی زمانەوە، لە بارەی ئەدەبەوە نووسیبوونی.

هێ لە هەندێش جاروبار سەری هەندێ بابەتی دەکردەوە، هەندێ لە یاد نەماوی بیردەخستیەوە، کەس بە لایدا نەدەچوو، کەس بیری لێنەدەکردەوە، وەبیرمدێتەوە، زیندووکردنەوەی رەمزی نافیعی ئالا هەڵگر، لە ناو خوێنەران دەنگیدایەوە...

دەمخوێندەوە هەر نووسینێکی، هەر کتێبێکی ئەوم دەستکەوتبا، بە زمانی

کوردی با، دەمخوێندەوە، بەڵام نەدەوێرام خۆ لە وانە بدەم کە بە عارەبی بوون، زۆر زەحمەت بوون، چ تێنەدەگەیشتم، ئاخر زمان و شێوازی ئاسان نیە، دەربڕینی وای هەیە بە کوردیەکەی تێڕامان و وردبوونەوەی گەرەکە، ئەوجا بە عارەبیش!

یەکێ دەیگۆ:

لە زمانیشدا خانەدانیی خۆی دەردەخات، زمانی نووسینی سەر بە چینی سەرێیە.

ئەوی دی باگۆی دەدایەوە:

زمان هەر زمانە، چ وابەستەی چینە! نووسەر هەیە ئاڵۆز دەنووسێ، هەیە سادە...

عەبدوڵایێ هەبوو، پتر بە عارەبی دەیخوێندەوە، دەیگۆ:

زمانی مەسعوود محەمەد لە زمانی قورئان سەرترە، دەگاتە ئاستی (کەسایەتی محەمەد)ی مەعرووف رەسافی.

لە سەر ئەوە (ئازاد)ێ پیس لێی توورە بوو، دوو سێ حەفتە رووی نەدایێ.

منیش لە بارەی زمانەوە وام دەبینی لە زمانناسی و زمانزانی، لە وشە دیتنەوە و رۆنان و زاراوەسازی و ئەوانە، کەمە هاوشانی.

بە بەسەرکردنەوەی سەربردەیەکی کورتی چەند رستەیی، مالاوایی لە کوڕی مەلای گەورە دەکەم:

لە گەڵ کوڕێ، ناوی نالێم، جاروبار لە سەر ئەو مەسعوودە تێکدەگیراین. هەڵێکیان لە مەیخانەکەی کۆشکی باکوور، بە دەم بادە هەڵدانەوە، کەوتینە مشتومڕ و حەفتوهەشتێکی نزیک لەوە:

- منیش پێموایە لە هەندێ نووسینی، گیانی بەگایەتی و کۆنەخوازیی هەیە، بەڵام هەمووی وا نیە، تێڕوانینی زۆر ورد و جوانی هەیە

+ ئەوە پیاوە بۆگەنە، هیچی پێنیە، نە هزرێ هەیە، نە تێڕوانین، تەنها هەندێ رستەی درێژی ئاڵۆز کە جووتیارێکی نەخوێندەوار بە زمانێکی سادە دەیانڵێتەوە.

- تۆ زۆر لەو نووسەرە مەزنە دەکەیت...

+ تۆ هێشتا لە بەرایی خوێندنەوەی، با هەندێ نووسینی هزری و فەلسەفی بە تێگەیشتنەوە بخوێنیتەوە، هەینێ تێدەگەی...

پاش نزیکەی بیست ساڵێ لەو دانیشتنەی کۆشکی باکوور، ئەو برادەرە لە کورتە نووسینێکدا گوتبووی:

مەسعوود محەمەد بیرمەندێکی گەورەی کوردە.

ئەودەم نەمدیتەوە، دەنا دوور نەبوو بڵێم:

لای من ئەو بیرمەندە نیە کە تۆ دەیڵێی!

ئێ، لە کوڕی مەلای گەورە گەڕێ، ئێستێ هەر لە پێش هەشتا و سێ دەمێنمەوە، هەندێ گرتەی ئاگرم بیرکەوتەوە، ئاگری نەورۆز بە تایە و جادە گرتن، بە دەنگی حەسەن زیرەکەوە، ئەو دەنگەی بێ وی نەورۆز رەنگی خۆی نەدەدا.

## نەورۆز بە حەسەن زیرەکەوە

ئەز لە کۆنەوە لە سەردەمی پیری سوارچاکانەوە هێشتا حەسەن زیرەک بە پێی خۆی و بۆ دیتنی دنیا دەچووە سەر ناڵەشکێنە و لەوێوە ناڵەشکێنەی دەگۆتەوە، لەو سەردەمەوە هۆگری نەورۆز بووم بە حەسەن زیرەکەوە، لەوێوە تائێرە، ئەو دووانە وا پێکەوە.

لەوێ ساڵێوە تا ئێستا من چ نەورۆزێکم بێ حەسەن زیرەک نەکردووە، حەمەد مەستان لە دەمی مەستی دەیگۆ:

نەورۆز، ئاگر و حەسەن زیرەکی لێبکەوە، بەرات دەمێنێتەوە.

بەوە وەڵامی ئەو مەلایەی دابۆوە کە گوتبووی:

نەورۆز بکەن، بەڵام ئاگر مەکەنەوە.

نزیکەی حەڤدە ساڵێ جێی ئاگرکردنەوەی من دیار بوو، نزیک دارتێلەکەی ئەو بەری کەندێ، دارتێلی یاد، ئەو جێیەی پیری سوارچاکان لێی کردەوە. جێیەکە وا هەڵکەوتبوو، ئەگەر ئاگرەکە گەورە با و بلێسەی نیو دارتێل هەستابا، هێ لە بەلاشاوە و موفتی، لە چوار پێنج گەڕەکەوە دەبینرا: لە رۆژاواوە سەر قەلات و سەیداوە، لە باشوورەوە ئیسکان، لە رۆژهەڵاتەوە مامۆستایان و باداوە. جێیەکە لە بار بوو، لە سالانی منداڵیماندا بە دڵی هەمووان بوو، بە دڵی شاتکە شێت و نەنە خان و فازیل رێحانە و کەویار بوو، بەڵام بە قسەی کچەکەی مەستان بێ، جێیەک هەیە لێرە لە بارتر و لەجێتر.

وەبیرمدێ لە ئێوارەی نەورۆزێ لە ساتی ئاگرکردنەوە، سەرچێخ نەچووبم ئەو نەورۆزە بوو کە چەند رۆژێ بوو سەدام بۆ کەوتنی کورد بۆ شا دانەویبوو، کچە ناسکەکەی مەستان گوتی:

بابم دەڵێ: باشترین جێ بۆ کردنەوەی ئاگری نەورۆز، ناو چاوی شێخ

محێدینه.

ئێمه به تیزەوه پرسیمان:

چاوی ئەو شێخه لەکوێیه؟

کچەکەی مەستان له شەرما سەری کوڵمی وێنەی بەردی پرێمز، وێنەی ئاگری نەورۆز سوور هەڵگەڕا، ئێمەش پتر پێی پێکەنیین.

درەنگ زۆر درەنگ له دانیشتنێک باسی نەورۆز و ئەو شێخه هاته گۆڕێ، گوێم لێیه بابم دەڵێ:

ئەو نەورۆزەی شێخ محێدین به گژ ئاگر و سەیراندا چۆوه.

چەتۆ سەرناس دەپرسێ:

چما شتی واش بووه؟

بابم دەڵێ:

ئا، ئەوه له تەمەنی تۆ نیه، شێخ محێدینێ پەیدا بوو، دەروێش و مەروێشی به زەرگ و شیر و دەفەوه به شار وەرکرد، هاواریان دەکرد:

ئەوەی له نەورۆزێ ئاگر بکاتەوه، گاوری بابەلباب گاوره.

هەرایەکی گەورەی نایەوه، هێندەی نەمابوو شار بن خوێن کەوێ، باشبوو زوو کوژایەوه.

چەتۆ سەرناس:

ئاگر کوژایەوه یان شێخ؟

بابم:

ئاگر سەرکەوت، شێخ بەزی.

ئێ، له بەزین و دژایەتی ئەو بۆ ئاگر بهێنه، ئاگری نەورۆز له هەموو سەردەمێ نەیار و دوژمنی هەبووه و هەیه، جا له هەر لاوه بێ، له داگیرکەرەوه، یان له شێخ و مەلاوه بێ.

لەوان ساڵان له گەڕەکێ مه گەڕەکی بەلاشاوه له ئێوارەی نەورۆزێ له زۆر جێ له هەموو سەره کۆڵانێ ئاگر دەکرایەوه، بەڵام ئاگری گەوره هێ له ئاگرەکەی ئێمه، هێندەی له بیرمبێ له حەفت جێ به ئاسماندا هەڵدەچوو:

ئاگرێ له نزیک سەید مارف بەری رادارەکه، ئەوەی خەڵکی له هاتنی

فڕۆکەی خومەینی ئاگادار دەکردەوە.

ئاگریّ لەو سەری، لە ساکە گۆڕەکەی نزیک ماڵی ئەنۆ، ئەو ئەنۆیە حەفتەک پێشتر تایەی خڕدەکردەوە، تا بە چیا نەکەوتبوو، ئەو ئاگرەی ئەویّ لە هەموو ئاگران بڵێسەدارتر بوو.

ئاگریّ لە نێوان هەر دوو حەسار، ئەو ئاگرە زوو بە ئاگری نەنەخان ناوی رۆیشتبوو، ئەو پیرێژنە خۆشی دەکرد و بە دەوری دەسووڕایەوە و چەپڵەی لێدەدا.

ئاگریّ لە خوار ماڵی ئەو ژنەی کە دواتر بە ماڵی پێنج شەهیدەکە ناوی چووە دیرۆکی بەلاشاوە، ئەو ئاگرە بەرانبەر گەڕەکی میرپێداوان بوو، ئەو گەڕەکەی زۆریان دەگەڵ ئەو ئاگرە تەبا نەبوون.

ئاگریّ لەو تەنیشتەی ماڵی فاتە کوردە، نزیک ئەو سەر کۆڵانەی دەگەیشتەوە ماڵی چاوشینەکە ئەو کوڕەی گەرمایی لە ئاگری نەورۆزەوە وەردەگرت و چەندی دەگیرا و بریندار دەبوو، گەرمتر دەبوو، نەدەکوژایەوە.

ئاگریّ لەو سەری سەریّ، بەرانبەر مزگەفتەکەی دەروێش برایم، وەختایەک ئازاد خەتخۆش و ئەوانە دەیانکردەوە.

ئاگرێکیش لەو دیو، دیوی ماڵی بابی جەمیل رەنجبەر، نزیک ماڵی محەمەدی مەلا، ئەو کوڕەی دەیگۆ:

تا دەنگی حەسەن زیرەک نەییت، ئاگر گەرم دانایێت.

وایە، بیّ نەورۆزەکەی حەسەن زیرەک وەک بڵێی نەورۆز ناتەواوە، بە دەنگی ئەوەوە ئاگر گەرم و جوانتر دەبوو، بۆیێ لە لای هەموو ئاگرەکانەوە بە گەورە و گچکەوە، لەگەڵ بڵێسە و چوونی دووکەڵ بە ئاسماندا، (ئەم رۆژی ساڵی تازەیە)ش بەرزدەبۆوە، بە ئاگرەکەی حەمەد مەستانیشەوە.

ئەو مەستانە تا لە گەڕەک بوو، هیچ نەورۆزیّ نەبووە ئاگر نەکاتەوە، ئاگری وی جیا بوو، کز بوو، دووکەڵی کەم بوو، بەڵام لە دوای هەموو ئاگران دادەمرکایەوە، ئەو تایە و نایلۆن و لنگە پێڵاو و ئەو شتانەی نەدەسووتاند، کۆڵیّ کۆڵکە داری گچکەی دەهێنا، هەموو ساڵیّ چەند رۆژیّ بەر لە نەورۆزیّ، نازانم لە کوێوە باریّ لا باریّ داربەڕووی بۆ دەهات.

هێشتا ڕۆژ زەردەی دەما، لە پێش دەرگای ماڵێ لە دەوکەندێ چەند پەلە دارێکی لە سەر ئێک دانابوو، چەرخ بە دەستەوە چاوەڕێی دەروێش برایمی دەکرد، دەروێش ئەللای لە زاری بوو، ئەکبەری بە دوادا نەهاتبوو، مەستان چەرخێ لێدەدا وکچەکەی دەنگی دەدایە نەورۆزێ.

دەڵێن لێیان پرسیبوو:

ئەرێ ئەوە دەروێش بانگینەدا، ئاگرەکە ناکەیتەوە؟

گوتبووی:

با، بەڵام بە دەستی کچەکەم.

ئێ، ئاگری مەستان کز بوو، ناوە ناوە پەلە دارێکی تێداویشت و تا درەنگانی شەو ئاگری ئەو هەر دەسووتا و بە دیاریەوە بادەی خۆی دەخواردەوە، پشکە گۆشت با، پەتاتە با، دەیخستە سەر پۆلوو...

لە مەستان گەڕێ، با بۆ خۆی مەست مەست بێ، ئەوسا بە دەنگی نەوی گۆرانی بچڕێ.

لە ئێوارەی نەورۆزێ، شار دەبووە ئاگر، لە چاوی من، جوانترین ئاگری دوور، ئەوەی لە دوورەوە دەبریسکایەوە، ئاگرەکەی سەر قەلاتێ بوو، لە لای ئاگرەکەی ئێمەوە جوان دیار بوو، زۆر جار خۆزگەم دەخواست لەوێ بام، ئەو ئاگرەی سەر قەلاتێ لەوەتەی هەیە هەر وا جوان بووە، ئەو ئاگرە زۆر کۆنە، هێشتا گردی یارە ئاگری پیرەمێردی بە خۆوە نەدیتبوو، سەلیم سەیدۆک لە سەر قەلاتێ ئاگری نەورۆزی کردبۆوە و تا هەوکەش هەر دەکرێتەوە.

ئاگرێک هەبوو لەوەی سەر قەڵاتێش جوانتر، بەڵام ئەو ئاگرە یەک جار بوو، نەمدیتەوە، ئاگری سەر منارەی چۆلی، منداڵ تایەکیان بردبووە سەر سەرێ، لەو ئاسمانە ئاگریان کردبۆوە، چ ئاگرێکی جوان بوو ئەو ئاگرە، لە دووردوە دەتگوت مانگە لەوێ نیشتۆتەوە و سووربۆتەوە، هەر کەسێ ئاگری ئەو ئێوارەیەی سەر منارەی چۆلیی دیتبێ، لەبیری نەچۆتەوە.

دەوروبەری ئاگرێ مە گەلەک ئاوەدان بوو، سالانی زوو پلکە بەندبێژیش دەهات و بەندی بەسەر ئاگر و کاوەدا هەڵدەگۆ، ئەژدەهاکی دەکردە پالوو و

پەڕۆ، حەیفی من لەوە دێ، لەو هەموو بەندە ئاگریە، نیوە بەندێکیشم لەیاد نەماوە، دواتر لێرە و لەوێ، هەندێ بەندم لە زاران هەڵگرتەوە:

**کاوە کوتکی لە دەستی**
**بە شێریش راناوەستی**
**دەچتە کۆشکی زوحاکی**
**گازدەکات بە بێ باکی:**
**ئەی زۆردار وەرە دەرێ**
**کوتکت وا گەیشت سەرێ**
**کاوە بە دەستوبردی**
**زوحاکی خستە عەردی**
**هەردوو ماری سەر شانی**
**کشانەوە ناو رانی...**

پلکە بەندبێژ بەندی دەگۆت و ئێمەش بە دەوری ئاگردا دەسووڕاینەوە، بە پێی ئاوازەی وی پێمان لە زەوی و شانمان لە شانی ئێکدی دەخشاند، کەویاریش سالانی زوو، لەو سرووتەی ئاگر لە تەنیشتە من بوو:

**هەموو هەستن لێکەوە**
**ئاگر پێکەن پێکەوە**
**ئاگر وا نێرە نێرە (نێڵە نێل)**
**لۆ ژنان و لۆ مێرە**
**هەستن هەستن، مەوەستن**
**رەشبەرەکێ ببەستن**
**ئاگرمان زەرد و سۆرە**
**لۆ کوڕیژگە و کیژۆرە**
**خرو خۆ بهەژینن**
**دەست لە ئاگر وەرینن**
**ئاگر گەیشتە ئاسمانێ**
**دوژمن کەتە لنگدانێ**

پلکە بەندبێژ کاتێ گەرم دادەهات، ئەوەی دەیگۆت، نەیدەگۆتەوە:

**سبەی لەگەڵ گزنگی**

**هەموو بە جلک و بەرگی**

**لە ناو لۆری بە ڕێوە**

**بە دانیشتن، بە پێوە**

**ریز ریز و نۆرە نۆرە**

**دەچین لۆ لای بەستۆرە**

**زیرەک بە دەنگ و سۆزی**

**جێژن دەکات پیرۆزی**

حەیف، هزرم بەربادە و لە بەندەکانی پلکە بەندبێژ هەر هێندەم لە یادە، هەوکە ئەو چارینەشم بیرکەوتەوە:

**ئاگر هاتە سەر جادە**

**هەیتە، هەیتە، خۆت لادە**

**ئەوەی ئاوی پێداکا**

**بە بابەوە گەوادە**

ئەو بەندە هەینێ پتر لەگەڵ جادەی پڕ ترۆمبێل و جادەی شێستمەتری دەهاتەوە، چوونکێ لای مە ترۆمبێلی پێدا نەدەهات. بیرمدێ لە سەیداوە لە نێوان هەردوو جادە، نەورۆز هەبووە، گردێ کۆنە تایە هەڵدەدرایەوە، بڵێسەی ئاگر دوو دارتێل بەرزبۆتەوە، ئێمەش جاروبار دەچووینە دیاری، لەپڕ ترۆمبێلی هەیتە بە قوورە قوور دەهات، دەکەوتنە گەف و هەڕەشە، تەقەشیان بە ئاسمانیدا دەهاویشت، بەلام منداڵ نەک هەر پەرتەیان لێندەکرد، لە پەنایەکەوە تایەکی ئاگرگرتوویان بۆیان غلۆر دەکردەوە، بە بەر بەردیان دەدان، هەیتە ناچار هەڵدەهاتن، ئاگر دەهاتە سەر جادە، منداڵان پێکەوە:

**ئەوەی ئاوی پێداکا، بە بابەوە گەوادە.**

ئەو شەوە رێ دەگیرا، هەر سەیداوە نا لە زۆر گەڕەک ئاگری نەورۆز تا درەنگانی شەو ریوبانی دادەخست و لە زیرەکیشەوە (**نەورۆز بوو ئاگریکی وەهای خستە جەرگەوە...**) دەهات و شار بە تاسەوە گوێی بۆ هەڵدەخست.

لەوان سالآن ئێمەمانان لە رۆژی نەورۆزێ دەچووینە دلۆپە، لەوێش بە دیار گوڵ و کچەوە، بە دیار ئەو هەموو رەنگەوە، لە ناو ئەو هەموو بەزم و رەزم و قاقا و حریتەوە، نەورۆزەکەی زیرەک دەهات و هەمووانی دەخستە گڕی جێژنەوە، ئەو نەورۆزەی چەند رۆژێ بەر لە هاتنی نەورۆز، نەورۆزی دەهێنا.

هەینێ وابوو، هێشتا رەشەمێ شەش حەفت رۆژی مابوو بارگە تێکنێ و لە جێی وی خاکەلێوە لێو بکاتەوە، بە جێژنی نەورۆزێ شادمان بکاتەوە، لە شار و دەشت و دەر لە هەموو جێوە، نەورۆز لە دەنگی زیرەکەوە گەیشتبوو، لە دڵی هەمووان بارگەی خستبوو، لە گشت لاوە دەهات:

لە مالآن و سەرە کۆلان، لە بازاڕ و چاخانە و دەلآڵخانە و مەیخانە، لە ناو ترومبێل و سەر ماتۆڕ و پاسکل و سەر عارەبانە...

عەمۆ جەلیل، ئەو کوڕەی شەو و رۆژ لە کۆلانی دەلآڵخانە دەسووڕایەوە و لە کاتێ خەوتنیش دەنگگرەکەی بە بن گوێیەوە بوو، دەنگی جزیری یان سیساوەیی لێوە بەرز دەبۆوە، لەو حەفتەیە وازی لەو دوو سترانبێژە دەهێنا و نەورۆزەکەی زیرەکی دەخستە سەری، دەگێڕنەوە لە ئێوارەیەکی نەورۆزێ، بەرۆکی مەلای مزگەفتی مەلا رەشکەی گرتبوو:

مامۆستا، ئەورۆ لە دوای بانگدانێ نەورۆزی بخە سەرێ.

ئیدی ئەو حەفتەیە حەفتەی حەسەن زیرەک بوو.

بمێنن لە جێژن و خۆشی، من درەنگمە، گیانکێشان نزیکە!

## بەرەو گیانکێشان

نە دەتوانم بخوێنم، نە دەتوانم بخەوم، شەوێکی بە سامە، هەوڵدەدەم بە کتێبی دەرەکی ترسەکە لە دڵم دەرکەم، دەستم کتێب ناگرێ، ئیدی بێ دەورکردنەوە، بێ خەو ڕۆژم کردەوە، باشە بۆچی هێندە دەترسم، دەڵێی گیانکێشانم لە پێشە.

سبەی زوو هێشتا زۆری مابوو بۆ چوونە ژوورێ، من گەیشتمە سەر دەرگا، ڕەنگە ئەوەش هەر لە ترسەکەوە هاتبووبێت، ویستبێتم زوو بگەمە ناو ترسەکە و لە ترسی چاوەڕوانی نەمێنمەوە.

ڕێ دوور بوو، لەو سەری شار، لەو بەری سایلۆ، بە پایسکل چووم، لە ڕێیێ دوو سێ جار هێندەی نەمابوو ترومبێل پانمبکاتەوە، ئەمن هزر و خەیاڵم هەر لە لای هۆڵی گیانکێشان بوو، لە ساتی چوونە ژوورێ بە بێ درۆ و زێدەگۆیی، هەستمکرد بەرەو جێی گیانکێشان رامدەکێشن، لە بەرخۆمەوە دەمگۆ:

منداڵ لە خۆڕا ئەو ناوەیان لێ نەناوە!

ئەها ئەو کاتانەی لە ڕۆژی تاقیکردنەوە، منداڵ بە یەک دەنگ:

**ئیمتیحانە، گیان کێشانە**

**زیڕ و هۆڕی تەمبەڵانە**

ئەمن هەینێ لێی نەدەترسام، بە بیرمنایە هێندە لە تاقیکردنەوە ترسابم کە هەژی گۆتن بێ، جێی ئەوە بێ لە چێوەی ترس جێی ببێتەوە، کەچی ئەوڕۆ دوای ئەو هەموو مانگ و ساڵە، دوای دوازدە ساڵی پڕاوپڕ لە تاقیکردنەوە، ئەوەتا لە بەری دەلەرزم، تۆ بڵێی لەبەر ئەوە بێ کە ئایندەی خوێندنی پێوە بەندە؟

هەرچی بێ، تا پرسیار هاتە پێشم و خوێندمەوە و دەستم دایە پێنووسێ،

چۆکم دەلەرزی، بە دوو دەستان گرتبووم، بۆم رانەدەوەستا، لەویوە تا ئێرە نایەتەوە بیرم هەرگیز وەها ترسابم، ترسێ بوو هات و رۆیی و سەری نەدایەوە.

ترس هەر هێندە بوو تا چوومە ناو وەلامدانەوە، نەما، ئەو چەند رۆژەی تاقیکردنەوە بێ ترس، بەلام بەناخۆشی رۆیشتن. ئاخر رادیۆی سەرێ ئاگری لە زاری دەباری، براکان هێشتا هەر وا بە ناو یەکتر وەربوونە و دەست لە یەکتر ناپارێزن.

ئێستا هاوینێ سالی هەشتاو سێیە، چاوەڕێی وەرگرتنەوەی ئەنجامین، من خولی دووەمیشم لە پێشە، ئینگلیزیم هێشتۆتەوە، تا دەگەمە هەینێ و لەوێوە بزانم ناوم لە چ زانکۆ و بەشێ دەردەچێ، شتێ لەو وەرزە ناخۆشە بەبیر خۆم دەهێنمەوە و دەیگێڕمەوە.

## وەرزێ لە خەمەوە

١

ئەو وەرزە لە چەند سەرەوە هەر خەم بوو، بۆ من وەرزی وەرینی ئومێد و خۆشی بوو، وەرزی دابڕان و دوورکەوتنەوە، وەرزی ماڵاوایی و بە یەک نەگەیشتنەوە، وەرزی کوشتن و بڕین و بێسەروشوێنکردنی بە کۆمەڵ بوو، وەرزێ بوو خۆزی لە خۆزیداران نەدەهاتە یادەوەریی من و لە سەرە کۆلانێکی کۆلان کۆلانی من خۆی پیشاننەدەدایەوە، هەر لە بەر هەندێ هێند تیژ پێیدا تیدەپەڕم، کەم کەس بمبینێ، کەم، زۆر کەمی دەگیڕمەوە، تەنها سەرەتاتکێ دەگەڵ هەندێ سەربردان دەکەم:

کەویار ئەو کچەی تا ئێرە لە سەد سەرە کۆلان پتر هاتۆتە ناو گێڕانەوە، ئەو کچەی منداڵیم بێ وی وەک ئەوەیە نەبووبێ، ئەو کچەی هێندە شیرینیەی کە ئێستا لە منداڵیمەوە تامی دەکەم زۆری لەوەوەیە، ئەو کچەی ئەگەر ئەو نەبا، دوور نەبوو گێڕانەوەی کۆلان کۆلانیش نەبا، ئەو کچەی تا ئێستاش، ئێستای گێڕانەوەی ئەو، هی کۆلان کۆلان، ناوێرم بیلێم ناوەکەی، هەر بە کەویار ناوی دەهێنم، لە گێڕانەوە هێندە بە کەویار ناوم هێنا، زۆر جار لێم تێکدەچێ و لە بەر خۆمەوە دەلێم:

ئەرێ بە راست، کچەکەی گەڕەک، کچەکەی بن دارخورما و دارتێلی یاد، کچەکەی ناو خەون و خەیاڵ، ناوی خۆی کەویار نەبوو؟!

ئێ، لەو وەرزەی ئەوێ ساڵێ، دەبینم کەویار زگی لە بەر دەمیەتی، خودایە، چیە ئەو بەڵایە! بەرایی وا تێگەیشتم خەیاڵە، خەیاڵی منداڵی، ئاخر بیرمکەوتەوە زۆر جار ئەو بە پەڕۆ زگی بۆ خۆی چێدەکرد و دەچووە پێش ژنی دووگیان و لاسایی رۆیشتن و دانیشتنی دەکردەوە، ئەمن هەر وا تێگەیشتم منداڵەکەی جارانە و پارچە پەڕۆی لوولداوە و خستۆتیە بن

کراسەکەیەوە، ئاخر تا هەینێش کەویار راستە دوو شووی کردبوو، بەڵام هەر منداڵەکەی ناو خەیاڵی منداڵیی من بوو، هەر کچەکەی سەردەمی ساپساپانێ و....

لە خۆم سەر بە هەشێ، لە خۆم خەیاڵ خۆشێ، زگی کەویار پەڕۆ دەرنەچوو، حەفتە وەرنەسووڕاوە، بیستم منداڵی بووە، ئیدی من ئومێدبڕ بووم، نائومێدانە لە بەر خۆمەوە گۆرانییەکەم دەگوتەوە، ئەوەی دەڵێ:

دایکی حەفت کوڕ بی، هەر بە تەماتم...

من گاڵتەم بەو تەمایەی ناو گۆرانییەکە دەهات، بەڵام نازانم بۆ دەمگوتەوە.

تا ئەو رۆژە و گەیشتنی ئەو هەواڵە من هەر بە تەمای کەویار بووم، بۆیێ چاوم چ کچی دی نەدەدی، بە خەیاڵیش نەمدەتوانی هیچ کچێکم خۆشبوێ، پێوەندی لەگەڵ چ کچێ ببەستم.

٢

لەو سەروبەندە، لەو وەرزەی کەویار بووە دایک، دڵم چووە کچێ، لەمێژ نەبوو ماڵیان هاتبووە ئەو سەری کۆڵانێ، رێی قوتابخانەی پێش ماڵێ مە بوو. ئەو کچە زۆر شەرمن لە منیش شەرمنتر بوو، سەری بڵند نەدەکرد، تا بلێی شیرن و میهرەبان دیار بوو، دوو چاوی رەشی قلەترێیی، برژانگ درێژی رەژگوڵی، ناوێکی ناسکی هەبوو، بەڵام لە جوانیی برژانگیەوە من لای خۆمەوە ناوم نابوو رەژگوڵ.

زۆر جار لە بن چاوانەوە تەماشامدەکرد، لە هەلێک ئاماژەیەکی خۆشەویستیم بۆی کرد، خۆی لە گوورە نەبرد، وەک ئەوەی لەگەڵ ئەویشم نەبێ، لە دڵێ خۆ گۆتم:

رەنگبێ بیگرێ، جاری یەکەم هەر وا دەبێ.

دوای چەند رۆژێ هەمان ئاماژەم بۆی کردەوە، وەی خوایە ئەوە چ بوو، ئەو کچە رووتەنک و نەرم و نیانە بۆ وا هەڵچوو، بە هەر سەرێ لێکیبدەیەوە، لەو نەدەهات، وەهای وەڵام دامەوە، تۆبەیەک بکەم، لەگەل

تەمەن بێت و نەیشکێنم، چ وەلامێ، باشبوو کەس نەیبیست، ئێستاش نامەوێ کەس بیبیستێ.

وەبیرمدێ چوومە بەر ئاوێنە، تاوێ لە سیمای خۆم وردبوومەوە، بزەیەکی تاڵم بۆ کرد و گوتم:

منیش لە جێی وی بام، وا دەبووم.

لە دڵێ خۆشم دەمگۆ:

چا نەبوو دڵی خۆم بۆ کەویاریش نەکردەوە، خۆ ئەویش دوور نەبوو، وەهای بشکێنێ و وردی بکات، بۆم خڕنەکرێتەوە، باشبوو لای وی بە رەنگی دوو هاورێی منداڵی ماینەوە.

ئەوەش دڵشکانێ بوو، لە بیرناچیتەوە، لە برژانگ رەژگوڵەوە بە شێوەیەک لە کچ ترسام، نەدەوێرام لە کچ نزیکبکەومەوە و بە چاوی خۆشەویستی تەماشای چ کچێ بکەم، گەیشتمە ئەو باوەڕەی من و ئەویندارییان نەگوتووە، هەرچی بکەم کچێکم لێ هەڵناکەوێ خۆشمی بوێ.

ئیدی لەو وەرزە خەمینە لە کەویار هۆبڕاو بووم و کچەکەی ئەو سەری کۆلانێش وانەیەکی وای دامێ کەس نەیداوەتە کەس، وانەی دەست شووشتن لە چاوچاوانێ و ئەوین.

{ سێ و حەفت ساڵ بە سەر سەربردەی برژانگ رەژگوڵیدا رابرد، حەفتەیەکیش دەبێ سەربردەکەم وەک خۆی خستۆتە (کۆلان کۆلان گێڕانەوە)وە، شەوی چووی کچەم دیتەوە، بە برژانگی ناسیمەوە، لە جاران جوانتر بوو، لە جادەی باتە شان بە شانی یەکتر دەڕۆیشتین، لە دوای شتێ دەگەڕا نەیدەدیتەوە، لەپڕ دەستی خستە نێو دەستم، ترسام ناسیارێ بمانبینێ، ویستم دەستم لە دەستی بکەمەوە، نەمتوانی، پەنجەکانی هێندە نەرم گەرم بوون، شەرم و ترسی نەهێشت، دەست لە دەست جادەمان دەبڕی، من هێشتا دڵنیا نەبووم داخوا ئەو من دەناسێتەوە یان نا، پرسیم:

تۆ منت وەبیردێتەوە؟

بەنەرمی گوتی:

ئەدی کوو، ئەتوو نەبووی گێچەڵت پێمکرد و..

لە دڵێ خۆ دەمگۆ:

باشە ئەو کچە هەینێ بۆ وا لەگەڵم لە بەرد رەقتر بوو، ئێستاش مینا ئاوە.

دەڕۆیشتین، چاومان لەو شوێنە دەگێڕا کە بە دوایدا دەگەڕاین، دەستیم توند دەگوشی و بەین نابەینێ تیچاوێکم دەدا روخساری، لێوی دەتگوت دەندووکی کەون، چاوم دەگێڕا، پەنایێ، جێیەکی نەدیو ببینمەوە تا ماچێکی لێبکەم...

دەست لە ناو دەست بەرەو باخی گڵکەند شۆڕبووینەوە، پرسیم:

تۆ بیرتدێتەوە من چۆن گێچەڵم پێتکرد؟

گوتی:

ئا، زۆر بە ناشیرینی من زۆر لێت تووڕە بووم.

دەمویست بۆی روونبکەمەوە، بەو شێوە نەبووە کە ئەو تێیگەیشتووە، لێوم بۆ لێوی برد، نەگەیشت...

وەئاگا هاتم، وای لەو خەونە! بە نیازی تەواوکردنی خەونەکە خەوتمەوە، بەڵام کچە نەهاتەوە.}

٣

ئەو هاوینە، دەستم چ کارێکی نەدەگرت، چەند رۆژێ چوومە کاری داربەستی، بایی هێندەم پەیداکرد، شتێ بدەمە ماڵێ و بەرکی خۆشم گەرم بکەم و ناوە ناو کتێبێکی پێبکڕم و پێی بچمە سینەما و لە چاخانان چایەکی بخۆمەوە، ناوە ناوە دەچوومە گڵکەند و لە بن دارەکەی خۆم، نەختێ ئینگلیزیم دەوردەکردەوە، شتێ لە کتێبێ، گۆڤارێ، رۆژنامەیەکم دەخوێندەوە، جاروباریش باسی شەڕ و براکوژی دەهاتە گۆڕێ.

چ وەرزێ، چ ساڵێ هێندەی ئەو وەرزە هەستم بە تەنیایی و بێ دۆستی و هاوڕێتی نەکردووە، فازیل، برادەری منداڵیم برادەری گیانیم، بە چیا کەوتبوو، بێ سەر و سۆراخ، نەمدەزانی کەوتۆتە کوێ، لە کوێ سەنگەری لە براکانی گرتووە، لە ترسی گوللەی براکان خۆی لە پەنای چ بەردێک

شاردۆتەوە، دڵم زۆر پێوەی بوو، خەونی ناخۆشم پێوەی دەدی.

هاوڕێیەکی دیم ئەویش لە چیایە و لە شەڕی براکانە، ئەو کوڕەم زۆر خۆشدەویست، ئەو کوڕەیە کە لە دوای سەردانەکەی بێرکۆتێ، جێیەکی وای لە دڵێ من گرت، کەس جێی وی نەگرتەوە، ئەو کوڕەی بەر لە چیا کەوتن، ناوی لە خۆی نابوو شالاو، لە دەمی مالاوایی بە پێکەنین و زمانگرتنەوە گوتی:

ئەگەر نەگەڕامەوە، جاروبار یادم بکە.

وا لە ئێستاوە لە گڵکەندێ یادی دەکەم و جاروبار دەیهێنمە ناو قسانەوە، لە دڵەوە نزای بۆ دەکەم لە گوللەی برا و نەیار بە دوور بێ. خەونی ناخۆش بەویشەوە دەبینم.

ئەو وەرزە هەواڵ هەواڵ ناخۆشییە، کەس لە زاری کەسەوە هەواڵێکی خۆش نابیستێ، لە چیاکان برا برا لە خوێن دەگەوزێنێ و هەواڵی خوێن بەرەو شار رێچکە دەبەستێ. پیاوە دەنگگرەکەی ناو رادیۆی سەرێش هەمیشە زاری شەڕی دەگەڕێ، جاڕی پەرێزپاکی و کوشتوبڕی براکان دەدا، هەینێ ئەگەر ئەو پیاوەم دەستکەوتبا، دوور نەبوو منیش ببمە براکوژ و قورقوشمم لە قورگی کردبا. هەر ئەو نەبوو وابێ، هەر رادیۆیەکی سەرێت دەکردەوە، خوێنی برای رەوا دەکرد.

لەو لایەشەوە لە بەرەی شەڕی قادسیەوە، رۆژانە تەرم دەهاتەوە، شار یەکپارچە پرسەیە، کەم ژن دەبینی رەشی نەپۆشیبێ، کێ هەیە تالاو و زوخاوی رەشی شەڕی نەنۆشیبێ. لە هەموو لاش راوە پیاوە، ئەوەی چۆتە تەمەنیشەوە و کەڵکی سەربازیشی نەماوە، دەبێت بەرگی (سوپای میللی) لەبەربکات، پێشتر ئەو شتە نەبوو، کەس ئەو ناوەی نەبیستبوو، ئەوەی تا ئێستا شەڕ نایگرێتەوە، پیری پەککەوتە و قوتابیە، کێ دەڵێ ئەوەش هەتا سەرە!

ئەو وەرزە ئاوهایە، دڵت بە چی خۆش بێ! بەڵام ئیدی ژیانە، ناچاری بەهانەیەکی بۆ ببینیەوە، دەبێ کەشێکی وا چێکەی، خۆت رادەستی دەرێی ژیان نەکەی. من بە کەم کەمە کارکردن و نەخت نەختە خوێندنەوە و ناوە

ناوه چوونه سینەما خۆم خەریککرد و گەیاندمە دەمی خولی دووەم، لە وانەی ئینگلیزیش رزگارمبوو، ترسی وەرگرتنم نەما، نمرەی کۆلێژێ دەهێنم، ئەویش لە سایەی بیرکاریەوە، ئاخر هەڵەم نیە و سەدی خۆم مسۆگەرە، تا ناو دەردەچێ، بزانین چۆن دەبێت، هەر هەواڵی ناخۆش نێت.

ئەوە هەواڵەی لێی دەترسام گەیشت.

تەرمی سێ چوار پێشمەرگە وا لە مزگەوتەکەی بەحرکە...

دەبێ ناسیار نەبن؟ هەر ناسیار!

یەکیان ئەو کوڕەیە کە لە کیفاحەوە بووە شالاو و چەکی کردە شانی و بە چیا کەوت، ئەو کوڕەی هێندە لە بەر دڵان، هێندە بزۆز بوو، ناخرێتە ناو رستانەوە، رستەی من لە باسی وی وێنەی وی زمان دەگرێ و ئەوەی دەیخوازێ، بۆی ناگوترێ.

لە بەری بەڕانەتـــــی، ئەو دیـــــوەی داری شـــــەکرانێ، ئەو دارەی لە ئەفسانەیەکی ناسکدا خۆی بەری خوێنە، هەوکە لە دوورەوە دیدڤانە بە سەر شەڕی خوێناویی براکانەوە، لەو ئاقارە دەستەیێ پێشمەرگە، شالاویشیان دەگەڵە، نیازیان هاتنە ناو شارە، دەستەیێ پێشمەرگەی بە وان نەیار، رێیان لێدەگرن، دەکەونە شەڕێکەوە تیری تێناچێ، شەڕ درێژە دەکێشێ، براکان خوێن بەرچاویانی گرتووە، تینووی خوێنن، تا خوێن نەڕژێ، تا لە خوێن نەگەوزێن، سەنگەر چۆل ناکەن، دەستەی شالاو دەور دەدرێن، دەزانن تێکەوتن، دەزانن تێدەچن، بەلام دەست نادەن و تا دوا فیشەک دەجەنگن، ئەوەبوو شالاو و سێ چوارێ لە خوێن دەگەوزن.

حوکمەت کە بە دیار شەڕی براکانەوە بزەی سمێڵی دێتێ و لە خوای دەوێ تا یەکتر دەبڕنەوە، بنی نەیەت و هەر ئێرە نا، هەموو جێ بگرێتەوە، ئەوەی خۆی پێیناکرێ، ئەوان بۆی بکەن، دوای بڕانەوەی تەقە، تەرم دەکێشێتەوە، ئەوەتا تەرمی چەند کۆمۆنیستێ لە مزگەفتێ فڕێدراون، یەکیان هاوڕێکەی منە، شالاوە.

هەر چۆنێ بوو، کەسوکار وەریاندەگرنەوە، شالاو دەبەنەوە موورتکەی زێد، ئەو گوندەی بە کوڕ و کچە ئازاکانی خۆیەوە دەنازێ، لە شاریش، بە

دزیەوە، دوور لە چاوی بەعس لە ماڵێکی لاچەپ سووکە پرسەیەکیان بۆ دانا، من بە ترس و لەرزەوە تا نزیک پرسەکەی چووم، ترومبێلێکی جاشان گەیشتە سەرم، وەک بڵێی بزانن دەچمە پرسەی کۆمۆنیستێک، پیس تێیان خوڕیم، ورتەم لێوەهاتبا دەیانکوتام، ڕێم گۆڕی و گەڕامەوە، جاش نەیانهێشت لە پرسەی هاوڕێ جوانەمەرگەکەم تاوێ دانیشم.

شالاو چوو، بووە خەونی شەوان، بەڵام وێنەکەی ما، لە ناو هاوڕێیانی دەستاودەستی دەکرد، لە ئامادەیی پیشەسازی کە خۆی قوتابی ئەوێ بوو، وێنەکەی وا بە دار و دیوارەوە. کوڕێک لەوانەی دەستی لە هەڵواسین و مانەوەی وێنەی شالاو هەبووە، درەنگ، زۆر درەنگ پێکەوتم، عومەری کوڕی خدر کاکیل بووە، ئەو خدرە لە شەڕی هەندرێنەوە، ساڵ ساڵ، شەڕ شەڕ، بە قارەمانێتیدا هاتبوو، مۆلگەکانی سەری سیرین و کۆسپی سپی و زۆریدی دیدڤانن بە سەر نەبەردیەکانیەوە، ئەو قارەمانەش لە گولانی هەمان ساڵ لە شەڕی گەرمی براکان بووە گولالەیەکی خوێنین، لە شێوەی تابلۆ بە سەر بەردێکی بۆڵێی بەرۆکی قەندیلەوە.

شالاو کە بۆ شەڕی بەعس رووی کردبووە چیا، هەرێش وابوو لەوێوە بۆ خوێندن بگاتە رووسیا، بە دەستی براکان چوو، چ خەمێکی گەورەیە، چ بە سوێیە ئەو مەرگە، مەرگ بە دەست برا، چیم لەدەستدێ، هێ لە یادکردنەوە، هەر دەبێ بڵێم دوا خەمم بێت، بە دوایدا نێت، بیرمدێ دوای مەرگی شالاو، زۆر بیرم لە فازیل ڕێحانە دەکردەوە و دەمگۆ:

ئەویش بە دەردی ئەو نەچێ.

دوور بێ، ئەوە چیە بە دڵی مندا دێ!

وا دیارە ساڵەکەی هەر نەهات نا، تووش و شوومیشە، تووش بە بەلا و نەهامەتی، ساڵی رەشبگیری و رەشەکوژی و بێ سەروشوێنکردنی بە کۆمەڵ.

٤

چێشتانێ وەستایەکی ناسیار لە دوای ناردم، بە نابەدڵی چووم، ئاخر من

حەزم لە کاری دیواری بلۆک نەبوو، نزیک بوو، هەر لەو بەری ماڵی مە، دیار بوو دوو کرێکاری نەهاتبوون، وەستا زۆر نیگەرانیان بوو، دەیگۆ:

هەبێ نەبێ شتێکیان لێقەوماوە، هەموو رۆژێ لە پێشە من لە سەر ئیشن.

بلۆکی وەردەگرت و دایدەنا و چەکوچێکی دەگەیاندێ دەیگوتەوە:

ئەوانە کە هەرێیان دا، سەریشی لە سەر دانێن، دەیبەنە سەر، تووشی شتێ بوونە.

گاسی چەمەنتۆی دەکرد و دەیگوتەوە:

ئەوشۆ خەونی زۆر ناخۆشیشم دیت.

وەستا تا درەنگیش تیچاوێکی هەر لە رێ بوو.

ئەو دوو کرێکارەی وەستا وا نیگەرانیان بوو، بارزانی بوون، لەوانەی حوکمەت بەزۆر لە قوشتەپەی خوار هەولێرێ ئاکنجی کردبوون.

ئێ، بۆ شەوێ بوو یان رۆژی دوایی، هەواڵ هات، زار لە زاری دەگێڕایەوە:

بارزانی تەنها مێینەیان ماوە، هەرچی نێرینەیە سوار زیل کران، تەنها حوکمەت دەزانێ بەرەو کوێ.

راستە، راست نیە؟ ئەو چەند هەزار بارزانیە بۆ کوێ؟ بۆچی؟ شتی وا ڕێی تێدەچێ؟

شار بووە شاری پرس و سەرسوڕمان.

هەواڵەکە راست دەرچوو، بارزانی منداڵی وردیلەی لێ دەرچێ، دەنا نێرینەی تێدا نەما، لە دە دوازدە ساڵیەوە تا حەفتا و هەشتا، ئەوەی کیرمیز بوو، بار کراو بە ڕێی پردێدا باژۆ، بێ سەر و سۆراغ مان.

لێرەوە چیرۆکی ژن و منداڵە بارزانیان دەستپێدەکات، ئەو چیرۆکەی مەگەر قەڵات بکارێ بە دەنگ و رەنگەوە بیگێڕیتەوە، ئەز ئێستا نا، با بگەمە زانکۆ، هەینێ هەندێ دیمەنی پیشاندەدەمەوە، بەر لە زانکۆ وا چاکە شتێ لە دیرۆک دەور بکەمەوە.

ئەز زوو بستێ منداڵ بووم، شەڕەفنامەم خوێندەوە، هەر دەبێ زمانەکەی رایکێشابم، وەرنا زەحمەت بوو لەو تەمەنە گچکە ئەو کتێبە قەبە و ئاڵۆزە پڕ

پەراوێزە لە بەراییەوە تا دیماهی بخوێنمەوە، ئا، زمانەکەی توند گرتمی و بەرینەدام، زمانێکی رەوان و پاراو هەرچەندە لە زۆر وشە تێنەدەگەیشتم، بەڵام هەستمدەکرد شیرنن، ماڵی هەژار ئاوا بێ، شەرەفنامەی شەرەفخانی پێ دەورکردمەوە، وای کرد ببێتە یەکەم کتێبی دیرۆکی لە دیرۆکی خوێندنەوەی من، دیارە دواتر جارێکی دی بۆی گەڕامەوە، لە شەرەفنامەوە حەزم چووە کتێبی دیرۆکی، هەرچیم لە بارەی کوردەوە دەستکەوتبا، بازمنەدەدا لە سەری. رۆژ هەبووە لە سبەینێوە تا دانگی ئێواری لە باخی کتێبان سەرم بە سەر دیرۆکەوە بووە.

بەرم لێگرت، لە دیرۆکی میرانی سۆران و بادینان و بۆتان و ئەردەلان و بابان و گاوان و ئەوانەوە پیداهاتم، یەک یەک ئاوام دەکردن، بیرمە کورد و کوردستانەکەی محەمەد ئەمین زەکی زۆر ماندووی کردم، رێنووسێکی کۆن و ناڕێک، زمانەکەش، شەرەفنامە لە کوێ ئەو لە کوێ؟ زۆر بە زەحمەت تەواومکرد، بەڵام زۆر چێژم لە زمانی شۆڕشەکانی کورد وەرگرت، ئەوەی عەلادین سەجادی دەڵێم، ئەمن هەینێش لە خوێندنەوەی کتێبان ئەگەر زمانەکە رەوان نەبا، لێی بێزار دەبووم، هەر لەو سەروبەندە کتێبێکیشم لە بارەی میدیاکانەوە خوێندەوە.

ئەوجا بەرێ خۆ دێ، لەو دیرۆکە چی دەبینی؟ چیت پێ دەڵێ؟ بۆنی چی لێدێ؟ وام لێهات خۆزی بە کەسێ بخوازم کە لاپەڕەیەکی لەو دیرۆکە نەخوێندۆتەوە، کە دەیبینی رووت نایێ سەرهەڵبێنی، سەراپا کوشتوکوشتارە، سەرڕێژە لە قارەمانێتی و بوێری، بەڵام لە خۆفرۆشی ناپاکی سەرشارە، دیرۆکێکە نیوەی پتر براکوژی، دیرۆکێکە دووبارە، هێندە دووبارە لە فیلمێکی سەد جار لێدراوە دەچێ.

وەبیرمدێ لە ناو دیرۆکی کۆن و نوێ، پەڕ پەڕ دەگەڕام، لە دوای قارەمانێکی وا دەگەڕام تا بۆ خۆم بیکەمە هێمای بەرەنگاری، بیکەمە سوارچاکی ناو خەیاڵ و شیعر و گۆرانی، سەرۆکی بێ کەمێ پێداهەڵگوتنی لێ بێ، نەمدیتەوە، زۆر گەڕام نەمدیتەوە.

تاکە کەس کە پێی سەرسام بووم و هەمیشە لە ناو برادەرەکانم باسم

دەکرد و پێمدا هەڵدەگۆ، سمکۆ بوو، پێموابوو سوارچاکە چەلەنگەکەی دیرۆکی کوردەواریە.

ئێ، دیرۆک لەوێ، سمکۆ لەوێ، وا دەڕۆم بەرەو زانکۆ.

بەڵام بەر لە چوونە زانکۆ ئێوارەیەکی ناسکی پایزی هەیە، ئێوارەیەک کە دنیام لێوەی دی، وا چاکە پیشانیبدەمەوە.

## له سینه‌ماوه بۆدیتنی دنیا

تا ئەو ئێوارە پایزیەی بە سەر دیاریی ئاسماندا کەوتم، من تەنها لە گۆڤاری رووت و هەندێ گرتەی کورتی سینەمایی ژنی رووتم دیتبوو، چەند جارێکیش لە خەونێ نەختێ تامم کردبوو، خەونێ یەکەم بەژنە جوانە شەلەکەوە و دوا خەونیش بە ئامێزی کەویارەوە.

لە سینەما دەگەڕێمەوە، رۆژ زەردەی ماوە، دەروێش برایم لە سەر بانگدانە، پەلەمە بگەمە مالێ، فیلمەکە وای خواست چەندی زووە خۆ بگەیەنمە سەرشۆرک، من دوای دیتنی فیلمی وا، خۆم پیرانەدەگیرا، یەکسەر خۆم بە ئاودەستی مزگەفتێکدا دەکرد، بەلام ئەم جارە خۆم گرت و هەلمگرت، هەستمکرد دەنگێک لە پەنهانەوە دەلێ:

لەو گۆڕەی مەڕێژە، بۆ منی هەلگرە.

داخوا ئەو دەنگە کێ بێ؟ تۆ بلێی ئەو دنیایە بێ کە لە خەونێش جوان نەمدیوە!

گرتەکەی سینەما زۆر دلکێش و کەمەندکێش، هەردووکیان رووت و قووت، لە ئاو و ماینەکە رووتتر، ماین بە سەر لمدا نەرم نەرم بەرەو کەنار دەڕۆیی، کورە کچەی لە پێش خۆی سوارکردبوو، وەهای دەگوشی، هێندەی نەمابوو لە ناو دەست و ئامێزیدا بتوێتەوە و بڕژێتە دەریاوە. کچە وەک بلێی لە کڕنووشدا بێ، پرچی خاوی بە سەر ملی ماینیدا هاتبووە خوارێ و تێکەلی بژ بووبوو، کوڕەش خۆی بە سەر دادابوو. ماین گەیشتە دەریا، ئێستا ئاو تا بن زگی هاتووە، پێی کوڕە و کچە لە ناو ئاوێ دەلێی ماسینە. ماین بۆ تاوێ لە جێێ خۆی وەستا، بەلام هەژانی کوڕە و کچە ئەویش دەهەژێنن، زۆری نەبرد ماین سەری رووە و کەنار وەرسووڕاند. ئێستا کچە و کوڕە لە سەر لم لە سەر گازەرەی پشت راکشاون، وا دیارە لە سەر پشتی ماین سەرجێیی

خۆیان تەواوکردووە.

لە سینەمای سیروانی بن قەلاتێوە تا گەیشتمەوە گەڕەک، لە خەیاڵی سەرجێیی سەر پشتی ماینەکەی ناو دەریا بووم و کچەکەم توند لە ئامێز گرتبوو، خۆ ئەگەر ئاماژەی ژنەکەی سەرکۆلانی ئەو سەر نەبا، من لەو ئامێز و خەیاڵە نەدەبوومەوە.

لەو کۆلانە ژنێ هەبوو، لە تەمەنی هەینێی ئەو کچەی لە (ئەمیرەکەم)ی فواد ئەحمەد لە جیاتی گوڵبەهار لێو دەجوولێنێ، هەر لەبەر هەندێش، هەندێ گەنج ناویان لەو ژنە شۆخە نابوو ئەمیرەکەم، خۆی ناوێکی ناسکی کوێستانیی هەبوو.

لە دوو سێ کەسم بیستبوو، ئەو ئەمیرە بێدڵیی خۆی ناکات و دڵی چ کوڕێ لە خۆی ناکات و دەست بە رووی کەسەوە نانێ، بەلام من باوەڕم نەدەکرد، ئاخر شتی وای پێوە دیار نەبوو، جگە لەو دوو سێ کەسەش، کەس بەو شێوە باسی ئەو ژنە نازدارەیان نەدەکرد، هێ لە هەندێش من چەند جارێ لە بن چاوانەوە بە چاوی خراپ سەیرم کردووە، بەلام ئەو وەک ئەوەی منداڵی لێی بڕوانێ، وا باگۆی داومەتەوە، جاری دوایی نەبێ، هێند بە توورەیی چاوی لە چاوم بڕی، لەرزم هاتێ، پێشتر لە چ چاوێ توورەیی وام نەدیتبوو، لەو رۆژەوە نەمدەوێرا ئاوڕیشی لێ بدەمەوە.

با درێژەی نەدەمێ و رێ لە خۆم دوور نەخەمەوە و زوو دنیا ببینم! لە دوورەوە دیتم، ئەمیرەکەم لە سەر دەرگا راوەستابوو، ئەو کۆلانە درێژ و بەرینە چۆل و هۆلە، بڕۆ ژوانی لێ ببەستە. نزیککەوتمەوە، نەوێرام لە بن چاوانەوەش لێی بڕوانم، دوو سێ شەقاو لە ئاستی وی رەتبووم، بە دەنگێکی ناسک:

کوڕە، تۆ...

داخوا لە گەڵی منی بێ! ترسام، ویستم پێ هەڵێنم، ناسکتر و نەرمتر لە جاری پێشی:

راوەستە.

زاخم دا بەر خۆم و ئاوڕمدایەوە، بە ئاماژەی چاو و پەنجە، تێیگەیاندم

بچمە خانووەکەی تەنیشتیان، خانووەکە تێکدرابوو، لەگژ چاککردنەوەی بوون، هێشتا سەری نەگیرابوو. باشە بۆچی دەمنێرێتە ئەو کەلاوەیە؟ چی لێم دەوێ؟ بە پەندێکم نەبات! چاوێکم بە دەوروبەردا گێڕا، دڵیم نەشکاند، تۆ بڵێی فەرمانەکەم بەجێهێنا، ئاخر من دەمێکە چاوەڕێم ئەو ژنە فەرمانێکم پێبکات، ئەگەر بڵێ:

خۆت بە ئاگر دادە.

لە گینە بێ دڵیی نەکەم. پێیەکم لە سەر دەرگای چاوە سەر نەگیراوەکە بوو، ئەویش بە پرتاو خۆی بە ژوورێدا کرد، زۆر ترسام، لە خۆوە خۆم بۆ چەقۆیێ ئامادەکرد.

ئەو پەریە ئەو دیاریی ئاسمانە، بە کراسێکی تەنکەوە باوەشی پێمدا کردبوو، منی زارەتریک چاوەڕێ بووم چەقۆ دەربێنێ و لە کەلەکەم رابکات، باشە من بۆ مێشکم لای چەقۆ بوو!

دوای چەند چرکەیێ، گەرمیی لەشولار چەقۆی لە بیربردمەوە، نە ترس ما نە شەرم، شێتانە تۆ بڵێ گورگانە کەوتمە گوشین و مژین و... هەر کێ لە جێی من با، لە من کەمتری بە (ئەمیرەکەم) نەدەکرد، لە شێوەی کوڕەی سەر ماینەی ناو سینەما لە پشتەوە ئامێزم پێدا کرد، ئەو خۆی وای ویست، نەیویست راکشێ، کەمێ خۆی کووڕ کردەوە، ماچ و رامووسان و سەرجێیی بە پێوە، هەمووی دوور نیە دوو خولەکی خایاندبێ، کاتێ دەنگی مەلا هات، هێشتا نەگەیشتبوومە ترۆپکی چێژ، ئەو چێژەی لە خەونیش نەمدیتبوو، بە خەیاڵیش وێنام نەکردبوو.

ئەمیرەکەم، پرچی خۆی رێکخستەوە و گوتی:

هەرێ بدە ئەوەی دیتت، لە کن کەس باسی نەکەیت، دەنا لێت خۆش نابم.

گوتم:

بێ خەم بە.

ئەو لە پێشەوە چووە دەرێ، چاوێکی بە کۆڵاندا گێڕا، گوتی:

خێرا برۆ، کەس لە کۆڵان نیە.

ئەو شەوە تا دەمی ماڵنووستنانیش چەند جارێ چوومەوە سەرە کۆڵانی

ماڵێ ئەمیرەکەم، نزامدەکرد سەرێ بێنێتە دەرێ و سەر لە ئێوارە دووبارە بێتەوە، نەهات. ئەو شەوە تا مەلای سپێدە خەو نەچووە چاوم، موچڕکەی ئۆخژنی ژن بە لە شمدا دادەهات. ئەو شەوە لە من بووە ساڵ، بنی نەدەهات، وەک بڵێی خۆر کەوتبێتە ناو زگی دێوەوە، ئەو خۆرەی لە هەقایەتێ دێوێک قووتیدا، دوای ساڵێ هێنایەوە، هەڵنەدەهات و هەڵنەدەهات. دەمویست رۆژ ببێتەوە و ئەمیرەکەم ببینمەوە و تێر لە جوانیی بڕوانم، وێنەی روخسار و لەشولاری لە چاوم بنەخشێنم، ئەو لەشولارەی هەر من دەزانم چەند ناسک و نەرم بوو، چەند پڕ و پڕ گڕ بوو.

ساڵێکی برد تا تاو کەوت، یەکپێ بەرەو ئەوێ، ئەو شوێنەی دوێنێ سەر لە ئێوارێ دنیایەکم تێدا دی، ئەوەی خۆشت دەوێ بیبینێ. بڕۆ، وەرە، لە بن سیلەی خانووان راوەستە، خۆ بدە بن دیوار و دارتێل و سێبەری داران، نیە، ئەمیرەکەم دیار نیە. نیوەڕۆ رۆیی، ئێوارە داهات، نەبوو، ئەو ژنە سەری لە دەرگا دەرنەهێنا، لە دڵێ خۆ دەمگۆ:

رەنگبێ بە شەرمدا کەوتبێت، نەیەوێ بمدینێ.

دوو رۆژ و دوو شەو، بوومە سەگی پێ سووتاو، ئەو ناوەم کوتایەوە، ئەمیرەکەم نەدی و نەدیتەوە، سەری سێیەی بیستم ماڵیان تێکناوە و باریان کردووە، بۆ کوێ؟ پێنەکەوتم، روویان لە کوێ کردووە، بارگەیان لە کوێ خستووە.

باشە، خۆ ئەو رۆژە نەمدی ماڵێ لەو کۆلانە باربکات!

من تا درەنگیش سوێم لەوە دەخوارد، ئەمیرەکەمی دوای ئێوارەی راموسان و سەرجێییم نەدیتەوە، تا بزانم وەک ئەوەی بەر لەو ئێوارەیە، یان...!

لەو سەروبەندە زۆر بە تاسەوە بووم فازیل رێحانەی بە چیا کەوتوو ببینم، تا پێی بڵێم:

منیش بێوەی درهەمێک بدەم، دنیام دی، دنیایەک زۆر جوانتر لەو دنیایەی تۆ لە مووسڵێ دیتت.

هەینێ گۆتەیەک لە سەر زاران بوو:

هەر کەسێ چ نێرینە، چ مێیینە، تا سەرجێیی نەکات، دنیای نەدیوە.

هەرێم بردە سەر و کەس لە زاری منەوە، ئەو ئێوارەیەی نەبیست، ئەو ئێوارەیەی دنیام دیت.

دوای ئەو هەموو ساڵە، لەو چەند دێرە گرتەیەکی تەمومژاویی ئەو ئێوارەیەم پیشاندایەوە، بە شێوەیەک کەس ئەو کۆڵانە نابینێتەوە، کەس(ئەمیرەکەم) ناناسێتەوە، ئەو ژنەی دوای ئەو ئێوارە بەهەشتیە بارگەیان تێکنا، نەمزانی بەرەو کوێ لێیاننا و لە چ وارێ نیشتنەوە.

لە هەینیوە تا هەوکە، هەر دەمێ ئەو ئێوارە پایزیە رەنگین و ناسکەم بیردەکەوێتەوە، دەپرسم:

ئەو ژنە بۆچی ئەو چاکەی دنیادیتنی! لەگەڵ کردم؟ تۆ بڵێی زگی پێمسووتابێ! هەرچی بێ چاکەیەکی کرد، نادرێتەوە.

دێتەوە بیرم، دواتر بە گۆڕینی ناو و کات و شوێن، ئەوم بۆ برادەرێکی ئۆلدار گێڕایەوە، بە راستیەکی تێکەڵ بە گاڵتە گوتی:

لە سەر ئەوە لە دۆزەخێ بە سێ ئاگر دەسووتێیت:

ئاگری زینا، ئاگری دواوە، ئاگرێکیش لە سەر ئەوەی مەلا بە سەرتا بانگیداوە و لە سەری هەڵنەستاویت و دەستت لێی بەرنەداوە.

گوتم:

دواوەکە نا، چوونکێ پێشەوە بوو، بەڵام لە دواوە.

چەند ساڵێ دواتر ئەو ژنە لە کتێبی (بە رێی کۆچبارا) دەبینمەوە.

## بەرەو زانکۆ

ئەو رۆژەی ئەنجامی ئەزموونمان وەرگرتەوە، بیرمە گازندەی من تەنها لە نمرەی بیرکاری بوو، ئاخر دڵنیابووم بایی سەدی رێکم وەڵامداوەتەوە، من لە سەرەتاییەوە لە ماتماتیک و بیرکاری هەر وا هاتووم، دەمگۆت:

نابێ، ئەو نمرە هی من نیە، نمرەی بیرکاری هەڵەیە.

بیرمە، نازانم کێ بوو پرسی:

ئەو پرتەوبۆڵەت لە چیە، لە بیرکاری چەندت وەرگرتووە؟

گوتم:

نەوەت و هەشت.

باوەڕی نەکرد، لە دەستی وەرگرتم، چاوی زەقبۆوە، گوتی:

هەتیم، بە راستی ئەتوو کەری.

من دەبوو سەد بهێنم، ئێستاش خەفەت لەو دوو نمرەیە دەخۆم و دەڵێم:

داخوا لە پەلەپەلی لە کوێ هەڵەیەکی دوو نمرەییم کردووە.

ئا، بیرمکەوتەوە، سەرتیپی هاوڕێم بە گاڵتەوە گوتی:

+ دەزانی دوو نمرەکەی تۆیان داوەتە کێ؟

-کێ؟

+ کاک عودەی.

- رێی تێدەچێ! واتە دوو نمرەم عودەی بردی.

+ ئەدی کوو، ئەگەر لە تۆ دوو لەو سێ لە... نمرەیان بۆ کۆنەکردبێتەوە، چۆن یەکەم دەبوو؟

ئەو ساڵە عودەی کوڕی سەدام کە باوەڕناکەم لە پۆلی شەشەم کتێبی قوتابخانەی کردبێتەوە، یەکەمی عێراق بوو.

دواتریش هەشت نۆ دە ساڵێ دواتر، لە کوردستانێ هەندێ لەوانەی

سەرە گوریسێکی دەسەڵاتیان کەوتە دەست، چاویان لە عودەی کرد، بێ ئەوەی هێندەی ئەویش سەر بە سەر کتێبدا دابگرن، بە شەو و ڕۆژێ دەگەیشتنە زانکۆ و...

ئێ، ئەوە لەوێ و لێی گەڕێ، کەڵکی دارتێوەردانی نیە.

هەوکە من وا لەڕێم، ناو هاتۆتەوە و دەڵێن بە دیوارەوە هەڵواسراوە، هێندە پەلەمە، دێتە سەرم لە پاسکل دابەزم و بە پێیان غاردەم، پێموابوو پێم لە پاسکل خۆشتر ددبەزێ، بە دەم ڕێوە نزادەکەم:

لەو کۆلێژەی نزیکماڵی خۆمانم لە بەشی کوردی وەرگیرابم.

دیارە یەکەم هەڵبژاردەی من ئەوێیە، ئەوێشم لە سەری سەرەوە، لە پێش هەموو جێیان نووسیوە.

گەیشتم، دنیا ڕژاوەتە ئەوێ، لا دیوارێکی درێژ بە ناو ڕڕبۆتەوە، تا دەگەیتێ و ناوی خۆ دەبینیەوە، ئەگەر هەبێ، کاتێکی زۆری دەوێ. وا دەگەڕێم، گوێم لە جوێن و گازەندەیە، وا دیارە خەڵکێکی زۆر ناوی لە چ جێ نەهاتۆتەوە، کەسێ دەڵێ:

هەموو لۆ سەربازی...

کەسێ دەڵێ:

مەبەستەکە هەر ئەوەیە، دەنا کەێ بووە، نمرەی وا لە چ جێیەک وەرنەگیرێ، ئاخر...پار لە....وەرگیرا.

منیش ترسم لێنیشت، هەرچەندە نمرەی من زۆر لەو نمرەیەی ئەو کوڕە گۆتی، زیاتر بوو، بەڵام ترسام هی منیش وەرنەگیرابێ.

بگەڕێ، بگەڕێ، لە ریزە ناوێ لە دوورەوە نیوە ناسینێ ناسیمەوە، ئاخر ناوی ئێمە لە خۆمەوە تا باپیری بابم، چوار نا حەفت ناوە، ئۆخەیش هەوە، نزام گیرا، ئەو جێیەی دڵ ویستی، دەست گەیشتێ.

ئەو ڕۆژە دڵم زۆر خۆش بوو، لە خۆشیا پێم بە زەویەوە نەمابوو، دەفڕیم، خەمی وەرزە خەمینەکەم لە دڵ نەمابوو. چوومە سەمەرقەند، سەمەرقەندی خەیاڵ، لەوێوە، بە دەم شەهریارەوە، لە خەیاڵی مەستان ژیانی زانکۆم بە دڵی خۆم، هێل هێل، کۆڵان کۆڵان دەکێشا و دەنەخشاند.

جـاریّ لای ئێـوەم خـۆش، ئەگەر مەرگ نەگـات و حەزی گێـڕانەوە بنـی نەهات، پەیدادەبمەوە. سێ چوار ساڵێکی دی تەمەن و هەندێکی پێشتریش کە خۆیـان نەدا بە دەسـتی گێـڕانەوە، دەگێـڕمەوە. زۆر سـەرە کـۆڵانی شـار و دەرێی شار دەگێڕمەوە.

ئەو کـچەش کە بەینـێ جێی کەویـاری گـرتەوە! نـاوی ئەویشـم گـۆڕی و کردمە ئەلیزا، کۆڵان کۆڵان بۆ خۆمیان دەگێڕمەوە.



# Kollan Kollan Gêrranewe

## Kerîm Kake

(کۆڵان کۆڵان گێڕانەوە) یادەوەرییە، گێڕانەوەی دیتن و بیستنە، پێ بە پێ بەپێی کات پێدا دێ، لێ لێرە و لەوێ جاروبار گەڕانەوە و بازدانی تێدەکەوێ. بەراییەکەی لە منداڵیمەوە، لە تەمەنی چوار پێنج ساڵیمەوە سەردەکات، لە هەرەتی لاویم بنی دێ.

کتێبی کۆڵان کۆڵان گێڕانەوە لە چوار بەرگ پێکدێ: بەرگی یەکەم (١٩٦٨ -١٩٧٤) بەرگی دووەم (١٩٧٤ -١٩٨٠) بەرگی سێیەم (١٩٨٠ -١٩٨٣) دەگێڕێتەوە و بۆی دەگەڕێتەوە. بەرگی چوارم ئەگەر مەرگ بوار بدات و زنەی گێڕانەوە چک نەکات، ساڵی (١٩٨٣ - ١٩٨٦) دەگێڕێتەوە. ئیدی لەوێوە پشت لە کۆڵان و روو لە چیا دەکەم و لەگەڵ خوێنەرێ خۆ خۆ هەڵدەدەینە ناو (گوڵەستێرەکان کوژانەوە)وە.

**کۆڵان کۆڵان گێڕانەوە** هەرچەندە بە زنجیرەی کات وێک گرێدراون، بەڵام خوێنەر لە زۆر بابەت و ناونیشان دەکارێ پێڕەوی زنجیرەی کات نەکات، دڵی چووە سەر هەر بەرگێکی، با لەوێوە دەست بە خوێندنەوەی بکات.

کافکاف

هەولێر- پووشپەڕی ٢٠٢٠





ناوەندی رۆشنبیری مەم و زین

Mem u zin cultural center
memuzin20@gmail
Mem u zin